# حەمەدۆك

## یەشار کەمال

وەرگێڕانی
عەبدوڵڵا حەسەن زادە



بەشی یەکەم

# حەمەدۆک

(بەرگی یەکەم)

نووسینی

یەشار کەمال

وەرگێڕانی

عەبدوڵلا حەسەن زادە



هەولێر - ٢٠١٢

# پێش بار

ناوی یەشار کەماڵ بۆ خوێنەری کورد بێگانە نیە. هەر ئەوەندەی من بزانم تا ئێستا مامۆستای بەڕێز شوکور مستەفا سێ داستانی یەشار کەماڵی کردوون بە کوردیو چاپو بڵاوی کردوونەوە. بەو پێیە خوێندەوارە کوردزمانەکان، یان بڵێین کورد زمانە خوێندەوارەکان لەگەڵ ناوی یەشار کەماڵ وەك نووسەرێکی پایەبەرز و لەگەڵ نووسینەکانی کەم و زۆر ئاشنان. بەڵام بەوحاڵەش ئەگەر لێرەدا شتێك لەسەر ژیان و پێگەیشتنی یەشار کەماڵ بنووسین، رەنگە بێ سود نەبێ.

یەشار کەماڵ ساڵی ۱۹۲۳ی زایینی (۱۳۰۲ی هەتاوی) لە یەکێك لە گوندەکانی "عوسمانیە" لە ناوچەی "سیهان"ی تورکیە بەناوی "هەمیتە" لە دایك بووە. ناوی ئەسڵیی ئەو، "کەماڵ گوێکچەلی"یە.

باوکی خەڵکی ناوچەی "ئەرجیش" لەدەوروبەری گۆلی "وان" لە تورکیەیە کە لە سەروبەندی یەکەم شەڕی جیهانی دا لەگەڵ بنەماڵەکەی کۆچی کردوە بۆ "چوکووراوا".

تەمەنی یەشار کەماڵ چوار ساڵ زیاتر نەبوو کە باوکی لە دەست چوو. پیاوێك بە ناوی وسووە کوردە لە کاتێك دا کە باوکی یەشار کەماڵ لە مزگەوتی ئاوەدانی خەریکی نوێژی شێوان دەبێ خەنجەرێکی لێدەدا. باوکی یەشار بە برینداری و شەلاڵی خوێن لە مزگەوتێ دەردەپەڕێ، بەڵام تەنیا چەند هەنگاوێك لە دەرگای مزگەوتێ دوور دەکەوێتەوە کە دەکەوێ و دەمرێ.

ئەم کارەساتە لە پێش چاوی یەشار کەماڵی چوار ساڵە روو دەدا. یەشار لە بیریەتی کە وەختێك باوکی لە خوێن گەوزی، لە پڕ دێیەکەیان شڵەژاو دەنگی تەقە بەرز بووەوە. یەشاری چکۆڵە لە ترسان زمانی گیراو لاڵ بوو. ئەو لاڵیە هەتا نیزیك دوازدە ساڵی درێژەی هەبوو. بۆخۆی لەم بارەیەوە دەڵێ:

"هێندێك لاڵ هەن كە بە هەر گیان كێشانێك بووە لە دەقیقەیەك دا دەتوانن وشەیەك بێننە سەر زمانیان, بەڵام زمان گیرانەكەی مـن جۆرێـك بـوو كـە بـۆ دەربڕینـی تاقـە رستـەیەك نیـو سەعات هەوڵم دەداو گیانم دەكێشا".

یەشار خوێندنی سەرەتایی لـە گونـدی "قـەدیرلی" تـەواو كـردو پاشـان هـەتا پـۆلی دووهـەمی ناوەندی لە قوتابخانەیەكی "ئەدەنە" خوێنـدی و تـەواو. وەختێـك بـاوكی مـابوو, بنەماڵـەی كـەماڵ یەكێك لە خۆش گوزەران ترین بنەماڵەكانی ئاوایی بوون. بەڵام هەتا كەماڵ گەیشتە تەمەنی هەشت ساڵی, هەرچی لەباوكی بـۆی بـەجێ مـابوو, تـەواو بـوو. سەرپەرستیكردنی بنەماڵەكـەیان كەوتـە ئەستۆی مامی كەماڵ كە پیاوێكی ساویلكەو زۆر دڵ و دەروون فـرەوان بـوو. بـۆ تەخـشان پەخـشان حیساب و كیتابێكی نەدەزانی. هەر ئەمەش بـوو بـە هـۆی ئـەوە كـە بنەماڵـەی كـەماڵ بـە زوویـی ئابووت بن و بە ناچار لە سەر زەوی و زاری ئەم و ئەو دەست بكەن بە سەپانی و سێیەك بەری.

كەماڵی چكۆڵە ناچار بوو بۆخۆی نانی خۆی پەیدا بكاو یارمەتیی بنەماڵەكەشی بدا. بۆیـە ماوەیەكی زۆری تەمەنی بە كاری جۆراوجـۆرەوە رابـواردوە. بـۆ نموونـە كرێكـاری لـە كارگـەی تەلیس چنین و میرزایی و میراوی لەمـەزراو مـەرەزەجارەكان دا... هـەر ئـەم كارانـەش بوونـە كۆسپی درێژە پێدانی خوێندنەكەی.

كاری میراوی لە مەرەزەجارەكانی دەوروبەری "چـۆمی سـاووران" دا یـەكێك لـە خۆشـترین كارەكانی یەشار كەماڵ بووە. بۆخۆی دەڵێ:"نیزیكەی هەشت ساڵ مـیراوی مـەرەزەجار بـووم و حەوتووی دوو جار بە پێیان هەتا سەرچاوەی چۆمی سـاووران دەچـووم و دەگەڕامـەوە. ئـەمن لەگەڵ ئاوی ساووران وەها ببوومە دۆست و هاودەم كە هەر لەگـەڵ مرۆڤێـك دەكـرێ پیـاو ئـاوا ببێتە دۆست و هاودەم. ئەگەر لێم بپرسن لە دنیا دا چ شتێكت لەهەموو شتێك خۆشـتر دەوێ, بێگومان دەڵێم ئاوی ساووران... یەكەم رۆمان كە لە مێشكم دا گووراوە هەر لەسـەر ئەم ئاوی ساوورانەیە. ئێستا رۆمانێكی پێنج بەرگی كە ئیلهامی لە ئاوی ساووران وەرگرتوە لە مێـشكم دا دەجووڵێ, كە رەنگە هەوەڵ رۆمان و دوا رۆمانی گەورەی من بێ"

هەر بە منداڵی عەلاقەی بە شێعر گوتن هەبوو. هێشتا تەمەنی هەشت ساڵ زیـاتر نـەبوو كـە دەسـتی كـرد بـە شـێعر دانـان. خـۆش ئـەوەبوو جـارێ ئـەش چـووبووە قوتابخانـەو خوێندنـەوەو نووسینیشی نەدەزانی, كە دەستی بە شێعر دانان كرد. لە تەمەنی یازدە ساڵی داكە قوتابیی پۆلی سێهەمی سەرەتایی قوتابخانەی گوندەكەیان بوو, شێعرەكانی زار بە زارو دێ بە دێ دەگەڕان.

لە هەشت ساڵی دا دەستی بە ساز لێدانیش كـرد. بـەڵام دایكـی هـیچ كـەیفی بـەو كـارەی نەدەهات. بۆیە ئەو سازانە كە یەشار كەماڵ بە حەقدەستی فەعلەیی و سەپانی و سێیەك بەری

دەیکڕین, یان دەیشکاندن یان لە ئاوری داویشتن و دەیسووتاندن. بەم جۆرە ئارەزووی مۆسیقا لێدان وەك پشکۆی بن خۆڵەمێش لە دڵی کەماڵ دا نێژرا.

وەختێك لە تەمەنی نۆ ساڵی دا چووە قوتابخانەو کۆلکە خوێندەوارییەکی پەیدا کرد, دڵی بەوە خۆش بوو کە ئەمجار شێعرەکانی دەنووسێتەوەو وەك جاران لە بیری ناچنەوە.

یەکەمین شێعری, ساڵی ١٩٤٢ لە گۆڤاری "گوڕووشلێر" دا لە شاری ئەدەنە چاپ کرا. ساڵی ١٩٤٣ کۆمەڵە شێعرێکی بەناوی "تازیەنامە" لە ئەدەنە چاپ کرد. یەکەمین داستانی بەناوی "داستانی پیس" ساڵی ١٩٤٧ کاتێك کە لە خزمەتی سەربازی بوو, نووسی. هەر لەو ساڵانەدا رۆمانێکی بەناوی "کاڵەی ئاسن" و داستانێکی درێژی بەناوی "سووورێژە" نووسی. بەڵام چونکە هیچیانی بە دڵ نەبوون, پێش نووسەکانی سووتاندن و فڕێی دان.

پاش خزمەتی سەربازی هاتە ئەستەمبووڵ و لە ئیدارەی گاز دا ماوەی ساڵێك کاری کرد. پاشان گەڕایەوە گوندی قەدیرلی و دوو ساڵ بە عەریزەنووسی ژیانی بردە سەر. کتێبی "زەردەگەرما"ی کە کۆمەڵە چیرۆکێکی کورت و درێژە لەو ماوەیەدا نووسیوە.

ساڵی ١٩٥١ سەرلەنوێ هاتەوە ئەستەمبووڵ و بوو بە هاوکاری هەمیشەیی رۆژنامەی "جمهوریت" و وەك ریپۆرتاژنووسی رۆژنامەکە دەستی بەکار کرد. هەرکام لەو ریپۆرتاژانەی یەشار کەماڵ کە هەتا ساڵی ١٩٦٣ لەو رۆژنامەیەدا چاپ کران, بە رووداوێك دەژمێردران. هەتا ئێستا سێ خەڵاتی ریپۆرتاژو رۆمان و شانۆنامەی وەرگرتوە.

"ئینجەمەمەد" یەکێك لە داستانە درێژەکانی یەشار کەماڵ و بەو جۆرە کە من تێی دەگەم لە نێو ئەو داستانانەدا کە خوێندوومنەوە شاکاری یەشار کەماڵە. زۆر پێش ئەوەی "ئینجەمەمەد" بخوێنمەوە ناوبانگیم بیستبوو, و ئاواتم بوو بکرێتە کوردی, یان بۆخۆم هەلم بۆ بڕەخسێ و بیکەمە کوردی. بەڵام ماوەی چەند ساڵ ئەو ئاواتەم وەدی نەهات هیچ, بەڵکوو "ئینجەمەمەد"م بۆ خوێندنەوەش وەدەست نەکەوت.

پاییزی ساڵی ١٣٦٢ نوسخەیەکی "ئینجەمەمەد"م دەست کەوت و خوێندمەوە. ئەمجار زیاتر ئاشقی کتێبەکە بووم و لەگەڵ قارەمانی داستانەکەش "ئینجەمەمەد" هەر بەڕاستی بوومە دۆست. دەستم پێ کرد بەڵکوو کتێبەکە بکەمە کوردی و ئەو دۆستە تازەیەم بە خوێنەرانی هاوزمانم بناسێنم. بەڵام هێشتا مرخم لێی خۆش نەببوو کە کەندو کۆسپ پێشیان پێ گرتم و بۆ ماوەیەك "ئینجەمەمەد"یان لێدوور خستمەوە. تەنیا لەوەدا شانسم هەبوو کە کتێبەکەم لە دەست دەرنەچوو. هاوڕێیەکم کە کتێبەکەی بۆ ماوەی سێ چوار مانگ وێ

دابووم، ماڵی ئاوەدان بێ، پەلەی لێنەکردم و "ئینجەمەمەد" لە قوژبنێکی کتێبخانە چکۆڵەکەم دا مایەوە.

نیزیك بە ساڵێك پێ چوو. ئاخرو ئۆخری هاوینی ئەمساڵ لە کاتێك دا زیاتر لە جاران پرکار بووم "ئینجەمەمەد" خۆی وەبیر هێنامەوەو لێی دەژاروژەنگ نام کە نیستەرەم هەر ئێستا دەبێ دەست بە وەرگێڕانی کتێبەکە بکەم. بە ناچارو نیوەنابەدڵی دەستم پێ کرد. خواوڕاستان بە دەستمەوە هات و لە ماوەیەکی تا رادەیەك کورت دا وەرگێڕانەکەی تەواو بوو. لە راستی دا کەمتر لە حەفتا رۆژی پێ چوو کەکاری وەرگێڕانەکەم تەواو کردو ئاواتەکەی خۆم و داخوازەکەی "ئینجەمەمەد"م وەدی هێنا.

**لەسەر تەرجەمەکە پێم خۆشە هێندێك شت بڵێم:**

ـ "ئینجە"ی تورکی مانای چکۆڵە، لاواز، باریك و ئەو جۆرە شتانە دەدا کە من بۆ "ئینجەمەمەد" دەمتوانی "حەمەلەڕ"، "حەمەچکۆڵ"، "حەمەدیلە"و حەمەدۆك و... دابنێم. لە نێو هەمووی ئەو وشە کوردیيانەدا وشەی "حەمەدۆك"م بۆ "ئینجەمەمەد"ی دۆستم هەڵبژارد. چونکە ئەوەی من لە کوردی بیزانم ئەم ناوە هەر لەو کاتەدا کە چکۆڵە بوونەکە دەگەیەنێ، خۆشەویست بوونیش نیشان دەدا. ئێستا جێ دەگرێ یان نا؟ کەوتوەتە بەر زەوق و سەلیقەی خوێنەری کورد.

ـ کوردییەکەی "حەمەدۆك" لەسەریەك کوردیی موکریيانە، بەڵام نازانم بۆچی پێم خۆش بوو هەر وشەیەك دێتە پێش و بە چەند جۆر بە کار هاتوەو من دەیانزانم و بە بیرم دا دێن هەموویان بنووسم، یان ئەگەر بۆ مانایەك چەند وشەم پێ شك دێن هەموویان بەکار بێنم. بۆ وێنە: (کەوچك و کەچك)، (سنگ و سینگ)، (هەڵاوەسین و هەڵواسین)، (ئاگرو ئاور)، (ئاورگ و ئاگردان)، (جۆخین و جێخوون) و زۆر شتی دیکە. یان وەك (تاوڵ، چادر، رەشماڵ و دەوار) کە هەموویان یەك مانایان هەیە. پێم وایە هەوڵێشم داوە ئەم وشە جۆراوجۆرانە بە چەشنێك بە کار بێنم کە سەر لە خوێنەر نەشێوێنن و لە هەموو جێگایەك ماناکەیان بە ئاسانی بە دەستەوە بدەن. ئێستا لەو کارەدا چەندە سەرکەوتووم، یان تێشکاوم، خوێنەری ژیرو وریای کورد دەزانێ.

ـ لە "حەمەدۆك" دا زۆر جار دێتە پێش چاو کە ناوێك چەند جار بە دوای یەك دا دووپات دەکرێتەوەو جاروبار کەمێکیش رەزاگران دیار دەکا. هەرچەند بە ئاسانی دەکرا خۆمی لێبپوێرم. بەڵام بۆ ئەوەی شێوە نووسینەکەی دانەر لە تەرجەمە کوردییەکەش دا دەربکەوێ، وام بە باش زانی چۆنێك نووسراوە، راست بەو جۆرەی بکەمە کوردی.

ـ مەیدانی کارەساتەکانی داستانی "حەمەدۆك" لادێ و دەشت و دەرو کێو و بەندەنە. منیش وەك کوردێکی پەروەردەی لادێ و شاخ و داخی کوردستان لەو بارەیەوە هێندێ وشەو زاراوەو تەعبیری کوردی فێر بووم کە یەکەم جار بوو بۆم هەڵدەکەوت بیانهێنمە سەر کاغەز. بۆیە درێخیم پێ نەکردوون و هەرچی وەبیرم هاتبێتەوەو جێگای خۆی کردبێتەوە بەکارم هێناوە. بۆ ئەوەش کە خوێندەوارە بەڕێزە شارنشینەکان لێیم تووڕە نەبن، بە هاوکاریی هێندێ برای دڵسۆز فەرهەنگۆکێکم بۆ "حەمەدۆك" ڕێك خستوە کە بە دوای داستانەکەدا دەیبینن.

لە "حەمەدۆك"دا هێندێ وشەی تورکی و فارسی و عەرەبیم بەکار هێناون. دیارە هیچ کامیان لە زمانی کوردی دا نامۆ نین و ژمارەشیان لە بیست وشە تێناپەڕێ. هۆی بەکار بردنی ئەم چەند وشەیە ئەوە بووە کە بە زەوقی خۆم وشە کوردیەکەی بەرامبەریان نەیتوانیوە لە هەموو جێگایەك ماناکەیان بە تەواوی بگەیەنێ، یان هەر نەبێ ئاهەنگی خوێندنەوەی خۆش نەبووە.

ـ خوێنەری خۆشەویست جاروبار تووشی هێندێ ڕستە دەبێ کە ماناکەیان تەواو نیە. ئەمەیان نە خەتای منەو نە لە ئەسڵەکەش دا بە کەمایەسی دەژمێردرێ. نووسەر زۆر وەستایانە لەکاتی گێڕانەوەی قسەی قارەمانەکانی داستانی خۆی دا نیشان دەدا کە مرۆڤ چۆن لە کاتی تەنگانەو دڵ پەرۆشی دا زمانی تێکەڵ پێکەڵ دەبێ‌و پێش ئەوەی ڕستەیەك تەواو بکا، ڕستەیەکی دیکە دەست پێ دەکا.

ـ لەسەر ڕێنووسی "حەمەدۆك"یش پێم خۆشە ئەوەندە بڵێم کە لەبەر ئەوەی بەداخەوە تا ئێستا شێوەیەکی یەکگرتوومان لە نووسینی کوردی دا نیە، ڕەنگە کەم و کووڕیی تێدا هەبێ. هەر جۆر بێ، دەستم وا ڕاهاتوەو ئەگەر ناتەواوییەك هەیە داوای لێبووردن لە خوێنەران دەکەم.

ـ ماوەتەوە ئەوە کە بڵێم زۆر لەمێژە دەڵێن وەرگێڕ ڕەنج بەخەسارە، چونکە ئەگەر کارەکەی سەرکەوتوو بوو خەڵك ئافەرین بۆ نووسەر دەنێرن و ئەگەر سەرکەوتووش نەبوو سەرکۆنەی ئەو دەکەن. بەش بە حاڵی خۆم ئەو ئەسڵەم قبووڵەو رادەگەیەنم کە هەر کەم و کووڕییەکی لە "حەمەدۆك"دا بێتە بەرچاو، خەتای وەرگێڕانەکەیەتی. "ئینجەمەمەد" داستانێکە لە نێو داستانان دا هەڵی بژێرێ. بە خۆڕایی نیە کە "ئینجەمەمەد" تا ئێستا بەدەیان زمانی زیندووی دنیا تەرجەمە کراوەو چەندین ملیۆن نوسخەی لێ لە چاپ دراوە.

لە کۆتایی دا بە پێویست دەزانم لە زەحمەت و ماندوو بوونی کاك بێهرووزی کورد ئەحمەدی کە لە ڕێك خستنی فەرهەنگۆکی ئەم تەرجەمەیەدا هاوکارییەکی بەنرخی کردم، پڕ بە دڵ

سوپاس بکەم و هەروەها سوپاسی جگەرگۆشەی خۆشەویستم محمدی حسن زادە بکەم کە ئەم کتێبەی بە شێوەیەکی جوان و رێك و پێك تایپ کردو زۆر گیروگرفتی چاپی لەکۆڵ کردمەوە.

پاییزی ١٩٨٤ ـ وەرگێڕ ـ

* ئەو زانیارییانەی لەبارەی ژیانی یەشار کەماڵەوە لەم پێش بارەدا هاتوون, لە (مقدمە)ی چاپی فارسیی ئینجەمەمەد وەرگیراون. ـ وەرگێڕ ـ

# (۱)

بناری "چیاکانی تووروووس" له لێوارەکانی "دەریای سپی"یەوە دەست پێ دەکا. ئەم لێوارانە کە هەمیشە بە شەپۆلی سپی و کەفاوی دەکوترێنەوە, بەرە بەرە هەتا تیرەشان و لوتکەکان دەچنە پێش.

لە ئاسمانی دەریای سپی دا هەمیشە پەڵە هەوری سپی‌دێن و دەچن. لێوارەکانی دەریای سپی دەشت و هەموارن و خاکەکەیان لیوەدارە. ئەو خاکە ئەوەندە تروسکەدارو هەموارە دەڵێی سپی کراوەتەوە. خاکی لیوەدار نەرمە وەك گۆشت. ئەو خاکە هەتا چەند فرسەق ئەو لای دەریا بۆنی توندی خوێ و بۆنی دەریای لێ دێ. لەوە بەدوا هەتا چاو بڕ دەکا زەویی کێڵراوەو لە پاش ئەویش دەوەناوی‌یەکانی "چووکووراوایە".

چووکووراوا وڵاتێکە ئەم سەر ئەوسەری دیار نیە, بە سەوزایی توندی دەوەن و دڕدووك و خێزەران و قامیشەڵان و گوێنی و لاولاوی کێوی داپۆشراوە. وڵاتێکە بەسام و تاریك, کە لە لێڕەواری تاریکیش بەسامترو تاریکترە.

ئەمجار گۆلاوی گەورە گەورە بە درێژایی ئەو ڕێگایانە کە لەلایەك دەچنە "ئاناوارزا" و لە لایەکیش بە "عوسمانیە"دا تێپەڕ دەبن و دەگەنە "ئیسلاحیە", پان بوونەوە. ئەو گۆلاوانە هاوینان گەنداوێکی پیس و گەرمن, ئەوەندە پیس و بۆگەنیون کە ناکرێ لێیان نیزیك ببیەوە. هاوینان ئەو گۆلاوانە بۆنی گەڵاو پووش وپەڵاش و خاکی رزیویان لێ‌دێ, بەڵام زستانان وەك چاوی قرژاڵ روون و جوانن. هاوینان سەریان بە قەوزە دادەپۆشرێ, بەڵام زستانان دەڵێی هەریرن, هەریری پان و پاك و خاوێن.

لەو لای ئەو گۆلاوانە دیسان پەڵە زەویی پان و بەرینی داچێندراوو وەردوشێو بڕاو دەست پێ دەکەنەوە. خاکی ئەم مەڵبەندانە چەورو سووکە. خاکەکەیان ئەوەندە باش و بە بڕشتە کە یەك و

چل, یەك و پەنجا دەبڕێ. لەولای ئەو زەوییانەش تەپۆلکە تەپۆلکەیە کە بە داری "مێرسین" داپۆشراون. بۆنی قورسی ئەم دارانە مێشکی پیاوی دەگرێ. ئەمجار بەردەڵان و کاجستانێك دەست پێ دەکا. ئەوەندەش لە ناکاو دەست پێ دەکا کە پیاو لێیدەترسێ و دەسڵەمێتەوە. کاجەکان و گابەردەکان شان بە شانی یەکتر دەڕۆنە پێش. شیلەی کاج لەو شوێنە وەك دەنکی مرواری دەتکێتە سەر زەوی. لە پاش ئەو بەردەڵان و کاجستانە بەربڵاوانە دیسان بیابان و زەویی پان و بەرین دەست پێ دەکاتەوە. لەم ناوچەیەدا زەوی نەزۆك و بەیارەو لێرەوە لوتکەی پڕ لە بەفری توورووس ئەوەندە نیزیك دیار دەکا کە پێت وایە دەست درێژ بکەی دەیگاتێ.

"خاردەشت" سووچێکە لەم بیابانە کە پێنج گوندی تێدان. خەلکی گوندەکانی خاردەشت بستێکیان زەوی نیە. هەموو زەوییەکان ملکی "عەبدی خان"ن.

خاردەشت ولاّتێکە تەریك و جیا لە ولاّتانی دیکە. خاردەشت دنیایەکە بە ژیان و قانوونی تایبەتیی خۆیەوە. خەلکی خاردەشت جگە لە گوندەکانی خۆیان دەکرێ بلێین هیچ کوێیان نەدیوە. کەم کەسیان لە خاردەشت بەولاوەتر چوون. لەلاوەش ڕا هیچ کەس ڕێی لەم ولاّتە ناکەوێ. ڕێگاکان و خەلکی خاردەشت کەس نایانناسێ. تەنانەت باجگری دەوڵەتیش چەند ساڵ جارێك زیاتر ڕێی ناکەوێتە ئێرە, ئەمجار ئەویش هیچ کاری بە دێنشینەکانی خاردەشت نیە. عەبدیخان دەبینێ و ئاوێ بێنەو دەستان بشۆ.

"ئاسیاب چەشمە" گەورەترین گوندی خاردەشتەو عەبدیخان لەوێ دەژی. گوندی ئاسیاب چەشمە لە ڕۆژهەلاّتی دەشت و لە بن بەردەلاّنێك دروست کراوە. گابەردەکان شینن و سەریان پڕە لە خەنەتیلکەی سەوزو زیوین و ژەنگاریو هەمەڕەنگە. چنارێکی پیرو قەدئەستوور کە لەبەر پیری لك و پۆپەکانی بەرەو خوار شۆڕ بوونەوە, زۆر لەمێژ ساڵە بە شکۆو سەنگینییەکی تایبەتییەوە لە سەرەوەی گوندەکە بە پێوە ڕاوەستاوە.

هەتا سەد هەنگاو, تا پەنجا هەنگاویش لە چنارەکە نیزیك ببیەوە گوێت لەهیچ دەنگێك نابێ . لێرە جگە لە بێدەنگییەکی بەسام خەبەرێك نیە. ئەگەر زیاتریش بچیە پێش, بیست و پێنج هەنگاوت بێنێ بۆ چنارەکە, دیسان هەر ئەو بێدەنگییەیە. لە دە هەنگاویش هەر ئەو بێدەنگییەیەو ئەو بێدەنگییە. دەڵێی نە زیندەوەرێك هەناسەی دێ و نە پەلەوەرێك باڵ لێك دەدا. بەلاّم هەر کە گەیشتیە پەنا بەردی بن چنارەکە, لە نەکاو هەموو شتێك دەگۆڕێ. هاڕەیەك هەڵ دەستێ, هاڕەیەك کە گوێت کەڕ دەکاو بە بیستنی تێك ڕا دەبی. کەچی پاش ماوەیەك بەرە بەرە ئارام دەبێتەوەو بێدەنگ دەبێ.

لادێیییەکان بەو جێیە کە هاڕەی ئاوەکەی لێ‌هەڵدەستێ, دەڵێن سەرچاوە. پێیان وایە کە سەرچاوەی ئاوەکە ئەوێیە. بەڵام ئەم ئاوە زۆر دوورتر لە "ئاکچاداغ" ڕا دێ و لە پاشان چەند فرسەق بە نێو کاجستان و ژێر بەردەڵانەکان دا تێ‌دەپەڕێ, لەگەڵ بۆنی پەنگ و جاترەی کێوی تێکەڵ دەبێ و سەرەنجام بە کەف پڕژاندن و هاڕە هاڕ لەو بن بەردە دەردەپەڕێ‌و ئەوەندە بە تاقەت و تین و تەوژم و سەرشێتە, ئەگەر دارێکی تێ‌بهاوێژی دەتوانێ ڕۆژێک, دوو ڕۆژ و تەنانەت حەوتوویەک بە دەوری خۆی دا هەڵی سووڕێنێ.

تەلانێکی بە گابەردو کاج داپۆشراو, ئاسیاب چەشمە لە ئاکچاداغ جوێ دەکاتەوە. ئەو تەلانە ئەوەندە رژدەو گابەردەکان ئەوەندە زەلامن و کاجەکان هێندە بڵیندن کە تووڕووس لێرەوە هەر هێندەی خانوویەک دیار دەکا.

دەکرێ بڵێین لەم بەردەڵانەدا هیچ حەیوانێک ناژی. تەنیا جار جار ـ ئەویش زۆر بە دەگمەن ـ ئێواران گاکێوییەک دەبینی کە لەسەر دوندی گابەردێک ڕاوەستاوە, شاخە درێژەکانی بە پشتیەوە نووساندوون و لەلایەکەوە ڕاماوە, دەڵێی سەیری فەزای بێ‌بڕانەوە دەکا.

## (٢)

چەقڵە شینکە لە رەقترین و بەپیارترین زەوی دا دەڕوێ. لە خاکی خەراپ و رەنگ قسڵیدا، لەو خاکانەدا کە نە دارو نە هیچ گیایەکی کێوییان لێناڕوێ. لەو جۆرە خاکانەدا چەقڵەشینکە بە ئازادی و بە هەراوی دەڕوێ. بێ سەرەوبەرە زیاد دەکاو پانایی دەشت و بیابان دادەگرێ.

لە خاکی باش دا تەنانەت چڵێکیش چەقڵەشینکە دەست ناکەوێ. هۆیەکەی ئەوەیە کە خاکی باش هەمیشە دەکێڵرێ و دادەچێندرێ ـ بەڵام زۆریش وەك ئەوە دەچێ کە ئەو چەقڵە نێوانی لەگەڵ خاکی بە پیت و بەرەکەت نەبێ ـ.

چەقڵەشینکە لە خاکی نە زۆر چاك و نە زۆر خەراپیش دا دەڕوێ کە دەسبەجێ خاشەبڕ دەکرێو جێیەکەی بۆ کشتوکاڵ ئامادە دەبێ. خاکی بنارەکانی تووڕووس لە نیزیك تیرەشانەکان لەو جۆرە خاکانەیە.

بەرزایی چەقڵەشینکە هێندێ جار دەگاتە یەك میتر. چەقڵەشینکە لك و پۆپ زۆر دەردەکاو لکەکانی پڕن لە گلۆوکی پێنج پەلکی وەك ئەستێرە. دەوری ئەم گلۆوکانە هەمووی درووپەکی درو تیژەو هەر چەقڵەشینکەیەکیش سەدان دانەی لەو گلۆوکە پێنج پەلك و شێوە ئەستێرانە پێوەیە.

چەقڵەشینکە لە هەر جێیەك بڕوێ، بە زۆری و بە پڕی دەڕوێ، ئەوەندە پڕو زۆر کە مار ناتوانێ بەنێو چڵەکانی دا تێپەڕێ، دەرزی هەڵاوێژی ناکەوێتە زەوی. چەقڵەشینکە بەهاران سەوزو بێهێزە، سەوزێکی کاڵ و کەم ڕەنگ، بە کزە بایەك دەلەرێ و بۆ لای زەوی دادێتەوە. نێوەڕاستی هاوینان لە گەڵاکانیدا رەگە رەگەی شینی ئاسمانی پەیدا دەبن و بەرە بەرە لك و پۆپ و تەواوی چڵەکە رەنگێکی ئاسمانی دەگرن، ئاسمانییەکی کاڵ. پاشان ئەو رەنگە ئاسمانییە رۆژ بە رۆژ توندتر دەبێ، تا وای لێدێ بە تەواوی شین دەنوێنێ و ئەو بیابانە بێسەرووبنە لەو شینایییەدا نوقم دەبێ.

ئێواران هەر کە شنەبایەك هەڵی دەکا، سەرانسەری بیابان وەك دەریا شەپۆل دەداو وەك دەریاش هاژەی دێ. دیوتانە ئێواران دەریا چۆن سوور دەنوێنێ؟... ئەو شوێنەی چەقڵەشینکەشی لێ بێ، ئێواران ئاوا لە سوورایی دا نوقم دەبێ، راست وەك دەریا.

پاییزان چەقڵەشینکە وشك دەبێ، رەنگی دەگۆڕێ و سپی هەڵدەگەڕێ. لە چڵەکانی چەقڵەشینکە دەنگێك بەرز دەبێتەوە، دەنگی قرچە قرچی وشك بوون و هەڵوەرین. لەم کاتەدا هەزاران ئینۆکە شەیتانەی سپی و دوگمەیی بە لاسك و لك و پۆپی چەقڵەشینکەوە دەنووسێن و چڵەکان خاڵ خاڵ دەکەن.

ئاسیاب چەشمە دڕووەڵانە. زەوییەکانی ئاسیاب چەشمە لە چەقڵەشینکەدا نوقمن. ئاسیاب چەشمە باغ و سەوزایی لێ نیە، هەتا چاو بڕ دەکا چەقڵەشینکەیەو چەقڵەشینکە.



کوڕیژگەیەك کە بە نێو چەقڵەشینکە دا غاری دەدا، هەناسەی لێبڕابوو. لەمێژ بوو یەك تەکان غاری دەدا. لە پڕ راوەستا. تەماشای لاق و لەتەری خۆی کرد. چەقڵ لاق و لەتەرییان هەڵدڕ هەڵدڕ کردبوو. لاقی خوێنیان لێدەچۆڕا. پێی خۆش نەبوو راوەستێ، دەترسا. دەترسا هەر ئێستا بگەنە سەری. بە ترسەوە ئاوڕێکی وەدوای خۆی دایەوە، بەڵام ئەوەندەی چاوی بڕی دەکرد، کەسی نەدی. ئارام بووەوەو بەرەو لای راست بای دایەوە. دیسان ماوەیەك غاری دا. دووبارە ماندوو بوو، و بە شەکەتی لە نێو دڕووەکان راکشا. لە لای چەپییەوە سەدان مێرووە عەجەمە لە تەنیشت شارە مێرووەکەی خۆیانەوە بە هەڵپەو پەلەپەل کۆ دەبوونەوەو تێکیانەوە داویشت. کوڕیژگە تاوێك هەموو شتێکی لەبیر چووەوەو لە تەماشای مێرووەکان دا نوقم بوو. دوایە هۆشی هاتەوە بەر خۆی و بە ترسەوە هەستایە سەرپێ. بای دایەوە لای چەپ و لە دڕووارییەکە چووە دەر. لە تەنیشت دڕووەڵانەکەوە بە کۆمەکۆم دەڕۆیشت. دەترسا بیبینن. خوێن لە لاق و لەتەری دەچۆڕا. دانیشت. گڵی بە برینەکانیدا کرد. گڵەکە برینەکانی برژاندەوە.

بەردەڵان نەختێك دوور بوو. هەرچی تینی هەیبوو، دای بە لاقەکانی و بەرەو بەردەڵان دەخۆی نووسا. لە چنارە پیرو قەدئەستوورەکەی تەنیشت گەورەترین گابەردی ئەو شوێنە نیزیك کەوتەوە. لە پشتەوەی چنارەکە قوولکەیەکی لێ بوو هێندی چاڵێك. گەڵای زەردو پەلك زێڕین بە رەگەڕەگی سوورەوە لە ژێر دارەکە کەوتبوونە سەر یەك و نیوەی قەدی دارەکەیان لە نێو خۆیان گرتبوو. کۆمای ئەو گەڵا وشکانە خشەخشیان دەهات. کوڕیژگە خۆی لەسەر ئەو وشکە

گەڵایە درێژ کرد. مەلێك کە بە سەر بەرزترین لکی دارەکەوە هەڵنیشتبوو, بە دەنگی خشەخش ترساو هەڵفڕی. کوڕەکە ماندوو بوو, بێهێز بوو. ویستی ئەو شەوەی لەوێ رابوێرێ, رەنگە بیشی توانیبایە. بەڵام بیری کردەوە:"ئەم بیابانە پڕە لە جانەوەر".

چەند گەڵای وشك لە لکێك بوونەوە, لە حەوادا سووڕان و کەوتنە سەر گەڵاکانی دیکە. ئەمجار هەر تاوە نا تاوێك گەڵایەك و دوو گەڵا لە لکەکان دەبوونەوەو بە هەڵپەڕین و سەما کردن دەکەوتنە سەر زەوی.

کوڕێژگە لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد. دەتگوت کەسێکی لەلایە. بە دەنگی بەرز دەیگوت:"دەچم... دەچم ئەو دێیە دەبینمەوە... کێدەزانێ بۆ کوێ چووم؟... هێند دەگەڕێم هەتا ئەو دێیە دەدۆزمەوە, ئیدی ناگەڕێمەوە. دەچم دەبە شوان, بزنان دەدۆشم, با دایکم هەتا شل دەبێ بە دوام دا بگەڕێ, ریش بزنیش ئەگەر توانی, با بمدۆزێتەوە... ئەگەر ئەوێم نەدییەوە چی؟!... ناشی بینمەوە... باشە, ئەگەر نەمدییەوە چی؟... هیچ, لە برسان و لە تینووان دەمرم... باشە, با بمرم... چما ئەگەر مردم چ دەقەومێ؟..."

هەتاوی بێتینی پاییز کابەردو گەڵا چنارەکانی دەلستەوە. خاکەکە نەرم و روون بوو. گوڵەجووتێرە (گوڵەپاییزە) پۆل پۆل و تاق تاق گڵیان هەڵدابوو, و هێندەی نەمابوو سەر وەدەر نێن. بۆنێکی ناخۆش لە گەڵا خوژەکان هەڵدەستا. لکەکان تەڕ بوون و دەدرەوشانەوە. ئەم دەوروبەرە پاییزان هەمیشە لە بۆنی قورسی خوژە دا نوقمە.

یەك دوو سەعات و بگرە زیاتریش لەوێ مایەوە, هەتا هەتاو بەرەو کەلەپۆ شۆڕ بووەوە. کوڕێژگە پاش ماوەیەك وڕێنە هاتەوە هۆش خۆی, پێی وابوو وەدوای کەوتوون و هێندەی نەماوە بیگەنێ. تەماشای هەتاوی کرد, ئەوەندەی نەمابوو ئاوابێ. ئێستا دەبوو بە کام لادا بڕواو بچێتە کوێ؟... ئەوەی نەدەزانی. رێچکە بزنێك بە نێو بەردەکان دا دەڕۆیشت. بەو رێچکەیە دا غاری دا. بێ ئەوەی گوێ بداتە داروبەردو دڕك و داڵ غاری دەدا. چاك ماندوو ببوو. جارجار رادەوەستاو ئاوڕێکی وەدوای خۆی دەدایەوەو سەرلەنوێ غاری دەدا. لەسەر مووره دارێکی رزیو چاوی بە مارمێلکەیەکی چکۆلە کەوت. نازانم بۆ پێی خۆش بوو. مارمێلکەکە بە دیتنی ئەو, لە ترسان رای کردو لە ژێر کۆلکەدارێکی دیکەدا خۆی شاردەوە. بەلادا هات. چاوی دەڕەشەوە هاتن. دنیا وەك فرفرە لە پێش چاوی دەسووڕا, چەند توندیش دەسووڕا. دەست و لاقی دەلەرزین. بە ترس و دڵەخورپەوە تەماشای دەوروبەرو دواوەی خۆی دەکردو دووبارە غاری دەدایەوە. لە نەکاو پۆلە کەوێکی لەبەر هەڵفڕی. ترسا. لە هەموو دەنگێکی چووکیش دەسڵەمیەوە. دڵی وەك شێتان لێی دەدا. بە ناهومێدییەوە سەیرێکی

چواردەوری خۆی کردو لینگی دا. لە خوێن و ئارەق دا شەلاڵ بوو. هێزی ئەژنۆی نەمابوو. شەکەت و بێگیان دانیشت. ئەو جێیەی لێی دانیشتبوو, گۆڕاییەکی بچووك بوو پڕ لە خیز و بەرد. بە بۆنی ترشاوی ئارەقی لەشی ناڕەحەت بوو. بۆنی گیایەکی بۆن خۆشیشی بە بەر لووتی هەڵڵاهات. بە زەحمەت چاوی هەڵپچڕی. سەری قورس ببوو. بە ترسەوە سەری هەڵبڕی و تەماشای دەوروبەری خۆی کرد. هەتاو خەریك بوو ئاوا بێ. سێبەرەکان هەتا بڵێی درێژ ببوونەوە. روانیە دوورتر. چاوی بە تارمایی کۆختەیەکی بە مۆرە دانراو کەوت. لە خۆشی‌یان راچەنی. دووکەڵێکیش لە کلاوڕۆژنەکە هەڵدەستاو لە هەوادا بڵاو دەبووەوە. ئەو دووکەڵەی لە کلاوڕۆژنەکە هەڵدەستا, تاریك نەبوو, دووکەڵێکی مەیلەو شین بوو.

لە پشتەوەی خۆی گوێی لە دەنگێك بوو. وەك هەستی پێی‌کەسێك. خێرا بەرەو دوا گەڕایەوە. لە سەرەوژێری لای چەپی, لێڕەواری کاج لە تاریکایی دا نوقم بوو, کەوەك لافاوێکی رەش لە ئاسمانەوە دەڕژایە سەر زەوی و جار لەگەڵ جار لێی نیزیك دەکەوتەوە. بە دەنگی بەرز قسەی لەگەڵ خۆی دەکردو بە بەر قسە کردنەوە لەبەر لێڕەوارو لەبەر ئەو رەشایی‌یە کە لە ئاسمانەوە دەڕژایە سەر زەوی, هەڵدەهات. دەیگوت:"دەچمە وێ... پێیان دەڵێم هاتووم ببمە شوان... دەڵێم ئەگەر پێتان خۆش بێ جووتیش دەکەم... دەڵێم ... وەردیش دەبڕم... دەڵێم هەر کارێك بڵێن دەیزانم. دەڵێم ناوم "مستەفا"یە مستەفاڕەش... دەڵێم دایك و بابم نەماون, دەڵێم عەبدی‌خانیشم نیە... دەڵێم بزنەکانتان بۆ دەدۆشم, مێگەلەکەتان دەبەمە کێو... دەڵێم ئەگەر پێتان خۆش بێ دەبمە کوڕی ئێوە. ناڵێم ناوم "حەمەدۆك"ە. دەڵێم ناوم مستەفاڕەشە... دایکم هەتا شل دەبێ با بەدوام دا بگەڕێ, عەبدی‌خانیش ئەگەر توانی با بمدۆزێتەوە... دەچم, دەچم, دەبم بە کوڕیان..."

پاشان زۆر زۆر دەستی کردە گریان. لێڕەواری رەش زەوی و ئاسمانی پێکەوە دروو بوون. هەتا زیاتر دەگریا پتر دڵی پڕ دەبوو. لە دەنگی گریانی خۆشی لەزەتێکی وەردەگرت.

کاتێك لە تەپۆلکەکە دەچووەوە خوار لەپڕ گریانەکەی بڕی. لووتی بە سۆرانی‌یەکەی پاك کردەوە. سۆرانی‌یەکەی تەڕ بوو.

گەیشتە خانووە قوڕینەکە. کاتێك وەژووری حەساری کەوت, تاریك داهاتبوو. لەدەوروبەری, تارمایی چەند ماڵی دیکەش دیار بوو. ئەم ماڵانە هەموویان بە مۆرە دانرابوون. لە فکران ڕاچوو:"ئاکا ئێرە دێیەکە بێ؟..."

لەبەر دەرگا پیاوێکی ریش‌هدار خەریك بوو کورتانی ولاغەکەی چاك دەکرد. کاتێك سەری هەڵبڕی, چاوی بە تارمایی‌یەك کەوت کە وەك بزمار لە نێوەڕاستی حەساری چەقیبوو. تارمایی‌یەکە یەك دوو هەنگاو لێی نیزیك بووەوەو رەق راوەستا.

پیاوه ریش دارەکە کە ئیدی چاوی نەیدەدی کورتانەکەی داناو هەستا. تارمایی‌یەکە تـەنیا چەند هەنگاو لەولاتر راوەستابوو, و مووی لـێ‌نەدەبزووت. پیاوەکە بانگی کرد:

"ها... بزانم, کارێکت هەبوو؟..."

تارمایی وەڵامی دایەوە:

"خاڵە شوانتان ناوێ؟... وەردیش دەبرم, هەر کارێك بڵێن دەیزانم."

پیاوە ریش دارەکە قۆڵی تارمایی‌یەکەی گرت و بردیە ژووری:

"جاری دانیشە بحەسێوە... دوایە خوا گەورەیە."

بایەکی ساردی دەهات. حەمـەد سـەرمای بـوو. وا هەڵدەلـەرزی ددانـی ددانـی نـەدەگرت. پیرەپیاوی ریش دار بانگی خێزانی کرد:

"کچێ... دووسێ بڕ دار لەم ئاگرە نێ... ئەو منداڵە وەك مێژۆك هەڵدەلەرزێ."

ژنە بە سـەرسوڕمانەوە پرسی:

"ئەمە کێیە؟"

پیرەپیاو وەڵامی دایەوە:

"خۆشەویستی خوایە, میوانە."

ژنە بە پێکەنینەوە لە بن لێوانەوە گوتی:

"ئەمە چ جۆرە میوانێکە؟."

پیرەپیاو:

"میوان ئەم جۆرو ئەوجۆری نیە. میوان میوانەو براپەوە."

ژنە باوەشێك داری هێنان و یەك یەك خستنیە سەر ئاگردانەکە. ئاگردان بەرەبەرە داگیرسا.

کوڕێژگە لەلای چەپی ئاگردان لـە بـن دیـواری کـز دامـاو دانیـشت. دەم و چـاوی چـووك و قەڵشیو و سەری زل بوو. مووی سەری کە دەگەیشتنە سەر لاجـانگی هێنـدیان تیـشکی هـەتاو وێ کەوتبوو, کاڵ ببوونەوەو مەیلەو سوور بوون. چاوەکانی کاڵ و گەورە بوون. لەشی تاوەگـازو تاوەسـووت بوو. یازدە ساڵە دیاری دەکـرد. درووی پانتۆڵەکـەیبیان هـەتا سـەر ئـەژنۆی دادڕ دادڕ کردبوو, و لاق و لەتەری بە دەرەوە بوون. خوێن پەڵە پەڵە لەسەر لاق و لەتەری وشك هەڵاتبوو. ئاگردان بە تەواوی داگیرسابوو, بەڵام ئەو هەر هەڵدەلەرزی. ژنەکە:

"منداڵی بەستەزمان... وادیارە زۆری برسی‌یە... ئێـستا جامێـك شـۆرباوی گـەرمی بـۆ تێدەکەم, با بیخواو گەرمی بێتەوە."

ژنه لە مەنجەڵێکی مس کە لە سەر ئاگرەکە دەکوڵی، چەند کەوچکی شۆرباو لە جامێك کرد. حەمەد چاوی بڕیبووە ئەو هەڵمە کە لە جامەکە هەڵدەستا. ژنە جامە چێشتەکەی لە پێش داناو کەوچکێکی داریشی دایە دەست:

"بخۆ با گەرمت بێتەوە... خێرا خێرا بخۆ."

پیرەپیاو:

"خێرا خێرا بخوا زاری دەسووتێ."

منداڵەکە:

"ناسووتێ."

منداڵەکە پێکەنی. پیرەپیاویش پێکەنی. ژنەکە تێنەگەیشت ئەوان بۆچی پێکەنین.

پیاوەکە:

"وادیارە شۆرباوی گەرم هێنایەوە سەرەخۆ."

منداڵەکە وەڵامی دایەوە:

"ئیدی هەڵنالەرزم."

ژنەکەش پێکەنی.

ئاورگەکە زۆر جوان وخاوێن و رێك سواخ کرابوو. بانی ژوورەکە گڵ بوو. هۆڵەکانی کە بریتی بوون لە دارو هەڵاش بە دووکەڵی چەندین ساڵە رەش ببوون و دەدرەوشان.

ژوورەکەیان کردبوو بە دوو بەش کە بەشێکی تەویلە بوو و هەڵمێکی گەرم و شەداری لێ هەڵدەستا، هەڵمێك بە گەرمی و شەداریی هەناسە. ئەم بۆنە بۆنی ریخی تازەی گوێلك بوو. وەك بۆنی کاوداری تەڕ دەچوو. لەلای تەویلەکەوە کوڕو کچ و بووکی پیاوە پیرە هاتنە ژوور. کوڕێژگە ئاوڕێکی خۆشی لێدانەوە. پیرەپیاو رووی کردە کوڕەکەی:

"بۆچی بەخێراتنی ئەم میوانە ناکەی؟."

کوڕەکە زۆر بە ژیری و سەنگینی بەخێراتنی کردو ئەحواڵی پرسی.

"بەخێر بێی کاکەگیان... شوکور باشی!"

کوڕێژگەش هەروا پیاوانە جوابی دایەوە:

"سوپاس بۆ خوا باشم."

ئەمجار کچ و بووکی مامەپیرەش بەخێراتنیان کرد.

لەم کاتەدا ئاگردانەکە بە چاکی داگیرسابوو. کوڕیژگە دەستی لە بن هەنگڵی نابوون و لەبن دیواری کز دامابوو. بڵێسەی ئاگر کە لە ئاگردانەکە جیا دەبووەوە، سێبەری سەیر سەیری دەخستنە سەر دیوار. سێبەرەکان پەیتا پەیتا بیچمیان دەگۆڕی و تاوێکیش ئارامیان نەبوو. پیرەپیاو بە گەرمی خەریکی سەیری سێبەرەکان و خوێندنەوەی فکری ئەو منداڵە بوو. کاتێک سەری وەرگێڕا زەردەخەنەیەك کەوتبووە سەر لێوانی.

دەم و چاوی مامەپیرە لەڕو باریك بوون. ریشی تۆپن و تەواو سپی بوو. نێوچاوانی هەتاو سووتاندبووی و رەنگی گۆڕابوو. سەر روومەت و لاچاوەکانی و ملی لە ئاقار شۆقی ئاگردانەکە وەك مسی سوور دەتروسکانەوە. لە نەکاو وەك شتێکی گرنگی بیر کەوتبێتەوە، پرسی:

"باشە، میوان... پێت نەگوتین ناوت چیە؟"

حەمەد:

"پێم دەڵێن حەمەدۆك."

کوڕیژگە وەك ئەوەی هەڵەیەکی کردبێ، سەری داخست و لێوی خۆی گەزی. لەبیری چووبوو بڵێ ناوم مستەفارەشە. پاشان لە دڵی خۆی دا گوتی:"باشە، ناوی خۆم چیەتی...؟ مستەفارەش کێیە؟... بۆچی ناوی خۆم نەڵێم...؟ خۆ لێرە کەس نامناسێ..."

پیرەپیاو رووی کردە بووکەکەی:

"سفرەکە راخە با پارووە نانێك بخۆین."

سفرەیان راخست. هەموو خاو و خێزانی ماڵ و حەمەدۆك لەدەوری سفرەکە ئاڵان. لەسەر سفرە کەس قسەی نەکرد. بە بێدەنگی شێویان خوارد. کاتێك سفرەکە کۆکرایەوە دووبارە باوەشێك داریان هێناو خستیانە سەر ئاور. مامەپیرەش بۆخۆی موورەیەکی گەورەی هێناو راست لە نێو مەشخەڵی ئاگرەکەی دانا. بڵێسەی ئاور لە هەموو لایەکەوە بەرەو موورە دارەکە لار بوونەوەو موورە داریان لە نێو خۆیان گرت. ئەمە گەورەترین خۆشیی مامەپیرە بوو. هەموو شەوێ دەبوو ئەم کارە بکا.

بڵێسە ئاورەکان بەم لاو ئەو لادا دەورەی ئەم موورە دارەیان دابوو کە مامەپیرە لە نێویان دانابوو. مامەپیرە لە تەماشای ئەو بڵێسە ئاورانە کە بێ وەستان دەوری موورەکەیان دەدا، تێر نەدەبوو. خێزانی بە گوێی دا چپاند:

"سلەمان، جێی ئەم منداڵە لە کوێ راخەم؟"

زەردەخەنەیەك وەك هەمیشە کەوتە سەر لێوی سلەمان:

"لە تەویلەی بارگینەکە... لەو جێگایەی کە بۆخۆمان لێی دەخەوین... دەتەویست لە کوێی بۆ رابخەی؟ چووزانی ئەم بەستەزمانە لە کوێوە بە هیوای سڵەمانی هاتوەتە ئێرە."
پاشان ئاوڕی دایەوە لای حەمەد. حەمەد لەبەر گەرمای ئاگردان خاو ببووەوەو وێژینگی دەدان. مامەپیرە بەپێکەنینەوە بانگی کرد:
"میوان... خەوت دێ؟"
حەمەد نەختێك خۆی کۆکردەوە:
"نا, بەهیچ جۆر خەوم نایە."
مامەپیرە جوان تەماشای چاوەکانی حەمەدی کرد:
"باشە, حەمەدۆك... پێت نەگوتین لەکوێ ڕا هاتووی و دەتەوێ بچیە کوێ؟"
حەمەدۆك چاوەکانی کە پڕ بوون لە دووکەڵ کەمێك هەڵگلۆفین:
"لە ئاسیاب چەشمە ڕا هاتووم... دەمەوێ بچمە ئەو دێیە."
سڵەمان بە وردی سەیرێکی کورپژگەی کرد:
"ئاسیاب چەشمە شارەزام, بەڵام ئەو دێیە کوێیە.":
حەمەد بێ ئەوەی بجەجڵێ, وەڵامی دایەوە:
"دەمەوێ بچمە گوندی "دورسوون" و ئەوان"
"کام دورسوون؟"
"خۆ عەبدیخان دەناسی..." پاشان بێدەنگ بوو و چاوی بڕیە سووچێکی ژوورەکە. مامەپیرە:
"باشە, دوایە..."
"دورسوون رەعیەتی عەبدیخانە... جووتی بۆ دەکا, وەردی بۆ دەبڕێ... دەمەوێ بچمە گوندی ئەو دورسوونە."
بریسکەیەك لە چاوەکانی حەمەد هەستا, پاش تاوێك بێدەنگی لەسەری رۆیشت:
"ئەو دورسوونە کە جووچکە باشووەکەی گرتبوو... ئێستا ناسیت کێیە مامەگیان؟"
"ئەرێ, ئەرێ, دەزانم! باشە دوایە..."
"دەمەوێ بچمە گوندی دورسوون و ئەوان... دورسوون دەیگوت لە دێی ئەوان بە زۆر جووتی بە منداڵان ناکەن... لێشیان نادەن... دورسوون دەیگوت گوندەکەیان چەقڵەشینکەی هەر لێنیە... دەمەوێ بچمە ئەوێ."
"باشە, ئەو گوندە ناوی چیە؟... دورسوون پێی نەگوتی؟... نەیگوت دێیەکەیان ناوی چیە؟..."

حەمەد بێدەنگ بوو، قامکی لە زاری ناو لە فکران راچوو. ماوەیەك بیریکردەوەو لە نەکاو وەڵامی دایەوە:

"نا... ناوی گوندەکەیانی پێنەگوتووم."

"سەیرە!"

حەمەدیش دووپاتی کردەوە:

"ئەرێ، سەیرە!... من و دورسوون پێکەوە جووتمان دەکرد... هێندێ جار دورسوون لەسەر بەردێك دادەنیشت و دەیگوت: بریا دێهاتی ئێمەت دیتبایە!... داروبەردی زێڕە... دەریای هەیە، کاجی هەیە... دەیگوت ئەگەر سواری دەریا بی لەم دنیایە هەر کوێیەك وازت لێ بێ دەتوانی بچی... دورسوون لەو گوندە رای کردبوو... بە منی گوتبوو ئەم قسانە لەلای کەس نەدرکێنم، منیش بە دایکیشم نەگوتن."

پاشان بە ئەسپایی گوتی:

"تۆش بە کەسیان مەڵێ مامەگیان!... ئێ؟"

سڵەمان:

"مەترسە، مەترسە... بە هیچ کەس ناڵێم."

بووکەکە هەستا رۆیشت و دوای دەقیقەیەك تەلیسێکی هێناو گەڕایەوە. تەلیسی لە نێوەڕاستی ژوورەکە هەڵڕشت. نێو ژوورەکە پڕ بوو لە قۆزاخە پەمۆ. گوڵە پەمۆیەکان سپی بوون و هەرکامێکیان دەتگوت پەڵە هەورێکی چکۆڵەیە. ژوورەکە پڕ بوو لە بۆنی قۆزاخە پەمۆ. سڵەمان گوتی:

"یاڵڵا حەمەدۆك بت بینم، هونەری خۆت نیشان بدە. داخوا دەزانی قۆزاخە پەمۆ پاك بکەی؟ ئافەرین پاڵەوان، دەی با بزانم."

حەمەدۆك کۆشێکی قۆزاخە پەمۆ کێشایە پێش خۆی. دەستی وا فێرەکار بوون وەك ماشێن کاریان دەکرد:

"پەمۆ پاك کردن شتێك نیە."

کوڕەکەی مام سڵەمان:

"دەی حەمەدۆك، ئێستا تۆ ئەو گوندە چۆن دەدۆزیەوە؟"

حەمەدۆك کە دیار بوو ئەم پرسیارەی پێ خۆش نیە، هەناسەیەکی هەڵکێشاو لە وەڵام دا گوتی:

"دەگەڕێم... دەیبینمەوە... دەیگوت لە نیزیك دەریایە... دەیبینمەوە."

"حەمەدۆك! لێرە بۆ دەریا پازدە ڕۆژەڕێیە."

"دەیبینمەوە، هێندە دەگەڕێم هەتا دەیبینمەوە... ئەگەر بش مرم تازە ناچمەوە ئاسیاب چەشمە."

سلەمان:

"حەمەدۆك، خۆ تۆ نەتگوت چت لێقەوماوەو بۆچی ماڵ و حاڵی خۆت بەجێ هێشتوەو ڕووت لە کێو و بیابان کردوە؟"

حەمەدۆك دەستی لە کار کێشایەوە:

"مام سلەمان گوێ بگرە بۆت باس بکەم... بابم مردوە، تەنیا دایکێکم هەیەو برایەوە. خزم و کەس و کاری دیکەم نیە... ئەمن ڕەعیەتی عەبدیخانم..."

ئەمەی کە گوت، چاوی پڕ بوون لە ئاو و کۆڵە گرووی لە ئەوکێ ما. ددانی بە جەرگی خۆی دادەگرت، ئەگینا لە پرمەی گریانی دەدا.

حەمەدۆك لەسەری ڕۆیشت:

"دوو ساڵە جووت بۆ عەبدیخان دەکەم... چەقڵەشینکە پیاوی دەخوا... چەقڵەشینکە وەك سەگ لاق و لەتەری پیاوی دەگەزێ. ئەمن لەو دڕووەڵانە جووتم دەکرد. عەبدیخان هەموو ڕۆژێ بە قەستی کوشتن دارکاریی دەکردم. دوێنێ بەیانییش لێیدام. هەموو لەشم ڕەش و شین هەڵگەڕا. منیش ڕام کرد... دەمەوێ بچمە ئەو دێیە. عەبدیخان لەوێ ناوم دۆزێتەوە... دەچمە ئەو ئاوایییە جووتی دەکەم، دەبم بە شوان، ئەگەر پێشیان خۆش بێ دەبم بە کوڕیان."

حەمەدۆك وەختێك گوتی "ئەگەر پێشیان خۆش بێ، دەبم بە کوڕیان" جوان سەیری چاوی مام سلەمانی کرد. حەمەدۆك دڵی پڕ بوو. ئەگەر زاری کردبایەوەو یەك قسەی دیکەی کردبایە، گریانی دەهات و خۆی پێ ڕاگیر نەدەکرا. سلەمان کە تێی گەیشتبوو، باسەکەی گۆڕی:

"حەمەد، ئێستا کە نیازت نیە بچیەوە ئاسیاب چەشمە، لەلای ئێمە بمێنەوە."

دەم و چاوی حەمەد پشکووت. لە خۆشییان هەموو گیانی لەرزی.

کوڕەکەی مام سلەمان:

"دەریا زۆر دوورە حەمەدۆك... ئەو گوندەش بەو ئاسانییە نادۆزرێتەوە."

هەموو تەلیسە پەمۆیەکە پاك کرابوو. ژوورەکە پڕ بوو لە ئەسپێ ڕەشەی پەمۆ. ئەسپێیەکان بە پەلە بە چوار قولینچکی ژوورەکەدا دەگەڕان. جێخەوی حەمەدیان لە نیزیك ئاگردانەکە ڕاخست. چاوی گەرم ببوون، ئەگەر لێی گەڕابان دەسبەجێ دەچووە نێو جێی. مامەپیرە کە دەیزانی حەمەد زۆر کوشتە خەوە، گوتی:

"برۆ سەر جێیەکەت" و جێ خەوەکەی نیشان دا.

حەمەد بێ ئەوەی قسەیەك بکا, چووە نێو جێیەکەی و خۆی قانگلە کرد. دەتگوت هەموو لەشی لە ناونگ دا کوتراوە. هەموو ئەندامی لەشی دێشان. لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"دەبمە کوڕی... دەبمە کوڕی... دایکم هەتا شل دەبێ با بە دوام دا بگەڕێ... ناتوانن بمدۆزنەوە... تازە ناچمەوە..."

حەمەد دوو سەعات پێش تاو هەڵات, ڕاست ئەو وەختە کە ڕۆژان دەچووە جووتی, لە خەو ڕاپەڕی. لە جێی هاتەدەر. هەروا بە خەوالوویی میزەکەی کرد. هاتەوە سەرەخۆ. دوێنێ شەو و مام سلەمانی ریش سپیی وەبیر هاتنەوە. لە دڵی خۆی دا گوتی:"ماڵی مام سلەمان!... هەر لێرە دەبم, ئیدی ناچمەوە... دەبم بە کوڕیان..."

لە دەرێ کزەبایەکی ساردی دەهات. سەرمای بوو, هاتەوە ژوورێ و سەرلەنوێ چووەوە نێو جێیەکەی. ئەژنۆی کۆکردنەوەو بە سنگی خۆیەوە نان. جێیەکەی گەرم داهات. حەمەد دەیزانی کە ئەمرۆ هەتا تاوهەڵاتیش دەتوانێ بخەوێ. بۆیە دووبارە خەوی لێکەوتەوە.

هەتاو بەدەم شنەبای بەیانییەوە لەگەڵ دەرکەوت. دایك مەنجەڵە شۆرباوی لەسەر ئاگر لابرد. هەڵم و بۆنێکی خۆش لە مەنجەڵەکە هەڵدەستا. کوڕ لەمێژ بوو چووبووە سەرکار. سلەمانیش دەستی کردبووەوە بە پینەکردنی کورتانەکە. ژنە بانگی کرد:

"سلەمان, شۆرباوەکەت سارد دەبێتەوە."

"میوانەکەمان هەڵستا؟"

"دیارە ئەم منداڵە دوێنێ زۆر ماندوو بووە, لە خەوێ دا قسان دەکا."

"هەڵی مەستێنە, بەستەزمانە دوێنێ هەموو دوێنێ غاری داوە."

"ئاخر ئەو منداڵە بۆچی ماڵ و حاڵی خۆی بەجێ هێشتوەو رای کردوە؟"

"چونکە زۆریان تێن بۆ هێناوە."

"ڕۆڵە گیان!... چەندیش جوانە... ئاخر ئەو خوانەناسانە چییان لەو بستە منداڵە دەوێ؟..."

"هەتا هەر وەختێك پێی خۆش بێ لەلای ئێمە دەمێنێتەوە."

لەو کاتەدا حەمەد وەخەبەر هات. بەهەردوو دەستان چاوەکانی هەڵگلۆفین. هەڵمێکی سووك لە نێو مەنجەڵی شۆرباوەکە هەڵدەستا. لە کەلێنی دەرگاوە شۆقی هەتاو وەك تیزماڵکێك کە بە چەقۆ بڕیبێتیان هاتبووە ژوور. حەمەد دەسبەجێ لە جێی دەرپەڕی. کاتێك سلەمان پەلەپەلی حەمەدی دی, گوتی:

"مەترسە کورِم... ئەگەر پێت خۆشە جارێ بخەوە."

حەمەد ئافتاوە مسەکەی لە تەنیشت ئاگردان هەڵگرت و چووە دەرێ. پاش ئەوەی دەست و چاوی بە ئاوی گەرم شوتن، چوو لەسەر سەری مام سلەمان راوەستاو تێیەوە راما. ژنە دیسان بانگی کردەوە:

"وەرن شۆرباوەکەتان بخۆن... سارد دەبێتەوە."

سلەمان کورتانەکەی داناو بە پێکەنینەوە چاوێکی لە حەمەدۆك داگرت:

"با بچین شۆرباوەکەمان بخۆین."

شۆرباوەکەیان برویش بە شیر بوو. بۆنی برویش و شیر تێکەڵ ببوو، و بە جارێك ژوورەکەی داگرتبوو. شۆرباوەکەیان بە کەوچکی دار خوارد. حەمەد شۆرباوەکەی زۆر پێ خۆش بوو. لە دڵی خۆی دا گوتی:"دەبم بە کورِی."

پاش قاوڵتی، سلەمان پینەی کورتانەکەی تەواو کردو بە پووش و سەمەڵ ئاخنیەوە. پووشەکە لە نێو قامکە درێژو پیرەڵۆکەکانی دا هەڵدەخلیسکا.

هەتاوی پاییز بە هەموو تیشك و رووناکیی خۆیەوە دەرو دەشتی داگرتبوو. تۆزێکی ورد لە پووش و پەلاش هەڵدەستا. هەرکات سلەمان چنگی لەو پووشە دادەگرت و لە کورتانەکەی داخنی، ئەو تۆزە زەردو زێرینە لەبەر تیشکی هەتاو بە چواردەوری دا بلاو دەبووەوە.

سلەمان:

"عەبدیخان زۆری ئازار داوی؟"

حەمەد چاوەڕوانی پرسیارێکی وا نەبوو. بەلام تەردەست وەلامی دایەوە:

"بە قەستی کوشتن لێی دەدام... جارێکیان ئەوەندەی لێدام کە مانگێکی رەبەق لە جێی دا کەوتم... دایکم دەیگوت ئەگەر نوشتەی مەلا ساری نەبووایە، دەمردم... عەبدیخان لە هەموو کەسی دەدا، بەلام لە من زیاتر..."

"باشە، کەوابێ لەلای ئێمە دەمێنیەوە."

"خۆ من لەو گوندە کارێکم نیە... ئەمجار لێرەڕا بۆ ئەو ئاوایییە پازدە رۆژەرِییە... دەریایەکەشی ئازانم بە کەلکی چی دێ... ئەگەر چەقڵەشینکەشی نەبێ، خۆ ئێرەش نیەتی... ئەمن هەر لێرە دەمێنمەوە، کەس ناتوانێ وەمبینێ، وا نیە؟... ئاسیاب چەشمە هەتا ئێرە دەلیارِیەکە، وا نیە؟... لێرە ناتوانن بمدۆزنەوە، وا نیە...؟"

پێت وایە ئاسیاب چەشمە لە کوێیە؟... ئاسیاب چەشمە لەودیو ئەم کێوەیە... چما بۆخۆت نازانی چەند بە رێگادا هاتووی؟."

حەمەد وشك بوو. چاوی پێ زەق بوون و ئارەقی کرد. هەموو هیوایەکەی ببووە بلقی سەرئاو. ئارەق چۆڕ چۆڕ لە هەموو گیانی سەرەوژێر بوو. ویستی شتێك بڵێ، بەلام تفی خۆی قووت دایەوەو هیچی نەگوت. پۆلە هەلۆیەك بە ئاسمانەوە دیار بوون. چاوی پێیان کەوت. خۆی لە سلەمان نیزیك کردەوەو گوتی:

"کەوابێ، باشترە بچمە ئەو دێیەو ببمە کوڕی ئەوان... ئەگەر عەبدیخان وەمبینێ ئەنجن ئەنجنم دەکا."

سلەمان بە سەرکۆنەوە وەلامی دایەوە:

"باشە، بچۆ ئەو دێیەو ببە بە کوڕی ئەوان!..."

"چەند خۆش بوو ببام بە کوڕی تۆ، بەلام..."

"بەلام چی؟"

"ئەگەر بکەومە بەردەستی، لە خواش ناترسێ، لەت لەتم دەکا."

"ئەمنیش کارێکم لە دەست نایە حەمەد!..."

سلەمان ئەمەی گوت و لەسەر کارەکەی هەڵستاو چاك سەیری حەمەدی کرد. دەم و چاوی حەمەد رێك هاتبوون، چاوەکانی کز داگیرابوون. دەتگوت سۆمایی چاوی رۆ رژاوە.

وەختێك حەمەد دیتی سلەمان تەماشای دەکا، زیاتریش خۆی لێ‌نیزیك کردەوەو دەستی گرت. هەموو ئاوات و ئارەزووەکانی لە چاوانی دا دیار بوون. لە سلەمانی پرسی:

"چ بکەم."

"مەترسە حەمەد."

حەمەد بە ترس و خۆشحاڵییەوە زەردەخەنەیەکی تاڵی کرد. سلەمان کورتانەکەی لە قوژبنێك داناو وەرێ کەوت:

"حەمەدۆك! من هەتا ئەو ماڵەی بەرامبەرمان دەچم، کارێکم هەیە. تۆش چیت پێ‌خۆشە وا بکە. ئەگەر پێت خۆشە بچوو لە نێو ئاوایی بۆخۆت بگەرێ."

حەمەد لێی جیا بووەوەو چووە نێو دێ. دێیەکە بیست ـ بیست و پێنج ماڵ دەبوو. هەموو خانووەکان بە مۆرە دروست کرابوون. هەروا لە گۆترە چەند بەردیان لەسەریەك دانابوون و خانوویان لەسەر دروست کردبوون. خانووەکان لە تەختی زەویرا میترێك زیاتر بەرز نەبوون و هەمووشیان مۆرە بوون.

حەمەد هەموو دێیەکە گەرا. منداڵان لە سەرانگوێلك یارییان دەکرد. ژنەکان لە بەربەرۆچکەی دانیشتبوون و خەریکی تەشی رستن بوون. سەگێکیشی بەرچاو کەوت. سەگەکە

کلکی لە گەڵۆزی گرتبوو و بە ترسەوە بە بن دیوارێك دا دەڕۆیشت. لە هەموو کەلێن و قوژبنێکی ئەم دێیە پەین و تەپاڵەیان لەسەریەك ڕۆکردبوو. هەتا ئێواری هەموو کون و کاژێری گوندەکەی سەنگ و سوژن نا. کەس کاری بە سەریەوە نەبوو، کەس لێی نەپرسی لە کوێوە هاتوەو بۆ کوێ دەچێ، لە دێی خۆیان ئەگەر غەوارەیەکیان دەدی، هەموو منداڵەکان لێی کۆدەبوونەوە. خەڵکی ئەم دێیە جۆرێکی دیکە بوون... و ئەمەشی پێ خۆش بوو.

کاتێك هاتەوە ماڵێ دیتی سلەمانیش لە ماڵێیە.

سلەمان:

"حەمەدۆك، ئەوە بۆچی سەرێکی ماڵەوەت نەدایەوە، لە نێو دێی چ باسە؟"

"چ باس نەبوو مامەگیان."

بەدوای ئەمەدا چەند ڕۆژێك حەمەد ئەمە کاری بوو. یەك دوو دەستە براشی پەیدا کردن. لەگەڵ منداڵان "هەڵووکێن"ی کرد. لەم یارییەدا لینگەی نەبوو، بەڵام قەت خۆی لەسەر کەس هەڵنەدەکێشا. هەر منداڵێکی دیکە لەو یارییەدا وەك ئەو سەر ڕاست بووایە، خۆی پێوە رادەنا. بەڵام وا دیار بوو حەمەد ئەم یارییە زۆر بە یارییەکی منداڵانە دەزانێ، هیچ گوێی نەدەدایە بردنەوەو دۆڕاندن. هەربۆیە منداڵەکان زۆریان خۆش دەویست.

پاشان، پاییزە بارانی تووڕووس دەستی پێکرد. دیوتانە پاییزان گەڵای داران چۆن هەڵدەوەرێ؟ پاییزەبارانی تووڕووسیش بە درشتی وەك گەڵازەردی پاییز دەکەوێتە سەر زەوی.

هەور دەیان گرماند. لە کێوی پشت ئاوەدانییەوە گاشەبەردی زەلام زەلام لەگەڵ دەنگی هەورەتریشقە بەرەو دەشت تاوێر دەبوونەوە. کێوەکە لێڕەوار بوو، لێڕەوارێکی چڕو داری زەلام زەلام.

ڕۆژێکیان حەمەد هاتە لای سلەمان و گوتی:

"مام سلەمان، هەتا کەنگێ بێکار بم. بۆچی هەر بسووڕێمەوەو نانی مفت بخۆم؟"

"گوێ مەدەیە حەمەد، ئاخرەکەی کارێکت پێ دەسپێرین."

باران چەند ڕۆژێك لێی کردەوە. هەتاو لەسەر گەڵاو بەردو خاك و دارە شەدارەکان مۆنج مۆنج دەدرەوشا. هەڵمێکی تەنك لە زەوی هەڵدەستاو بۆنی ریخ و پەینی بۆ لای ئاوایی بەرێ دەکرد. جارجاریش پەڵە هەوری زێوین پێشی تیشکی هەتاویان دەگرت...

حەمەد لە نیزیك ماڵێ لەسەر بەردێك دانیشتبوو، جووتە کاڵەیەك کە سلەمان لە چەرمی خاو بۆی دروویبوو، لە پێی دەکرد. کاڵەکان تەڕ بوون. دیوی دەرەوەیان بە تووکێکی مەیلەوشین داپۆشرابوو. لەوەڕا دیار بوو کە کاڵەکان لە چەرمی جوانەگا دروست کراون.

حەمەد لە خۆشیی کاڵەکانی خەریك بوو باڵ بگرێ.

سلەمان هات و لە پەنای راوەستا. حەمەد بەن کاڵەکەی دەبەست و سلەمان تەماشای دەکرد. دیار بوو حەمەد دەستی بەو کارە راهاتبوو. خێرا بەن کاڵەکانی هێناو بردو لەلای پاژنەی گرێیدان.

سلەمان:

"حەمەدۆك، لە کاڵە لەپێکردنیش دا وەستای."

حەمەدۆك سەری هەڵبڕی و پێکەنی:

"ئەمن دەزانم کاڵە هەڵێش بەستم. بەڵام ئەتۆ باشتر دەزانی."

حەمەدۆك هەستایە سەرپێ. یەك دوو جار قورسایی خۆی خستە سەر لاقی راست و چەپی و کاڵەکانی تاقی کردەوە. پاشان دە پازدە هەنگاو رۆیشت و گەڕایەوە. دیسانیش چەند هەنگاوێك بەم لاو ئەو لادا رۆیشت. بەدەم رۆیشتنەوە چاوی هەر لەکاڵەکانی بوو. حەمەدۆك چاوی لە کاڵەکانی هەڵنەدەگوێزت. پاشان هات و لە پەنا سلەمان راوەستا:

"پڕ بە پێمن."

وەڕێ کەوتن. حەمەدۆك چاوی هەر لە کاڵەکانی بوو. جارجار رادەوەستا هەتا کاڵەکانی باشتر ببینێ و جارجاریش دادەهاتەوەو دەستێکی بەسەر تووکی کاڵەکانی دا دێنا.

سلەمانیش بەشداری دڵخۆشییەکەی حەمەد بوو:

"پێم وایە پێت خەراپ نین؟."

"پڕ بە پێمن، نە تەنگن و نە فرەوان."

"حەمەدۆك، ئەگەر چووبایە ئەو دێیە، کێ هەبوو کاڵەی وات بۆ بدروێ؟"

"چما لەو دێیە خەڵك بە پێخواسی دەگەڕێن؟"

ئەم پرسیارەی حەمەد بەشێکی لە ساویلکەیی و بەشێکیشی لە زۆرزانییەوە بوو. بەڵام سلەمان تێنەگەیشت. بۆیە لە وەڵام دا گوتی:

"نا....، بەڵام لەوێ کاڵە لەپێ ناکەن، کەوش لەپێ دەکەن."

"تێگەیشتم مامە."

بە پیاسە لە ئاوایی وەدەرکەوتن. حەمەد لە ئەکاو دڵی کرایەوە. هەتا کێوەکەی ئەوبەریان مەزرایەك پان ببووەوە. ئەم مەزرایەش زۆر بە کەڵك نەدەهات. چەقڵەشینکەی نەبوو، بەڵام زۆریش باش نەبوو. ئەم مەزرایانە هەموویان بەرد بەرداوی بوون...

حەمەد راوەستا:

"مام سلەمان، دەچینە کوێ؟"

"هەروا دەگەڕێین."

حەمەد هیچی نەگوت و هەروا ڕۆیشتن.

کاڵە نوێیەکەی حەمەد قوڕاوی بوو. لە دڵی خۆی دا چەند جنێوی تەڕو تازەی بەو قوڕە دا کە کاڵەکانی لێ پیس کردبوو.

لە ئاوایی دوور کەوتنەوە. جگە لە دووکەڵی کولاوکەکان هیچ شتێکی نێو دێ دیار نەبوو.

سلەمان:

"گوێت لێ بێ حەمەدۆك. هەموو ڕۆژێ بزنەکان بێنە ئێرە... دەتوانی لەم دەوروبەرە حەیوانەکان بلەوەڕێنی. بەڵام نەکەی لەم تەپۆلکەیە، لەم تەپۆلکە خەنەیییە ئاوا بی. ئەودیوی نیزیك گوندەکەی خۆتانە... هەربینا دیت هاتن و گرتیانی."

"پێ لەودیوی نانێم... چاك بوو پێت گوتم."

"باشە ئێستا با بچینەوە."

گەڕانەوە. ئاسمان پڕ لە پەڵەهەوری سپی بوو. ڕەپستەکان وەك چەند خاڵی سەوز پەڵە پەڵە لە نێو بەرد بەرداوییەکەدا بڵاو ببوونەوە. تاق تاقیش نینۆکە شەیتانە بە لاسکی بڵندی گیاکانەوە نووسابوون.

سلەمان:

"حەمەدۆك، ڕەنگە عەبدیخانە ریش بزنە زۆری ئازار دابێ."

حەمەد راوەستا، سلەمانیش راوەستا. حەمەد سەرلەنوێ تەماشایەکی کاڵەکانی کرد.

سلەمان:

"با لێرە دانیشین."

"با دانیشین مامە." و پاشان دەستی بە گێڕانەوە کرد:

"با بۆت باس بکەم مام سلەمان، وەختێك بابم مرد، عەبدیخان دارو نەدارمانی لێ‌نەستاندین. ئەگەر دایکم قسەی کردبایە دارکاریی دەکرد. پیلی منیشی دەگرت و فڕێی دەدام. جارێکیان دوو ڕۆژی تەواو منی لە دارێ بەست و بە جێی هێشتم. پاش دوو ڕۆژان دایکم هات و لە دارێی کردمەوە. ئەگەر دایکم نەیدیبامەوە، گورگ دەیخواردم."

سلەمان هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

"ئارا حەمەدۆك؟..." هەستایە سەرپێ و حەمەدیش هەستا.
سڵەمان:
"لەبیرت نەچێ چیم پێ گوتی. پێ لەو دیوی تەپۆلکە خەنەیی‌یەکە نەنێی. ئەوەك چاویان پێت بکەوێ و خەبەر بە عەبدی‌خان بدەن. ئەوددەم ئیدی هیچ ناکرێ. دێ و دەتباتەوە."
"پێ لەو دیوی نانێم."
رۆژی دواتر حەمەد زوو لە خەو هەستا. دەسبەجێ لە جێی هاتەدەر. خەریك بوو دنیا رووناك دەبوو. چووە سەر سەری سڵەمان. سڵەمان پرخەپرخی خەوی دەهات. بە نقورچێك سڵەمانی وەخەبەر هێنا. سڵەمان چاوی هەڵێنا:
"چیە؟... تۆی حەمەدوك؟..."
حەمەد بە خۆرانانەوە جوابی دایەوە:
"منم مام سڵەمان... درەنگە، دەمەوێ بزنەکان لێ‌خورم."
سڵەمان راست بووەوە. چاوی بۆ ژنەکەی گێرا. خێزانی دەمێك بوو هەستابوو. خەریك بوو حەیوانەکانی دەدۆشی. سڵەمان بانگی خێزانی کرد:
"زووبە نیورۆژی حەمەدۆکی لە پرپێچەیەك هاوێ و بیدەیە."
ژنە دەستە شیراوی‌یەکانی لە مەنجەڵێکی گەورەدا شوتەوەو گوتی:
"ئەوانی دیکە ئێوارێ دەدۆشم."
هێندەی بڵێی یەك و دوو نیورۆژی حەمەدۆکی خستە پرپێچەیەك و دایە دەستی. چەند کەوچك شۆرباویشی لەو مەنجەڵە کە لە نیزیك ئاگردانەکە دانرابوو و هەروا زلقی دەدان، بۆ تێ‌کرد. حەمەد خێرا خێرا شۆرباوەکەی هەڵقووراندو هێندەی چاو لەسەر چاوی دانێی پرپێچەکەی لە پشتێ بەست و بزنەکانی رەپێچەك دا. کڵاوە چەورو کۆنەکەی لەسەری هەڵگرت و رە بزنەکانی گورزاندو مێگەلەکەی بەرەو لەوەرگە دەنگ دا.
سڵەمان لە دواوە بانگی کرد:
"پیرۆز بێ حەمەدۆك!"
هەتا حەمەدو بزنەکان دیار بوون، سڵەمان راوەستاو تەماشای کردن. پاشان لەبەر خۆیەوە گوتی:
"منداڵی دنیایەکی سەیرە!..."
خێزانی هاتە لای:
"چیە؟ دیسان لەبەر خۆتەوە دەستت پێ کرد."

"خوا دەزانێ عەبدی خانە ریش بزنە چ بەڵایەکی بەسەر ئەم منداڵە هێناوە. پیاو زگی پێ دەسووتێ... باوکیم دەناسی. پیاوێکی فەقیرحاڵ و بێدەنگ بوو. منداڵی بەستەزمان، بزانە چیان بەسەر هێناوە کەوا سەری خۆی هەڵگرتوە؟"

ژنە:

"خوات لێ رازی بێ، ئەتۆش هەموو شتێك لەسەر دڵی خۆت دەکەیە خەفەت. لێم بوویە مامە خەمە... وەرە شۆرباوەکەت بخۆ."

## (٣)

لای ئێواریێ بوو. هەموو خەڵك لەسەر كاروكاسبی گەڕایەوە. بەڵام حەمەدۆك نەهاتەوە. ڕۆژ ئاوابوو, دیسان حەمەدۆك دیار نەبوو. دنیا تاریك بوو, بەڵام حەمەدۆك پەیدا نەبووەوە.

دراوسێی دیوار بە دیواری دایكی حەمەد, خات زێنەب بانگی دایكی حەمەدی كرد:

"دوونە, دوونە... حەمەدۆك هاتەوە یان نا؟"

دایكی حەمەد بە گریانەوە جوابی دایەوە:

"نە بە خوای خوشكێ گیان. هێشتا هەتیوەكەم دیار نیە, هێشتا حەمەدم پەیدا نەبووەتەوە... چم لێدەكەی خوشكێ, تەگبیرم چیە؟"

خات زێنەب ئەو قسەیەی دە جاری كردبوو, دووپاتی كردەوە:

"گیر مەبە خوشكم, هەستە بە پێیەكی سەرێكی مالی عەبدی خان بدە, ڕەنگە لەوێ بێ... هەر بەدبەختییەكیش بێ, پێش هەمووان داوێنی فەقیرو هەژاران دەگرێ... گیر مەبە خوشكم... هەستە بە پێیەكی تا مالی عەبدی خان بچۆ... هەستە خوشكم, هەستە."

دوونە:

"كوڕەكەم چی بەسەر هاتوە... كوڕی من هاتبایەوە ڕاستەڕێ دەهاتەوە مالێ... كوڕی من پێ لە مالی عەبدیخان نانێ. ناكا كوڕەكەم بەڵایەكی بەسەر هاتبێ... هەر ئێستا سەرێكی مالی عەبدیخان دەدەم, بەڵكوو لەوێ بێ. بەڵام دەش زانم ئەگەر كوڕەكەم هاتبایەوە لە هیچ كوێ گیر نەدەبوو. یەكسەر دەهاتەوە مالێ, ڕاستەڕێ دەهاتە كن دایكی... ئێستا دەچم سەرێكی وێش دەدەم, بەڵكوو لەوێ بێ."

هەور بەری ئاسمانی گرتبوو. نە مانگ بە دەرەوە بوو, نە تاقە ئەستێرەیەك. تاریكێك بوو چاو چاوی نەدەدی. دایكی حەمەد بە كۆمەكۆمە بەرەو مالی عەبدی خان وەڕێ كەوت.

لە پەنجەرەیەکی چکۆلەوە رووناکایی یەکی چکۆلە, هێندەی لەپە دەستێك کەوتبووە سەر زەوی. کاتێك گەیشتە ئەم تیشکە, تەپە تەپ دڵی لێی دا. یەك دوو جار تفی خۆی قووت دایەوە. دەلەرزی. ددانی لەسەر یەك دادەنان. نەیدەتوانی زاری بکاتەوە. دەنگێکی مردەلۆکە لە گەرووی هاتەدەر:

"خان. خان... لەبەر بەری پێیانت مرم خان... حەمەدم هێشتا نەهاتوەتەوە, هاتم خەبەرێکی بزانم... گوتم بەلکوو لێرەبێ... هاتم خەبەرێکی حەمەدی بزانم خان."

دەنگێکی زبرو رەق وەڵامی دایەوە:

"کێیە لە دەرێ... بەو شەوە چ کارێکت هەیە؟..."

دوونە پاڕایەوە:

"دەسەر سەرت گەڕێم خان... حەمەدم هێشتا نەهاتوەتەوە, هاتم خەبەرێکی بزانم... گوتم بەلکوو لێرە بێ."

هەر ئەو دەنگە زبرو ئەستوورە دیسان بەرز بووەوە:

"خوا بت گری دوونە, تۆی... چ سندانێکتە؟."

"منم خان, دایکی حەمەدم."

هەر ئەو دەنگە زبرە دیسان جوابی دایەوە:

"وەرە ژوورێ بزانم چ سندانێکتە؟..."

دوونە بە لارەملی خۆی لە ژوورێ هاویشت. عەبدیخان لە نیزیك تاگردان چوارمێزیلکە لەسەر تەختێك دانیشتبوو. کلاو گەرگەرییە مەخمەرەکەی وەك جاران بەلایەکی سەریەوە نابوو. لێوی کلاوەکەی گوێی چەپی داپۆشیبوو. کراسێکی گولدۆزیکراوی لەبەر بوو. دەسحێبە دەنك درشتە کارەبایەکەی دەگێڕا. ئەو هەمیشە بەم تەشك و دیمەنەوە لە هەموو جێیەك دەبینرا. چاوەکانی نە ئاسمانی بوون و نە سەوز. رەنگی چاوی لە نێوان ئاسمانی و سەوز دا بوو. سەر روومەتی سوورو دەم و چاوی درێژو باریك بوون. عەبدیخان دوورپاتی کردەوە:

"چ باسە؟... دیسان چ بووە؟."

دوونە نەختێك داهاتبووەوەو دەستی چەپی لە نێو دەستی ڕاستی دا دەگوشی:

"خان گیان, قەزات لە گیانم, حەمەدم هەتا ئێستا لە جووتی نەهاتوەتەوە, گوتم رەنگە لێرە بێ, هاتم خەبەرێکی بزانم."

عەبدیخان نەڕاندی و ڕاست بووەوە:

"هەتا ئێستا نەهاتوەتەوە؟... ئەی حەرامزادە... گایەکانی لە کوێ بەرەڵڵا کردوەو چووەتە چ جەهەننەمێك؟."

بە پەلە خۆی گەیاندە دەرگا. دەرگای کردەوەو هاواری کرد:

"هۆی... دورسوون, وەسمان, عەلی لە کوێن؟."

سێ دەنگ لە سێ جێگا وەڵامیان دایەوە:

"لێرەم خان!"

"زووکەن, وەرنە ئێرە."

هەرسێکیان لەو تاریکایی‌یەدا بە پەلەو بە لینگ دان خۆیان گەیاندە عەبدی‌خان. دورسوون پیاوێکی چل ساڵەی چوارشانەی بەخۆوە بوو. بەڵام عەلی و وەسمان مێرمنداڵێکی پازدە, شازدە ساڵانە بوون:

"زوو بگەنە مەزرایە, بزانن ئەو بیژووە لە کوێیە, بزانن گاجوتەکانی لە کوێ بەرەڵا کردوون... هەتا گایەکان نەبیننەوە, نەیەنەوە."

دورسوون گوتی:

"ئێمەش هەر بیرمان لەوە دەکردەوە خان! دەمانگوت ئەو کورە تا ئێستا لە کوێ ماوەتەوە. بە چاوان خان, هەر ئێستا وەدوای دەکەوین."

دوونە خۆی پێ ڕانەگیراو لە پرمەی گریانی دا. عەبدی‌خان بە تووڕەیی‌یەوە بە گۆی دا هات:

"لێوەبڕە... بێدەنگ بە, بزانین لە دەست ئەو بیژووەی تۆ فرێت داوە چیمان بەسەر دێ... بەم خوایە مووێك لەسەری گاجوتەکانم کەم بێتەوە کەوڵی دەکەم. ئێسکانی لە ئاونگ دا دەکوتم..."

دورسوون و عەلی و وەسمان خەریك بوون لە تاریکی دا ون دەبوون, دوونەش وەدوایان کەوت. دورسوون کە دیتی دوونەشیان بە دواوەیە, گوتی:

"خوشکم, پێویست بە هاتنی تۆ ناکا, تۆ بڕۆوە ماڵێ. ئێمە ئەگەر دیانەوە دەی‌هێنینەوە. ڕەنگە گاسنەکەی پساندبێ, لەوانەشە ئامووره‌کەی شکاندبێ و نەوێرێ بێتەوە... تۆ بگەڕێوە خوشکم, ئێمە دەی‌بینینەوە."

دوونە:

"قەزاتان لە من کەوێ... حەمەدم لە ئێوە دەوێتەوە... کوڕەکەم لە تۆ دەوێتەوە مام دورسوون... دەزانی حەمەد چەندەی تۆ خۆش دەوێ؟ ئەمن حەمەدم لە تۆ دەوێتەوە..."

دوونە هاتەوە مالێ و ئەو سێ کەسە لە تاریکایی شەودا ون بوون و دەنگی پێیانیشیان دوور کەوتەوەو بێ هەست بوو.

ئەوان ئەو رێگایانە باش شارەزا بوون، بەو تاریکەشەوە دەرۆیشتن، لە پێش دا بە مەزرایەکی پڕ لە بەردو سندەگڵ دا تێپەر بوون، دوایە بەردەلانێکیان بەجێ هێشت لەولای بەردەلانەکە دانیشتن، بحەسێنەوە. هەرسێکیان پالیان وێك دابوو. ماوەیەك هەروا بێدەنگ مانەوە.

تاریکاییەکی ئەنگوستەچاو عەرزو عاسمانی لێك درووبوون. جگە لە دەنگی سیسرە دەنگێك نەدەهاتە بەر گوێ. لە پێش دا دورسوون دەستی بە قسان کرد.

بەلام ئەو لەگەڵ کەسی نەبوو. لەگەڵ شەودا دەدوا:

"چی بەسەر هاتوە؟..."

وەسمان:

"خوا دەزانێ."

عەلی:

"حەمەد هێندێ شتی لە کن مـن درکاندبوو. گوتبووی دەمەوێ بچمە ئەو دێیە... دەیگوت ئەگەر بگەمە وێ، سەریشم ببڕن تازە نایەمەوە تاسیاب چەشمە."

دورسوون:

"ئاکا هەلاتبێ؟... ئاکا خۆی شێت کردبێ؟..."

عەلی، بە جۆرێك کە پیاو باش لێی حالی نەدەبوو، لە وەلام دا گوتی:

"ئەگەر رۆیشتبێ کارێکی چاکی کردوە..."

وەسمان:

"زۆرر چاکیشی کردوە."

عەلی:

"ئەگەر ژیان ئەوەیە کە ئێمە هەمانە، بۆیە نابێ بێتەوە."

وەسمان:

"ئەگەر ئێمەش توانیبامان خۆ بگەیەنینە چوکووراوا رزگاریمان دەهات."

دورسوون:

"چوکووراوا هێندەش دوور نیە. بەلام خاکەکەی ماشەللا وەك زێڕ وایە. کار کردن و گیان کێشان لە هەموو جێیەك هەیە، بەلام لە چوکووراوا کەس کاری بە کاری تۆ نیە. بۆخۆت ئاغای خۆت و رەعیەتی خۆتی. بۆخۆت کار بکەی کەس هەقی بەسەرتەوە نیە. چوکووراوا

پەمۆیەك دێنێ, ئەگەر سەیری مەزرا دەكەی پێت وایە پەڵە هەوری لەسەر راوەستاوە. هەتا دەتوانی پەمۆ خڕ كەوەو لە جەواڵی ئاخنە, هەر جەواڵەی دە قرۆشت دەدەنێ و منەتیش دەبەن. هاوینێك لەوێ كار بكەی, پێنج هێندەی شەرتی ساڵێكی عەبدیخانت دەست دەكەوێ. هەر لەو نیزیكانە شارێك هەیە پێی دەڵێن "ئەدەنە". بەڕاستی چ شارێك, دەڵێی بەهەشتە. بە رۆژ دەڵێی خۆرە دەدرەوشێتەوەو بە شەویش دەڵێی گەوهەری شەوچرایە. لە نێو ماڵەكانی دا رێگایەك هەیە پێی دەڵێن كۆڵان. كۆڵانەكانی دەڵێی ئاوێنەی بێگەردن, ئەوەندە پاك و خاوێنن رۆنیان لێوەماڵە. تەختی كۆڵانەكان راست وەك ئاوێنەیە. كاتێك بە نێو شار دا دەگەڕێی پێت وایە لە بەهەشتی خوادا دەسووڕێیەوە. هەموو رۆژێ چەند جار قەتاری بەنێو دا دەڕوا. ئەوبەریشی دەریایە. ئەو گەمیيانەی بەنێو دەریادا تێدەپەڕن, هەریەكەی هێندەی دێیەك دەبن... گەمیيەكانیش كە شەو دادێ, وەك هەتاو تیشك داوێژن. پیاو لەتەماشایان تێر نابێ. پووڵ و پارە بە لێشاوە... هەر ئەوەندەی دەوێ كار بكەی..."

وەسمان:

"دنیا چەند گەورەیە؟."

دورسوون:

"زۆر!..."

كاتێك هەڵستان, دورسوون خەریك بوو تاریفی دێیەكەی خۆیانی دەكرد. پاش بەردەڵانەكە گەیشتنە دڕووەڵان. چەقڵەشینكە لە لاق و لەتەریان هاڵاو بەلەكی هەڵدڕین.

وەسمان:

"ئەو زەوییەی حەمەد وەردی دەبڕی, دەبێ ئێرە بێ. ئەمن ئێرە شارەزا نیم."

لە دوورەوەو لە لای راست دەنگی عەلی بەرز بووەوە:

"ئێرەیە... دەبێ ئێرە بێ..."

دورسوون وەك ئەوەی باوەڕ نەكا, گوتی:

"ئەوێ؟!"

عەلی:

"بەڵێ, دەبێ ئێرە بێ... بۆن بە هەواوە بكە, بۆنی زەوی كێڵراوی لێدێ... بۆنی خاكی تازە كێڵراو ناكەی؟..."

دورسوون راوەستا. پاش ئەوەی باش بۆنی بە هەواوە كرد, گوتی:

"راستە."

وەسمان لەولاوە بانگی کرد:

"ئێرە کێڵراوە، لاقم رۆ دەچێ."

عەلی:

"لاقی منیش."

دورسوون:

"راوەستن با منیش بێم."

ئەوان راوەستان، هەتا دورسوون گەیشتە لایان.

دورسوون:

"باشە، ئێستا دەبێ ئەو جێگایە بدۆزینەوە کە ئەمرۆ کێڵاویەتی، وا نیە؟."

وەسمان:

"شتێك نیە، ئێستا دەیبینینەوە."

عەلی:

"ئای لەو سەرمایە رەق هەلاتم."

دورسوون:

"باسی ساردو سەرما مەکە، جارێ با کارەکەمان بکەین."

وەسمان هاواری کرد:

"کووزەکان هەروەك خۆیانن، دیارە ئەمرۆ جووتی نەکردوە."

عەلی چووە پێشێ، ئەویش بە شەقاو کووزەکانی پێوا. وەسمان راستی دەکرد، ئەو رۆژە حەمەدۆك جووتی نەکردبوو.

دورسوون بەدڵسۆزی و سەرسوورمانەوە گوتی:

"نەکا بەلایەکی بەسەر هاتبێ."

وەسمان:

"خەفەت مەخۆ مام دورسوون، بۆخۆت حەمەد ناناسی؟ شەیتانیش داوی بانادا. هیچی نابێ."

عەلییش قسەی وەسمانی دووپات کردەوە:

"وایە مام دورسوون، تۆ بۆخۆت دەیناسی. کەس داوی بانادا."

دورسوون:

"خوا بکا وابێ... منداڵێکی هەتیوە... کورێکی باشیشە. خوا بکا بەلایەکی بەسەر نەهاتبێ."

لە نێو کێڵراوەکە دانیشتن. وەسمان چرپ و چاڵی خڕ کردەوەو ئاوری کردەوە. عەلی و دورسوون گەرمی قسان بوون. لە دەوری ئاگرەکە دانیشتبوون و هەر بیریان لە حەمەد دەکردەوە. هەرچی بە بیریان دا دەهات بە یەکتریان دەگوت: رەنگە گەشکەی گرتبێ و لە سووچێك کەوتبێ... لەوانەشە گورگ خواردبێتی... لەوانەشە دز هاتبێ گایەکانیان بردبێ و حەمەدیش لە ترسان نەیوێرابێ بێتەوە نێو دێ...

لەسەر هەرکام لە فکرەکان ماوەیەك قسەیان کرد, بەڵام لەسەر هیچیان ساغ نەبوونەوە. هەمووی ئەوانە ڕێیان تێدەچوو, لەوانە بوو هیچیشیان روویان نەدابێ.

بلێسەی ئاگر لە دەم و چاوی دورسوونی دا. دەم و چاوی دورسوون وەك مسی سپی نەکراوە سوور هەڵگەڕابوون. لەخۆوە زەردەخەنەیەك کەوتبووە سەر لێوانی. ئاورەکە خۆش بوو. پاشان کوژایەوە, ئەمجار جگە لە چەند پژلوو کە وەك چاوی پشیلە لە تاریکایی دا دەدرەوشانەوە, شتێکی لێنەمایەوە. دڵتەنگ بوون. عەلی تێی هەلکردە گۆرانییەك, گۆرانییەکی پڕ لە سۆز کە لەگەڵ تاریکایی شەو تێکەڵ دەبوو.

وەسمان:

"باشە... ئێستا چ بکەین؟."

دورسوون:

"بەدەستی بەتاڵ بچینەوە, عەبدیخان دێیەکە وەسەر خۆی دەگێڕێ. وا باشە هەتا بەیانی هەر لێرە بین. بەیانی هەر جۆرێك بێ دەیبینینەوە.

عەلی:

"تازە نابینرێتەوە, پێم وایە چووەتە ئەو دێیە کە باسی دەکرد. ئەم رۆژانە کردبوویانە بنێشتەخۆشکە. خوا دەزانێ ئەو دێیە لە کوێیە! ..."

دورسوون پێکەنی, عەلی بۆ ئەوەی ئاگای لە ئاورەکە بێ و نەیەڵێ بکوژێتەوە, نەنوست. ئەوانی دیکە لەبەر تینی ئاورەکە خۆیان مات کردو چاویان لەسەر یەك دانان.

عەلی سەیری ئاگرەکەی دەکرد. لە نەکاو سەری هەڵبڕی و لە تاریکاییەوە راما. عەلی لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد: "رۆیشتوە... رۆیشتنێك کە گەڕانەوەی نەبێ... دەبێ چووبێتە ئەو شارە کە دەڵێن لە شەودا وەك چل چرا دادەگیرسێ... چووەتە ئەو جێگایە کە دەڵێن خاکەکەی زێڕە."

وەسمان وەخەبەر هات. عەلی ئێشکی ئاورەکەی بەو ئەسپاردو بۆخۆی سەری وەبەردێك کرد. پێش ئەوەی خەوی لێبکەوێ گوتی:

"تۆ چۆنی تێدەگەی وەسمان! ... من دەڵێم چووەتە ئەو شارە کە دورسوون باسی دەکرد."
وەسمان:
"چووەتە ئەو دێیە."
لەگەڵ شەبەقی بەیانی هەرسێکیان لە خەو هەستان. وردە وردە دنیا رووناك بوو و خۆرهەڵات سوور بوو. لێواری هەورەکانیش سوور هەڵگەڕا. ئەمجار وا رووناك بوو کە دەیان توانی هەموو جێیەك ببینن. لەولای کێڵگەکە چەقڵەشینکە هەتا ئاسۆی خۆرهەڵات پان ببووەوە.
هەرسێکیان لەسەرەخۆ هەستانە سەرپێ و لە نێو مەزرایەکە راوەستان. لە رووناکایی چێشتەنگاو دا نوقم بوون. سێبەری رەش و پڕ رەنگیان بۆ لای خۆرئاوا راکشابوو. هەرسێکیان بەدەم باوێشکەوە هەڵتروشکان و میزیان کرد.لە دوایە هەروا بە خەواڵوویی هەموو ئەو زەوییە گەڕان کە حەمەد وەردی دەبڕی.
وەسمان:
"شوێنم هەڵگرت! بڕواننە شوێنی گاسنەکە! گاجووتەکان بە نیرو ئاموورەوە لێیان داوە رۆیشتوون... دیارە حەمەد گاجووتەکانی بەرنەداوە... دەبێ ئەم شوێنە بگرین و بەری نەدەین..."
وەدوای شوێنەکە کەوتن. لە رێیەدا لە جێگایەك راوەستان و دەستیان بە قسان کرد. لە قوپاویی عەرزەکەڕا دیار بوو کە گاجووتەکان بەنیرو ئامووروەوە لەو جێگایە خەوتوون.
خۆر هەروا بەرز دەبووەوەو دەرودەشتی گەرم دادێنا. ئەوان لە دڕووەڵانەکە چوونەدەرێ، گەیشتنە چۆمی. عەلی لە نەکاو بانگی دورسوون و وەسمانی کرد. هەردووکیان بۆ لای ئەو بایان دایەوە. گاجووتەکان بە نیرو ئامووروەوە لەوێ دەخولانەوە. پەراسوویان دەژمێران. یەکێك لە گایەکان خەنەیی و ئەوی دیکەیان رەش بوو. وەسمان رەنگی بە بەرەوە نەما:
"حەتمەن حەمەد بەڵایەکی بەسەر هاتوە, ئەگەر ویستبای رابکا نیروئامووری لەو بەستەزمانانە دەکردەوە... حەتمەن تووشی بەڵایەك بووە."
عەلی:
"هیچ بەڵای بەسەر نەهاتوون... بۆ شوێنەونکە گاجووتەکانی بەرنەداوە... حەتمەن چووەتە دێیەکە."
وەسمان توورە بوو:
"هەر دەڵێن دێیەکە دێیەکە... ئاخر کام دێ... حەتمی تووشی بەڵایەك بووە."
دورسوون پێکەنی:
"مەیکەنە هەرا... چتان لێ قەوماوە؟..."

گایەکانیان وەپێش خۆیان داو گەڕانەوە بۆ دێ. کاتێك گەیشتنەوە ئاوایی هەتاو لە هەموو جێیەکی دابوو. لە کێوەکەی ئەوبەری مالانیش مژێکی نەرم هەڵدەستا.
خەلکی ئاوایی بە وردو درشتەوە لە دەوری دوونە هالابوون. کاتێك دورسوون و عەلی و وەسمان بە گاجووتەکانەوە پەیدا بوونەوە. لەپڕ هەموویان بێدەنگ بوون و هەستانە سەرپێ. هەموویان چاویان بڕیبووە گایەکان. دوونە بە گریان و دادو ڕۆ غاری دایە کن گاجووتەکان:
"مام دورسوون کوا کوڕەکەم... حەمەدم چی بەسەر هاتوە؟... ئەمن کوڕەکەم لە تۆ ویستبوو مام دورسوون... دەزانی حەمەدم چەندی تۆ خۆش دەویست؟..."
دورسوون:
"گایەکانمان لە نیزیك چۆمی دیتەوە, بەستەزمانانە نیروئامووریان هەر پێوە بوون."
دوونە بە سەری خۆی دادەداو دەیناڵاند:
"کوڕی خۆم... رۆڵەی خۆم... حەمەدی خۆم... هەتیوەکەم لە کوێی؟..."
دورسوون:
"هیچی نەبووە خوشکم, لە هەر کوێیەك بێ دەیبینمەوە."
بەلام دوونە گوێی لەم قسانە نەبوو, دەگریاو سەروسنگی خۆی دەکوتا:
"رۆڵەکەم... تاقانەکەم... هەتیوەکەم..."
دوونە هێندی لە خۆی داو بەسەری خۆی داداو گریا, کەوت. سەروپرچ و دەم و چاوی خۆلاوی بوون. پاشان فرمێسکی چاوی لەگەڵ تۆزی سەر دەم و چاوی تێکەڵ بوون و دەم وچاوی قوڕاوی بوون.
خەلکی دێ کە لە دەوری دوونە هالابوون, رەق رامابوون. ئاورێکیان لە گاجووتەکان دەدایەوەو ئاورێك لە دوونەو هیچیان نەدەگوت. دوو ژن لە نێو ئاپۆرایەکە هاتنەدەرو چوونە لای دوونە کە لە سەر زەوی درێژ ببوو. راستیان کردەوە. دوونە هێندەی نەمابوو لە هۆش خۆی بچێ. وەك مردووان کەوتبووە سەر کەلەکەی راستی. باسکیان گرت و بردیانەوە مالێ.
هەرکە دوونەیان بردەوە مالێ, دەسبەجێ خەلك کەوتنە جم و جۆڵ و قسەو باس.
پێش هەمووان جەننەت دەستی پێ کرد. لە نێو ئاوایی هەموو کەس ئەو پیرێژنەی بە "جەننەت بارگین" دەناسی. جەننەت بارگین دەم و چاوێکی درێژو باریك و بەژنێکی زۆر کەڵەگەتی هەبوو, و قامکەکانی هەریەکەی هێندی باسقەلنەیەك درێژ بوون:
"دوونەی بەستەزمان... کوڕەکەی چی بەسەر هاتوە؟..."
ئەمجار "ئەلیف" دەستی پێکرد. ئەو ژنە خرپنە لە نێو دێ دا بە بەدیومن ناوبانگی دەرکردبوو. هەموو کەس پێیان شووم بوو:

"ئەگەر مابایە، هەتا ئێستا دەهاتەوە..."
پاشان ئەو قسەیە زار بە زار لە ئاوایی گەڕا:
"ئەگەر نەمردبایە، دەهاتەوە..."
"ئەگەر مابایە، دەهاتەوە..."
"ئەگەر نەمردبایە، دەهاتەوە..."
ئەلیف دووبارە دەستی پێ کردەوە:
"لەوانەشە دوژمنانی باوکی کوشتبێتیان."
جەننەت ئەمەی بەرپەرچ دایەوە:
"برایم ماری رەشی لە ئاو نەدەکرد، دوژمنی لە کوێ بووە؟"
لەچکەی سپی و ئارەقچنی گوڵگوڵی و داوێنی رەنگاوڕەنگ و پێشە سەری بە پوولەسوور کە رازاوە، وەك شەپۆل هاتنە جێ و ئەم قسەیە دەماودەم گەڕا:
"برایم ماری رەشی لە ئاو نەدەکرد..."
"برایم ماری رەشیشی..."
"ماری رەشی لە ئاو نەدەکرد."
ئەمجار ئیتر خەڵك تێکیانەوە هاویشت. هەرکەسە قسەیەکی دەکرد:
"بەستەزمان حەمەد."
"حەیف بۆ حەمەد."
"ئەحلەت لە پیاوی خوانەناس."
پاشان قسەیەکی دیکە دەماودەم گەڕاو وەك شەپۆل بە نێو دێ دا تێپەڕی. بەڵام کەس نەیدەزانی ئەم قسەیە لە کوێوە داکەوتوە:
"دوونە دەبێ بچێتە ئەو شوێنە کە داڵاشی لێدەگەڕێ... دەبێ ئەو جۆرە جۆیانە بپشکنێ... داڵاش لەسەر کەلاکی دەگەڕێ... لە هەر کوێیەك داڵاش بگەڕێ... دەبێ بچێتە ئەو جێگایە کە داڵاشی لەسەر دەگەڕێ..."
"حەمەن لە تەندوورەی سەرچاوێ کەوتوە."
"لە سەرچاوێ..."
"لە تەندوورەی سەرچاوێ..."
ئاپۆرایەکە بەرەو خۆرهەڵات وەرسووڕا. منداڵ بە پێخواسی غاریان دەداو ژنانی پێخواسیش بە دوایان دا... لە پێش دا منداڵەکان گەیشتنە درووەڵان... لاقی منداڵەکان لە خوێن دا شەڵاڵ بوو، بەڵام دیسان غاریان دەداو ژنانیش چەقڵەشینکەیان لە جنێو و تووك و لەعنەت دا نوقم دەکرد:

"خوایە رەگ و ریشەتان لە بن بێ..."

لەولای دڕووەڵانەکە گابەردەکان وەدەر کەوتن. منداڵانی ماندوو کە لاقیان لە خوێن دا شەلاڵ ببوون، بەجێ مان و ژنەکان وەپێش کەوتنەوە.

کاتێك گەیشتنە بن چنار، ماندوو بوون. پیرەچنار بە حاڵ و باڵ لك و پۆپی دەبزاوتن. لەگەڵ گوێیان لە هارەی لە نەکاوی ئاوەکە بوو، هەموویان راوەستان و پاشان لێکڕا بەرەو سەرچاوەکە غاریان دا. هەرکەس دەگەیشتە سەرکانی، چاوی دەبڕیە تەندوورەی سەرچاوەکە. هەموویان لە دەوری سەرچاوەکە هاڵان و یەك لە دوای یەك سەرێکی زارکی سەرچاوەکەیان دا. ئاو لە ژێر گابەردێکی زەلام بە نەرەنەڕو کەف پرژاندن دەردەپەڕی. چەند گەڵای وشك لە تەندوورەی سەرچاوەکەدا بە دەوری خۆیان دا دەسووڕان، بەڵام دوور نەدەکەوتنەوە. ئاو لە تەنیشتی چەپی سەرچاوەکە حەوزێکی گەورەی دروست کردبوو. ماوەیەکی زۆر بە بێدەنگی لە ئاوەکەوە ڕامان، هەتا جەننەت خاتوون وەقسە هات:

"ئەگەر منداڵەکە لە کانی کەوتبایە، لانی کەم جارێك دەهاتەوە سەر ئاو."

دیسان هەموو کەوتنەوە جم و جۆڵ و ئەم قسەیە زار بە زار لە نێویان دا گەڕا:

"لانی کەم جارێك دەهاتەوە سەر ئاو"

"مردوو لە ژێر ئاو دا نامێنێ، دێتەوە سەر ئاو."

"دەهاتەوە سەر ئاو."

هەموویان بە شەکەتی و ناهومێدی بەرەو دێ وەڕێ کەوتن. لە گەڕانەوەدا ژنەکان لە پێشەوە بوون و منداڵەکان لەدوایان. منداڵەکان جار جار خەریکی یاری دەبوون. لە گەڕانەوەدا پێکەوە نەدەڕۆیشتن، بە پەرش و بڵاوی و تاق تاق و هەموویان بە لارەملی بەرەو ئاوایی دەگەڕانەوە.

لەو رۆژەوە دوونە بە گریان و ناڵاندنەوە نەخۆش کەوت. دوونە لەبەر تاو لەرز وەك تەندوور دایساو کچەکانی ئاوەدانی پێی رادەگەیشتن.

پاش چەند رۆژ دوونە لە جێی هاتەدەر. هەردوو چاوی سوور هەڵگەڕابوون و ببوونە دوو گۆمی خوێن و بە پەڕۆ کۆنێکی سپی نێوچاوانی رابەستبوو.

رۆژێکیان ئەم خەبەرە لە ئاسیاب چەشمەدا بڵاو بۆوە:

"دوونە دەم لە نان و ئاو نادا. رۆژ تا ئێواری لەسەر کانی دانیشتوەو چاوی بڕیوەتە تەندوورەی سەرچاوەکە... چاوەڕوانە کە جەندەکی کوڕەکەی بێتەوە سەرئاو."

ئەم خەبەرە راست بوو. دوونە هەموو رۆژێ بەری بەیانی دەچووە سەرکانی و هەتا ئێواری چاوی لە تەندوورەی سەرچاوەکە نەدەگوێزتەوە.

ده رۆژی بەم جۆرە رابوارد. پاشان بێ‌گیان و بێ‌حاڵ لە ماڵێ دا گردەنشین کەوت و وەدەر نەکەوت.

دوای ئەوە دوونە رێگایەکی دیکەی گرتەبەر: هەموو رۆژێ لەگەڵ تاریک و روونی بەیانی دەچووە سەربان و چاوی لە ئاسمانەوە دەبری. هەموو لایەکی ئاسمانی سەیر دەکرد، بۆ ئەوەی بزانێ داڵاش لە کوێ دەگەڕێ. هەروەخت چەند کۆلارەی دەدیت کە لەسەر جێگایەك چەرخیان دەدان، بە پێخواسی و بێ‌حاڵی خۆی دەگەیاند\ە ئەو جێگایە.

هێندێ جار داڵ لەسەر جێی زۆر دوور دەگەڕا. بۆ وێنە لەسەر "گردەباران". لە ئاسیاب چەشمەوە بۆ گردەباران رۆژەرێیەکی تەواو بوو. دوونە خۆی دەگەیاندە ئەوێش.

دوونە ئەوەندەی بەم لاو ئەولادا راکردبوو، وەك دەرزی باریك ببوو.

شەوێکیان لە دەرگای ماڵێ دوونەیان دا. لە دەرێڕا یەکێك بانگی کرد:

"خوشکێ... منم، دورسوون."

دوونە بە ترس و هیواوە دەرگای کردەوە:

"وەرە ژووری کاك دورسوون، حەمەدم زۆری تۆ خۆش دەویست."

دورسوون هێدی و سەنگین لەسەر دۆشەکێك کە لەوێ راخرابوو، دانیشت:

"گوێ بگرە خوشکم. دڵی من ناڵێ حەمەد مردوە. حەقەن ماوە. پێم وایە سەری خۆی هەڵگرتوەو رۆیشتوە... ئەگەر مابێ، ئەمن دەی‌بینمەوە."

دوونە ئەژنۆی سست بوون و لە پەنا دورسوون هەڵترووشکا:

"قەزات لەگیانم کاکەگیان! ئاکا خەبەرێکت لێی هەبێ."

"نا خوشکێ، خەبەرێکم لێی نیە، بەڵام دڵم خەبەر دەدا کە ماوە."

دوونە پاڕایەوە:

"تۆ، بە قوربانی زارت بم، مام دورسوون."

دورسوون:

"ئەمن وەدوای دەکەوم. لە هەر جێیەك بێ دەی‌بینمەوە... هەر ئەوەت پێ دەڵێم کە دڵم ناڵێ مردوە... حەمەد ماوە، دڵم وا خەبەر دەدا."

وەختێك دوونە دورسوونی بەرێ دەکرد:

"لە تۆ بەولاوە کەسم نیە مام دورسوون، هەوەڵ خوا پاشان تۆ... ئەگەر خەبەرێکی حەمەدم بۆ بێنی، ئیدی هیچم لە خوا ناوێ... ئەتۆ براگەورەی منی مام دورسوون، ئەمن تەنیا خەبەری ساغی و سلامەتیی کوڕەکەمم دەوێ."

## (٤)

هاوین داهات، وەختی دروێنان بوو. گەرما گاڵەی دەکرد. بە گەرمای چوکووراوا دەڵێن "زەردەگەرما"و بە گەرمای دەوروبەری توورپووس دەڵێن "سپێیە گەرما" سپێیە گەرمای توورپووس داهاتبوو.

حەمەدۆك لەو ڕۆژەوە کە هاتبووە ئەم ماڵە، ڕاستە کە کردبوویانە شوان، بەڵام بە کوڕی ئەم ماڵە دەژمێردرا. سلێمانیش ئەوی وەك گیانی خۆی خۆش دەویست. کەچی ئەم ڕۆژانەی دوایی، وەزعی حەمەد بە تەواوی گۆڕابوو. ئیدی حەمەد ئەو منداڵە زیت و دەم بە پێکەنینەی جاران نەبوو. مێش لەبەردەمی هەڵنەدەفڕی. هەمیشە لە فکردا بوو. ئەوکات کە تازە هاتبوو، گۆرانیی دەگوت و زۆر چاکیشی دەگوت. دەنگێکی بەسۆزی هەبوو. بەڵام ئەو ڕۆژانە دەنگی گۆرانییەکانیشی نەدەهات.

لە پێش دا مێگەلەکەی دەبردە باشترین لەوەڕگەو زەنوێرترین لێرەوارەکان. ئەگەر دەیدی بزنێك باش ناڵەوەڕێ دەسبەجێ چاری دەکرد. کەچی ئێستا زۆر وایە بزنەکان لە دەشتێ خۆڕایی دەکاو بۆخۆی لەبن دارێك یان گابەردێك دادەنیشێ، چەنەگەی داوێتە سەر گۆپاڵەکەی و لە فکران ڕادەچێ... جارجاریش لەگەڵ خۆی دەدوێ.

"دایەگیان... ئاخ دایەگیان... کێ گەنمەکەت بۆ دەدروێتەوە دایەگیان!... عەبدیخان... دایەگیان... ئەگەر من نەبم گەنمەکەمان دەپەڕێ. کێ گەنمەکەمان دەدروێتەوە دایەگیان. ئەگەر بۆخۆم نەبم، گەنمەکەمان دەپەڕێ دایەگیان..."

تاوێك تەماشای ئاسمان، هەور، زەوی و گەنمە سوورداگەڕاوەکانی دەکردو دیسان لەگەڵ خۆی دەکەوتەوە قسەکردن:

"گەنمەکەی "لەك لەك چەشمە"مان حەتمەن ئێستا پەڕیوە... خۆ تۆ کەست نیە گەنمەکەت بۆ بدروێتەوە دایەگیان... تۆ بە یەك تەن و یەك باڵی ناتوانی دروێنە بکەی دایەگیان..."

شەوانەش خەوی لێنەدەکەوت, لەنێو جێی دا هەمیشە جینگڵی دەدان و هەر لە فکری لەك لەك چەشمەو دەغڵو دانەکەی ئەوێیان دا بوو:

"ئەگەر گەنمەکەی لەك لەك چەشمە بە وەخت نەدروونەوە, هەمووی دەپەڕێ و لەنێو دەچێ... تاقە گوڵێکیشی لێنامێنێتەوە... لەك لەك چەشمە وەك جێیەکانی دیکە نیە, گەنمەکەی زوو پێدەگاو دەبێ زوو لەسەری حازر بی... دەنا دەنکە گەنمێك چیە لێت وەدەست ناکەوێ."

بەیانێیان کە لە خەو هەڵدەستێ حاڵی باش نیە, هەموو لەشی ژان دەکا. بە نابەدڵی بزنەکان لێدەخوڕێ. بزنەکان پەرش و بڵاو و ناڕێك بەرەو کێو دەچن و حەمەد هۆشی بەسەریانەوە نیە.

هەروەخت رووی خۆش و چاوی پڕ لە خۆشەویستیی سڵەمانی دێتە پێش چاو, بەخۆدا دەشکێتەوە. دەسبەجێ مێگەلەکەی خڕ دەکاتەوەو بەرەو لەوەڕگەی سەوزو زەنوێر دەنگی دەدا. بەڵام زۆری پێ ناچێ کە دیسان وەك خۆی لێدێتەوە. دیسان لە فکران رادەچێ و لەسەر ئەو هەردە گەرمە رادەکشێ. ئەو گەرمایەی بەخەیاڵیش دا نایەو تەنیا شتێکی بیری لێدەکاتەوە, لەك لەك چەشمەیەو دایکی و ئەو گەنمە کە لە لەك لەك چەشمە لەبەر گەرما دەپەڕێ.

کاتێك وەهۆش خۆی دەهاتەوە کە ئێوارە داهاتبوو و خەریك بوو رۆژ ئاوا بێ. بزنەکانی کە لە مەزرادا بڵاو ببوونەوە, کۆ دەکردەوەو بەرەو تەپۆلکەی خەنەیی دەنگی دەدان. لەو کاتەدا دوا تیشکی هەتاو لەسەر لوتکەی تەپۆلکەکە دەدرەوشا. ئەو, بزنەکانی لە داوێنی تەپۆلکە بەجێ دەهێشت و بۆخۆی دەچووە سەر لوتکەی سەرێ. لە دوور بەستێکی دەدی, بوولێڵی ئێواران کەوتوەتە سەری. ئەو بەستە هەتا چاو بڕ دەکا چەقڵەشینکە دایپۆشیوە. بەڵام لەسەر تەپۆلکەی خەنەیی ڕا ئاسیاب چەشمە دیار نیە, چونکە چەند تەپۆلکە لەولای درووەڵانەکە وەك پەردە پێشی چاوی مرۆڤ دەگرن. گیای سەر ئەو تەپۆلکانە ئەوەندە وشکە دەڵێی ئێستا نا, ئێستا هەڵدەبن و گڕ دەگرن. قسەکانی سڵەمانی وەبیر دێتەوەو لە خۆی تووڕە دەبێ... ئاخر سڵەمان پێی نەگوتی پێ نەخەیە ئەم دەورووبەرانە؟.

لەودیو تەپۆلکەی خەنەیی نە پەلەوەرێك باڵی لێك دەداو نە زیندەوەرێك دەبینرا. ئەمەش زیاتر ئەوی تووڕە دەکرد.

دەهاتەوە داوێنی تەپۆلکەکەو ئەو بزنانەی لەوێی خڕایی کردبوون, سەرلەنوێ خڕی دەکردنەوە. ئەم کارە هەتا خۆرئاوای دەخایاند. وەختێك دەگەیشتەوە ئاوایی شەو داهاتبوو.

هەروەخت سڵەمان دەیپرسی بۆ درەنگ هاتوەتەوە, جوابێکی بە درۆی بۆ ساز دەکرد. دەیگوت:"لەوەڕگەیەکی چاکم دیبووەوە, دڵم نەهات حەیوانەکان زووتر بێنمەوە... گوتم بەستەزمانانە با کەمێك بلەوەڕێن..."

رۆژێکیان پێش تاریك و روون له خەو هەستاو چووە ئاغەڵێ. ئاغەڵ بۆنی پشکل و مـرووی لـێدەهات. حەمەد بزنەکانی دەرکردو لێی خوڕین.

هێندێك رۆژان پێش دنیا رووناك بوون، زۆر پـێش روونـاك بـوون سووچـێك لـه خۆرهـەڵاتی ئاسمان رەنگێکی خەنەیی دەگرێ. کـەمێك دواتـریش لێـواری هـەورەکانی لای خۆرهـەڵات وای لـێدێ وەك پـەراوێزیان لـێنرابێ، جـا ئـەمجار بـەیان دەنگـوێ. حەمـەد سـەیری ئاسمـان و لای خۆرهەڵاتی کرد، ئەمڕۆ یەکێك لەو رۆژانە بوو.

حەمەد له نەکاو دڵی روون بووەوە. خۆی قالب سووك و به کـەیف دی. لـەو کاتـەدا شنەی بەربەیانیش ئەنگوت. شنەی بەربەیانِ وەك وردە قەڵبەزەی سووك و فێنکی شەپۆل ڕوومەتی وی دەلستەوەو تێدەپەڕی. دڵی کەوتە لێدان، گوێی له تەپەتـەپی دڵـی خـۆی بوو. بزنەکانی بەرەو تەپۆلکەی خەنەیی دەنـگ دان. بزنـەکان لـە پێـشەوەو حەمـەد بـە دوایان دا هەورێکی تۆزو غوماریان له پشت خۆیانەوە بەجێ دەهێشت و لـە تەپۆلکـەی خەنەیی نیزیك دەبوونەوە. کاتێك گەیشتنە خوار تەپۆلکەکە، حەمەد پێـشی بزنـەکانی گرت. حەمەد سەیر کەوتبووە تەقەلا. بزنەکان بەم لاو ئـەو لادا بـڵاو بوونـەوە. حەمـەد لەسەر عەرزی دانیشت و چەنەگەی هاویشتە سەر گۆپاڵەکەی. ماوەیەکی زۆر له فکرەوە چوو. بزنێك دەست و ملی لستەوە، بەڵام حەمەد رووی نەدایە. بزنەکە بەجێی هێشت و رۆیشت. رووناکایی‌یەك چواردەوری داگرتبوو، پیاو دەیگوت شاخ و کێو و دارو گیا دەبن به ئاو و لەگەڵ رووناکایی تێکەڵ دەبن.

دەستی لەسەر دەم و چاوی لابرد. تیشکی هەتاو له چـاوانی دا. ماوەیـەك نـەیتوانی هـیچ ببینێ، هەتا کەم کەم چاوی راهات. بەنابەدڵی هەستایە سەرپێ. له چاولێك نانێـك دا بزنـەکان وەسەر کەوتن و بەو دیوی تەپۆلکە دا شۆڕ بوونەوە. حەمەد بەرەو جنووب گەڕایەوە. دەستی بۆ چاوی کردە سێبەرو روانییە دوور، پێی وابوو تلۆفکی پیرەچناری ئاسیاب چەشمەی لێوە دیـارە. دڵی داخورپا. لای شیمالی تەپۆلکەکە بەست بوو. چەند زەوی‌یەکی شۆرەکات و نەزۆك ئێرەیان له بیابانی پڕ له چەقڵەشینکەی ئاسیاب چەشمە جیا دەکردەوە. ئەم خاکە وشك و نەزۆکانە وەك کۆمایەك له دوورەوە تێهەڵپەڕیبوون. حەمەد بزنەکانی بۆ لای ئەو کۆما خاکی‌یـە لـێخوڕی. دوو باڵندەی چکۆلەی لەبەر هەڵفڕین و هەڵاتن. تەماشای ئاسمانی کرد. لـە باڵندەیـەك زیـاتری له ئاسمان دا نەدی و لەوە بەولاوە تەنانەت مێشوولەیەکیش لەو دەوروبەرە باڵی نەدەبزاوت. زۆر دوور پەڵە هەورێك لەسەر زەوی راوەستابوو.

لە نەکاو لـە تەنیـشت ئـەو کۆمـا خاکیـیـە مەزرایـەکی چـکۆلەی لـێ‌دەرکەوت. لـەنێو ئـەو مەزرایە تارماییـیەك دوولا دەهاتـەوەو راسـت دەبـووەوە. بـە نابـەدڵی مێگەلەکـەی بـۆ لای ئـەو لـێ‌خوڕی. کاتێك گەیشتە نیزیك مەزراکە، ئەو تارماییـیەی لە دوورەوە چاوی پێ کەوتبوو، دیت و ناسیـیەوە. ئەو "حەسۆ" پیرە پیاوێك بوو کە خەڵکی ئاوایی پێیان دەگوت "حەسۆ شێلم".

حەسۆ شێلم سەری هەڵبڕی و ئاوڕێکی وەسـەر حەمـەدو بزنـەکانی دا. حەسـۆ سـەرگەرمی کاری خۆی بوو. داسی دەوەشاند. حەمەدیش بزنەکانی خۆڕایی کرد. بزنەکان لە کـەردی نیزیـك بوونەوە، بەڵام پیرەپیاو هۆشی هەر بەسەر کارەکەی خۆیەوە بوو. پاشان بزنەکان لە هەمـوو لاوە چوونە نێو گەنمەکەو دەستیان کرد بە لەوەڕو هەڵبەز دابەز. کاتێـك حەسـۆ پێـی زانـی، دەهـری بوو، داسەکەی دەستی ڕەبزنەکان هاڵاندو بۆخۆشی بە جنێودان غاری دایە لای بزنەکان.

حەمەد لە جێی خۆی نەدەبزووت و هەروا تەماشای حەسۆی دەکرد.

وەختێك حەسۆ بە هەزار زەحمەت و هانکە هانك بزنـەکانی لـە کـەردی دەرکـرد، چـاوی بـە کوڕیژگەیەك کەوت کە راماوەو تەماشای دەکا. تێ‌گەیشت ئەو کوڕە شوانی بزنەکانە. ئیدی بە تەواوی لە دین دەرچوو. بزنەکانی بەجێ هێشت، داسـەکەی هەڵگرتەوەو پەلاماری کوڕەکەی دا. لە رقان کەفی دەپڕژاندو جنێوی دەدان:

"بیژووی حەرامزادە، ئەو بزنـە سـەگباب خێوانـەت تـەواوی ئـەو دەغڵـەیان تێـك وەرداوەو بۆخۆشت هەروا راوەستاوی و تێیانەوە راماوی؟... راوەستە با بتگـەمێ هـەتا وات بـە گـۆڕی بابت دا بریەنم کە هەتا ماوی روو لەم نێوە نەکەیەوە..."

منداڵەکە لە جێی خۆی نەدەبزووت و هەروا چاوی لـە حەسـۆوە بڕیبـوو. بـەڵام حەسـۆ بـەو خەیاڵە کە منداڵەکە لێی دەترسێ و رادەکـا، بەبـەر غاردانـەوە دادەهاتـەوەو خـڕە بـەردی لـە دەسـتان خۆشی کۆدەکردنەوە کە پێی دا بدا.

حەسۆ سات بە سات لە کوڕەکە نیزیك و نیزیکتر دەبووەوە، کەچی کوڕەکە هەروا لـە جێـی خۆی چەقیبوو و مووی لـێ‌نەدەبزووت... کوڕیژگە هەڵنەهات. حەسـۆ خـۆی گەیانـدێ و قـۆڵی گرت. دەیویست بە دەسکە داسـەکەی لە سـەری راکێشێ، بەڵام وەك دەستی وشـك بووبـێ. ئـەو دەستەی هەڵی هێنابوو، نەهاتەوە خوارێ و دەستەکەی دیکەشی قۆڵی بەردا:

"ئەتۆی حەمەد؟... ئەتۆی کوڕم؟... لە کوێ بووی؟... هەموو کەس پێی وابوو مردووی..."

پیرەپیاو هەناسـەی سوار ببوو، نەی‌توانی بە پێوە راوەستێ. ناچار هەڵتروشکاو دانیشت. لە پشتە ملی تاوەسووت و لە سەروچاوی ئارەق هەڵدەڕژا. لـەو نێـوەدا دووبـارە بزنـەکان بـە نێـو مەزراکە وەربوون.

حەسۆ شێلم:

"هەراکە حەمەد. غاردە... بزنەکان دەرکە, خەریکن گەنمەکەی وێران دەکەن..."

حەمەد کە هەتا ئەو کاتە وەك پەیکەرێکی بێگیان راوەستابوو و جوولەی نەدەکرد, لە نەکاو دەرپەڕی و خێرا بزنەکانی دەرکردو بۆ لایەکی دیکەی لێخوڕین. پاشان دووبارە هاتەوە لای حەسۆ و دانیشت.

حەسۆ شێلم:

"چووبوویە کوێ رۆڵە گیان؟... هەموو دنیات لە دوا گەڕان... گوتیان حەتمەن لە چۆمی کەوتوەو خنکاوە... هێندەی نەماوە ئەو دایکە بەستەزمانەت لە تاوان دیق بکا... هیچ لە فکری دایکت دا نەبووی؟..."

حەمەد دانیشتبوو و کوشم هەڵاتبوو. چەنەگەی هاویشتبووە سەر گۆپاڵەکەی و متەقی لە خۆی بڕیبوو.

حەسۆ پرسی:

" ئەو بزنانە هی کێن؟."

حەمەد نە زاری هەڵپچڕی و نە جوولەی کرد.

حەسۆ:

"لەگەڵ تۆمە حەمەد... ئەو بزنانە هی کێن؟..."

حەمەد بە زەحمەت زاری کردەوەو بەنابەدڵی وەڵامی دایەوە:

"هی سلەمانن... لە گوندی "کەسمە"."

حەسۆ:

"پیاوی چاکە..."و دوایە لەسەری رۆیشت:

"باشە رۆڵەگیان, تۆ کە نیازت بوو رابکەی بۆ بە دایکتت نەگوت... دەزانم لە دەستی ئەو عەبدییە بێناموسە کێردت گەیبووە سەر ئێسکان. بەڵام هەق وابوو بە دایکتت گوتبایە کە دەتەوێ رابکەی."

حەمەد وەختێك گوێی لە ناوی عەبدی بوو, دەستی حەسۆی گرت و پاڕایەوە:

"بۆ خاتری خوا مام حەسۆ, بە کەس مەڵێ حەمەد بۆتە شوانی مام سلەمان. ئەگەر بە گوێی عەبدیخان بگاتەوە, بە دوام دا دێ, دەمباتەوەو لە بن داران دا دەمکوژێ."

"کەس ناتوانێ هیچت لێ بکا... شێتە, تۆ دایکەکەتت کوشت... دایکت بووەتە چنگێك ئێسك و پێست."

دوای ئەم قسەیە حەسۆ هەڵستاو بۆ ئەوەی شتێکی دیکە بڵێ چووەوە بەر کەردی و دەستی بە دروێنە کردەوە. حەسۆ خێرا خێرا گەغی دەدروو. دەنگی خشەخشی داسەکەی دەگەیشتە بەرگوێی حەمەدیش. حەسۆ هەروەخت پشتی دەکەوتە ژان, داسەکەی دادەناو, تاوێك دەستی لەکار هەڵدەگرت, دەستی بە پشتیەوە دەگرت, پشتی راست دەکردەوەو تاوێك تەماشای دووری دەکرد, ئەمجار سەرلەنوێ دەستی دەکردەوە بە دروێنە. حەمەدیش لە نیزیك کەردی راوەستابوو. بۆ ئەوەی مووی لێ‌ببزوێ, چاوی بڕیبووە حەسۆ.

خۆر بەرەو کەلەپۆ شۆڕ ببووەوە. سێبەرەکان لەبەر هەتاوی ئێواری درێژ ببونەوە. حەمەد سەیرێکی هەتاوی کرد. خۆر سوور هەڵگەڕابوو. گیاوگۆڵ نیوە هەتاو و نیوە سێبەر شەپۆلیان دەدا.

حەمەد بۆ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ, بە چەند شەقاو خۆی گەیاندە لای حەسۆ. حەسۆ خێرا خێرا داسی دەوەشاند. کاتێك گەیشتە لای حەسۆ, دڵی تەپە تەپ لێی دەدا. حەسۆ بە دەنگی خشپەی هەنگاوەکانی سەری هەڵبڕی و چاوی پێی کەوت. حەسۆ لەو دەمەو ئێوارەیەدا بەو ئارەقە کە لە سەروچاوی هەڵدەڕژا, رەش دیار بوو. چاویان پێك کەوت. حەسۆ بە ماندوویی لە چاوەکانی حەمەدەوە راما. حەمەد سەری داخست و چەند هەنگاوی دیکەی بەرەو حەسۆ هەڵێنانەوەو دەستی گرت:

"مام حەسۆ, بیکە بە خاتری خواو پێغەمبەر, بە هیچ کەس مەڵێ کە منت دیوە. بە دایکیشم مەڵێ."

پاشان دەستی حەسۆی بەردا, بێ ئەوەی ئاوڕ وەدوای خۆی بداتەوە, غاری داو خۆی گەیاندەوە بزنەکان.

کاتێك گەیشتەوە تەپۆلکەی خەنەیی, خۆر ئاوا ببوو. حەمەد شەلاڵی ئارەق بوو. دیار نەبوو بۆچی حەمەد لە نەکاو دڵخۆش دەبوو و پاش تاوێك دڵی تەنگ دەبووەوە. گەیشتە سەر لوتکەی تەپۆلکەکە. لەوێ ڕا چاوی بڕیە مەزرایەك کە زۆر دوور, لە نیزیك کۆما خاکییەکە دیار بوو. لەنێوەڕاستی مەزراکەدا هێشتا تارماییەکی چکۆلە بەدی دەکرا.

کاتێك حەسۆ گەیشتەوە نێو دێ, زەردەخەنەیەك لەسەر لێوانی دیار بوو. وەك ئەوەی شتێك بزانێ و نەیهەوێ بەکەسی بڵێ, وەختی وابوو لە پەنای کەسێك رادەوەستاو زەردەخەنەیەکی دەهاتێ. کەس تێی نەدەگەیشت. ئەو, راستەڕێ چووە ماڵی دوونە...

دوونە لەبەر دەرگا دانیشتبوو کە حەسۆ پەیدا بوو. حەسۆ تەماشای دوونەی دەکردو پێدەکەنی. دوونە هیچ لەم وەزعە حاڵی نەبوو.

حەسۆ بۆخۆی پیاوێکی دەم بە پێکەنین نەبوو. کەم کەس پێکەنینی لەسەر لێوانی دیتبوو. سەری لەم و لەویش نەدەدا. هەتا ئەمڕۆ سەری دوونەشی نەدابوو. ئەو، هەموو ڕۆژێ لە ماڵێ ڕا ڕاستەڕێ دەچووە مەزراو لە مەزراش ڕا یەکسەر دەهاتەوە ماڵێ.

ئەو ڕۆژانە کە ئەش دەچووە مەزرا، حەسۆ لەبەر دەرگای ماڵێ بە بێدەنگی لەسەر حەسیرێك دادەنیشت. دەسحێب، یان بادی و کەوچك و تەشیی لە داری کاج دروست دەکردو بە چەقۆ دەی‌نەخشاندن.

حەسۆ هەروا تەماشای دوونەی دەکردو پێدەکەنی و هیچی نەدەگوت.

دوونەش لەم وەزعە تێ‌مابوو، نەی‌دەزانی بڵێ چی. یەك دوو جار هەڵستاو دانیشتەوەو سەرەنجام گوتی:

"بەخێر بێی کاك حەسۆ، فەرموو دانیشە."

حەسۆ وای نیشان دا کە گوێی لێ‌نەبووەو هەروا بە بێدەنگی زەردەی دەهاتێ. دوونە دووبارە خولقی کرد:

"بۆ دانانیشی کاك حەسۆ؟..."

زەردەخەنەی حەسۆ راوەستاو لەسەرەخۆ گوتی:

"دوونە... دوونە..."

دوونە هەموو گیانی بوو بە گوێ. حەسۆ لەسەری ڕۆیشت:

"مزگێنیم دەوێ دوونە... مزگێنیم دەوێ."

دوونە پێکەنی و پاشان وەپەلەقاژە کەوت. دوونە دەلەرزی:

"مزگێنیت لەسەر چاوەکانم کاکە گیان!"

حەسۆ:

"ئەمڕۆ کوڕەکەتم دی دوونە!"

دوونە نەی‌توانی هیچ بڵێ، زمانی گیرابوو. وشك ببوو.

حەسۆ درێژەی پێ‌دا:

"ئەمڕۆ کوڕەکەت هاتە کن من، ماشەڵڵا گەورە بووە... قەڵەویش بووە..."

دوونە ناڵاندی:

"دەبەر زارت مرم کاك حەسۆ، مزگێنیت لەسەر چاوم، لەسەر سەرم."

دوونە باوەڕی نەدەکرد، تاوێك بێدەنگ بوو، سەرلەنوێ دەستی پێ‌کردەوە:

"ئۆ خوایە، دەبەر زارت مرم کاك حەسۆ... بەڕاستیتە؟... مزگێنیت لەسەر چاوەکانم، لەسەر سەرم کاك حەسۆ!"

پاشان دانیشتن و حەسۆ ئەوەی دیتبووی بۆ دوونەی گێڕایەوە.

دوونە لە خۆشییان حاڵی نەبوو. لەم سەری ژوورەکەوە دەچووە ئەوسەری و دەگەڕایەوە.

سەعاتێك پاشتر ئەو خەبەرەی حەسۆ هێنابووی دەماودەم لە نێو ئاواییدا دەگەڕا.

ژن و پیاو و پیرو لاو و منداڵ هەموو لە ماڵی دوونە خڕ ببوونەوە، شۆقی مانگەشەو دەڕژایە سەربانی سواخ کراو و ئەو خەڵکە کە لە دەوری ماڵی دوونە کۆ ببوونەوە.

خەڵك کەوتبوونە باس و خواس و جم و جۆڵ. ئەو هەراو هەنگامەو تێکەوە هاویشتنە لە نەکاو مات بوو. ئیدی کەس قسەی نەدەکرد. هەموو سەریان بۆ لای شیمال وەرگێڕا. سوارێك نیزیك دەکەوتەوە. رەختی زینی ئەسپەکەی لەبەر تیشکی مانگ دەدرەوشایەوە.

سوار نیزیك بووەوە. دڕی بە ئاپۆڕای خەڵك دا. لەنێوەڕاستیان جڵەوی ئەسپەکەی کێشاو راوەستا.

هاواری کرد:

"دوونە دوونە."

دەنگی کزەلۆکی ژنێك لەنێو ئاپۆرایەکە وەڵامی دایەوە:

"فەرموو عەبدیخان..."

"خەبەرێکم بیستوە، راستە دوونە؟"

دوونە هات و لە پێش لمبۆزی ئەسپەکە راوەستا:

"حەسۆ شێلم حەمەدی دیوە. ئەو خەبەری بۆ هێناوم."

عەبدیخان:

"کوا ئەو شێلمە؟... لە هەر کوێیەکە بێتە ئێرە."

لە نێو خەڵکەکەدا بوو بە جم و جۆڵ:

"حەسۆ لێرە نیە..."

"حەسۆ کەنگێ هاتۆتە نێو خەڵك، هەتا ئێستا بێ..."

"دنیا خەرابێ حەسۆ لە ماڵێ نایەتەدەر."

خان دەستووری دا:

"لە هەر کوێیەکە بیهێنن."

هەتا حەسۆیان هێنا, هیچ کەس مته‌قی لێوه نه‌هات. پاش تاوێك حه‌سۆیان هێنا. کراس و دەرپێیەکی سپیی لەبەر دابوون. دوو کەس پیلیان گرتبوو, بە راکێش راکێش دەیان هێنایە لای عەبدیخان. حەسۆ خۆی رادەپسکاوت و جنێوی دەدان:

"ئاخر چ سندانێك لە سەری داون, کە بەم نیوەشەوە نایەڵن خەڵك بخەوێ؟... چیتان لە من دەوێ قورمساغینە؟... بۆ لە کۆڵم نابنەوە؟..."

عەبدیخان:

"ئەمن داوام کردی."

حەسۆ نەرمی کردەوەو دای نەواند:

"بێشەرەفانە, بۆ پێم ناڵێن خان کاری پێتە؟..."

پاشان رووی کردە خان:

"تکایە لێم ببوورە خان!"

عەبدیخان پرسی:

"حەسۆ, دەڵێن ئەمرۆ کوڕی دوونەت دیوە..."

حەسۆ:

"بەڵێ خان... بە دوونەشم گوت."

خان:

"ئێستا بۆم بگێڕەوە بزانم."

کاتێـك حەسـۆ دەسـتی بـە گێڕانـەوە کـرد, خـەڵك لـە دەوری هـاڵان. حەسـۆ هـەموو بەسەرهاتەکەی بێ کەم و زیاد گێڕایەوە, تەنانەت باسی ئەوەشی کرد کە چۆنی داس ڕەبزنـەکان هاڵاندوەو چۆن ویستوویە بە دەسکە داسـەکەی لە سەری حەمەد راکێشێ.

عەبدیخان لە دین دەرچوو:

"ئاوا سلەمان... پیاوی من فریو دەدەی و دەیکەی بە شوانی خۆت؟ ئەمـە یەکـەم جـارت نیە کە پێ لە بەڕەی خۆت زیاتر رادەکێشی... باشـە, هـەتا بـە خزمـەتت دەگـەم... لـەبیرت نەچێ... ئەوە هەر ئەو جەنابی سلەمان کەسمەیییەیە! ..."

حەسۆ:

"بەڵێ خان!"

عەبدیخان بانگی دوونەی کرد:

"دوونە، دوونە، سبەینێ دەچم دەیهێنمەوە."
ئەمەی گوت و ئاوزەنگیی لە ئەسپەکەی داو خەڵك لە دواوە بۆڵەیەکیان لێ‌هات...



عەبدیخان کە بە چوارناڵ ئەسپی لینگ دەدا. لەبەر دەرگای ماڵی سلەمان رایگرت:
"سلەمان!... سلەمان! ..."
سلەمان لە ماڵێ بوو. هاتەدەرێ. کاتێك چاوی بە عەبدیخان کەوت، رەنگی بە رووانەوە نەما.
عەبدیخان ئەسپەکەی بۆ لای سلەمان دەنگ دا. کاتێك لێی نیزیك کەوتەوە، لەسەر ئەسپەکەی داهاتەوەو گوتی:
"خەجاڵەت نابیەوە سلەمان؟... شەرم ناکەی؟... وات لێ‌هاتوە نان خۆرەکانی من فریو بدەی؟... ئافەریم سلەمان... پیاوی زۆر لە تۆ پیاوتر تا ئێستا نەیان وێراوە قەرە لە قەرەی من بدەن... ئی لە تۆ مل ئەستوورتریش نەیان توانیوە بە دەوری ماڵی عەبدیخان دا بێن. ئێستا تۆ شەرم لەو ریشە سپییەت ناکەی و نان خۆرەکانی من فریو دەدەی؟."
سلەمان:
"خان، ئێستا دابەزە... فەرموو بحەسێوە، هەتا بۆت باس بکەم."
عەبدیخان:
"پێت لەماڵێ نانیم. پێم بڵێ ئەو هەتیوە لە کوێیە؟."
سلەمان:
"تۆ خۆت ماندوو مەکە خان، بۆخۆم ئێستا دەچم دەیهێنمەوە."
عەبدیخان:
"نەخەیر، غەمی منت نەبێ. جێیەکەیم نیشان بدە."
سلەمان ملی بەلاوە نا:
"باشە خان، فەرموو برۆین."
سلەمان کەوتە پێش ئەسپەکەو وەرێ کەوتن. هەتا گەیشتنە مێگەل نە سلەمان قسەی کردو نە عەبدیخان.

کاتێك گەیشتنێ، حەمەد لەبن بەردێك دانیشتبوو و لە فکرەوە چوو بوو. حەمەد وەختێك چاوی کردن هەستا هاتە لایان. حەمەد لە دیتنی عەبدیخان هیچ نەشەمزاو وەسەرخۆی نەهێنا. چاوی بە چاوی سڵەمان کەوت. قسەیەکیان نەکرد، بەڵام لە چاوی سڵەمان دا کە ملی بەلاوە نابوو، دەخوێندرایەوە کە دەڵێ:"چ بکەم حەمەد، هیچم لە دەست نایە."

عەبدیخان یەك دوو هەنگاو ئەسپەکەی بۆ لای حەمەد لێخوڕی:

"پێش کەوە."

حەمەد بێ ئەوەی قسەیەك بکا، وەپێشی کەوت. ملی بە نێو شانانی دا ڕۆچووبوو.

لای نیوەڕۆیە بوو کە عەبدیخان بەسواری و حەمەد بە پێیان گەیشتنەوە ئاوایی. لە ڕێگا نە عەبدیخان شتێکی پرسیبوو، نە حەمەد هیچی گوتبوو، بەڵام لە تەواوی ڕێگادا حەمەد لەوە دەترسا کە عەبدیخان لە پشتەوەڕا وەبەر چنگە ئەسپانی بداو بیپلیشێنێتەوە. حەمەد شارەزای ئاکاری عەبدیخان بوو.

لەبەردەرکیماڵی دوونە عەبدیخان جڵەوی ئەسپەکەی ڕاکێشا. ڕاوەستان. عەبدیخان نەڕاندی:

"دوونە، دوونە... وەرە توتکە سەگەکەت وەرگرە."

کاتێك دوونە لە ژوورێ هاتەدەر، عەبدیخان ئەسپەکەی لینگ داو دوور کەوتەوە.

وەختێك دوونە چاوی بە حەمەد کەوت، بە شیوەن و گریان خۆی گەیاندێ و لە ئامێزی گرت. وردە وردە خەڵکی ئاوەدانییش پێیان زانی. وردو درشت لە دەوری ماڵی دوونە کۆبوونەوە. هەموویان دەوری حەمەدیان دابوو و لێیان دەپرسی:

"لە کوێ بووی حەمەد؟."

"حەمەد ئەوە تۆی؟."

حەمەد سەری داخستبوو، هیچی نەدەگوت. وردە وردە خەڵك بڵاوەیان کردو ڕۆیشتن.

## (٥)

حەمەد گوڵە گەنمەکانیشی خڕ کردەوە. کاتێك دروێنەیان دەکرد، بارانێـك بـاریبوو لاسـکی گەنمەکەی پێکەوە نووساندبوو. ئێستا ئەم لاسـکە گەنمانـە تۆزێکیـان لـێ‌هەڵدەستا وەك خاکـە خـەڵووزی رەش. حەمـەد کـە لـە بـەری بەیانی‌یـەوە کێـشەی کردبـوو، وا رەش ببـوو، نـەت دەناسی‌یەوە. تەنیا ددانی سپی دەچوون. کاتێك کـاری حەمـەد تـەواو بـوو، کلۆشـەکە لـە نێـو جۆخینەکەدا ببووە تەپۆلکەیەکی زەلام.

حەمەد ماندوو بوو. چوو لەبەر هەتاو لەسەر گازی پشتێ راکشا. مێروولە لەنێو کلۆشـەکە دەهاتنەدەرو بەرەو جێگایەکی دوور لە دوای یەکتر دا قەتارەیان دەبەست. حەمەد قۆڵی لەسـەر چاوانی درێژ کردو ماوەیەکی زۆر هەروا لەسەر پشتی راکشا.

چەند رۆژ بوو کاری دەکرد. لە پێش دا بەتەنێ گەنمەکەی دروو بووەوە. مەزراکەی لەك لەك چەشمەیان پڕ لە چەقڵەشینکە بوو. پاشان لەگەڵ دایکـی گەنمەکـەیان بەسـت و خڕیـان کـردەوە، ئەمجار گێرەیان کرد... گێـرە کردنەکـە چـەندین رۆژی کێـشا. حەمـەد هێنـد کـز ببـوو، تـەنیا چنگێك ئێسـك و پێست مابووەوە... دەم و چاوی چرچ ببوون... پێستی شـل ببـوو... لەبـەر هەتاوێ رەش داگیرسابوو، لاروومەت و چاوەکانی دەقووڵ کەوتبوون...

ئەو بارگینەی جەنجەڕەکەی رادەکێشا، کـەمێك لـەولاتر بـە دەوری جۆخینەکـەدا دەسـووڕا. ئەوحەیوانە ئەوەندە لەڕ بوو کە پەراسووی دەژمێردران... پیر بوو... لەوانە بوو پازدە سـاڵیش زیاتر بێ. مێش لە سـەروچاوی هالآبوون. راست لە نێوەڕاستی ملیشی برینە پیسکەیەك هەبوو. چڵك و کێم و خوێناو لەو برینە هەڵچۆڕابوو و تۆزی خەرمانیشی لـێ‌نیشتبوو.

مێشە رەشکەی زل زل لەسەر ئەو برینە دەنیشتن و هەڵدەفرینەوە.

لای نیوەڕۆیە بوو. حەمەد تەنیشتاو تەنیشتی کرد. دەستی بە نێوچاوانی دا هێناو مستێك ئارەقی ڕەش لە نێوچاوان و دەمو چاوی هەڵەڕژایە سەر زەوی.

لاسکە گەنمەکان لە هەموو جێیەك وەها لەبەر تیشکی هەتاو دەبریسکانەوە, چاویان لەبەر هەڵنەدەهات. هەر لەو شوێنە کە لێی خەوتبوو لە پشت سەمەڵەکەوە سەیرێکی بارگینەکەی کرد.

چەند لەك لەك لە دەوری بارگینەکە دەفڕین. ئەو لە تەماشای لەك لەکەکان دا نوقم ببوو. بە دەستیش ڕێگای مێرووڵەکانی بەست. مێرووڵەکان بەسەر دەستی دا تێپەڕین.

بە زەحمەت توانی ڕاست بێتەوەو دانیشێ. سەری وەئەژنۆی ڕاستی کردو لە فکرەوە چوو. پاش ماوەیەك وەخۆ هاتەوە. دەستی لەسەر زەوی داداو لەسەرەخۆ هەڵستا. مێرووڵە بەسەر شان و مل و سەروچاوی دا دەهاتن و دەچوون. مێرووڵەکانی لە سەروچاوی کردنەوەو فڕێی دان. بارگینەکە لە پەنا چڵە دڕدووکێك ڕاوەستابوو. لە تۆزو خۆڵ دا ون ببوو, و خەریك بوو لاقێکی پێشەوەی دەلستەوە.

بەزۆر بارگینەکەی هێنایەوە سەر جۆخین و جەنجەڕەکەی پێوە بەستەوە. حەیوانی بەستەزمان هێزی نەبوو بەسەر سەمەڵەکەدا بسوورێ. حەمەد لە جەنجەڕەکە هاتە خوارو هەوڵی دا بە پێیان لەگەڵ بارگینەکە بەسەر سەمەڵەکەدا بگەڕێ. بارگین جار بە جار لەپێ دەکەوت و لە نێو کلۆشەکەدا دەخەوت. حەمەد زۆری بەزەیی بەم حەیوانەدا دەهاتەوە. بەڵام نەیدەزانی چ بکا. بارگین ئارەقی دەرکردبوو و سەرتاپای لەشی لە تۆزێ دا ڕەش داگیرابوو. بە جۆرێك پشووی سوار ببوو کە بەستەران و کرانەوەی قەوەزەی سنگ و پەراسووەکانی بە چاو دەبینرا. هەموو لمبۆز و سنگ و ملی حەیوانەکە لە کەفێ دا ون ببوون. حەمەدیش شەڵاڵی ئارەق بوو. لە سەرتاپای لەشی حەمەدۆك و بارگینەکەی ئارەق هەڵدەچۆڕا. ئارەق دەچووە چاویانەوەو چاویان دەبرژایەوە. بۆنی مرووی مەزرای شەداریش بەری هەناسەیانی دەگرت.

پاش ئەوەی ماوەیەك بە کەوتن و هەستانەوەوە بە دەوری جۆخینەکەدا گەڕان, کلۆشی خەرمانەکە شکاو لەسەر زەوی پان بووەوە.

ئێستا گێرەکە ئاسانتر بوو. سەمەڵەکە لە ژێر چەرخی جەنجەڕەکەدا بە قرچە قرچ تێك دەشکاو ورد دەبوو.

لای نیوەڕۆیە کلۆشەکە تەواو ورد ببوو. لاسکەکان دانیان پێوە نەمابوو و بریسکەیان دەدا. ئێستا تۆزێکی وردو ڕەنگ زێڕین بە ئارامی لە ژێر چەرخی جەنجەڕەکە بەرز دەبووەوە. ئەم تۆزە دەچووە نێو چاوی حەمەدەوەو چاوەکانیی دەبرژاندەوە. ئەم تۆزە بۆنێکی لێدەهات, بۆنی شتێکی سووتاو.

لەولاتر پیاوێك گەنمەكەی لەسەر جۆخینێ خڕ دەكردەوە. لەولای ویش یەك دوو كەس دیار بوون كە جەنجەڕیان لێدەخوڕی. لەمانە زیاتر لە سەرتاسەری ئەم دەشتە هەزار بە هەزارەدا شتێك نەدەبینرا.

زارو لێوی حەمەد لە گەرمان وشك ببوون. بارگینەكەشی لمبۆزی گەیاندبووە سەر گوێزینگی و وەك كەلاك بە دەوری جۆخینەكەدا دەسووڕا.

حەمەد لەسەر جەنجەڕەكە دانیشتبوو، و لە فكران ڕاچووبوو. تەماشای هیچ جێیەكیشی نەدەكرد. لەك لەك لە نیزیك و دەوروبەری خەرمانەكە چەرخیان دەدان. حەمەد خەوی لێكەوتبوو.

بارگین جارو بار لمبۆزی لە نێو خۆیانەكە رادەكردو چنگێك سەمەڵی دەجوی. بەڵام چونكە بێوازو لاواز بوو، سەمەڵەكە بە لالغاوی دا دەهاتەوە خوار.

حەمەد باكی بە هیچ شتێك نەبوو. هەتاو لە سەری دەدا. جارێكیان لەسەر جەنجەڕەكە هەستاو تەماشایەكی دووری، لای ئاوەدانیی كرد. هەتا چاو بڕ دەكا هیچ دیار نەبوو. ددانی دەچیڕەوە بردن و لە بن لێوانەوە گوتی:

"ئەو دایكەم!..."

قەرار بوو دایكی ئاوی بۆ بێنێ، زاری وشك ببوو. دووبارە بە ئەسپایی لەسەر جەنجەڕەكە دانیشتەوە. بارگینەكە راوەستاو لمبۆزی لە خۆیانەكە رۆكرد، بەڵام حەمەد فكری لە جێیەكی دیكە بوو. پاش ماوەیەك پێی زانی و هەوسارەكەی راكێشا:

"هەیها... گیان، هەیها..."

مێشوولە لەسەر برینی حەیوانەكە دەنیشتن. بارگین بە ئارامی و بێحاڵی كلكی رادەوەشاند. بەڵام مێشوولە بە خەیاڵیشیان دا نەدەهات.

حەمەد بە قەڵسی و نیگەرانییەوە لەسەر جەنجەڕەكە هەستا. رووی بۆ لای ئاوەدانی وەرگێڕا. لەسەر درووەڵانەكەڕا سەرێك دیار بوو. تاوێك دواتر دایكی ناسی و قەڵسی و نیگەرانییەكەی بوو بە خۆشحاڵی.

دایكی كە لە ئارەق دا شەڵاڵ ببوو، بە هەناسە سواری پێپێچەی نیوڕۆژی حەمەدی دانا. وەك ئەوە دەچوو دەستی درێژتر بووبن، دەگەیشتنە سەر زەوی.

دایك:

"چت كردوە كوڕم، كارەكەت سووكتر بووە؟."

حەمەد:

"هەموو گەنمەکەم کێشاوەو گێرەم کردوە."

دایک:

"باش ورد بووە؟."

حەمەد:

"ئەریّ، خەراپ نیە."

گۆزەڵە ئاوەکەی لەدایکی وەرگرت و تینگی پێوەنا. ئەوەندە بە ئیشتیای دەخواردەوە کە ئاو بە لالێوانی دا هەڵدەڕژاو بەرۆك و سنگ و تەنانەت لاق و لەتەرییشی تەڕ دەکرد.

دایک:

"دابەزە حەمەد، دابەزە کوڕم، ئەتۆ پاروە نانێك بخۆ، ئەمن جەنجەڕەکە لێدەخوڕم."

هەوساری بارگینەکەی وەدەست دایکی داو بۆخۆی لەبەر سێبەری دڕدووکێك دانیشت. پڕپێچەکەی کردەوە، پیوازو خوێی تێدا بوو. دۆدانەکەش دۆی تێدابوو. جامێکی دۆ تێکرد.

پاش نان خواردن لە بن سێبەری دڕدووکێ راکشا. لە پشتێن بەرەوخواری لەبەر هەتاو بوو. خەوی لێکەوت.

وەختێك وەخەبەر هات، ئێوارە بوو، چاوی راگوشین و غاری دایە سەر جۆخین.

حەمەد:

"دایە گیان، ماندوو بووی، وانیە؟... زۆر ماندوو بووی؟."

دایکی سەری بەلاوە ناو بە دەنگێکی خەماوییەوە جوابی دایەوە:

"وەرە سوار بە کوڕم."

دوو رۆژ دواتر خەرمانەکەیان شەن کراو سوور بوو. رۆژی چوارەم سوورەکەیان کەو کرد. دەنکە گەنمەکان لەبەر هەتاو دەتروسکانەوە. ئەو رۆژە نەیان توانی خەرمانەکە هەڵگرن. گەنمەکە لەسەر جۆخین مایەوە. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە هێشتا عەبدیخان نەهاتبوو ملکانەکەی بەرێ.

ئەو شەوە حەمەدو دایکی هەتا بەیانی لەگەڵ تەپۆیان مل بەملەیان کردو ئێشکیان لە خەرمانەکە کێشا. سبەینێ هەتاو گەرم بوو، بەڵام عەبدیخان دیار نەبوو. بوو بە نیوەرۆ دیسان پەیدا نەبوو. لای ئێوارێ بوو کە خۆی و سێ کەس لە پیاوەکانی بە سواری ئەسپ هاتن. ئەسپی پیاوەکان جەواڵیان پێوە بوون. دوونە لە دیتنی سەروچاوی ترسا. زۆر لەمێژ بوو لە نیزیکەوە دەیناسی. دەم و چاوی دوونە کە وەك چەرمێکی رەش و چرچەلۆك دەچوون، چرچ ترو گرژتر بوون.

عەبدیخان بە دەست هەڵتەکاندن بانگی دوونەی کرد. دەستووری بە پیاوەکانیشی دا:
سێ بۆ ئێمە, یەك بۆ دوونە."
دوونە داوێنی خانی بادا:
"ئەکەی خان, روحمت بێ... زستانێ لە برسان دەمرین... دەبەر بەری پێیانت مرم خان."
"بەخۆڕایی مەگری دوونە... هەقی خۆتت دەدەمێ."
دوونە ناڵاندی:
"هەقی من سێ یەکە خان."
خان لەسەر ئەسپەکەی ڕا بۆ لای دوونە داهاتەوە, تەماشایەکی چاوەکانیی کردو پرسی:
"جووتەکە کێ کردوویە دوونە؟."
دوونە:
"من کردوومە خان!."
"پیاوەکانی من یارمەتییان داوی یان نا؟."
"بەڵێ خان!."
"دوونە گوێ بگرە پێت بڵێم."
ئێستا بە کوڕەکەت بڵێ جارێکی دیکە نەکا بڕواو بچێ لەلای سلەمان ببێتە شوان."
دوونە سپی بوو. خان ئەسپەکەی دەنگ داو ڕۆیشت. دوونە هەر ئەوەندەی پێکرا, لە پشتەوەی هاوار بکا:
"بە قەرەواشت بم خان, قەزات لە من کەوێ, روحمم پێ بکە."
پیاوەکانی خان دەستیان کرد بە پێوان. سێ کیلە بۆ خان و کیلەیەك بۆ دوونە... بەشی خان زۆرو زۆرتر بوو, بەشی دوونەش کەم و کەمترو بوو بە کۆیەکی چکۆڵە.
دوونە تەماشایەکی ئەو کۆ گەنمەی کرد کە جەواڵەکانیان لێپڕ دەکردو دەستی کرد بە تووك کردن:
"ڕەببی لە گەرووت نەچێتە خوار... ئیشەڵلا دەیدەی بە دوکتۆرو دەرمان... خوایە هەمووی بدەی بە شووتی و لەبن سەرتی دانێی."
پیاوەکانی خان بەشی ئەویان لەو جەواڵانە کرد کە هێنابوویانن.
هیچ کامێکیان زاری هەڵنەپچڕی و هیچیان بە دوونە نەگوت. هەموویان وەك پەیکەرێکی بێگیان ڕەق ببوون و قسەیەکیان نەدەکرد.

حەمەد هات و لە پەنای دایکی دانیشت. لە نێو ئەو جۆخینـە تۆزاوییـە کۆیـەکی چـکۆلە گەنم مابووەوە. بەڵام ماوەیەك لەمەوبەر چەند زۆر بوو. حەمەد سەیرێکی گەنمەکەو سـەیرێکی دایکێی کرد. حەمەد وەك تاوانباران بێدەنگ دانیشتبوو.

دایك:

"ئەودەم کە تۆی لە ماڵێ سلەمانی ڕا هێنایەوە، لێـی نـەدای مـن پـێم سـەیر بـوو. بـەڵام ئێستا تێدەگەم بۆچی بژیوی ئێمەی بڕی... کافری خوانەناس..."

حەمەد پێشی گریانی خۆی پێ نەگیراو دەستی کرد بە هەنیسك دان:

"خەتای منە..."

دایك بە هەموو هێزی خۆی کوڕەکەی لە ئامێز گرت و بە خۆیەوە گوشی:

"چ بکەین، دەسەڵات چیە حەمەدی خۆم؟."

حەمەد:

"ئەدی زستانێ؟."

دایك:

"ئەم زستانە! ..."

لە پاشان دایکیشی لە بانگی گریانێی دا:

"خۆزگە باوکت مابایە، ئەگەر باوکت مابایە..."

# (٦)

تاقە مانگایەکیان هەبوو. مانگاکەیان ئەمساڵ زابوو. گوێلکە نێرێکی لەبەر بوو...

ئەگەر حەمەدۆك جێگای تاقە کیلەگەنمێکی زەوی هەبووایە، بە تاسەوە چاوەڕوانی ساڵی دواتر دەبوو کە دیسان مانگاکەیان بزێ و گوێلکە نێرێکی دیکەی ببێ.

گوێلکە نێرێك کە لەوانەبوو ساڵی دواتر ببێ، وەك خەیاڵێك لە مێشکی حەمەد دا دەجوولاً. بەراستی چەند خۆش بوو: هەردوو گوێلك پێکەوە گەورە دەبوون... دەبوونە جووتە گایەکی شاخ کەوانی لە نێو زەوی و زارێکی هەزار بە هەزاردا... جوانەگا تۆرن و بە زوویی و بە ئاسانی نایەنە بەر نیر. بەڵام ئەگەر حەوسەڵەت هەبێ و لەگەڵیان لەسەرەخۆ بی، زوو فێر دەبن و بەستەزمانانە وا رام دەبن، دەبنە بەرخی دەستەمۆ... ئەگەر زەوی درووەڵانە لێی مەترسە... ئەگەر هەموو ساڵێك بیکێڵی، چەقڵە شینکە ساڵێك دەڕوێتەوە، ساڵی دواتریش سەر هەڵدەداتەوە، بەڵام ساڵی سێهەم خاشەبڕ دەبێ... هەر ئەوەندەی دەوێ زەوییەکە هی خۆت بێ.

تووکی گوێلکە ساوا لە رۆژەکانی هەوەڵ دا کە تازە بووە، سوورێکی مەیلەو تاریکە. بەڵام دوایە رەنگی زەرد دەبێ و ئەمجار دەبێتە خەنەییەکی تاریك.

تووکی گوێیانی وەك مەخمەر نەرمە. ئەگەر پیاو دەست بەسەر گوێی گوێلکە ساوادا بێنێ، هەست بە لەرزەیەکی فێنك و نەرم و لەزەتێکی شیرین دەکا.

جێی گوێلکە ساوا لە ماڵە هەژارەکانی لادێ، لە نیزیك ئاگردان و لە تەنیشت جێ خەوی لادێییەکانە. لە ژێر گوێلکە ساوا دۆشەکێك لە گیای نەرم و پڕ گڵوکی بەهاران ڕادەخرێ. ماڵەکان پڕ دەبن لە بۆنی گڵوکی بەهاری و گیاو ریخ و گوێلکە ساوا... بۆنی گوێلکە ساوا شتێکە وەك بۆنی شیری کاڵ.

گوێلکە ساوا پاییزان گەورە دەبێ. ئەودەم جێگاکەی دەگۆڕێ و دەچێتە کن گوێلپارەکان.
دوونە سێ مانگەی بەهاری بەسەر برد, بێ ئەوەی هۆشی بەسەر گوێلکە ساواکەوە بێ و ئاگای لێی بێ. ئەگەر خەم و خەفەتی حەمەد نەبووایە, گوێلکە ساوایەکە لە ماڵێ دا وەك گلوکە سوورەی بەهارێ دەبوو بە مایەی شادی و خۆشیی ژیانیان.
ماڵی حەمەدو ئەوان تەنیا ژوورێکە, ژوورێکی قوڕو بەرد... بەرزایی دیواری ژوورەکەیان لە تەختی ژوورێ ڕا تەنیا میترێکە...
هیچ خانوویەکی دێ خۆ لەبەر بارانی پاییز ڕاناگرێ, دلۆپە دەکا. لە دێ دا تەنیا خانووی حەمەدو ئەوان بوو کە لەو باراندا دلۆپەی نەدەکرد.
بابی حەمەد ماوەیەك پێش مردنی چوو بوو لە "ساری چاغشاك" گلی هێنابوو, و سەربانەکەی پێ سواخ کردبوو. گلی ساری چاغشاك شتێکی دیکەیە, هیچ وەك ئەو گڵە ڕەش و نەزۆك و پڕ چرپ و چاڵە ناچێ کە ئێمە دیتوومانە. ئەو گڵە وەك دەنکی بلوور وایەو لە هەموو ڕەنگێك دەنوێنێ. زەردو سوورو بنەوشەیو ئاسمانی و سەوز... هەر ڕەنگێك بتەوێ. ئەو گڵە ئەگەر گیرایەوە دەبێتە قوڕێکی توندو خەست. سەربانی ماڵی حەمەدو ئەوان بەو قوڕە سواخ کرابوو. بۆیە بانەکەیان لەژێر تیشکی هەتاودا بریسکەی دەداو ڕەنگاوڕەنگ دیار بوو.
سەرانسەری هاوین دایك و کوڕ بە گیانە مەرگی کاریان کردبوو... لە گەڵاڕێزانی پاییز دا هاتنەوە نێو ماڵە پڕ دەردو بەڵاکەیان. ئەوکاتە وەبیریان هاتەوە کە گوێلکێکیان هەیە. گوێلکەکەیان بە تەواوی لەبیر چووبووەوە, ئێستا گوێلکە ساواکەیان تەواوێك گەورە ببوو.
دایك مووڕەیەکی گەورەی بە ئاگرەوە نابوو. لە دەرێ هەوری ڕەش لەجنووبەوە بەرەو شیمال دەڕۆیشتن. نەختێك دواتر ژوورەکەیان بە بریسکەیەك روون بووەوە. بڵێسە ئاگرەکان لە نێو ئاگردانەکە تێك هەڵدەنگوتن. لەو کاتەدا حەمەد هاتەوە ماڵێ. دەستی سوور هەڵگەڕابوون. لەبەر ئاگرەکە دانیشت. مانگاکەیان لە پشتەوەی ژوورەکە نووستبوو, کاوێژی دەکرد. مانگایەکە بێ خەم لێی کەوتبوو. تفاقیان لە پێش دانابوو, بەڵام نەی‌دەخوارد. لە قوژبنێکی دیکەی ژوورەکە کایان ڕۆکردبوو.
حەمەد هەستاو چوو سەری مانگاکەی دا. گوێلکەکە لەسەر سەری دایکی ڕاوەستابوو. حەمەد گوێی گرت. گوێلکەکە ئەوەی پێ خۆش نەبوو. بە قەڵسی سەری وەرگێڕاو ڕای کرد, چوو لەولای دایکی ڕاوەستا. حەمەد زەردەخەنەیەکی هاتێ.

دایك:

"ئەو وەختی تۆ لە ماڵ نەبووی، "فندق" ئەم گوێلکەی لە دۆڵی "ئاڵچیلی" بوو. بە شەوی تاریك زۆری لیگەڕام هەتا فندقم لە بن دڕدووکێك دۆزییەوە. بەستەزمانە زابوو. خەریك بوو گوێلکەکەی دەلستەوە. لە پێش دا نەیدەهێشت لێیان نیزیك بەوە، هەتا ئاخری گوێلکەکەم لە ئامێزێ کردو هێنامەوە."

حەمەد:

"چەند گەورە بووە؟."

دایك:

"ئەدی ماشەڵلا."

پاشان بێدەنگ بوون. نەیان توانی تەماشای یەکتر بکەن. هەردووکیان سەریان داخستبوو، چاویان بڕیبووە ئەو خەڵووزانە کە لە نێو ئاورگەکەدا دەگەشانەوەو پڕیشکیان داویشت.

دایك:

"چارمان نیە، دەبێ بیدەینێ... ئاردەکەمان خەریکە تەواو دەبێ."

حەمەد متەقی نەکرد.

دایك:

"بۆخۆت عەبدیخان دەناسی. لێمان توورەیە. ئەگەر درەنگی بۆ بەرین، بەخۆڕایی لە دەستمان دەردێنێ. ئەودەم ناتوانین هەتا هاوینێ رایکێشین."

حەمەد دیسان بێدەنگ بوو.

دایك:

"چارەیەکمان نیە حەمەدە، دەبێ بیدەینێ... ئەو هەلاّتنەی تۆ پشتی شکاندین."

حەمەد بە ئارامی سەری هەڵبڕی و تەماشای دایکی کرد. چاوی پڕ بوون لە ئاو، گوتی:

"منی کردوەتە بیانوو دایەگیان، ئەگەر منیش نەبوایەم بیانوویەکی دیکەی دەدۆزیەوە."

دایك:

"ئەدی رۆڵەم، دەی دۆزیەوە... ئەم خوا نەناسە دوژمنی بابە هەژارەکەشت بوو."

هەردووکیان ئاوڕیان وەسەر مانگاکە دایەوە. مانگاکە ڕەنگ خەنەیی و قەڵەو بوو. نێوچاوانیشی چەند خاڵی تێدابوون.

زستان داهات. بەفر گەیشتە ئەژنۆیان. دوانیوەڕۆیان تاریکە. دایك لەمێژ بوو مەنجەڵە مسە ڕەشەکەی وەسەر ئاور نابوو. لەو کاتەدا جەننەت وەژوور کەوت.

دوونە:

"فەرموو دانیشە خات جەننەت، فەرموو دانیشە."

جەننەت هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

"دادەنیشم خوشکێ، دادەنیشم."

خات جەننەت لە سووچێك دانیشت و دەستی پێکرد:

"لە بەیانییەوە تا ئێستا ماڵ بە ماڵ گەڕاوم خوشکە دوونە. ماڵ نەماوە رووی تێنەکەم. بیستم ئێوەش گەنمتان نەماوە... دەڵێن جۆیەکەشتان تەواو بووە. ئێمەش حەوتوویەکە جەواڵەکەمان بەتاڵ بووە. ئەمساڵ گەنمەکەمان باش نەبوو خوشکە دوونە، بەڵام هی ئێوە خراپ نەبوو. مێردەکەشم هەر جۆیەکی پێ شك دەهات و هومێدی پێ بوو سەری تێهەڵکرد، بەڵام بێسوود بوو..."

خات جەننەت چاوی بەو ئاوە کەوت کە لە مەنجەڵەکەدا لەسەر ئاگر دەکوڵی:

"چ لێدەنێی خوشکێ؟."

خات جەننەت لەو پرسیارە مەبەستێکی هەبوو.

دوونە پێکەنینێکی ساردی هاتە سەر لێوان:

"ئاوە وەسەرم ئاوە بکوڵێ."

خات جەننەت بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

"هیچتان نەماوە؟."

دوونە:

"هەرچی هەمانە لەسەر ئەم ئاگرەیە."

خات جەننەت:

"باشە، خوشکە دوونە دەتەوێ چ بکەی؟."

دوونە:

"خوا دەزانێ خوشکێ!."

جەننەت:

"بۆچی ناچیە کن مستەفای؟."

دوونە:

"دەچمە کنی خوشکێ، بەڵام دەزانم ئەویش نیەتی."

چەند رۆژ بوو بەفرو باو بۆران گالـەی دەکـرد. لەبـەر کەرەسیـسـە چـاو هەڵنـەدەهات. ئـەو سەگانە کە هەمیشە لە کووچەو کۆڵانان دەگەڕان, یەکیشیان دیار نەبوو. دەتگوت چۆڵگەیە...
هەموو دێنشینەکان دەرگایان داخستبوو و لە تەواوی ئاوایی‌دا زیندەوەر نەدەجوولا. هەرکـەس لە ماڵێ مانگایەکی هەبوو, تفاقەکەشی هەبوو. کەس کاری بە کەس نەبوو.

دوونەش دەرگا نەمابوو لێی نەدا, ئاشنا نەمابوو سەری بە ماڵێ دا نەکا.

دە رۆژ دەبـوو دوونـە لـە هـەموو جێیـەك تـەمابڕاو ببـوو, بـەڵام لـە دڵـی خـۆی دا دەیگوت:"ئەگەر بشمرم ناچمە دەرکی عەبدیخان." هەموو ساڵێکیش وەزعەکە هـەر وا بـوو. نیوەی خەڵکی ئاوایی برسی دەبوون و دەچوونە دەرکی عەبدی خان.

دوونە نەی توانی لەوە زیاتر خۆی راگرێ. ئەگەر هـەر بۆخـۆی بووایـە, بـە هـیچ قیمـەتێك نەدەچووە دەرکی عەبدیخان, بەڵام کورەکەی چی؟."

چەند رۆژە حەمـەد متـەق لـە زاری نەهاتوەتـەدەر. سـوورایی لـە رووەمـەت و لێوەکـانی دا نابینرێ. لێوی وەك کاغەز تەنك بـوون. روخـساری رەنگـی مردووانـی لـێنیـشتوە. ئەگـەر لـە قوژبنێك دانیشێ, هەتا خۆرئاوا لە جێی خۆی نابزوێ. هەمیشە سەری لەنێو دەستانی دەگرێ و لەگۆ فکران ڕا دەچێ. هەموو هەناسەو ژیان و رق و خۆشەویستی و ترس و هێزی لە چاوانی دا کۆ بووەتەوە. لە چـاوەکانی دا جـار بـەجار بریـسکەیەك بـە قـەدەر نـووکی دەرزی هـەڵدەبێ و دەکوژێتەوە. ئـەم بریـسکەیە تیـژو بـەکارە. ئەمـە بریـسکەیەکە پیـاو لێـی دەترسـێ, چـونکە بەسامە. لە چاوی ئەو پڵینگەش دا کە خۆی مات داوەو خەریکە ئامبازی دوژمنی خـۆی بـێ, رەنگە هەر ئەم بریسکەیە هەڵ بێ و بکوژێتەوە.

ئەم بریسکەیە لە کوێوە دێ؟ رەنگە لە سروشتەوە هاتبێ... بەڵام راستییـەکەی ئەوەیە کە ئەم بریسکەیە لە ئەشکەنجەو ئازارو دەردو بەڵایەکەوە هاتوە کە دەوری حەمەدیان داوە. ئێـستا ساڵێکە ئەم بریسکەیە هاتوەو لە چاوی حەمەدۆك دا هێلانەی کردوە. ئەگینا پێشتر, چاوەکانی پڕ بوون لە تیشکی پاکیو خۆشحاڵییەکی منداڵانە.

هـەوری رەش و تاریـك لـە ئاسمـان کۆدەبوونـەوەو دەسـووڕان. لـە پـێش مـاڵی عەبـدیخان ئاپۆرایەك لە دێنشینەکان بە بەرگی دەست چن و پوواوەوە کـۆ ببوونـەوەو لـە سـەرمان پاڵیـان وێك دابوو, کوشم هەڵاتبوون و دەلەرزین. تـەنیا یـەکێکیان دوور لـە ئاپۆرایەکـە بـە تـەنیا لـە قوژبنێك راوەستابوو. ئەو یەکەش دوونە بوو. هەموو چاوەڕێ بوون عەبدیخان دەرگا بکاتـەوەو بـە دەردو مـەرگیان رابگـا. لـەو کاتـەدا دەرگـا کرایـەوە. عەبـدیخان بـە ریـشێکی بزنانـەو دەسحێبێکی دەنك گەورەو کڵاوێکی تووکە وشترەوە دەرگای کردەوە:

"دیسان برسیتانە؟..."

ئاپۆرای دێنشینەکان متەقی لێوە نەهات. عەبدیخان چاوی بە دوونە کەوت کە دوور لە هەمووان لە سووچێك راوەستابوو. نەڕاندی:

"دوونە، دوونە... ئەتۆ بە چ ڕێیەك دا هاتووی هەر بە وێ دا بڕۆوە ماڵی خۆت. دەنکەگەنمێك چیە نات دەمێ دوونە... هەتا ئەمڕۆ کەس نەیوێراوە لەم دێیە، لە دەرکی من بڕواو ببێتە شوانی کەسێکی دیکە... هیچ کەس لە نان خۆرەکانم نەیان وێراوە کاری وا بکەن، دوونە... ئەو سەربزێوییە هەر کوڕی تۆ کردوویە دوونە... باشترە تۆ بگەڕێیەوەو بچیەوە ماڵێ."

پاشان رووی کردە ئەوانی دیکە:

"ئێوە بە دوام دا وەرن."

دەستی لە گیرفانی شەڵوارە فش و فۆڵەکەی راکردو چەپکە کلیلێکی دەرهێنا. دەفتەرێکیشی لە گیرفانی چاکەتەکەی دەرهێناو رۆیشت.

پاش تاوێك دوونە وەخۆی هاتەوەو بە زەحمەت بانگی خانی کرد:

"خان، ئەو، هەمووی بستە منداڵێکە... مەیەڵە برسی بێ خان!"

خان راوەستا، رووی کردە دوونە. خەلکەکەش راوەستان.

خان:

"دوونە باشت گوێ لێبێ... لەو رۆژەوە خۆم ناسیوە، هیچ کەس نەیتوانیوە لە ئاسیاب چەشمە رابکاو بچێتە دێیەکی دیکە ببێتە شوان... لەمەولاش کەس ناتوانێ کاری وا بکا... ئەتۆ لە رێی خۆت برۆ، بچۆوە ماڵێ دوونە!"

کاتێك عەبدیخان دەرگای عەمباری کردەوە، بۆنی گەرم و تۆزاویی گەنم هاتەدەرێ. خان لە پێش عەمبارێ راوەستاو رووی لە دێنشینەکان کرد:

"باشتان گوێ لێ بێ. هیچ کەستان هەقی نیە دەنکە گەنمێك بدا بە دوونە. دوونە دەبێ لە برسان بمرێ... هەتا ئەمڕۆ هیچ کەس لە ئاسیاب چەشمە لە برسان نەمردوە، بەلام دوونە دەبێ بمرێ، یان ئەگەر شتێکی هەیە دەبێ بیفرۆشێ... ئەگەر ببیسم یەکێکتان گەنمی داوە بە دوونە، یەك یەك پێتانەوە دەگەڕێم و ئەو گەنمەی بە قەرزم داونێ لێتان دەستێنمەوە... حاڵی بوون چیم گوت؟."

دێنشینەکان:

"بەشی خۆمان ناکا هەتا بیدەین بە دوونە..."

"بەشی خۆمان ناکا..."

"چما هەمووی چەندە هەتا بەشی دوونەشی لـێبدەین."

قیژەی ژنێکیش لە پشتەوە بیسترا:

"با نەیهێشتبا کورەکەی رابکا..."

هەموویان بە کۆڵە ئاردو چێودان و گەنم و جۆوە چوونەوە ماڵ.

ئاش لەوسەری ئاوایی، کەمێك لەولای پیرەچنار بوو. شانسی "سمایل گوێبڕاو"ی ئاشەوان هەستابووەوە.

لای ئێواریێ لە هەموو ماڵەکان بۆنی نانی گەرم و تازە هەڵدەستا.

✧ ✧ ✧

"دورمووش عەلی" راست شەست ساڵ تەمەنیەتی. بەخۆوەترین پیاوی ئاسیاب چـەشمەیەو وەك چناری پیر ساغ و بە ئێسکە. سەرو رووەمەتی زەلام و چاوەکانی چکۆڵەن. بە هـەموو عـومری خـۆی کەوشی لەپێ نەکردوە. پێستی ئەستوورو رەش و قەڵشت قەڵشتی بەری پێی کاری کەوشی بۆ دەکـا. لاقی زۆر گەورەن. گەورەترین کەوشی دنیای بۆ بێنە لە پێیەوە ناچێ. تەنانـەت کاڵـەی لاقـی ویـش وەدەست ناکەوێ. بەڵام ئەگەر پێی خۆش بێ، دەتوانێ کاڵە لەپێ بکا. ئەگەر کەسـێك لـەو بارەیـەوە پرسیاری لـێبکا، وەڵامێك وەرناگرێتەوە... دورمووش عەلی تەنیا جنێوێك دەداو دەڕوا.

ژنێك هەویری دەشێلا، یـەکێك ئـەنگوتکی دەگـرتن، یـەکێك نـانی دەکـردو یـەکێك لەسەر سێڵ دەیبرژاند. نانی ئەستوورو زەردو سووری سێڵێ لـە لای راستی ئانکەرەکـە هەڵچنابوو.

عەلی، یەك دوو نانی بە ئیشتیاوە خواردن. پاشان چاوی پڕ بوون و رووی کردە خێزانی:

"ژنەکە، نانەکەم بە گەروو دا ناچێ."

خێزانی بەسەرسوڕمانەوە پرسی:

"بۆچی عەلی؟ چ قەوماوە؟."

عەلی:

"خەمی ژن ومنداڵی برایـمە... نەت دی ئەو عەبدییە خوانەناسـە چی لـێکردن؟... دوێنێ یەك دەنکیشی گەنم نەدانێ."

ژنە:

"بەستەزمانانە... ئەگەر برایم مابایە..."

عەلی:

"عەبدی بە هەمووی ئێمەشی گوتوە کە..."

ژنە:

"بیستوومە چی گوتوە..."

عەلی:

"ئاخر چۆن وا دەبێ, لە دێیەکی وا گەورەدا دوو کەس لە برسان بمرن و کەسیش بە خەیاڵی دا نەیە؟..."

عەلی تووڕە بوو, دەیبەڕاند. دەنگی دەگەیشتە ئەوسەری ئاوایی. پاشان رووی کردە خێزانی:

"هەستە ژنەکە... هەستە بوخچەیەك لەم نانە وەپێچە... تووڕەکەیەکیش پڕ کە لە ئارد. دەمەوێ بیبەم بۆ ژن و منداڵی برایمی."

ژنە لەبەر نانی هەڵستا, دەست و داوێنی خۆی تەکاندن.

عەلی بە بوخچە نان و تووڕەکە ئاردەوە وەك دارێکی پڕ لك و بەر, بە گورجیو بە خۆشحاڵی لە ماڵێ وەدەرکەوت. کاتێك گەیشتە بەر دەرگای ماڵی دوونە, کەمێك ئارام ببووەوە.

عەلی بانگی کرد:

"دوونە, دوونە... دەرگام لێبکەوە."

دوونەو کوڕەکەی لەبەر ئاگری دامرکاوی خۆیان کز دامابوون. بەرد بزووتبایە, ئەوان نەدەبزووتن.

عەلی چەند جاری دیکەش بانگی کرد:

"دوونە, دوونە..."

دوونە پاش ماوەیەك وەخۆ هاتەوەو دەنگەکەی بیست. خۆی کۆکردەوەو هەڵستا. بە بێزاری دەرگای کردەوە:

"فەرموو کاعەلی."

عەلی:

"هێندەت بانگ دەکەم بۆ جواب نادەیەوە کچێ؟."

دوونە:

"وەرە ژوورێ کاعەلی."

عەلی داهاتەوەو چووە ژوورێ. پرسی:

"ئاگردانەکەتان بۆ کوژاوەتەوە؟..."

هەر ئەو بریسکەیەی جاران, وەك نووکی دەرزی هاتبوو و لە چاوەکانی حەمەد دا دەدرەوشایەوە. کاتێك سیمای باوکانەو رووی بە پێکەنینی عەلیی چاو پێکەوت, ئەو بریسکەیە لە چاوی دا نەما.

عەلی بوخچەکەی دانا:

"خوا کەریمە."

دوونە:

"خوا کەریمە کاعەلی."

عەلی:

"دیارە رەق بوویەوە دوونە... بڕوانە کوڕەکەش رەق بووەتەوە... بۆچی ئاگرەکە هەڵناکەی؟..."

دوونە تەماشایەکی وشکی ئاورەکەی کرد:

"کووژاوەتەوە؟... هیچ حەوسەڵەم نەبوو."

دوونە دوو بڕ داری لە ئاورەکە نا. ئاورەکە هەڵ بوو:

"ئەم عەبدیی‌یە خوانەناسە..."

کاتێك حەمەد ناوی عەبدیی هاتە بەر گوێ, دیسان بریسکەکە لە چاوانی دا درەوشایەوە.

عەلی:

"هەرکەس ئەو بێناموسە بکوژێ, دەستی شین دەبێ... جێگای بەهەشت دەبێ... بابی وا نەبوو, فکری لادێیی‌یەکانیشی هەبوو."

پاش عەلی دووسێ کەسی دیکەش لە خەڵکی ئاوایی ئازووخەیان بۆ دوونە هێنا. عەبدی‌خان رووحیشی لەو کارە خەبەردار نەبوو. بەڵام هەمووی ئەو یارمەتی‌یانە هەر بەشی پازدە رۆژیان بوو.

دایك و کوڕ دوو رۆژان برسی بوون. رۆژی سێهەم, دوونە بێ ئەوەی قسەیەك بکا, پەتێکی کردە ملی مانگایەکەو وەڕێ کەوت.

کاتێك دوونە مانگایەکەی دەبردە دەرێ. حەمەد بانگی کرد:

"دایە!"

دوونه:

"چیه کوڕی خۆم؟."

دوونه مانگاکەی لێخوڕیو لەبەر دەرکی ماڵی عەبدیخان راوەستا. گوێلکەکە سەری لە نێو لاقی دایکی راکردبوو, دەیمژی.

دوونه ماوەیەك لەبەر دەرگای ماڵی عەبدیخان مەحتەل بوو. دورسوون چاوی پێ کەوت و خەبەری بە خان دا. خان هاتە دەرێ. دوونه سەری داخستبوو, هەڵی نەدەبڕی. چەنەگە درێژو باریکەکەی دەلەرزی. لێوەکانی وەك لێوی منداڵان وێك هاتبوون و دەلەرزین. هەموو گیانیشی هەڵدەلەرزی.

خان دەستێکی بە پشتی مانگایەکە دا هێناو گوتی:

"هێناوتە بیفرۆشی دوونه؟."

دوونه بێ ئەوەی سەری هەڵبڕێ وەڵامی دایەوە:

"بەڵێ خان!"

عەبدیخان دەستووری بە دورسوون دا:

"ئەم مانگایە لە خوشکت وەرگرەو بیبە پشتێری."

لە پاشان دەستی لە گیرفانی راکرد, چەپکە کلیلەکەی دەرهێناو گوتی:

"جەواڵت هێناوە, خوشکێ..." دەنگی دڵسۆزانەو خۆشەویستانە بوو. دوونه وەڵامی دایەوە:

"بەڵێ خان!"

## (٧)

لەو جێیەی بەڕوو دەڕوێ, کەم داری دیکە شین دەبێ. لەو جۆرە جێیانە دەرودەشت و کێو و بەندەن بە دار بەڕوو دادەپۆشرێ.

قەدی دار بەڕوو نەوی و ئەستوورە, لکەکانیشی کورت و خەپەتۆڵەن, درێژایی لک و پۆپی داربەڕوو ئەوپەڕەکەی میترونیوێکە. گەڵاکانی سەوزو پڕ ڕەنگ و چڕو پڕن. ئەو دارانە ئەوەندە توندو قایم چنگ لە زەوی گیر دەکەن, دەڵێی هیچ هێزێك ناتوانێ هەڵیان کەنێ.

ئەو خاکەی بەڕووی لێدەڕوێ خاکێکە ئەزۆك و سپی وەك گێچ... دەڵێی سوێندی خواردوە نەهێڵێ هیچ دارێکی دیکە تـخوونی مەڵبەندی وی بکەوێ.

مەودای نێوان "کادیرلی"و "جیفجیك" هەمووی تەپۆلکەی چووك و گەورەیە. خاکی ئەو تەپۆلکانە لیوەدارو ڕەش و چەورو بەرێژەوە.

لێرە باتلاغە لەمێژینەکانی چوکووراوا دەبڕێنەوە. باتلاغەکانی "ئاغاچسیز" کەوتوونە خۆرئاوای ئەو تەپۆلکانەو خۆرهەڵاتی ئێرە کاجستانەکانی توورووسە. تەواوی ئەو تەپۆلکانە لە داوێنێ ڕا هەتا سەرێ داچێندراون. لە خاکی ئەم دەوروبەرەش دا بەڕوو دەڕوێ. بەڵام داربەڕووەکانی ئێرە جۆرێکی دیکەن. وەك ئەو دار بەڕووانەی ئێمە دەمیان ناسین, قەد ئەستوورو گرێ گرێ نین. ئەو داربەڕووانە هێندەی سەروێك بڵیندن. لك و پۆپ و گەڵایان سەوزاییەکی تەڕو تازەیان لێدەبارێ. قەدی ئەم داربەڕووانە وەك قەدی سپیدار نەرمە. ئەم دار بەڕووانە لە نێو دەغڵو دان دا, نەك وەك بەڕوو, بەڵکوو وەك دارەکانی دیکە تێهەڵچوون.

دڕووەڵانی چەقڵەشینکە سەوزە, شینە... چڵەکانی چەقڵەشینکە شەپۆلێك دەدەن وەك شیری سپی... سەرانسەری ئەو مەزرایە سەرلەبەیانییان شەونم لێی داوە. خاك و بەردیش

سەهۆڵ بەستوویەتی. لاق و لەتەری لە نێو درووەڵان هەڵدڕ هەڵدڕ دەبوون. بەنێو ئەو درووەڵانەدا جووتی لێدەخوری. سەرمای ئەو وەختانە سەختە.

لەبەر سپێیە گەرما جەنجەری لێخوری. لەبەر سپێیەگەرما سووتا. سێبەشی ئەو بەرهەمەی بە چنگ و نینۆك لە بن گڵی دەرهێنابوو عەبدیخان لێی ئەستاند.

عەبدیخان دوو بەش لە سێ بەشی بەرهەمی لە خەلکی دیکە دەستاندو بەشێکی بۆ ئەوان دادەنا، پاش ئەو ساڵە رقێکی تایبەتی لەوان داگرتبوو... هەرجارەی بیانوویەکی دەدۆزیەوە، هەتا شل دەبوو حەمەدی دەکوتاو زۆریشی جنێو پێدەدا.

زەوی هەر جۆرێك بێ، هەموو شتێك چۆن بروێنێ، هەر واشی گەورە دەکاو پێی دەگەیەنێ.

ئەو لە خاکێکی ئەزۆك و بێکەلك دا گەورە بوو و پێگەیشت. ئەو بوو و هەزارو یەك دەردوبەلا... نەی توانی زۆر هەڵبدا... شان و پیل و لاقەکانی هەڵیان نەدا. دەست و لاقی وەك ئەمامێکی بێئاو وشك بوون.

خاکی رەقەنی ئەم وڵاتە حەمەدیشی هەروەك دارەکان پێگەیاندبوو... لارووەمەتی قوپیبوون. دەم و چاوی ئەسمەر بوون، ئەسمەرێکی تاوەگاز... ئەگەر بە باشی لێی ورد بایەوە، پێت وابوو داربەڕوویەکی ئەو مەڵبەندە دەبینی... سەخت و قایم، راست وەك داربەڕووەکانی ئەو مەڵبەندە کە توند چنگیان لە زەوی گیر کردوە. هەموو ئەندامی لەشی زبرو وشك بوو، تەنیا لە ئەندامێکی دا کەمێك تەڕایی مابوو... لێوەکانی هێشتا وەك لێوی منداڵان تەڕو تازەو سوور بوون... وەك لێوی منداڵان دەپشکوتن... وەك ئەوە دەچوو کە هەمیشە زەردەخەنەیەك لەسەر لێوانی نیشتبێ، زەردەخەنەیەك کە لەگەڵ برسیەتیو زبرییەکەی دا رێك دەکەوت.

حەمەدۆك ئەمڕۆ خەریك بوو لە خۆشحاڵی باڵ بگرێ. دەهاتەدەر، لەبەر هەتاو سوورێکی دەداو دەچووەوە ژوورێ.

گیرفانی چاکەتەکەی کە لە قاچاخچییانی کڕیبوو، دەسرۆکەیەکی تێدا بوو. دەسرۆکەکەی بە شێوەی جۆراوجۆر قەد دەکرد. جارێك لێکی دەکردەوەو یەك توێی دەکردو جارێکیش هەڵی دەپێچا. کڵاوە گەرگەرییەکەشی نوێ بوو. کڵاوەکەی لەسەر دەنا. کاکۆڵە رەش و درێژەکانی لەبن کڵاوەکەیەوە دەهاتنەدەرو دەڕژانە سەر نێوچاوانی. پاشان کاکۆڵەکانی کۆ دەکردەوە، کڵاوە گەرگەرییەکەی کەمێك لە پاشتر دادەناو دیسان تەماشای ئاوێنەی دەکرد. بەڵام بە دڵی نەبوو. سەرلەنوێ کاکۆڵەکەی دەخستەوە سەر نێوچاوانی، ئاوای پێ جوانتر بوو.

پانتۆڵەکەشی نوێ بوو. دوو ساڵ لەمەوبەر کڕیبووی، بەڵام هەتا ئەمڕۆ دەپێی نەکردبوو. ئەمڕۆ یەکەم ڕۆژ بوو کە پانتۆڵە نوێیەکەی دەپێ دەکرد.

چەند جووتی گۆرەوی دەپێ دەکردن و دایدەنانەوە. چەندی گۆرەوی هەبوو! ئەو هەموو گۆرەوییە؟...

دایکی لە گۆرەوی چنین دا لینگەی نەبوو... جگە لەوە، لە گۆرەویی میزاییش دا کەس تای نەدەکرد.

ئاخر گۆرەوییشی دەپێ دەکرد، ئەویشی بەدڵ نەبوو، گۆرەوییەکانی داکەندو لە سووچێکی دانان. لەبن چاوانەوە هەر وریای دایکی بوو، چووە لای سندووقەکە. سندووقی کردەوە. بۆنی سێوە لاسوورە لە سندووقەکە هەڵدەستا. چاوی بە گۆرەوییەکی نەخشین کەوت کە لە سووچێکی سندووقەکە دا بوو. لەرزی. داهاتەوەو گۆرەوییەکانی دەرهێنا. بۆنی سێوە لاسوورە ژوورەکەی پڕ کرد. کاتێك دەستی وەگۆرەوییەکە کەوت، لەرزینەکەی زیاتر بوو. شتێك بە گەرمایی خوێن بە نێو دڵی دا تێپەڕی. پێی خۆش بوو... چەند گەرم، چەند خۆش و نەرم...

لە تاریکایی نێو سندووقەکەدا، ڕەنگی گۆرەوییەکان تاریك دیار بوو... گۆرەوییەکانی دەرهێناو بردنیە بەر هەتاو... ڕەنگەکان لەبەر تیشکی هەتاو کرانەوەو گوڵیان کرد.

جاری وایە گۆرانییەك دەبیسین... ئەم گۆرانییە بە شەو جۆرێکەو بە ڕۆژ جۆرێکی دیکە... ئەم گۆرانییە ئەگەر منداڵێك بیڵێ تامێکی هەیەو ئەگەر ژنێك بیڵێ تامێکی دیکە... ئەم گۆرانییە ئەگەر لاوێك بیڵێ جۆرێکەو ئەگەر پیرێك بیڵێ جۆرێکی دیکە... ئەم گۆرانییە لە کێو جۆرێکەو لە دەشت و لێرەوارو دەریا جۆرێکی دیکە... تامی جۆراوجۆری هەیە... سەرلەبەیانی جۆرێکەو نیوەڕۆ و ئێواران جۆرێك و کاتی خۆرئاواو ئەوانە جۆرێکی دیکە...

ئەم گۆرەوییە نەخشینانەش ڕاست وەك ئەو گۆرانییەن... بە گەرمایی گۆرانی چنراون... زەردو سوورەکەیان، سەوزو ئاسمانی و نارنجی و شینەکەو هەموو ڕەنگەکانیان تێکەڵ بوون و گەرمایی و نەرمایییەکیان هەیە، هەر مەپرسە. ئەم گۆرەوییانە بوونە شتێك وەك ئەوین، وەك خۆشەویستی...

ئەم گۆرەوییە ئەوینە، ئەم گۆرەوییە دابێکی زۆر کۆنە. بەخۆڕایی نیە وەختێك حەمەد دەستی لێدا، دەستی لەرزی... بەخۆڕایی نیە کە وەختێك لەبەر هەتاو چاوی پێی کەوت، شتێکی توندتر لە لەرزین ڕایتەکاند. لەسەر ئەم جۆرە گۆرەوییانە نەخشی دوو باڵندە

دەچنرێ... دوو باڵندە کە دەندووکیان پێکەوە نوساندوە، هەر دەڵێی یەکتر ماچ دەکەن... پاشان نەخشی دوو داری قەد باریك... هەرکام لەم دارانە تەنیا گوڵێکیان دەرکردە، گوڵێکی زۆر گەورە... دارەکان لە تەنیشت یەکتر چنراون و گوڵەکانیان رووەمەتیان پێکەوە لکاندوە، هەروا بزانە خەریکن یەکتری ماچ دەکەن... پاشان بە نێو ئەو دوو دارەدا ئاوێك تێدەپەرێ وەك جۆری شیری. ئەم جۆگەلە چکۆڵەیە چەند گابەردی سووری لەم بەرو ئەوبەر هەن. چ رەنگ و تیشکێکی جوان لەم دیمەنە هەڵدەستێ... دەڵێی دنیایەکە پڕ لە جم و جۆڵ کە لە خۆی دا دێت و دەچێ.

حەمەد گۆرەوی‌یەکانی دەپێ کرد. گۆرەوی‌یەکان دەگەیشتنە ئەژنۆی. هەتا ئەژنۆی دنیایەك گوڵ و باڵندە خەریکی ماچ و مووچ بوون و جۆگەو جۆبار تێدەپەڕین.

حەمەد خوا خوای بوو خەجیج بەم وەزعەوە ببینێ. بۆ لای ماڵی خەجیج و ئەوان وەرێ کەوت. خەجیج لەبەر دەرکی ماڵێ راوەستابوو. کاتێك حەمەدی دی، چاوە پیاڵەیی و جوانەکانی پێکەنین. کاتێکیش ئەو گۆرەوی‌یانەی لەپێ دا دی کە بۆخۆی بۆی چنیبوون، تەواو کەیفی کرد.

حەمەد سەرێك بەوێ دا تێپەڕی و گەڕایەوە بۆ نێو دێ.

کاتێك گەیشتەوە بۆ نێو ماڵ چێشتەنگاو بوو. لەسەر بەردێك دانیشت. چاوەڕێی دەستەبراکەی بوو. پاش تاوێك دەستەبراکەی هاتە قوونەبانێ.

دایك:

"کوڕینە زۆرتان پێنەچێ... عەبدی‌خان پێبزانێ کە چوونە شار رۆژگارتان رەش دەکا."

حەمەد:

"پێنازانێ."

هاواڵەکەی ناوی مستەفا بوو... کوڕی عەلی‌یە کەچەڵ... مستەفاش ئەم ساڵ پێی نابووە تەمەنی هەژدە ساڵی.

زۆر لەوەپێش هەردووکیان لەسەر ئەوە کە شار چۆن جێیەکە، زۆریان قسە کردبوو، سەرەنجام قەول و قەراریان دانابوو کە بچن و لە نیزیکەوە بزانن شار چیە؟ شتێك دڵی ئەوانی بۆ لای شار رادەکێشا. هەر ئەو چوکووراوایە کە دورسوون بۆی باس کردبوون، ئەوانی بۆ لای شار رادەکێشا.

راست دوو ساڵ لەمەوبەر ئەم بڕیارەیان دابوو، بەڵام تا ئەمڕۆ نەیان توانیبوو جێبەجێی بکەن. یەکەم شت کە بڕیارەکەیانی ئەوەندە وەدرەنگ خستبوو، ئەوە بوو کە مستەفا لە باوکی و حەمەد لە دایکی و هەردووکیشیان لە عەبدی‌خان دەترسان.

سێ رۆژ لەمەوبەر بوو کە هەردووکیان مەسەلەکەیان لەگەڵ دایکی حەمەد باس کرد.

دایك:

"چۆن دەتانـەوێ بـچنە شـار؟... لـەم تەمەنـەدا چـۆن دەتـوانن بـچنە شـار؟... ئەگـەر عەبـدیخان پێبزانـێ چ دەکـەن؟... بـەخوا عەبـدیخان ببیـستێتەوە, هـەموومان لـە ئـاوایی دەردەکا."

حەمەد پاڕایەوە.

دایك:

"نابێ..."

ڕاستە گوتی "نا" بەڵام ئەو "نا"یە لەسەر دڵی بوو بە گرێ... هەتا قسەکەی خۆی گۆڕی:

"ئەگەر دەریشی کردین چش, ئێمەش..."

بەڵام ئەو باسەیان بە باوکی مستەفا نەگوت. لەلای ئـەو گوتیـان دەچـینە ڕاوی گـاکێوی و چەند شەوێك لە چیا دەمێنینەوە.

زۆر لەمێژ بوو ئەوانـە دەچـوونە ڕاوەکێـوی. حەمـەد لـە تـەواوی ئاواییـدا بـۆ ڕاوە کێـوی لینگەی نەبوو. ئەنگێوەیەك بوو دەرزیت بۆ داکردبا, هـەڵی دەگـرت. ئەگـەر عەلییـە کەچـەڵ ئەوانی بەو سەرو سیمایەو بەو وەزعەوە دیتبایە, دەسبەجێ دەیزانی کە مەسەلەی ڕاوەکێوی لە گۆڕێ دا نیە. مستەفا ئەو تفەنگەی کە بۆ ڕاوی هەڵگرتبوو, دایە دەستی حەمەد.

ئەو شەوە تا بەیانی قسە نەما نەیکەن و خەیاڵ پڵاو نەما تێکی نەکەنـەوە. ئـەو شـەوە بـە هیچ جۆر خەو نەچووە چاویان.

پێش دنیارووناك بوون, هێشتا دۆست و دوژمن لێك نەدەکرانەوە کە وەڕێ کـەوتن. وا تونـد دەڕۆیشتن دەتگوت غار دەدەن. لەلای خوارەوەڕا شنەبایەکی نەرم و فێنك هەڵی کردبوو.

هەتا خۆر کەوت, نە قسەیان کردو نە ماندوویان حەساندەوە:

حەمەد لە نیزیك "ئیشێل توویڕاك" ڕاوەستاو پشوویەکی دا:

"لە پاش ئێرە دەبێ بگەینە "ساری بوغا"و دوای ئەویش دەگەینە گوندی "ئاشان", ئەگەر لەوێش تێپەڕین دەگەینە "دێکیرلی"... شار لەولای دێکیرلییە..."

مستەفا:

"لەولای دێکیرلی!..."

وەڕێ کەوتن. دیسان دەتگوت ڕادەکەن. تاوێك ڕادەوەستان, تەماشایەکی یەکتریان دەکـردو پێدەکەنین و دیسان وەڕێ دەکەوتنەوە.

یەك تەكان هەتا گوندی "سلیمانلی" ڕۆیشتن و لە پردە دارینەكەی پەنای گۆڕستانی ئەوێ پەڕینەوە. كاتێك گەیشتنە "توروونلار" نیوەڕۆ بوو.

هەوا زۆر خۆش بوو, هەنار تازە گوڵی دابوو. خاك ئاوی بوو. لەسەر هەردی دانیشتن. لەولای دارهەنارەكەوە پیرەپیاوێكی سەرو سنگ رووت و ماندوو و شارەق كردووی كەڵەگەت دەركەوت. تووكی تێك هاڵاوی سنگی سپی بوو. سپییایەكەشی تێك هاڵاو بوو. كۆڵەكەی دانایە سەر زەوی:

"ماندوو نەبن كوڕینە."

دەنگی مامە پیرە گڕو وەك كوتك قورس بوو. هەر كە دانیشت بوخچەیەكی لە كۆڵەكەی دەرهێناو كردیەوە. بوخچەكەی چەند نانی تەندوورو پیوازێكی گەورەو كلۆیەك پەنیری تێدا بوو.

پیرەپیاو بەر لەوەی دەست بە خواردن بكا, خولقی كردن:

"فەرموون لاوەكان."

حەمەد:

"نۆشی گیانت بێ."

مستەفا:

"نۆشی گیانت بێ."

پیرەپیاو:

"فەرموون پاروەوە نانێك بخۆین."

حەمەد:

"نۆشی گیانت بێ."

مستەفا:

"نۆشی گیانت بێ."

پیرەپیاو زۆری كێشە كرد.

حەمەد:

"ئێمە دەچینە شار, لەوێ دەخۆین."

مستەفا:

"ئێمە دەچینە شار, لەوێ دەخۆین."

پیرەپیاو:

"باشه, ئەگەر وابێ هیچ. "پاشان زەردەیەکی کردو لەسەری رۆیشت:
"بەڵێ, نانی شاری تامێکی دیکەی هەیە... بەڵام جارێ زۆرتان ماوە بۆ شار."
حەمەد:
"ئێمە لە شاری دەخۆین."
مستەفا:
"ئێمە لە شاری دەخۆین."
ئەو چۆمەی لە تەنیشتیانەوە بوو, بە کەف پرژاندن و غوڕەم بەسەر بەردەکان دا تێدەپەڕی و دەڕۆیشت.
پیرەپیاو هەروا کە پارووی لە دەم دا بوو گوتی:
""دەبێ راست ملی ئەو چۆمە بگرن و برۆن. ئەم چۆمە راستەڕێ دەڕوا هەتا دەگاتە شار."
حەمەد:
"چما تۆ لەگەڵ ئێمە نایەی؟."
پیرەپیاو:
"بۆچی کوڕم... منیش دەچمە شار, بەڵام بە پێی ئێوە دەرناچم."
حەمەد هیچی نەگوت.
پیرەپیاو نیوڕۆژەکەی تەواو کرد. بوخچەکەی توند بەستەوەو گرێی دا. پاشان هەستا چووە سەر چۆمەکە تینگی پێوەناو تێر ئاوی خواردەوە. ئەمجار هەستایەوە, بە پشتە دەستی زارو سمێڵی سڕینەوەو هات دانیشت, قوتووە سیغارە زەلامەکەی دەرهێناو لێکی کردەوە. سیغارێکی هێندەی قامکی خۆی ئەستووری هەڵپێچاو دەستی کرد بە لێدانی ئەستێو بەرد, هەتا سەرەنجام پووشووەکەی هەڵ کرد. پووشووەکە بۆنێکی خۆشی لێ بەرز بووەوە. پاش ئەوەی سیغارەکەی داگیرساند پاڵی وە دار هەنارێك داو پرسی:
"کوڕینە, نەتان گوت خەلکی کوێن؟."
حەمەد:
"خەلکی ئاسیاب چەشمە."
مستەفا:
"خەلکی ئاسیاب چەشمە."
پیرەپیاو:

"تێگەیشتم، تێگەیشتم... لە دێی ئەو ریش بزنە خوانەناسەوە... دەڵێن عەبدی ریش بزنیش بۆتە خان و بە جۆرێك دەماری لادێییەکان دەردێنێ، هەر مەپرسە! دەڵێن لادێییەکان وەك کۆیلە دەخاتە ژێر بارو بێ پرسی ئەو، کەس ناتوانێ قاملك لە ناوێ رۆبکا... دەڵێن هەتا عەبدیخان رازی نەبێ، کەس ناوێرێ ژن بێنێ و کەس ناوێرێ لاق لە دێی بترازێنێ... بیستوومە دەڵێن عەبدیخان خەڵکی لەبن داران دا دەکوژێو هەموو ساڵێش لە ئاسیاب چەشمە چەند کەس لە برسان زەلیل دەبن... دەڵێن پادشای پێنج دێیەو کەس ناوێرێ قسە لە قسەی بکا... دنیایەکی سەیرە... عەبدی ریش بزنیش بووەتە خان! هم..."

پیرەپیاو بەخۆی نەبوو، هەر پێدەکەنی و دووپاتی دەکردەوە:

"دنیایەکی سەیرە... عەبدی ریش بزنیش بووەتە خان! هم..."

پاشان پێکەنینەکەی بریەوەو پرسی:

"ئەو قسانەی بیستوومن، راستن؟."

کورەکان سەیرێکی یەکتریان کرد. هەر ئەو بریسکەیەی وەك نووکە دەرزی سەرلەنوێ هاتەوەو لە چاوەکانی حەمەد دا دەرکەوت.

پیرەپیاو کاتێك دیتی کورەکان داماون و هیچ نالێن، گوتی:

"ئەو دەویت بابە کە پێی دەڵێن عەبدی، ئەو دایك حیزە کە بووەتە شێرو لە گیانی لادێییەکان بەر بووە، لە کەروێشکیش ترسەنۆکترە... ئەو، ژنە، ژن... پیاو نیە... حەیف کە مەمانان بە بەرمانەوە نەماوە، حەیف... ئەگەر زوو دەمزانی چ بێشەرەفێکە، مشوورم دەخوارد... بەڵام ئیدی مەمانان بە بەرمانەوە نەماوە... ئا...وا... عەبدیخان!..."

پیرەپیاو دووبارە دەستی کرد بە پێکەنین:

"عەبدی ریش بزن بووەتە خان و ئیددیعای پادشایەتیی پێنج دێ دەکا!... خوێنی لادێییەکان دەمژێ! تف، تف، تف... تف، حەیف کە زوو تێنەگەیشتم چ حەرامزادەیەکی عەبدی... ئەگەر زوو دەمزانی، ئەودەم دەتزانی چیت بەسەر دێنم."

حەمەدو مستەفا پاڵیان وێك دابوو، بە جۆرێك تەماشای مامەپیرەیان دەکرد کە وا بزانە باوەڕ بە قسەکانی ناکەن. لەخۆوە زەردەخەنەیەك هاتە سەر لێوی مستەفا کە پیرەپیاوەکەش هەستی پێکرد.

پیرەپیاو:

"ئێوە رەعیەتی عەبدی خانن؟... هەی زەمانە... ئەو رۆژانە رۆیشتن کە خۆی دەخستە بەر پێیانم!."

پاش ئەم قسەیە، مستەفا بە ئاشکرا پێی پێکەنی. حەمەدیش نقورچێکی لە کەلەکەی مستەفا کوتا، واتە "ئاگات لە خۆت بێ!"

پیرەپیاو ئەمەشی هەست پێکرد:

"بڵێن بزانم، تا ئێستا ناوی "ئەحمەدەزلە"تان بیستوە یان نا؟."

حەمەد:

"بەڵێ، ناومان بیستوە."

پیرەپیاو بە قەڵسی رووی کردە مستەفا:

"لەگەڵ تۆمە!... بیستوتە یان نا؟."

مستەفا:

"دیارە بیستوومە... چما کەس هەیە ناوی ئەحمەدەزلەی بەر گوێ نەکەوتبێ..."

پیرەپیاو:

"رۆژێکیان کە عەبدی بە "سیرینگیچ" دا تێدەپەڕی، کەوتبووە داوی دوو کەس لە یاغیەکان... یاغییەکان عەبدییان رووت کردبوو و ژنەکەشییان بردبوو. ئەو خەبەرە بە من گەیشتەوە. عەبدی خۆشی هات و خۆی لەبەر پێیانم هاویشت. من چووم ژنەکەیم وەرگرتەوەو هێنامەوەو وێم دایەوە، خۆزگە ئەودەم زانیبام چ جانەوەرێکی لێدەردەچێ... ئەگەر ئەودەم دەمزانی کە دەبێتە دوژمنی گیانی فەقیرو هەژاران!..."

ئەحمەدە زلە لەو کوێستانانەدا ئەفسانەیەك بوو. دایکان منداڵەکانیان بە ناوی ئەحمەدەزلە ژێر دەکردەوە. ئەحمەدەزلە، هەروەك ترسی دەخستە دڵانەوە، ئارامی و خۆشەویستییشی دەدانێ، ئەو توانیبووی ئەم دوو هەستە لە پەنای یەکتر لەو کێوانەدا بە زیندوویی رابگرێ. هەر یاغییەك نەتوانێ ئەو ترس و خۆشەویستییە لە پەنای یەکتر لە دڵان دا دروست بکا، ناتوانێ لە ساڵێك زیاتر لە کێوەکان دا بژی. شتێکی ژیانی یاغییەکان دەپارێزێ، ترس و خۆشەویستییە. خۆشەویستی بە تەنیا زەبوونییەو ترسی بە تەنیاش رق و قینە.

ماوەی شازدە ساڵی رەبەق ئەحمەدە زلە لووتیشی لە خوێن نەهاتبوو. ئەحمەدەزلە لە ماوەی شازدە ساڵ یاغییەتیی خۆی دا، تەنیا نەفەرێکی کوشتبوو، ئەویش پیاوێك بوو کە وەختێك ئەحمەدەزلە سەرباز ببوو، بە زۆر دەستی بۆ دایکی درێژ کردبوو... ئەحمەدەزلە کاتێك لە سەربازی گەڕابووەوەو ئەم خەبەرەی بیستبوو، کابرای کوشتبوو و رووی لە کێوان کردبوو. ئەو کابرایەش ناوی حوسێن خان بوو.

ئەحمەدە زلە چەتە نەبوو. لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەودا هیچ یاغییەکیش نەی دەوێرا چەتەیی بکا. ئەو یەکێك لە دەوڵەمەندە قورسەکانی چوکووراوای دەست نیشان دەکرد. لە پاشان بە یەکێك لە تفەنگچییەکانی دا وەڵامی بۆ دەنارد کە ئەوەندەی بۆ بنێرێ.

ئەو کەسەی دەستخەتی ئەوی پێ دەگەیشت، دەسبەجێ ئەو پوولەی داوای کردبوو، بێکەم و زیاد بۆی دەنارد. بە درێژایی چەندین ساڵ یاغییەتیی خۆی هەرچەند پوولێك لە هەرکەسی ویستبوو، لێی وەرگرتبوو.

یاغییەکانی دیکە دەوڵەمەندەکانیان ئازار دەدا، دەیان کوشتن، بەڵام زۆر وابوو هیچیان دەست نەدەکەوت و ئەمانە ناچار بوون رەوەیەك ژاندارمە بە دوواوە بگەڕێنەوە جێی خۆیان.

ئەحمەدە زلە ئەو پوولەی وەری دەگرت خەساری نەدەکرد. ئاخر، لە کێوی پوولّ بە کەلکی چی دەهات؟... ئەو بەو پوولە بۆ ئەو نەخۆشانەی لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆی دا بوون، دەواو دەرمانی دەکڕی، بۆ ئەوانەی گاجووتیان نەبوو، گاجووت و بۆ ئەوانەی ئازووخەیان نەبوو، ئازووخەی دەکڕی و بۆی دەناردن.

کاتێك بەخشراو هاتەوە ئاوایی، لادێییەکان لە دوورو نیزیکەوە چەندین رۆژەرێ هاتن بۆ سەردانی.

ئەحمەدەزلە دوای بەخشرانی، گەڕایەوە ماڵێ خۆی و بێجگە لە مەزراو سەبیلەکەی خۆی کاری بە کەس نەبوو. تەنانەت مێروولەیەکیشی ئازار نەدەدا، بەڵام هەروەخت یەکێك زوڵم و زۆرو ناهەقیی لێدەکرا، لە دین دەردەچوو و بە داخ و خەفەتەوە یادی رۆژانی رابردووی دەکردەوە. پاشانیش، وەك ئەوەی بەخۆدا بشکێتەوە، بێدەنگ دەبوو و پێکەنینی بە خەفەت خواردنی خۆی دەهات...

ئەحمەدە زلە لە دێی خۆیان دا لەبیر خەڵك چووبووەوە. کەس بە بیریشی دا نەدەهات کە ئەحمەدەزلە ماوە یان مردوە. ئەو بۆ خەڵکی دێهاتی خۆیان ببووە شتێکی ئاسایی. ئەو پیرە پیاوە ریش سپییە بۆ خەڵکی دێهاتی خۆیان ئیتر ئەو ئەحمەدەزلەیە نەبوو کە چەندین ساڵ ناوچەی تووروووس ببووە مەڵبەندی شەڕناخێویی ئەو.

ئەگەر یاغییەك لە کێوان ناوبانگی دەردەکرد، دەیان گوت:"یەکێکە وەك ئەحمەدەزلە..."

پیرەپیاو رووی کردە مستەفا:

"شتێکت لەبارەی ئەحمەدەزلەوە بیستوە؟... دەزانی چ جۆرە پیاوێك بوو؟..."

مستەفا:

"بـابم دەیگـوت هـەتا ئـەمڕۆ پیـاوی وەك ئەحمەدەزلـە لـە نێـو یاغیـیـەکان دا لـەم وڵاتـە هەڵنەکەوتوە... دەیگوت ئەحمەدەزلە بابی فەقیرو هەژاران بوو."

پیرەپیاو:

"بۆی باس نەکردی کە بەژن و باڵای چ جۆر بوو, سەرو سیمای چۆن بوو؟"

مستەفا:

"بابم دەیگوت ئەحمەدەزلە پیاوێك بوو وەك کێو... کەڵەگەت و زبرو رەشتاڵەو سمێڵ زل... بابم دیتبوی... دەیگوت ئەحمەدەزلە خاڵێکی رەش و زەلامی لە نێو چاوانێ دا هـەبوو... لـە چاوانی دا هەمیشە بریسکەیەك دیار بوو. بە تفەنگ دەرزیی هەڵدەگرت... بەڵێ... دەیگوت بە تفەنگ پووڵە رەشکەی هەڵدەگرت... بابم ئەحمەدەزلەی دیتبوو."

پیرەپیاو بە دەنگێکی تەوساوییەوە پرسی:

"کێ بوو کە ژنی عەبدی خوانەناسی لە یاغییەکان ئەستاندەوەو وێی دایەوە؟"

مستەفا:

"دەتەوێ کێ بێ؟... چما خۆت نەت گوت کە تۆ بووی؟..."

پیرەپیاو بە داخێکەوە سەری راوەشاند:

"ئەمن نەبووم, ئەمن!..."

حەمەد جوان تەماشای سەروچاوی مامەپیرەی کرد. خاڵێکی زەلام و سەوز راست لە نێـوان هەردوو برۆی دا هەبوو. خاڵەکە رەش نەبوو, سەوز بوو... لەوە بەدوا حەمەد چاوی لـە چـاوی مامەپیرە نەگوێزتەوە.

مستەفا بە تەوسەوە گوتی:

"چما بۆخۆت نەتگوت کە ئەتۆ ژنێ عەبدیت لە یاغییەکان ئەستاندەوە؟..."

پیرەپیاو:

"نا, نا... ئەمن نیم... ئەو مردوە."

لە پاش ئەم قسەیەش لەسەر زەوی راکشاو کۆڵەکەی وە بن سەری دا.

مستەفا نقورچێکی لە حەمەد کوتا:

"یاڵڵا با برۆین."

حەمـەد هیـچی نـەگوت. چـاوەکانی هـەروا لـە سەروچـاوی مـامـەپیرەوە بریبـوون. کاتێـك ویستیان وەرێ کەون, پیرەپیاو چاوەکانی هەڵێنا:

"باشە، خەریکن دەڕۆن؟."
حەمەد بە ئۆگرییەوە جوابی دایەوە:
"بەهیوای خوا."
مستەفا:
"بە هیوای خوا."
پیرەپیاو:
"بڕۆن، بەخێرچن... خواتان لەگەڵ."
پاشان سەری لەسەر کۆڵەکەی هەڵبڕی و تەماشایەکی کردن و دوای ئەوەی وەڕێ کەوتن، سەرلەنوێ سەری وەسەر کۆڵەکەی کردەوەو چاوی لەسەر یەك دانان.
ئاو بە جۆشوخرۆش تێدەپەڕی. حەمەدو مستەفا هەتا کاجستانەکانی وشترمل قسەیەکیان نەکرد. نێوچاوانی حەمەد وەك ژەهرەمار تاڵ بوو. هێندێ جار لە خۆشحاڵییان دڵی دەهاتە جۆش. بەڵام دیسان وەك خۆی لێدەهاتەوە. وا تاڵ دەبوو دەتگوت هەورێکی رەش و بارانییە...
حەمەد چەند جار بە دزییەوە سەیری مستەفای کرد. مستەفا سەرسوڕماو دیار بوو. پاش ئەوەی لە تەپۆلکەیەك وەسەر کەوتن، حەمەد لەسەر بەردێك دانیشت. ماندوو بوو، لە نەکاو پێکەنی. مستەفا دەرفەتێکی دەست کەوتبوو کە قسە بکا:
"بەچی پێدەکەنی؟."
حەمەد هەروا پێدەکەنی.
مستەفا:
"بەچی پێدەکەنی؟."
حەمەد خۆی گرتەوە:
"بە خوای خۆی بوو... ئەحمەدەزلە بوو. دڵم خەبەر دەدا کە خۆی بوو."
مستەفا:
"ئەرێ!."
حەمەد:
"ئەرێ نیە... خۆی نەبێ کەسی دیکە نەبوو."
مستەفا:
"چی خۆی بوو؟... هیچ فەرقی لەگەڵ خەڵکی دیکە نەبوو... زۆریش وەك باپیرم دەچوو... ئەو پیرەپیاوە کوێی وەك ئەحمەدەزلە دەچوو؟."

حەمەد:

"چما خاڵەکەی نێوچاوانیت نەدی؟... ڕاست لە نێوان هەردوو برۆیانی دا بوو."

مستەفا:

"نا , نەمدی."

حەمەد:

"ئەمن دیتم. ڕاست لە نێوان برۆیانی دا خاڵێکی سەوزو زەلام هەبوو."

مستەفا:

"ئەمن نەمدی."

"چاوەکانی وەك ئەستێرە دەدرەوشان."

"ئەمن نەمدی."

"پێم وایە ئەحمەدەزلە خۆی بوو... جگە لە ئەحمەدەزلە هیچ کەس نەبوو."

مستەفا:

"ئەگەر ئەحمەدەزلە ئاوا بێ, دنیا پڕە لە ئەحمەدەزلە."

حەمەد:

"چاوەکانی وەك بڵێسە بریسکەیان دەدا. چەند ڕوخسارێکی جوانی هەبوو... خۆزگە باوکت دەیدی..."

وەختێك بە قسەکردن گەیشتنە خوار تەپۆلکەکە, لە نەکاو گەیشتنە بەستێك. سووچێکی ئەو بەستە پڕ بوو لە سپیدار. بە نێو سپیدارەکان دا چۆمێك بە قووڕت و پێچ تێدەپەڕی. بە درێژایی بەستەکە ئەم چۆمە بە قوورت و پێچە لەبەر هەتاو بریسکەی دەهات. یەکەم جار بوو دەیان دی چۆمێك بەو درێژی و قوورت و پێچە بە نێو بەستێك دا تێدەپەڕێ و بریسکەی دێ.

حەمەد:

"نیزیك بووینەوە."

مستەفا:

"بە چ دەزانی؟."

حەمەد:

"دەڵێن چۆمەکانی چوکووراوا بە قوڕت و پێچن. پێم وایە ئەم چۆمە "چۆمی ساوور"ە, ئەم سپیدارانەش دەبێ هی "ئاشەدێ" بن, هی ئاوایی "کادیرلی"... ئاخر مام دورمووش وای نەگوت؟."

راوێژی زاری حەمەد نەختێك توند بوو. مستەفا وای زانی حەمەد توورە بووە. حەمەد وا زوو توورە نەدەبوو, بەڵام ئەگەر توورە بووایە باسی سەر بوو... بۆیە مستەفا ویستی دڵی حەمەد بێنێتەوە جێ:

"بەڵێ, راستە... ئێرە دەبێ چوکووراوا بێ, ئێرە ئەو جۆرەیە کە مام دورمووش باسی دەکرد, باشت لەبیر ماوە."

گەیشتنە "شاباپلی". چۆمی شاباپلی هەستابوو و رێیەك کە بە دەم چۆمی دا تێدەپەڕی وەبن ئاوێ کەوتبوو. بۆیە ناچار بوون بە پێخواسی بەوێ دا تێپەڕن.

لە خوارەوەی شاباپلی, واتە لە نیزیك ماڵەکەی ئەمرۆی "مستەفا بولات", خاك دوو رەنگە, لە جێیەك سوورەو لە جێیەك سپی. ئێرەش دڕووەڵانە.

کاتێك لە دڕووەڵان تێپەڕین, یەکەمین خانووەکانی شار وەدەر کەوتن. بانی ئەو خانووانە قامیش بوو. پاش ئەوان, خانووبەرەیەکی گەورە بوو کە بانەکەی سواڵەت بوو. پاشان شار بە شیروانیی بریسکەدارو خانووی سپیکاری کراو و بانی سووری سواڵەتەوە وەك شارێکی یاری پان ببووەوە.

حەمەدو مستەفا چاویان لە شار بوو. لەبەر سەرسووڕمان چاویان پێ دەرپەڕیبوون...

خانووەکان چەند سپی بوون! ... چەند زۆر بوون! ... نەیان دەتوانی چاو لە شار هەڵگوێزن.

پاش ئەوەی لە "بوکورلووردە" تێپەڕین گەیشتنە شار. شووشەکان لەبەر تیشکی هەتاو بریسکەیان دەدا... هەزاران شووشە لە هەر لایەکەوە... چەندین کۆشکی بلووڕین... راست ئەو جۆرە کە دورسوون باسی کردبوو, دەتگوت شاری شای پەریان و کۆشکەکانیەتی.

پێش ئەوەی بگەنە شار چەپ و راستیان گۆڕستان بوو. بەردی گلکۆکان لەبەر کۆنی, رەش ببوون و لێواری لای شیمالیان خەنەتیلکەی هێنابوو. لەنێو ئەم گۆڕستانەش دار تووێکی پیر هەبوو کە لکەکانی گەڵایان پێوە نەمابوو, و لایەکیشی بە تەواوی وشك ببوو. یەکەم جار بوو کە گۆڕستانێکی وا گەورەیان دەدی.

هەتا گەیشتنە بازاڕی شار, هەر لە فکری ئەم گۆڕستانەدا بوون. گۆڕستان سام و ترسێکی لە دڵیان دا دروست کردبوو. کاتێك گەیشتنە یەکەم دوکان گۆڕستانیان لەبیر چووەوە. یەکەم دوکان دوکانێکی چکۆڵە بوو بە بانێکی شیروانیییەوە. دوکاندار لەسەر مێزێکی درێژ ریزێکی دەفرو ئامانی چینی دانابوو, هەموویان پڕ لە ئاونەباتی رەنگاوڕەنگ بوون. لە پێش ئەو مێزەش تەنەکە نەوت و سندووقی شەکرو خوێ و هەنجیرو کشمیش ریز کرابوون.

ماوەیەك بە جووت راوەستان و تەماشای دوکانەکەیان کرد. ئەم دوکانە هیچ وەك دوکانی عەبدیخان نەدەچوو.

به تەماشا کردنەوە گەیشتنە نیوەڕاستی بازاڕ. ئێستا هەتاو بەرەو ئاسۆ شۆڕ ببووەوە. لە پێش دوکانێکی پارچە فرۆشی راوەستان. ئەم دوکانە پڕ بوو لە چیتی رەنگاوڕەنگ و گوڵدار، لەچك و پارچەی كەواو پانتۆڵ... و بە پێشی دوکانەکەشەوە کڵاو و پارچەی ئەتڵەسیان هەڵاوەسیبوو... پارچەی ئەتڵەس لەم سەر هەتا ئەوسەری دوکان... لەنێو دوکانەکەش پیاوێکی زگ زل و خەپەتۆڵە خەریکی وێزینگ دان بوو.

لەسەر پیادەڕۆیەك کە بەردەچۆمی تێگیرابوون، راوەستان. بەردی پیادەڕۆیەکە پۆل پۆل هەلکەندرابوون. حەمەد لە دڵی خۆی دا گوتی:"خاکی خواشیان تەنیوە."

دارە تووی پیرو خوارو خێچ لە لای راستی بازاڕەکە لە تەنیشت یەکتر ریز ببوون و لك و پۆپیان تێك ئاڵقابوو. لەبن ئەو دارانەش ئالبەندەکان دەزگایان دانابوو. بۆنێکی بێگانەیان بەبەر هەڵڵا هات. بۆنی تیژی سابوون... بۆنی خوێ و پارچەی تازەو دەقاق...

حەمەد دەستی مستەفای گرت و بردیە بن دارە توویەك. چۆلەکە لەسەر دارتووەکە جریوەیان دەهات و جیکەجیکیان بازاڕی پڕ کردبوو.

حەمەد:

"مستەفا، خەریکە شەو دادێ، ئەتۆ دەڵێی چ بکەین؟."

مستەفا لە پڕ وەخۆ هاتەوەو خۆی کۆکردەوە:

"دەڵێی چ بکەین؟."

ئەوەی گوت و چاوی لە چاوی حەمەدەوە بڕی. وەك ئەوە دەچوو کە مستەفا خەوی دیتبێ:

"مام دورمووش دەیگوت وەختێك لادێیی دەچنە شار، شەوێ لە کاروانسەرا دەخەون، وانیە؟."

"بۆچی... کاروانسەرا لە هەموو جێیەك باشترە."

"کاروانسەرای چۆن وەبینین؟."

"ئەرێ چۆنی وەبینین؟."

دوکانەکان بە تەقەو شەقە دادەخران. ئەو تەقەو شەقەیە ئەوانی گێژ دەکردو خەون و خەیاڵی لێ‌تێك دەدان. دەستی یەکتریان گرت و وەڕێ کەوتن. دوو پیاوی پیر بە کنیان دا تێپەڕین. لە روویان نەهات لێیان بپرسن کاروانسەرا لە کوێیە؟ پاشان لە پێش دوکانێك راوەستان. خۆر ئاوا ببوو. دوکاندارەکە پێی وابوو ئەمانە کڕیارن:

"فەرموون کاکینە..."

وەختێك دیتیان دوکاندار ئەوان بە "کاکینە" بانگ دەکا، بەخۆدا شکانەوە. لە پێش دوکانەکە لاچوون، هەرچەند بەلای خۆوە دەیان ویست رێگای کاروانسەرا بپرسن.

هێندەی نەمابوو هەموو دوکانەکان داخرێن, ئەوان هێشتا لەم سەرەوە دەچوونە ئەو سەرو دەگەڕانەوە. نەیان دەتوانی پێ لە جەرگی خۆیان بنێن و لەو خەڵکە نەناسیاو و سەیرە پرسیار بکەن. هەروا ڕاوەستابوون و فکری خەراپیان دەکردنەوە, لەپڕ حەمەد خۆشحاڵ بوو. پیاوێك کە چاکەتێکی دەست چنی کێوپارەی لەبەردا بوو, بە تیژی بە کنیان دا تێپەڕی. حەمەد هەموو شتێکی لەبیر چووەوەو دوای کەوت:

"کاکە, کاکە... تۆزێك ڕاوەستە."

کابرا ڕاوەستاو لە کاتێك دا سەری لە پەلەقاژەی حەمەد سوڕمابوو, بە تەوسێکەوە گوتی:

"چیە؟."

حەمەد:

"ئێمە ناشارەزاین."

"باشە, چیتان دەوێ؟."

حەمەد بە شەرمێکەوە پرسی:

"کاروانسەرا لە کوێیە؟."

پیاوەکە گەڕایەوەو گوتی:

"بە دوای من دا وەرن." و بە کۆڵانێك دا بای دایەوە.

کابرا زۆر توند دەڕۆیشت. حەمەد بیری لەو ڕۆیشتنەی کابرا دەکردەوە. ئەو جۆرە ڕۆیشتنە تایبەتی خەڵکی شاخی بوو. لادێییە کێوپارە نشینەکان وەختی ڕێڕۆیشتن لاقیان هەتا ئاستی ئەژنۆیان لە زەوی بڵیند دەکەن, بەڵام بە پارێزو ترسەوە دایدەنێنەوە. ئەوان وایان خوو پێ گرتوە. لە کاتێك دا خەڵکی دێهاتی دەشتایی ڕاست بە پێچەوانە لە ڕێ ڕۆیشتن دا لاقیان خەریکە ڕە زەوی بخشێ.

کاروانسەرا خانووبەرەیەکی کۆن و ڕزیو بوو, بە دەروازەیەکی گەورەی دارینەوە. دەروازە دارینەکەی کاروانسەرا جێ جێ خۆرکە لێی دابوو و کون کون بوو.

کابرا:

"کاروانسەرا ئێرەیە."

ئەم قسەیەی کردو هەر بەو ڕۆیشتنی کوێستانیانەی خۆی ڕۆیشت و دوور کەوتەوە.

حەمەد:

"دەبێ بچین کاروانسەرادار بدۆزینەوە."

مستەفا:

"دەبێ بیدۆزینەوە."

چوونە ژووریٚ. کاروانسەرا پڕ بوو لە ئەسپ و بارگین و ئێستر و داشقە. پەینیش دەگەیشتە ئەژنۆیەك... بۆنی پەینی تەڕ گەرووی بنیادەمی دەسووتاند. لەبەر بۆنی توند دڵیان پێك دا هات. لە نێوەڕاستی حەساریٚ دا فانۆسێك بە دارێکی درێژەوە هەڵاوەسرابوو. شووشە فانۆسەکە بە چەند جیٚ دووکەڵ گرتبووی و ڕەش ببوو.

حەمەد:

"بڕوانە ئەو فانۆسە!"

مستەفا:

"چەند زەلامە!"

لە حەساری کاروانسەرا پیاوێکی ریوەڵەی کورتە باڵا, خێرا خێرا دەهات و دەچوو. لە گۆشەیەکیش دە پازدە کەس کە بە کەوای درێژو بێیەخەیان ڕا دیار بوو خەڵکی "ماراش"ن, بە دەنگی بەرز وتووێژو کێشەیان بوو. یەکیان قەڵس ببوو, جنێوی بە ئەرزو ئاسمان و دارو بەرد دەداو خوشك و دایك و ژن و منداڵی هەموو خانەکانی پێکەوە وەبەر دەدا.

ئەو پیاوە تاوێك بێدەنگ دەبوو, پاشان لە پڕ, قسەی سووك و جنێوەکانی لەو جێیەوە کە بەجێی هێشتبوون دەست پیٚ دەکردنەوە. دەیگوت:

"ئەدی ئەو جاوانە!... (وێ دەچێ جاوەکان بنەماڵەیەکی فیئودالی بن ـ وەرگێڕ ـ).

و دووبارە جنێو و قسەی سووك... هەتا بڵێی زمان پیس بوو, پاشان دایك و خوشکی هەموو جاوەکانی تێك دەکردەوەو بێدەنگ دەبوو. دەورویەرەکەی هەر ئەوەندە قسەیەکیان لە دەم دەرهاتبا, دایك و خوشك و بابەڵباب و مردوو و زیندووی ئەوانیشی لە پەنای یەك دادەناو ئاسوودە دەبوو.

حەمەدو مستەفا بیٚ ئەوەی بە دەست خۆیان بیٚ, کێشرانە نێو ئەو کۆمەڵە. ئەوانەی کێشەو شەڕە دەندووکەیان بوو, هەر هۆشیشیان بەسەر حەمەدو مستەفاوە نەبوو. لە تەنیشت ئەو کۆمەڵە پیرەپیاوێك دانیشتبوو کە کاری بەسەر کاری ئەوانەوە نەبوو. روخسارێکی شیرین و لەبەر دڵان و منداڵانەی هەبوو. جار جاریش دیار نەبوو بیر لە چ دەکاتەوە, زەردەخەنەیەکی دەهاتیٚ.

حەمەد سووك و ئاسان و بیٚ شەرم کردن لێی نیزیك بووەوە:

"مامە... کاروانسەرادار لە کوێیە؟."

پیرەپیاو:

"چ کارێکت بەو دەویتەیە؟... فەقیرە لە حەوزەکە کەوتوە."

مستەفا:

"حەیف... بەستەزمان..."

حەمەد نقورچێکی دە مستەفا کوتا. حەمەد تێگەیشتبوو کە مامەپیرە گاڵتە دەکا.

پیرەپیاو بە پێکەنینەوە:

"ئەرێ وەڵا حەیف... بەستەزمانە راست بە سەر پشتەوە تێکەوتبوو."

مستەفا دیسان حاڵی نەبوو:

"ئەی، بەدبەختی، بێچارە."

پیرەپیاو:

"بەڵێ... زۆر حەیف بوو."

حەمەد:

"مامەگیان! سەری مەخەرە سەر... ئێمە دەمانەوێ ئەمشەو لە کاروانسەرا بخەوین. کاروانسەرادارەکە لە کوێیە؟."

مستەفا سەری سوڕ مابوو.

پیرەپیاو بە دەنگێکی بەرز ـ بە جۆرێك کە کاروانسەراداریش کە لە نێوەڕاستی حەسارێ دا دەهات و دەچوو، گوێی لێبوو ـ وەڵامی دایەوە:

"ئەو قوڕمساخەی پێی دەڵێن کاروانسەرادار، هۆوەیە... هەر دەردێکتان هەیە بچنە لای ئەو گەووادەو بە خۆی بڵێن."

کاروانسەرادار گوێی لێ بوو و پێکەنی:

"ئاها... کوڕینە... ئەگەر لە گەوواد دەگەڕێن، لە هەمووان گەووادتر هەر ئەو پیرە سەگە ریش سپیەیە کە لە بنانگوێتان راوەستاوە... پێتان وا نەبێ ئەو سەرو ریشەی لەبەر هەتاو سپی کردوە... لە گەووادی دا سپیی کردوە..."

پیرەپیاو:

"گوێت لێ بێ گەوواد باشی... ئەم لاوانە دەیانەوێ جێگایەکیان بدەیەی شەوێ لێی بخەون."

لەو نێوەدا حەمەد چووە لای کاروانسەرادارەکە.

کاروانسەرادار:

"دەتوانن هەر لە ژووری ئەم گەووادە ریش سپیەیە بخەون... بچن، بۆخۆی ژوورەکەیتان نیشان دەدا."

پیرەپیاو:

"ئەمڕ گەووادێکی گەوواد... وەرن کوڕینە... وەرن هەتا جێگاکەتان نیشان بدەم.

لەنەردیوانەکە کە لە تۆزو خۆڵ دا ون ببوو، بە ترس و لەرزەوە وەسەر کەوتن. نەردیوان لەبن پێیانیان دا قرچە قرچی بوو، دەتگوت ئێستا نا، ئێستا دەشکێ. چوونە ژوورێك کە لە تۆزو خۆڵ دا نوقم بوو. لە ژوورەکەدا دۆشەکێکی زۆر بە تەنیشت یەکەوە راخرابوون.

پیرەپیاو:

"وا دیارە یەکەم جارە هاتوونە شار؟."

حەمەد:

"بەڵێ... یەکەم جارە."

پیرەپیاو:

"هەردووکتان بیست ساڵێك دەبن... چۆنە تا ئێستا نەهاتوونە شار؟."

حەمەد، بە شەرمەوە:

"نەمان توانیوە."

پیرەپیاو:

"خەلکی چ دێیەکن؟."

حەمەد:

"خەلکی ئاسیاب چەشمە."

پیرەپیاو:

"ئاسیاب چەشمە کێوپارەیە، وا نیە؟."

"بەڵێ، کێو پارەیە."

پیرەپیاو:

"ئێوە هێشتا شێوتان نەکردوە؟."

کاتێك مامەپیرە ئەم قسەیەی کرد، حەمەدو مستەفا هەستیان بە برسیایەتی‌یەکی توند کرد.

پیرەپیاو:

"ئەمن ناوم نایب حسەنە..."

حەمەد:

"ئەمن ناوم حەمەدەو ئەوەش مستەفایە."

پیرەپیاو ئەوانی بردە دوکانێك. قوتووە تەنەکەی ژەنگ لـێدراو...، مێش و مەگەزێکی زۆر کە وەك پەڵـە هـەورێکی رەش لەسـەر قوتـووی شـیلەو کـشمیش و هـەڵوا دەنیـشتن و هەڵدەفڕینەوە، دوکانەکەیان پڕ کردبوو.

نایب حەسەن:

"بزانە ئەم پاڵەوانانە چیان دەوێ بیان دەیە... منیش نان و هەڵوا دەخۆم."

حەمەد:

"ئێمەش نان و هەڵوا دەخۆین."

لەبەر چرا فتیلەیەك کە فرتێنەی دەکرد، نـان و هەڵواکـەیانیان خـوارد. کاتێـك گەڕانـەوە کاروانسەرا، جگە لە نوێنەکانی خۆیان، هەموو نوێنەکان پڕ بـوون. هـەروا بـە جـل و بەرگـەوە چوونە نێو جێی.

ژوورەکە پڕ لە دووکـەڵی سـیغار بـوو. دووکـەڵی سـیغار لـە ژوورەکـەدا شـەپۆلی دەداو لـە پشتەوەی ئەو شەپۆلە فانۆسێکی چلکن کە شووشەکەی بە کەلاکی جرو جانەوەر خاڵ خاڵ ببوو، بە حاڵە حاڵ دیار بوو. ئەوانەی لە نوێنەکان دا راکشابوون، هەموو پێکەوە بە هەڵڵاو هەنگامە قسەیان دەکرد.

حەمەدو مستەفا خەریك بوون کەلەکەیان لەنێو جێ دا خۆش دەکردن.

نایب حەسەن:

"ئاوا؟... یەکەم جارتانە؟..."

حەمەد:

"بەڵێ." و پاشان گوتی:

"پیاو بەو دووکەڵەو بەو بۆنە دەخنکێ."

حەمەدو مستەفا لەنێو جێ دا تەخت راکشان.

نایب حەسەن:

"شار چۆن بوو؟ پێتان خۆش بوو؟."

حەمەد:

"زۆر گەورەیە... خانووەکان زۆر زەلامن، دەڵێی کۆشکن."

نایب حەسەن پێکەنی:

"جا ئەگەر ماراش ببینن دەڵێن چی؟... بازاڕێکی هەیە دەڵێی چل چرای ڕەنگاوڕەنگە... تەماشای هەر شتێك دەکەی، دەڵێی پێت پێدەکەنێ... بەڕاستی پیاو دەحەبەسێ... لایەکی بازاڕی پارچە فرۆشانە، لایەکی بازاڕی زین دروان و لایەکی بازاڕی مسگەران... هەرچی بتەوێ... ماراش هەر دەڵێی بەهەشتە... سەتی وەك ئەم شارانە دێنێ!."

حەمەد لە فکرەوە چوو:

"سەتی وەك ئەم شارانە دێنێ؟."

نایب حەسەن:

"بەڵێ... وایە... ئیشەڵڵا ڕۆژێك قیسمەت و نسیب ببێ و ئەستەمبوڵ ببینن، ئەودەم دەزانن شار بە کوێ دەڵێن."

حەمەد نێوچاوانی تێك نابوو. لە نێوەوە شتێك دڵی دەگوشی. دەبوو شتێك بزانێ. تینی بۆخۆی هێنا، لە نایب حەسەنی پرسی:

"خانی ئەم شارە کێیە؟."

نایب حەسەن تێنەگەیشت.

حەمەد:

"دەڵێم خانی ئەم شارە کێیە؟."

نایب حەسەن:

"ئەوە تۆ دەڵێی چی کوڕم... شار خانی لە کوێ بوو؟... لە شار هەرکەس خانی خۆیەتی. لێرە بە پیاوی پوڵدار دەڵێن خان و ئاغا. بەو حیسابە بێ لە شار خان زۆرە، بەڵام..."

حەمەد بە هیچ جۆر حاڵی نەبوو، پرسی:

"دەمەوێ بزانم خانی هەمووان کێیە؟ خانی ئەوانی دیکە؟... دەمەوێ بزانم ناوی چییە... خاوەنی ئەم دوکانانەو ئەو زەوییانە کێیە؟."

نایب حەسەن تێگەیشت کە حەمەد مەبەستی چییە، پرسی:

"خانی دێی ئێوە کێیە؟."

حەمەد:

"عەبدیخان."

نایب:

"هەموو زەوی‌یەکانی ئاوایی ملکی عەبدی خانن؟."

حەمەد:

"ئەدی دەتەوێ هی کێ بن؟."

نایب:

"دوکانەکان هی کێن؟."

"هی خان."

نایب:

"بزن و مەڕو گاو گۆلەکەی؟..."

"بەشی زۆریان هی ئەون..."

نایب حەسەن ریشی خۆی خوراندو لە فکران ڕاچوو. پاشان گوتی:

"گوێ بگرە حەمەد, ئێرە ئەو جۆرە خانە کە تۆ باسی دەکەی لێی نیە. زەوی‌یەکانی شار هی ئەم و ئەون... دیارە هێندێ کەسیش هەن کە زەوی‌یان نیە. هەرکام لەم دوکانانە کە تۆ دیوتن, هی کەسێکە. دیارە ئەوانەی پوولدارترن زەوی‌یەکی زۆرتریان هەیە. ئەوانەش کە پوولدار نین, لە قەدەر خۆیان زەوی‌یان هەیە, فەقیرو هەژارەکانیش بێزەوین."

حەمەد بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

"بەڕاستیتە؟."

نایب:

"درۆی بۆ چیە؟ دیارە بەڕاستیمە."

پیرەپیاو بە درێژی لەبارەی ئەو خەلکەوە کە زەوی‌یان نەبوو, لەبارەی ماراش و مەرەزەجارو مەرەزەکێلەکانیەوە, لەبارەی ئاو و خاك و کوڕە حاجی‌یەکەی ماراشەوە قسەی کرد. گوتی کە ئەو کوڕە حاجی‌یە چەندی زەوی هەیە, بە ئەندازەی دنیایەك... و چەندی پوولی هەیە, هەر بە کووپە...

حەمەد هەموو گیانی ببووە گوێ. نایب لە بیرەوەری‌یەکانی سەردەمی دیلیەتیی خۆی لە قەفقاز زۆر داستانی شیرینی دەگێڕانەوە. پاشان لەبارەی "گالیچیا", "شام", "بێرووت", "ئەدەنە", "مێرسین", "کینیاو" دەربارەی پیاوێکی گەورە بەناوی مەولانا کە لەو شارە نێژراوەو لەبارەی گلکۆکەیەوە هێندێ شتی باس کردو لەپڕ بێدەنگ بوو و لێفەکەی بەسەر خۆی هەلکێشا. هەللاو هەنگامەی ئەوانی دیکەش دامرکابوو. ئەفەرێك لە قوژبنێك خەریك بوو

سازەکەی لێدەداو بە دەنگی زبری خۆی لەبن لێوانەوە بە ئارە ئار گۆرانیەیەکی دەگوت کە بە زەحمەت دەبیسترا. دەم و چاوی درێژی ئەم پیاوە لەبەر شۆقی چرا فتیلەکە پەیتا پەیتا شکڵی دەگۆڕی، جارێك درێژترو جارێك کورت یان پان دەبوو.

حەمەد ماوەیەك بێ ئەوەی بیر لە هیچ شتێك بکاتەوە گوێی بۆ سازەکەی ئەو راگرت، هەتا ئەویش سازەکەی بە بزمارێکەوە کە لە پشت سەری لە دیوار درابوو، هەڵاوەسی و لێفەکەی بەسەر خۆی هەڵکێشا.

ئەوەی کە دەبوو بۆ حەمەد بێتە پێش، هاتبوو، و ئیدی خەوی لێ رەوی بوو. لە گژ فکران را چووبوو و فکری جۆراوجۆر یەك لە دوای یەك بە زەینی دا رادەبردن و پسانەوەیان نەبوو. دنیا لە مێشکی دا گەورەو گەورەتر دەبووەوەو هەر بیری لە گەورەیی دنیا دەکردەوە. ئاسیاب چەشمە لە پێش چاوی ببووە نوختەیەك. عەبدیخان لەبەر چاوی ببووە مێروولەیەك. رەنگە ئەمە یەکەم جاری بووبێ کە راست و دروست بیری دەکردەوە.

زۆر بە ئۆگری و تاسەوە بیری دەکردەوە. بۆ یەکەم جار لە دەرەوەی ئەو ئیمکاناتەی دەیناسی، بیری دەکردەوە. ئێستا ئیدی هەستی بە رق و قین دەکرد. خۆی لە پێش چاوان گەورەو گەورەتر دەبوو. ئەو، ئیدی خۆی بە بنیادەم دەزانی. وەختێك لە نێو نوێن دا تەنیشتاو تەنیشتی دەکرد، لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"عەبدیخان بنیادەمە ئێمەش بنیادەمین..."

لەگەڵ کازیوە مستەفا نقورچێکی لە کەلەکەی حەمەد کوتا. بەڵام حەمەد تێ نەگەیشت. لەخەودا بوو. لەوانەش بوو بەخەبەر بێ. لە فکر دا بوو، بە جۆرێك کە هەروا بزانە خەوتبوو. مستەفا لێفەکەی لەسەر لابرد.

حەمەد بێ لێفە خەوی لێنەدەکەوت. وەخەبەر هات. یان هەر بە خەبەر بوو، راست بووەوەو دانیشت. چاوەکانی ریپۆقیان کردبوو. روخساری زەرد زەرد ببوو، بەڵام خۆشحاڵیەیەك لە روخساری دا بەدی دەکرا. لە چاوانیشی دا بەختەوەریی بیرکردنەوە دەخوێندرایەوە.

پووڵی کاروانسەرایان داو رۆیشتن.

حەمەد:

"نایب حەسەن لە کوێیە؟ خواحافیزیان لێنەکرد."

مستەفا:

"ئەرێ، دەبێ خواحافیزیی لێبکەین."

لەبەردەرگا هەواڵی نایب حەسەنیان لە کاروانسەرادارە کورتەباڵایەکە پرسی. کاروانسەرادار:

"ئەو گەروادەی دەڵێن؟... ئەو دەویتە، هەر شەو بوو سندووقە وردەواڵەکەی لە کۆڵنێ ناو ڕۆیشت بۆ دێهات کە قاڵی بکاتەوە. یەك دوو ڕۆژی دیکە پەیدا دەبێتەوە، چ کارێکتان بەو گەروادەیە؟."

حەمەد:

"بریا بمان توانیبا بیبینین."

مستەفا:

"ئەرێ وەڵلا...بریا..."

گەیشتنە نێوەڕاستی بازاڕو بە سەرسوڕماوی راوەستان. بە گێژو وێژی تەماشای دەوروبەریان دەکرد. هەتاو بڵێند ببوو. قەڵەباڵغیی بازاڕ بۆ ئەوان بە تەواوی تازە بوو. لە جێ دا ئەوان باوەڕیان نەدەکرد ئەوەندە خەڵك لە جێیەك کۆببێتەوە.

حەمەد لە دڵی خۆی دا گوتی:"هەر دەڵێی مێروولەن لە زەوی هەڵدەقوڵن."

شەربەت فرۆشەکان کووپە برنجەیی‌یەکانیان بە کۆڵیان دا دابوو، پیاڵە برنجەیی‌یەکانیان لێك دەداو هاواریان دەکرد:

"شەربەت... شەربەتی شیرین... ساردو بە لەزەت... هەنگوینە شەربەت... شەربەتی شیرین بەیانم هەیە... بیخۆیەوە پەژیوانی... نەیخۆیەوە پەژیوانی... ئای شەربەت..."

هەتاو لەسەر کووپە برنجەیی‌یەکان دەدرەوشا. حەمەد چاوی لە کووپەکان نەدەگوێزتەوە. بۆ ئەوەی لە نیزیکەوە بیان بینێ، لە شەربەت فرۆشەکە نیزیك کەوتەوە:

"کاکی شەربەت فرۆش، شەربەتێکم بدەیە."

کاتێك شەربەت فرۆشەکە داهاتبووەوەو پیاڵە شەربەتەکانی تێدەکرد، حەمەد بە دەرفەتی زانی و بە ترسەوە دەستێکی بەسەر ئەو برنجە بریسکەدارە دا هێنا. شەربەت فرۆشەکە هەریەکەی پیاڵەیەکی شەربەت بۆ تێکردن. شەربەتەکە فێنك بوو، وەك سەهۆڵ و لە پیاڵەکە دا کەفی دەکرد. ئەوان تەنیا توانیان هەر یەکەی نیوەی پیاڵەکە بخۆنەوە. پێیان خۆش نەبوو.

لە سووچێك ناڵبەندێك لەسەر کۆلکەدارێکی بڵێند دانیشتبوو، ناڵی دەکوتانەوەو بە هەوای کوتك وەشاندنەکەی گۆرانی‌یەکی دەگوت. ئەو، حاجی کوورەی بەناوبانگی شار بوو. لە شار هەموو کەس، ئەوی بەو ناوە دەناسی. حاجی کوورە پاشان لە کووپە شەربەتەکە ورد بووەوە. حاجی کوورە نەخش و نیگاری لەسەر کووپەکە دەکێشاو حەمەدیش بە تۆگرییەکی تەواوەوە سەیری دەکرد.

بۆنێکی خۆشی بۆ هات. ئەمە بۆنی کەباب بوو. کاتێك گەڕانەوە دوای خۆیان دووکەڵی کەبابیان دی کە لە دوکانێکی شەق و شڕ هەڵدەستا. ئەو دووکەڵە بۆنی گۆشت و چەوری و دووگی لێدەهات. ئەو بۆنە گێژی کردن و بە دەست خۆیان نەبوو، چوونە کەبابخانەکە.

شاگرد کەبابچی چەند جار فەرمووی کردن. بەو فەرمووە فەرمووەش گێژتر بوون. دانیشتن. بازاڕی دوێنێ، شاری دوێنێ، دنیای دوێنێ و هەموو شتێکی دوێنێ ئەمڕۆ لە پێش چاوی حەمەد جۆرێکی دیکە بوو. ئەو زنجیرەی دوێنێ لە دڵ و دەست و لاقی بەسترابوو، پچڕابوو. هەستی دەکرد سەربەست و ئازادە. ئەوەندە سووك بار بوو، دەتگوت دەتوانێ بفڕێ.

بە شەرمەوەو بە رەنگ هێنان و بردنەوە کەبابەکەیان خوارد. دەتگوت هەموو موشتەرییەکان تەماشای وان دەکەن. وەختێك لە دوکانی کەبابچی هاتنەدەرێ، بە تەواوی گێژ بوون.

چەند جار ئەم سەرو ئەوسەری بازاڕ گەڕان.

حەمەد رووی کردە مستەفا:

"دەڵێن ئێرە خانی لێ نیە."

مستەفا:

"تۆ بڵێی راست بێ؟."

حەمەد:

"ئاوەدانیی بێ خان!."

چوونە دووکانێك. قەوارەی ئاوریشمیان بە تەنافێکەوە کە ئەم سەرو ئەو سەری دوکان راکشابوو، هەڵاوەسیبوون. حەمەد قەوارەیەکی ئاوریشمی زەردی هەڵبژارد. ئەمە ئاوریشمی خالیس خالیس بوو. ئاوریشمەکەی لە دەستی دا خڕ کردەوەو کردیەوە. ئاوریشم لە دەستی دا دەخزی. قەوارە ئاوریشمەکەیان کڕی و هاتنەدەرێ.

مستەفا چاوێکی لێکردو پرسی:

"بۆ خەجیجێیە؟."

حەمەد بە گاڵتەوە جوابی دایەوە:

"زۆر ئاقڵی، ئافەریم باشت زانی."

پاشان چوونە دوکانی هەڵوافرۆشەکەی دوێشەو. هەڵوایان کڕی. دوایە لە نانەواخانە نانیان کڕی. هەڵمێکی گەرم لە نانە گەرمەکە هەڵدەستا. نان و هەڵواکەیان لە دەسرەیەکەوە پێچاو گرێیان دا.

لە بازاڕ لەسەر سەکۆیەك دانیشتن. چاویان لەو پرتەقاڵانە بوو کە لە دوکانی میوەفرۆشی دا کەوتبوونە سەر یەك. هەستان, یەکی پرتەقاڵێکیان کڕی و پاکیان کرد.

لای نیوەڕۆیە بەرەو ئاسیاب چەشمە وەڕێ کەوتن. هەتاو لەسەر سەریانەوە سێبەرەکانیانی خستبووە ژێر پێیان. سێبەری هەرکامێکیان ئەڵقەیەکی خڕو بچووك بوو.

وەختێك لە شار وەدەر کەوتن, هەتا ئەو کاتە کە شاریان لێوە دیار بوو, خێرا خێرا ئاوڕیان دەدایەوەو تەماشای شاریان دەکرد. لە ئاسمانی شار دا چەند پەڵە هەوری سپی دەگەڕان. ئەو دووکەڵە سپییە کە لە دووکەڵکێشی ماڵەکان هەڵدەستا وەك ئەوە دەچوو کە بە ئاسمانەوە هەڵاوەسرابێ و سواڵەتە سوورەکانیش بە تەختی شینی ئاسمانەوە نووسابوون.

کاتێك گەیشتنەوە دێ نیوەشەو درەنگتر بوو. ئەو ئەستێرە گەشە کە هەمیشە لای بەیانییان دەردەکەوت, هەڵاتبوو و بۆ هەموو لایەك تیشکی داویشت.

مستەفا لە نیزیك ماڵی حەمەد, لێی جیا بووەوە. زۆر ماندوو بوو. ئەو لەو چوون و هاتنەوەیە وەك سەگ پەژیوان بوو. بەڵام حەمەد ڕاست بە پێچەوانەی ئەو, نوقمی خۆشحاڵی بوو. حەمەد چووە لای ماڵێ..., بەڵام لاقی بۆ لایەکی دیکەی دەکێشا. پاڵی وەدیواری ماڵێ دا. دوو دڵ بوو. نەیدەزانی بچێتەوە ماڵێ, یان بچێتە ئەو جێگایە کە بۆی رادەکێشرا. بڕیاری خۆی دا. گەڕایەوە. دوولا هاتەوەو بە بن پەرژین و تەیانەکان دا تێپەڕی. بەرامبەر بە ماڵێك ڕاوەستا. وەهەناسە بڕکە کەوتبوو. لەبەر دەرکی ئەو ماڵە دارتوویەك وەك چەتر گەڵاکانی کردبووەوە. حەمەد لەبن دارتووەکە ڕاوەستابوو. پاشان ڕۆیشت و لەتاریکایی تەیانەکەی لای چەپ دا ڕاکشا. کەم کەم ماندووی دەحەسایەوە.

تەیرێك هەیە... تەیرێکی لاق درێژو پەل باریك کە رەنگی مەیلەو سەوزە... یان رەنگی وەك دووکەڵە...نا... رەنگی وەك سەوزایی دارێك دەچێ کە لە پشت دووکەڵەوە دیار بێ... مل و دەندووکی ئەوەندە درێژن, دەڵێی هی لەشی خۆی نین... ئەم تەیرە هەمیشە لە دم چۆمان دەبینرێ. خەڵکی ئاسیاب چەشمە بەو تەیرە دەڵێن "دیولیك". (رەنگە شینەشاهۆ بێ ـ وەرگێڕ). دەڵێن ناوی ئەم تەیرە لە دەنگەکەی وەرگیراوە.

دەنگی ئەو تەیرە سەیرە, وەك دەنگی فیتوو دەچێ. دەنگی ئەو تەیرە لە ئاخرەکەی دا پچڕ پچڕ دەبێ, دووبارە پچڕ پچڕتر دووپات دەبێتەوە. شیرینیی ئەو تەیرە هەر لەو دەنگە سەیرە دایە کە هەیەتی, لە پچڕ پچڕ بوونی دەنگەکەی لە کاتی خوێندن دا. حەمەد دەیتوانی ڕاست

وەك ئەو تەیرە بخوێنێ. هەر لەو جێیەوە کە راکشابوو چەند جار لاسای ئەو تەیرەی کردەوە. دەتگوت هەر بەڕاستی دیولیکە دەخوێنێ.

حەمەد چاوی لە دەرگای ماڵەکەوە بڕیبوو، بەڵام دەرگا نەکرایەوەو وا دیار بوو نیازی کرانەوەشی نیە... نیگەران بوو... دووبارە چەند جار لاسای ئەو تەیرەی کردەوە، هەتا دوای ماوەیەك بەسپایی دەرگا کرایەوە. دڵی حەمەد دەتگوت لە قەوەزەی سینگی دا جێی نابێتەوەو دەیەوێ بفڕێ. ئەو رەشایی‌یەی لە دەرگا هاتبووە دەر بەسپایی و بێدەنگ لە حەمەد نیزیك دەکەوتەوە. رەشایی گەیشتە لای حەمەد و لە پەنای راکشا. هەردووکیان خزینە بن پەرژینەکە.

حەمەد دەستی بۆ لای ئەو درێژ کردو بەسپایی گوتی:

"خەجیج!."

خەجیج وەڵامی دایەوە.

"گیان... چاوەڕوانت بووم، حەمەد... هەر چاوم لە رێت بوو."

گەرمای لەشیان تێکەڵ دەبوو، هەناسەیان دەتگوت پشووە بایە، زیاتر پێکەوە چەسپان. سەریان لە گێژەوە دەهات.

لە تاریکایی دا قەوارە ئاوریشمەکە، بە فێنکایی سەهۆڵ، وەك ئاوێکی شل لە دەستی حەمەد ڕا رژایە دەستی خەجیج. ماوەیەك هەروا لە باوەشی یەکتر دا مانەوە. قسەیەکیان نەکرد. دەلەرزین. بۆنی گیای شلك... پیاوی گێژ دەکرد:

"ئەگەر تۆ نەبی، منیش نیم... بەبێ تۆ ژیانم بۆ چیە؟... دوو رۆژە دیار نی حەمەد... دەڵێی ئەم دنیایە بە سەر من دا وێران بووە."

حەمەد:

"منیش هەروام."

خەجیج:

"شار؟..."

حەمەد:

"راوەستە. زۆرم قسە هەیە... دنیا جۆرێکی دیکەیە... نایب حەسەنم دی... نایب حەسەن هەر جێیەك بتەوێ دیویەتی، ئەستەمبوولیشی دیوە... نازانی چۆن پیاوێکە... خەڵکی ماراشە... نەك دێهاتی ماراش، خەڵکی شاری ماراشە، هەرچی بڵێی بۆی باس کردم... هەرچی بتەوێ پێی گوتم...دەزانی نایب حەسەن چی گوت؟... گوتی دەزگیرانەکەت هەڵگرەو وەرە چوکووراوا... دەیگوت چوکووراوا داری نیە... هەمووی زەوی‌یە... زەویی

کشت و کاڵ... نایب حەسەن دەیگوت زەویم بۆ پەیدا دەکا, جووتم بۆ پەیدا دەکا... نایب حەسەن گوتی دەزگیرانەکەت هەڵگرەو هەڵێ... هەڵێ, وەرە چوکووراوا."

خەجیج:

"نایب حەسەن..."

حەمەد پەڕییە نێو قسەی خەجیج:

"نازانی چەند پیاوی چاکە... ئەگەر رابکەین, هەرچی بڵێی بۆمان دەکا"

خەجیج:

"ئەگەر رابکەین..."

حەمەد:

"خۆزگە دیتبات... ریشی درێژو سپی... وەك شیر... هەتا ئەو رۆژەی نایب حەسەن لە چوکووراوا بێ, هەرچی بڵێی هەمانە... هەرچی بتەوێ هەمانە... پێی گوتم کوڕم, دەزگیرانەکەت هەڵگرەو رابکە... گوتی راستەڕێ وەرنە چوکووراوا... منیش گوتم هەتا دە رۆژی دیکە رادەکەین و دێین."

خەجیج:

"دە رۆژی دیکە..."

حەمەد:

"لە بابم دڵسۆزترە... ریشێکی هەیە سپی سپی, دەڵێی کلووە بەفرە, هەر دەبریسکێتەوە..."

خەجیج:

"هەر سبەینێ..."

حەمەد:

"دە رۆژی دیکە..."

خەجیج:

"دەترسم."

حەمەد:

"وەختێك نایب حەسەن لە چوکووراوایە, لە هیچ شتێك مەترسە. ئەمن تەنیا پەرۆشی دایکمە, خوا دەزانێ عەبدی چ بەلایەکی بەسەر دێنێ."

"ئێستا کە نایب حەسەن لەوێیە, دایکیشت حەتمەن دێ."

حەمەد:

"سبەینێ خۆی لەبەر پێیان داوێم, لەبەری دەپارێمەوە. دەڵێم هەتا نایب حەسەنمان هەیە, نابێ لە هیچ بترسی... بەڵکوو رازیشی بکەم..."

خەجیج:

"ئەمن دەترسم... لە عەبدی دەترسم. خوشکەزاکەی شەو و رۆژ لەماڵی ئێمە دایە... هەمیشە لەگەڵ دایکم سرت و خورتیەتی... دوێنێ نا پێرێ..."

حەمەد:

"دە رۆژی دیکە... رۆژی یازدەهەم... تۆ و من و دایکم... شەوێك... بە بیابانان دا... دەگەینە چوکوورراوا... دەڵێم نایب حەسەن, ئێمە هاتین... لە سەیران وشك دەبێ... زۆریش خۆشحاڵ دەبێ..."

"حەتمەن خۆشحاڵ دەبێ... ئەمن دەترسم."

ماوەیەکی زۆر قسەیان نەکرد, تەنیا دەنگی هەناسەیان دەهات. سیسرە دەیان خوێند.

"ئەمن دەترسم."

حەمەد:

"نایب حەسەن زۆری پێ خۆش دەبێ, لە دایکم دەترسم."

حەمەد سەرەگێژەیەکی گرتبوو, چۆن؟ دنیا بە دەوری دا دەسوورا... شتێك وەك پریشکێکی زەرد کە لە خۆرەتاو جیا بووبێتەوەو بسوورێ و پریشکان باوێ, لە سەری دا دەگەڕاو دەگەڕا:

"رۆژی دەهەم تەواو بێ, رۆژی یازدەهەم... لێرە بڕۆ..."

خەجیج کچی وەسمانە. وەسمان پیاوێکی لەسەرەخۆو ئارامە کە کاری بە کاری کەس نیە.

بەڵام دایکی خەجیج... دایکی بەڵایەکە, هەر مەپرسە... لە نێو دێ دا لە هەر جێیەك هەرایەك ساز بێ, لە هەر جێیەك دەمەقاڵەیەك هەبێ, دایکی خەجیج لەوێیە. کەڵەگەت و بەخۆوەیە. هەموو کارەکانی حەمەد و خەجیج سەردەمی منداڵیان پێکەوە گوزەراندبوو. پێکەوە گەورە ببوون. لە نێو کورۆکەکانی ئاوایی دا, حەمەد باشترین ماڵە بووکەڵەی دروست دەکردن و خەجیجیش لە هەموو کچۆڵەکان باشتری ماڵە بووکەڵە دەڕازاندەوە. ئەوان هەمیشە ئاواڵ یارییەکانی خۆیان بەجێ دەهێشت و بۆخۆیان دەچوونە سووچێکی دیکە. چەندین جۆر یارییان دادێنا, هەر جۆرە یارییەك بتەوێ...

نێو ماڵ بە تاقی تەنیا دەکا، تەنانەت جووت و گاش ئەو دەیکا.

خەجیج کاتێك تەمەنی بوو بە پازدە ساڵە، هەموو رۆژێ دەچووە ماڵێ حەمەدو ئەوان و لە دایکی حەمەد ڕا فێری گۆرەوی چنین دەبوو. دایکی حەمەدیش باشترین کرو جوانترین ئەخشی فێری ئەو دەکردو جارو باریش دەستێکی بە مووەکانی دا دێناو دەیگوت:

"ئیشەڵڵا دەبی بە بووکی خۆم."

لە ئاواییش دا لەگەڵ هەموو کەس باسی خەجیجێی دەکرد. هەر بە "بووکەکەم" ناوی دەبرد، هەتا لە شازدە ساڵی دا ئەوەی دەبوو ببێ، بوو. حەمەد بەماندوویی لە جووتی دەهاتەوە، خەجیجیش لە کێوی ڕا دەگەڕایەوە. خەجیج چووبووە کارگان. ڕەنگە مانگێك دەبوو یەکتریان نەدیبوو. ئێستا لە "ئاڵاجاکدیك" تووشی یەکتر ببوون. هەردووکیان خۆشحاڵ بوون. هەردووکیان پێدەکەنین. لەسەر بەردێك دانیشتن. دنیا خەریك بوو تاریك دادەهات. خەجیج ویستی هەڵستێ حەمەد دەستی گرت و لە پەنا خۆی داینایەوە:

"چما ئەتۆ دەزگیرانی من نی؟."

دەستی خەجیجێی لەنێو دەستی گرت:

"ئاخر ئەتۆ..."

خەجیج دەستی کرد بە پێکەنین.

حەمەد:

"دە بڵێ کچێ... ئاخر ئەتۆ دەزگیرانی من نی؟."

خەجیج دەیەویست خۆی بکێشێتە ئەولا. حەمەد بەری نەدەداو ئارەقێکی کردبوو هەر مەپرسە...

حەمەد:

"کچێ... ئاخر ئەتۆ..."

لە پاشان بە فکری دادەهات کە خەجیجێ ماچ بکا. خەجیج سوور داگیرساو بە زۆر پاڵێکی بە حەمەدەوە ناو ڕای کرد. حەمەد وەدوای کەوت و گرتی. کچەکە رام ببوو، وەك بەرخی دەستەمۆ. حەمەدیش کەمێك ئارام ببووەوە.

حەمەد:

"نیوەشەوێ دێم... دێمە بن دارەتووەکە، هەر لەوێ ڕادەکشێم و وەك دیولیك دەخوێنم. هەموو کەس وادەزانێ دیولیکە دەخوێنێ."

پاشان چەند جار وەك دیولیك خوێندی وگوتی:

"چاو، ئاوا."

خەجیج پێکەنینی هات:

"ڕاست دیولیك... هیچ کەس فەرقی پێ ناکا..."

حەمەد:

"چما ئێمە دەزگیران نین؟."

خەجیج لە نەکاو ڕەنگی پەڕی و گوتی:

"ئەگەر دیتیانین چی..."و هەڵات. لە پاش ئەو ڕۆژە هەموو شەوێ بە هەر جۆرێك بوایە، یەکتریان دەدی. ئەگەر شەوێك یەکتریان نەدیبایە هیچ کامیان خەویان لێنەدەکەوت.

چەند جار دایکی خەجیج بەسەریان دا چووبوو. خەجیج چەند جار لێدان و ئازاری بەرکەوتبوو، بەڵام بێسوود بوو. دایکی شەوانە دەست و لاقی دەبەستن، چەند دەرگای لەسەر دادەخستن... بەڵام هیچ کام لەمانە کاریگەر نەبوو. خەجیج بە هەر فێڵ و کەڵەکێك بوایە، خۆی دەگەیاندە حەمەد. چەندی گۆرەوی و دەسرۆکە بە یادگار بۆ دەچنی و بۆی دەبرد!...

خەجیج گۆرانیی دادەنا. ئەوین و ئارەزووەکانی خۆی لە ئاهەنگی گۆرانییەکانی و نەخش و نیگاری گۆرەوییەکانی دا دادەڕشت. ئەم گۆرانییانە ئێستاش لە ناوچەی توورووس دەگوترێن. هەرکەس گۆرەوییەکانی دەسکری ئەوی دەدی، دەلەرزی. گۆرانییەکانیشی ئێستاش کە ئێستایە قامیێژو گوێگرەکانیان دەلەرزێنن، لە دەروونیان دا شتێك سەوز دەبێ و خونچە دەردەکا.

کاتێك حەمەد گەیشتەوە ماڵێ بەری بەیانی بوو. نەیدەزانی شەو چ وەختەو چۆن هاتوەتەوە ماڵێ. ئەستێرەگەشەکەی بەرەبەیانی ڕەنگی کاڵ ببووەوە، ئاسۆ ڕوون ببوو، خەریك بوو شەبەق دەنگوت.

حەمەد چەند جار بانگی دایکی کرد:

"دایە، دایە..."

دایکی بەخەبەر بوو... هەر لە فکری کوڕەکەیدا بوو... هەستاو دەرگای کردەوە. کوڕەکەی لە ئامێزێ گرت و دەستی دە ملی کرد:

"شەوێ هەموو شەوێ بەڕێوە بوون؟."

"بەڵێ، بەڕێوە بووین."

هەرکە چوونە ژووری، حەمەد خۆی لە جێی ڕا کرد. زۆری خەو دەهات. تیشکێکی زەرد لە مێشکی دا پرێشکی داویشت. بڵێسەی ڕەنگ زەرد لە مێشکی دا دەگەڕان. وێ دەچوو هیوا بێ، وێش دەچوو خەفەت بێ. خەفەت گەرمە، خەفەت وەك خۆشەویستە... وەك خۆش ویستنەو گەرمایەکەی مرۆڤی تێك هەڵدەگلێنێ. بریسکە زەردەکانی کوڕە برنجەیی‌یەکە لە مێشك و دڵی حەمەد دا دەگەڕان و کاریان کردبووە سەر مێشکی ئێسکانی. لەولای ئەو بریسکەو تیشکانەشەوە سواڵەتە سوورەکانی شار بە تەختی شینایی ئاسمانەوە چەسپابوون... تیشکە زەردەکانی برنجە لەگەڵ دووکەڵی شین و خەستی کەباب تێکەڵ دەبوون... دەنگی ناڵ کوتانەوەی حاجی کوورە... پیادەڕێ سپی و سپی کراوەکان بەردی ڕەنگاوڕەنگی چۆمەکانیان تێ‌گیرابوو، و لە چەشنی بلوور دەبریسکانەوە...

دایك لە ژوور سەری کوڕەکەی دانیشتبوو و دەی پرسی:

"رۆڵە شار چۆن بوو؟."

حەمەد هەتا دەهات دەم بکاتەوەو جواب بداتەوە، سەری قورس دەبوو و دەکەوتەوە سەر سەرین و ئەو گۆرانی‌یانە کە حاجی کوورە وەختی ناڵ کوتانەوە بە نارەنار دەیگوتن، لە گوێی دا دەزرینگانەوە، لە پاش ئەوە خانووەکانی شار بە سواڵەتە سوورەکانیانەوە جێگای دەنگی حاجی کوورەیان دەگرتەوە. لە نێوان خەو و بێداری دا زەردەخەنەی دەهاتێ. وەبیری دەهاتەوە کە سبەو دووێکی رادەکەن. نایب حەسەن قەرار بوو هەتا دە رۆژی دیکە لە سەفەری دێهات بگەڕێتەوە. نیگەران دەبوو. لە پاشان وەبیری دەهاتەوە کە هەتا دە رۆژی دیکە هەر ئەوەندە بتوانن خۆیان خڕ کەنەوە. ئیدی نیگەرانی‌یەکەی تەواو دەبوو.

نایب حەسەن منداڵی نەبوون. قسەخۆش و دەم بە پێکەنین بوو. ریشی سپی بوو. ریشە سپی‌یەکەی دەتگوت هی خۆی نیەو وەریگرتوە... نایب حەسەن قەرار بوو جێگاو جووت و کاریان بۆ پەیدا بکا... زۆری بڕوا بە نایب حەسەن هەبوو. لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"هەموو دنیا بست بە بست گەڕاوە." خۆ شاریش خانی نیە. دەیان توانی هەرسێکیان کار بکەن. هەم خۆی، هەم دایکی و هەم خەجیج... بەرهەمی کارەکەیان هەرچی بێ هی خۆیان دەبێ. ئێستا کە نایب حەسەن بەڵێنی داوە، حەتمەن هەموو کارەکان جێ‌بەجێ دەبن. بیستبووی کە خاکی چوکووراوا زۆر بەرێژەوە، بەڵێ ئەمەی بیستبو، بەڵام لە بیری نەبوو لەکێی بیستوە. فکر دەکاتەوە...، خۆشحاڵ دەبێ... ئەوەندە خۆشحاڵ دەبێ کە دڵی هەڵی ناگرێ. خاکی چوکووراوا دڕووەڵان نیە. خاکی چوکووراوا چەقڵەشینکەی لێ‌نارێ. نیازی هەبوو پاش ئەوەی

لە چوکووراوا جێگیر بوو، ڕۆژێك سەرلەنوێ بێتەوە ئاوایی خۆیان و بۆ ئاومالـەکانی بـاس بکـا کـە چـوکووراوا چ جـۆرە جێیەکـە... لـە پاشـان دووبـارە دەگەڕایـەوە چـوکووراوا، هـەموو دێهاتی‌یەکانیش بە دوای دا... عەبدی بە تەنیا دەمایەوە. تاق و تـەنیا... نـە دەزانـێ تـۆوی بچێنێ، نە دەزانێ دروێنە بکا...و بۆخۆی لە برسان دەمرد.

دایکی دووبارە پرسی:

"شار چۆن جێیەك بوو، کوڕم؟."

ئەو پێی وابوو جوابی دایکی دەداتەوە، بـەڵام هـەر فکـری دەکـردەوە. لـە شـار، لـە دوکانی تەڕەفرۆشی پیاوێکی دیتبوو. ئەو پیاوە کڵاو گەرگەڕی‌یەکی سپیی هەبوو، تەڕو تەمیز... شەڵواری فەرەنگیشی لەپێ دا بوو. ئەو پیاوە خەریك بوو پرتـەقاڵی دەکـری. حەمەد جوان تەماشای قامکەکانیی کردبوو. قامکەکانی سپی و درێژ بوون و پووڵی زۆر خێرا دەژمارد. سکە پووڵـەکان لـە نێـو قـامکی دا دەخـزین... چ جـۆرە سـکەیەك... بریسکەدار وەك زێو...

دایك بانگی کوڕەکەی کرد:

"خەریکی دەنووی رۆڵەم؟."

نووستبوو یان نـا؟... تیـشکی برنجـە خـەو و خـەیاڵی لـێ‌تێك دابـوو. دەتگـوت هـەتاوی چوکووراوا لەسەر سەری هەڵاتوە. دەتگـوت بـە ملیـۆن پریـشك کـە لـە شـتەکانی بەرهـەتاوی چوکووراوا هەڵدەستن، بۆ نێو مێشکی ئەو لووزەویان بەستوە...

کاتێك وەخەبەر هات هەتاو تەواو بڵیند ببوو. دایکی لە ژوور سەری دانیشتبوو و تەماشای دەکرد. دیار نەبوو بۆچی لە دیتنی دایکی بەخۆدا شکایەوەو سەر لەنوێ لێفەکەی بەسەر خـۆی هەڵکێشا. بە منداڵی کاتێك بە دەماغ دەبوو، زۆر جار وای دەکرد.

دایکی بە پێکەنینەوە لێفەکەی لەسەر وەلادا:

"هەستە کوڕە زەلام، ئەوەنیوەڕۆیە، هەستە بڵێ بزانم شار چۆن جێیەك بوو"

حەمەد چاوی هەڵێنان و کەمێکی هەڵگلۆفین. دەرێ هێنـدە رووناك بـوو کـە چـاوی لەبـەر هەڵنەدەهات. حەمەد سەیرێکی هەتاوی کردو دەسبەجێ رووی وەرگێڕا. هەتاو هـەموو خـەو و خەیاڵێکی لـێ تێك دابوو.

بەماندوویی و شەکەتی لە جێـی هاتـەدەر. زۆر کفـت و شـەکەت بـوو. بـەڵام بـەو حاڵـەش رووناکایی‌یەك کە دیار نەبوو لە کوێ ڕا دێ، دڵی ئەوی روون دەکردەوە. بۆخۆشی نەیـدەزانی چ

شتێکه خەم و خەفەت لە دڵی ئەو دەتارێنێ؟ خۆشحاڵییەك کە هەستی پێ دەکرد، هەر لەو ڕووناکاییەوە بوو کە لە دڵی دا هەڵدەبوو. ئەم ڕووناکاییە چ بوو؟

حەمەد لە پەنای دایکی دانیشتبوو، باسی شاری بۆ دەکرد. دایکی چەند جاری دیکەش هێندێ شتی لەبارەی شارەوە لە باوکی حەمەدو کەسانی دیکە بیستبوو. بەڵام هیچ کامێکیان وەك حەمەدیان باش بۆ نەگێرابۆوە. وەختێك گەیشتە باسی ئەو تیشکە زەردە کە دەبریسکایەوە، وا نەشە ببوو کە وشەکان وەك ئاو لەدەمی هەڵدەرژان...

حەمەد زۆر بە ئیشتیاوە باسی شارو هەرچی لە شار دیتبووی بۆ دایکی گێڕایەوە، بەڵام وەختێك نۆرەی گێڕانەوەی مەسەلەکە هات، تفی خۆی قووت دایەوەو نەیتوانی قسە بکا.

دایکی شارەزای ئەخلاقی حەمەد بوو. تێگەیشت کە حەمەد شتێکی لێدەشارێتەوە. دەستێکی بەسەری کوڕەکەی دا هێناو لە چاوەکانیەوە ڕاما. دیار بوو کە کوڕەکەی دەیەوێ شتێك بدرکێنێ، بەڵام ناتوانێ.

حەمەد چاوی لە چاوی دایکی وەرگێڕا. دایکی لە دڵی خۆی دا گوتی:"حەمەن دەیەوێ شتێك بدرکێنێ، بەڵام ناتوانێ.". حەمەد وا دیار بوو تاقەتی بزووتن و قسەکردنی نیە. دایکی بیری کردەوە کە :"ناتوانێ بیڵێ، بەو ئاسانییە ناتوانێ بە زمانی دا بێ."

دایك:

"دەتەوێ چ بڵێی حەمەد، بۆ دەیشاریەوە؟."

حەمەد بەو پرسیارە تێك چوو، ڕەنگی بزڕکا.

دایك:

"مەیشارەوە ڕۆڵەم، قسەکەت بکە."

حەمەد سەری داخست و گوتی:

"ئەمن دوێنێ لەگەڵ خەجیج قسەم کرد. قەرارمان داناوە هەڵی گرم."

دایك:

"حەمەد چتە، شێت بووی؟."

حەمەد:

"ئەگەر ئەتۆ نەیەی، حەمەن عەبدیخان ناڕەحەتت دەکا. ئەتۆش لەگەڵمان وەرە. دەچینە چوکووراواو لە شاری دەحاوێینەوە."

دایکی بە توندی جوابی دایەوە:

"چما شێت بووی؟... ماڵ و گوزەرانی خۆم بۆ کێ بەجێ بێڵم و بێمە کوێ؟ ئەتۆش دەتەوێ کچی خەڵك هەڵگری, بۆ کوێی بەری؟."

حەمەد:

"ئەدی چ بکەین؟ ئەتۆ ڕێگایەکمان بۆ وەبینە."

دایك:

"ئەمن سەد جارم پێ گوتی دەست لەخەجیجێ هەڵگرە... هەزار جارم گوت لە کۆڵ خەجیجێ ببەوە. ئەتۆ دەزانی, دەیانەوێ خەجیجێ بۆ خوشکەزای عەبدیخان بخوازن... باشترە ئەتۆ ئەو خەیاڵە خاوە لەسەرت بەریە دەر."

حەمەد:

"دەستی لێهەڵناگرم. عەبدیخان هیچ, هەرکەسی دیکەش بێ دەست لە خەجیجێ هەڵناگرم. عەبدیخان خۆ ئاغای دڵی ئێمە نیە. خەجیجێ هەڵدەگرم. ئەگەر خەمی تۆم نەبێ لە هیچ کەس ناترسم. دەترسم زوڵم لە تۆ بکا. تەنیا لەوەندە دەترسم... و ئەگینا خوا پشتیوان بێ..."

"ئەمن ناتوانم ماڵ و حاڵ و ژیان و ئاوەدانیی خۆم بەجێ بهێڵم و ملی بیابانێ بگرم. ئەتۆ ئەگەر دەتەوێ خەجیجێ هەڵگری و بڕۆی, بۆخۆت دەزانی, بەڵام پێت دەڵێم ئەو کارە ئاکامێکی باشی نیە. ئەتۆ تەنیای کوڕم, ناتوانی بەرامبەر بە ساحەبی پێنج دێ ڕاوەستی...دەیەوێ ئەو کچە بۆ خوشکەزاکەی بخوازێ... فکری ئاکامی ئەم کارە بکەوە ڕۆڵەم, دەس لە خەجیجێ هەڵگرە... کچ بۆ تۆ قاتی نین..."

حەمەد تووڕە بوو. کەم هەڵکەوتبوو حەمەد قسە لە قسەی دایکی بکا:

"خەجیج نەبێ هیچ کچێکم ناوێ... ئەگەر دنیا پڕ بێ لە کچ, ئەمن هەر خەجیجم دەوێ."

دوو ڕۆژی دیکە دەنگۆ داکەوت کە خوشکەزای عەبدیخان, لەدێیەکەی دیکەڕا خوازبێنیکەری ناردوەتە سەر خەجیج. دەڵێن عەبدیخان خۆشی لەگەڵ خوازبێنیکەرەکانە. دەیان گوت هەرچەند خەجیج دادو هاواری کردبوو دادی نەدابوو, و هەر ئەو ڕۆژە دەیانەویست خەجیجێ مارە بکەن.

خوشکەزای عەبدیخان بۆ خەجیجێ شانسێکی باش بوو. دەیان گوت ئەگەر لێی گەڕابان, ئەو کچە مێردی بە قەرەج یان دەهۆڵ کوتان دەکرد. بەڵام خەجیج هەر بە سەری خۆیدا دەداو دەگریا.

دوو ڕۆژ دواتر عەبدیخان بە دەستی خۆی ئەڵقەی دەزگیرانەتیی کردە دەستی خەجیج. لە پاش خوازبێنییان لەدێی دا هێندێ قسە دەکران. ژن و منداڵ شتێکیان دەگوت, پیرو لاو و گەورەو چووك هێندێ قسەیان دەکرد. هەموویان هێندێ شتیان دەگوت:

"حەمەد ئەو کچەی هەڵدەگرێ, نایەڵێ لە گەرووی خوشکەزای عەبدیخان بچێتە خوارێ."

"ناتوانێ, دەترسێ."

"نا... حەمەد ناترسێ."

"هەتا ئێستا هیچ کەس ترسی لە چاوی حەمەد دا نەدیوە."

"راست دەکا, کەس ناتوانێ ترس لە چاوی حەمەد دا ببینێ."

"ئەوە حەمەدە, حەمەد..."

"با حەمەد بێ. بە خوا عەبدیخان کوت کوتی دەکاو گۆشتەکەی داوێتە پێش سەگان."

"خوا نەکا خان قەڵس بێ... ئەگینا کەلاکەکەی بۆ سەگان فرێ دەدا."

"حەمەد ئەو کچەی هەڵدەگرێ, دەش بینی!".

"بۆ کوێی دەبا؟."

"بۆخۆی دەزانێ... حەتمەن فکری بۆ کردوە."

"هەر کوێ دەچێ با بچێ... بەخوا بچێتە پاش کێوی قافیش خان دەگیری دەخا."

"دەستی عەبدیخان وەك دەستی من و تۆ نیە... دەگاتە هەموو جێیەك... فکرت لەکوێیە, حکوومەت لە پشتی خانە."

"راست دەکا... حکوومەتی لە پشتە. حاکمی لە پشتە, دەسەڵاتی حکوومەتی لەپشتە... ناتوانێ لە چنگی دەرچێ."

"بەخوا بەزەییم بەحەمەد دادێ."

"بەڵێ, کوڕە کەچەڵەیەك لەسەد فرسەق دوورتر ڕا هاتوەو دەیەوێ ئەو کچەی لە چنگی حەمەد دەربێنێ."

"حەیف حەمەد."

"ئەمن دوێنێ دیتم."

"فەقیرە حەمەد."

"لە پشتەبانێ خۆیان دیتم. رەنگی بە رووانەوە نەمابوو. روخساری وەك بەهێی زەرد وابوو, کەمێکیش سەوزی دەنواند."

"ئەمن لە چاوانی ترسام... چاوەکانی ئیدی ئەو چاوی جاران نین."

"ئەو کچە فەقیرە... لەو رۆژەوە کەخوازبێنی کراوە, لە ماڵێ نەچووەتەدەر."

"دەڵێن رۆژ تا ئێوارێ لە قوژبنێکی تاریك دانیشتوە."

"دادەنیشێ و لە گژ فکران ڕا دەچێ."

"بەوانە دەڵێن ئاشقە رووتە. یاخوا کەس گرفتاری دەردی وا نەبێ."

"حەمەد بۆخۆی نیوە شێتیشە."

"دەڵێن دایکی خەجیجێ هەموو شەوێ دەست و لاقی کچەکەی تەناف پێچ دەکا."

"دەرگاشی لەسەر دادەخا."

"دەرك لەسەر دەرك لەسەری دادەخا."

"دوونەش بەدبەخت بوو."

"دوونەش لە پاشەڕۆژی کوڕەکەی دەترسێ."

"خانیش بیستوویەتەوە."

"فەقیرە حەمەد."

"دەڵێن وەختێك بیستبووی خەجیجیان خواستوە, پێکەنیبوو."

"دوو چاوی خەجیج دەڵێی دوو کانیاون."

"فەقیرە حەمەد."

"خوشکەزا کەچەڵەکەی عەبدیخان هاتوە بە فیزەوە لە نێو دێ دا پیاسە دەکا."

"شاخدارە..."

"دەڵێی شوورە..."

"شوور..."

"ئەی بەستەزمان حەمەد."

"زوڵم! ..."

"حەمەد لە خەفەتان وەزگ نەدا, باشە..."

"کچەکە لە پێش حەمەدی دا وەزگ دەدا."

"یاخوا ئەوەی ئەم دووانەی لێك کرد, خوا کوێری کا."

"بەسپایی قسان بکەن."

"یاخوا چی چاکیان نەیەتە ڕێ..."

"خوا چاکیان بۆ نەکا..."

"یاخوا سەبەبکار بە کۆی زوخاڵ بێ."

"یاخوا تووشی دەردی بێدەرمان بن."

"بەسپایی قسان بکەن."

"یاخوا چەقلەشینکەیان لە چاوان دا شین بێ."

"پێنج دێی هەیە چاوی پڕ نابێ."

"دەتوانێ دنیا بە پوولّ بکڕێ. بەلاّم دلّ شتێکی دیکەیە... دلّ بە پوولّ ناکڕێ..."

"فەقیرە حەمەد."

"راوەستن بزانن حەمەد چ بەلاّیەك بەسەر عەبدیخان دێنێ..."

"خۆزگە بیکوشتایە."

"هەرکەس ئەو ناپیاوەی بکوژێ دەستی شین دەبن."

"حەمەد هێشتا منداڵە."

"فەقیرە حەمەد."

"منداڵە, بەلاّم..."

"دەزانی ساڵێ چەند سەر بزنە کێوی دەکوژێ؟."

"ئەگەر پیاوی بیان ژمێرە!."

"هیچ وەخت گوللەی بە خەسار ناچێ... بەخوا دەرزییە سپیلکەی بۆ داکەی, یەکەو تفەنگ هەڵی دەگرێ."

"ئیشەڵلاّ تفەنگێکیش لە چاوی عەبدی دەدا."

"بەسپایی قسان بکەن, بەسپایی."

"ئەگەر چەکی وەدەست کەوێ, هاوار بۆ عەبدی."

"حەیف ئەحمەدەزلە لە چیای نەماوە."

"ئەگەر مابایە دەهات کچەکەی لێیدەستاندەوە, دەستی کچەی دەگرت و دەیدایە دەستی حەمەد..."

"ئەگەر حەمەد چەکی دەبوو... بەخوا بەزەیی بە عەبدی دا نەدەهاتەوە."

"خۆزگە بیبایە."

"ئەگەر لادێییەکان ئەو رۆژە ببینن, چل شەو و چل رۆژ شایی دەگێڕن."

"دەڵێن ئەوەی دوو دلّداران لێك بکا, قەت چاکەی نایەتە رێ."

"ئەگەر حەمەدیش نەتوانێ تۆڵەی خۆی بستێنێ, خوا لە هەقی بەندەی خۆی خۆش نابێ."

"ئەرێ, خوا خۆش نابێ..."

"بەسپایی، بەسپایی."

"لە کوێی ئەحمەدەزلە؟... وەختی ئەوەیە پەیدا بی... وەختی ئەوەیە خۆت نیشان بدەی..."

"دەڵێن ئەحمەدەزلە لە داغستان خەریکی جووت و گایە. ئیدی ئەویش بووەتە ژن... لە ژنانیش ترسەنۆکتر بووە."

"دەڵێن حەمەد چووەتە شار..."

"دەڵێن خەریکە لە شاری جێ و ڕێ بۆخۆی پەیدا دەکا."

"خۆزگە بەڵایەك بەسەر ئەو خوشکەزا کەچەڵەی عەبدیخان هاتبایە."

"خۆزگە بریسکە لە سەری دابایە."

"یاخوا سەر دڵی خڕ بێ و کەس دەنگی لێنەبیسێ."

"حەمەدیش کچەکە هەڵگرێ و بڕوا."

"خۆزگە...، خوا بکا..."

"ئەمن خەجیجێ دەناسم. بەخوا خۆی دەکوژێ."

"ئەگەر خەجیج بمرێ، حەمەد ناژی."

"فەقیرە حەمەد."

"دوونەی بەستەزمان... بە جوان و جووری بێوەژن بوو. ئیشەڵلا خوا ئەو کوڕەی بۆ رادەگرێ."

"خوایە حەمەدی بۆ دوونەی بپارێزە."

هەموو دێیەکە قسەی دەکرد. مەسەلەی حەمەد لەسەر دڵی هەموویان ببوو بە گرێ، بەڵام کێ هیچی لە دەست دەهات؟ تەواوی ئەم قسانە دەقیقە بە دەقیقە بە گوێی عەبدیخان دەگەیشتنەوە. لە دێی دا ئەگەر شتێك رووی دابایە، دەسبەجێ بە گوێی دەگەیشتەوەو لە هەرچی دەکراو دەگوترا خەبەردار بوو.

شەوێکیان یەکێك لە پیاوەکانیی بە دوای حەمەد دا نارد... حەمەد بە خەمباری و پەرێشانی هات و دەست لەسەر سنگ لە پێش عەبدی راوەستا. عەبدی بە هەموو قەوەتی خۆی نەڕاندی:

"هەتیوە بێناموس و بێ نەمەکە... وەك سەگ لە دەرکی خۆم گەورە بووی و بوویە بنیادەم. ئێستا دەبیسم تەمات لە دەزگیرانی خوشکەزاکەم کردوە... وایە بێناموس؟."

حەمەد وەك بەرد لە جێی خۆی رەق ببوو، مووی لێنەدەبزووت. روخساری وەك دیواری سپیکراو سپی هەڵگەڕابوو. تەنیا ئەو بریسکە وەك نووکە دەرزییە هاتبوو و لە گلێنەی چاوی دا راوەستابوو.

عەبدی خان:

"باش چاو و گوێی خۆت بکەوە. ئەگەر دەتەوێ لەم دێیە دا بژی و نان بخۆی، دەبێ هەرچی دەیڵێم بیبیسی. ئەتۆ منداڵی. ئەتۆ نازانی. ئەتۆ من ناناسی حەمەد. ئەگەر بەوێ ئاورگی ماڵەکەتانتان وا بەسەر دا وێران دەکەم کە گیاشی لە جێگا سەوز نەبێ... دەزانی دەڵێم چی؟ بێغەکی نەزان؟... ئەمن ئاورگەکەتان بەسەر دا وێران دەکەم.

لە پاشان هات و توند قۆڵی حەمەدی گرت و لەسەری ڕۆیشت:

"بە من دەڵێن عەبدی. ئەمن ئەگەر بەوێ ئاورگەکەتان وا بەسەر دا، دەڕووخێنم کە گیاش لە جێگاکەی سەوز نەبێ."

حەمەد زاری نەدەکردەوە، و هەرچی حەمەدیش بێدەنگ دەبوو، عەبدی زیاتر تووڕە دەبوو:

"بێنەزانی غەك بە حەرام... کەس ناوێرێ تەما لە دەزگیرانی خوشکەزای من بکا... هەرکەس غەڵەتی وا بکا، دەڵێم لەت و کوتی بکەن و هەر کوتەی باوێژنە بەر سەگێك. ئێستا چاوی خۆت ورد بکەوە، ئیدی هەقت نیە بە دەوروبەری ئەو ماڵە دا بێی. تێگەیشتی یان نا! ... هەقت نیە ئیدی بە دەوروبەری ئەو ماڵە دا بێی."

چەند جار بە هەموو هێزی خۆی حەمەدی ڕاتلەکاند، بەڵام حەمەد دەنگی لەبەر نەدەهاتە دەر، دەتگوت بەردە... لەوانە بوو بەرد دەنگی لەبەر بێتە دەر، بەڵام حەمەد هەر بێدەنگ بوو، و ئەو بێدەنگییە عەبدیخانی دەهری دەکرد.

عەبدیخان لە نەکاو خۆی پێ ڕاگیر نەکراو بە پێلاقە وەرگەڕایە گیانی حەمەد. حەمەدیش بۆ ئەوەی نەیکوژێ، بە توندی خۆی دەخواردەوە، ددانی لە چیڕەوە دەبردن و گۆشتی شەویلاکەی لەبەر ددانی دا ورد دەبوو. لە ڕقان گۆشتی خۆی دەجوی و دەیخوارد. زاری پڕ ببوو لە خوێن و تیشکێکی زەرد لە مێشکی دا دەدرەوشا:

"لاچۆ لەپێش چاوم... قەت بۆ ئەوە نابن پیاو چاکەتان لەگەڵ بکا، بۆیە نابن پیاو گەورەتان بکاو بتان کا بە بنیادەم... بەخۆڕایی نەیان گوتوە سەگی قەڵەو کەی لاقت دەگەزێ. بڕۆ لاچۆ لەپێش چاوم."

حەمەد بە نیوە بێهۆشی لەوێ دوور کەوتەوەو تفێکی گەورەی لە عەرزی کرد. تفەکەی تەنیا مستێك خوێن بوو.

## (٨)

خانووەکان، دارەکان، تەختە بەردەکان، ئەستێرەکان، مانگ، زەوی و هەرچی لە دنیا دا هەبوو، هەمووی لە تاریکایی دا ون ببوو، هەموویان تواببوونەوە. خوناوکە بارانەیەك نم نم دەڕژایە سەر تاریکی. خوناوکە بارانەکە پشووە بایەکی نەرمیشی لەگەڵ بوو. کزەبایەکە لەوانی سارد بوو. سەگ بە نۆرە تاوە نا تاوێك لە تاریکاییدا دەوەڕین. پاشان کەڵەبابێك خوێندی، دەنگی چەند بەرز بوو. حەتمەن خاوەنی ئەو کەڵەشێرە لەبەر ئەوەی بێوەخت خوێندوویە، سەری دەبڕێ.

لە دوور، لەودیوی کێوی دەنگی زەنگوڵەیەك دەهات. دەنگی زەنگوڵەکە جار جار بێدەنگ دەبوو و سەرلەنوێ دەبیسترایەوە.

دەنگی زەنگوڵەکان کە بێدەنگ دەبوو، زۆری پێدەچوو، هەتا سەرلەنوێ دەبیسترایەوە. ئەمە نیشانەی ماندوویی ڕێبوارەکان بوو.

حەمەد لەمێژ بوو لە ژێر دارە توویەکی پیر کە لك و پۆپی وەك چەتر هەڵدرابوون درێژ ببوو و چاوەڕوان بوو. حەمەد فکری کردەوە کە... نا...، فکری نەدەکردەوە! حەمەد لە وەزعێك دا نەبوو کە بتوانێ فکر بکاتەوە. حەمەد تەنیا سەرمای بوو. حەمەد بێ ئەوەی فکر بکاتەوە، هەستی بە هێندێ شت دەکرد. نم نمەی باران دەپرژایە سەر تاریکایی. لەو کاتەوە کە باران دایدابوویە، هەمووی بە شانی حەمەد دا باریبوو. جێی وشکی ددان بوو. جار جار هەڵدەلەرزی، پاشان ئارام دەبووەوە.

لە پشتی چەپەرەکانەوە دەنگێکی هاتە بەر گوێ. گوێی هەڵخست. پشیلەیەك بەسەر چەپەرەکەدا بازی دابوو. وای بە فکر داهات کە پشیلەیەك بەسەر چەپەرەکەدا بازی داوە.

ماوەیەك بیری دایكی زەینێ ئەوی بەخۆیەوە خەریك كرد. دەتگوت بە گازی گۆشتیان لێكردوەتەوە. لەشی دەبرژایەوە. لە دڵی دا تاڵایی ژەهرەماری هەست پێكرد. دڵی دەسووتا. حەتمەن دایكیان ئازار دەدا... زۆر دوور بریسكەیەك لێی دا. قەدی تووەكە كە لە تاریكایی‌دا تەڕ ببوو، تیشك باران كرا.

بە تاریكایی دڵی حەمەد دا ڕێگایەكی رووناك تێدەپەڕی، ڕێگایەكی دوورو درێژ و رووناك.

لەم كاتەدا تەواوی ئاوەدانی بە ئەسپ و ئێسترو بزن و مەڕو گاو مریشك و پشیلەو سەگەكانیەوە لە خەو دا بوون.

خەو وەك پەردەیەكی ئەستوور بەسەر دوژمنایەتی و رق و قین و خۆشەویستی و ترس و نیگەرانی و پیاوەتی و ناپیاوییەكان دا كشابوو. لەو كاتەدا خەونەكان پێكەوە لە كێشەو بەرە دا بوون. لەو كاتەدا تەنیا خەونەكان دەژیان...

دیەنی پێش چاوی بنیادەم هەرچەندی بەرتەسك بێ، مەودای خەیاڵی بەربەرینە. تەنانەت ئەو كەسەش كە پێی لە ئاسیاب چەشمە نەترازاوە، دەتوانێ خەیاڵێكی زۆر بەربەرینی هەبێ، بەرادەیەك كە لە ئەستێرانیش تێ بپەڕێ. ئەگەر هیچ جێیەكیشی دەست نەكەوێ، دەتوانێ هەتا پشت كێوی قاف بڕوا. ئەگەر ئەوەش نەبێ، لەو خەونەدا كە دەیبینێ لە دنیایەكی دیكەو خۆشتر دا دەژی. لەو كاتەدا خەونەكان لە ملكی خەودا گاڵەیان دەكرد. لەو كاتەدا لەم گوندە هەژارە، لەم ئاسیاب چەشمە زۆرلێكراوەدا، ئەوانەی لە خەودا بوون، لە دنیایەكی دیكەدا دەژیان.

حەمەدیش خەونی دەدی. هەم دەترسا و هەم خەونی دەدی. لە نەكاو بریسكەیەك لە مێشكی دا جوولا. خۆرەتاوی بەربڵاوی چوكوورا وا لە مێشكی دا بڵاو بووەوە، گەورە بوو، پان بووەوەو درەوشا. وەختێك لافاوی ئەو رووناكاییە كە بە دڵی دا تێدەپەڕی، نیشتەوە، حەمەد لە فكرەوە چوو. ترسا:

"ئەگەر نەیە چی! ... ئەگەر نەهات چ بكەم؟..."

هەزار جۆر فكری كردەوە:

"ئەگەر نەیە دەزانم دەبێ چ بكەم."

دەستی بەسەر دەستی دەمانچەكەی دا هێنا. وەختێك چەكەكەی وەبیر هاتەوە، هەرچی ترس بێ لە دڵی دا نەماو هەموو داماوییەكانی لەبیر چوونەوە.

لە فكری چەكەكەی دا بوو كە دەنگێكی نەرمی هاتە بەر گوێ. وەك هەستی پێ دەچوو. لەو شتەی تاوێك لەمەوبەر بە دڵی‌دا هاتبوو، بەخۆی دا شكایەوە. ئەو كەسەی لێی دەگەڕاو ئێستا لەسەر سەری راوەستابوو، خەجیج بوو.

بریا رۆژ بووایەو حەمەد روخساری خەجیجێی دیبایە. ئەگەر رۆژ بایە دەیدی کە روخساری خەجیج لە پێش دا زەرد بوو، دوایە کەم کەم سوور هەڵگەڕا. ئەگەر دیتبای پێی سەیر دەبوو. لەوانەبوو ئەو رەنگ گۆڕینە بە نیشانەی هێندێ شت و بە نیشانەی ترسیش دابنێ.

خەجیج:

"زۆرم مەحتەل کردی؟... دایکم نەدەنووست..."

دەستی یەکتریان گرت و بەسپایی و بە ترسەوە لەوێ دوور کەوتنەوە. ئەوەندە بەسپایی پێیان لەسەر عەرزێ دادەنا کە چووکترین دەنگی لێ نەدەهات. دەتگوت بەسەر عەرزێ دا نارۆن.

ئەگەر بڵێین هەتا لە ئاوایی وەدەرکەوتن هەناسەشیان هەڵنەکێشا، درۆمان نەکردوە.

تەنیا ئەو وەختە کە لە دێی چوونە دەر هەناسەیان هەڵکێشا و کەمێك ترسەکەیان بەسەر چوو. نەختێکیش خۆیان ئازاد هەست پێ کرد.

بوخچەکەی خەجیج بە دەست حەمەدەوە بوو. خەجیج کە پێی وابوو حەمەد ماندوو بووە، ویستی بوخچەکەی لێ وەرگرێ. بەڵام حەمەد وێی نەدا.

ئەو بارانەی تا ئێستا نم نم دەباری، هەروەك وەختێکی باشی دەست کەوتبێ، وەك گۆزەی سەرەوژێر دای دایە. لە تەنیشتیان، لە پشتەوەیان و لە بەرامبەریان بریسکەی دەداو دنیای رووناك دەکردەوە.

پاش ئەوەی بەردەڵانیان بەجێ هێشت، وەنێو دارستانی کەوتن. دارستان جار بە جار بە بریسکە وا روون دەبووەوە، وەك نوێژی نیوەڕۆیە. ئاوەچۆڕی قەدی دارەکان بە باشی دەبینرا.

خەجیج بە هەنیسك دان دەگریا.

حەمەد تووڕە بوو:

"ئێستا وەختی ئەو گریانەیە؟."

هەتا دنیا رووناك بوو بەو جۆرە لێرەواریان بڕی. نەیان دەزانی لە کوێن، بارانیش هەروا دەباری. لەهەموو هەنگاوێك دا خەجیج تووکێکی لە باران دەکرد:

"دەك وەبەر غەزەبی خوا کەوی..."

وەختێك دنیا باش رووناك بوو لانەشکەوتێکیان دیەوەو پەنایان بۆ برد.

هەردووکیان بە پێوە راوەستابوون و هەڵدەلەرزین. جلەکانیان بە لەشیانەوە چەسپابوون. کەزییەکانی خەجیج هەروا بزانە ئێستاش باران دەبارێ، ئاویان لێ دەچۆڕا.

حەمەد هەروا بەدەم لێوەلەرزەو ددان لێکدانەوە گوتی:

"ئەگەر ئەستێ و بەردەکان تەڕ نەبوونایە, دەمان توانی ئاگر بکەینەوەو خۆمان گەرم بکەینەوە."

خەجیج بە خۆشحاڵییەوە پێکەنی.

حەمەد:

"پێکەنینی ناوێ... بارانێکی وامان وێ کەوتوە کە نەك هەر لە کیسە چەرمەکە ڕەت بووە, بەڵکوو لە پێستی بەدەنیشمان تێپەڕیوە."

لە کاتێك دا دەستی دەلەرزی, هەوڵی دەدا ئەو کیسە چەرمییەی بە پشتێنەکەیەوە هەڵاوەسیوە بکاتەوە. هەموو هیوای حەمەد بەو کیسەیە بوو. بە چوار چاوان تەماشای کیسەکەی دەکرد. پاشان چاویان پێك کەوت و پێکەنین. ناو لە کیسە چەرمەکە تێنەپەڕیبوو.

حەمەد:

"دەزانی ئەو کیسەیە کێ بۆی دروست کردووم؟."

خەجیج:

"نا."

"هەر ئەو مام سلەمانە کە جاری پێشوو کە هەڵاتبووم لە ماڵی ئەوان مابوومەوە... ئەمە یادگاری مام سلەمانە."

حەمەد وەپەلەقاژە کەوت و تەماشایەکی دەورووبەری کرد:

"شتێکی وشك دەست ناکەوێ دەستانم وشك کەمەوە, دەستم تەڕن, دەترسم پووشووەکە تەڕ ببێ, ئەودەم ئیدی هەڵنابێ."

خەجیج:

"ئەرێ..., وریا بە دەستت وە پووشووەکە نەکەوێ."

حەمەد بە خۆڕانانەوە وەڵامی دایەوە:

"ئێستا بزانە دەستانم چۆن وشك دەکەمەوە."

چووە بنەوەی لا ئەشکەوتەکە. ئەوێ بارانی وێ نەکەوتبوو و وشك بوو. گڵەکەشی وشك وشك بوو. دەستی دەگڵەکە راکردو دەستی سڕینەوە. لە پاشان دەستە تۆزاوییەکانی هەڵێناو بانگی خەجیجێ کرد:

"بزانە... وشك بوونەوە یان نا؟."

خەجیج زەردەیەکی هاتێ.

حەمەد:

"خەجیج... تۆ بچۆ هێندێك چەقڵ و چاڵ خڕ بکەوە."

خەجیج لە لانەشکەوتەکە هاتەدەرێ. لە دەرێ باران دەباری. تاوێك دواتر بە باوەشێك داروچیلکەوە گەڕایەوە. دارەکان وشك بوون، بەڵام لەبەر بارانێ تەڕ ببوون. دارەکانیان ورد ورد شکاندو لە بن نوای لانەشکەوتەکە لەسەر یەکیان دانان.

حەمەد ئەستێ و بەردی دەرهێنان. بەڵام ئەگەر پووشووەکەش بیگرتایە، دیسان ئاوریان بۆ هەڵنەدەکرا، چونکە پووشوو هەر بۆخۆی دەسووتێ، ئەگینا گڕی لێنابێتەوە. کەوابوو دەبوو چ بکەن؟

حەمەد:

"تۆ هەر لێرە راوەستە، با من بچم دارکاجێك وەبینم."

نەختێك دواتر هاتەوەو چلێك دار کاجی چەوری هێنابوو.

بە خەنجەرە گەورەکەی دارەکەی لە نێوەڕاستی دا لەت کرد. بەڵام ئاگری پووشوو گڕی نیە. حەتمەن گڕێکی چکۆلە پێویستە هەتا دارە کاجەکە هەڵبێ. ئەگەر شەمچەیەکیان هەبایە... ئیدی گیروگرفتێك نەدەما...

حەمەد شەمچەشی هێنابوو، بەڵام شەمچەکە وا خووسابوو، لەبەر یەك هەڵوەشابوو.

حەمەد:

"خەجیج... دەتوانی پەڕۆ کۆنێکی وشك پەیدا بکەی؟."

خەجیج لە سەرمان شەقەشەقی ددانی دەهات:

"راوەستە بوخچەکەم بکەمەوە، بەڵکوو شتەکانی نێویەندێ تەڕ نەبووبن."

لە دەرێ باران گاڵەی دەکرد. دەتگوت ئاسمان کون بووە.

خەجیج بوخچەکەی کردەوەو هەموو جێیەکی باش گەڕا. لە نێویەندی بوخچەکەی لە نێو کراسەکانی دا دەسرۆکەیەکی وشکی دۆزیەوە. ئەو دەسرۆکەیە یەکەمین یادگاری حەمەد بوو. دەسرۆکەیەکی سووری خاڵ خاڵ بوو. ئەو جۆرە دەسرۆکەیە ژنە لادێییەکان لە سەریانی دەبەستن.

دەسرۆکەکەی نیشان دا:

"ئەم دەسرۆکەیە وشکە."

حەمەد دەسرۆکەکەی ناسییەوە:

"دەسرۆکەی گۆرینە؟."

حەمەد لە دیتنی دەسرۆکەکە خۆشحاڵ بوو.

خەجیج:

"خۆیەتی."

حەمەد نەختێك تووڕە ببوو:

"ئەگەر بزانم لە سەرمان رەق دەبەوە، دیسان دڵم نایە ئەو دەسرۆکەیە بسووتێنم."

خەجیج:

"رەنگە بتوانم لە کراسەکانم کوتێکی وشك پەیدا بکەم."

حەمەد:

"بوخچەکە بێنە."

خەجیج بوخچەکەی بۆ حەمەد برد. حەمەد بوخچەکەی تێك وەردا:

"ئەی بابە! ... لێرە سەد کوتە پەڕۆی وشکیش دەست دەکەوێ..."

خەجیج:

"جا کەوایە هەمووان بسووتێنە، با بەڕووتی وەمێنین."

حەمەد:

"بەم وەزعەوە چارەی دیکەمان نیە."

حەمەد بەری یەکێك لە کراسە وشکەکانی لێك کردەوە. ئەستێ و بەردی لێدا. پووشووەکە گرتی. پووشووەکەی لەنێو پارچەکە هاویشت و دەستی کرد بە فوو لێکردن. فووی لێکردو فووی لێکرد هەتا ماندوو بوو. پارچەکەی وەخەجیج دا.

لەو نێوەدا بریسکەیەك لە نیزیك ئەوانی دا. زەوی کەمێك لەرزی. دارەکان دەنگێکیان لێهات.

خەجیج پارچەکەی فڕێ دا. حەمەد داهاتەوەو پارچەکەی هەڵگرتەوە. گوویی پڕ کردن لە باو دەستی کرد بە فوو لێکردن. شەویلاکەی شل بوون. کاتێك گڕێکی چکۆڵە لەسەر پەڕۆیەکە پەیدا بوو، کەیفی کرد. تەڵەزمە کاجێك بە دەستەکەی دیکەیەوە بوو، لەسەر گڕەکەی راگرت. دارە چەورە کاجەکەش بە چزە چز هەڵبوو. چەند تەڵەزمە کاجی دیکەشی لەسەر گڕەکە راگرت، ئەوانیش گرتیان. ئەمجار دەستەچیلەی لەنێو ئەو چیلکەو چاڵە ڕاکرد کە لەسەر یەکیان دانابوون.

باران هەتا دەهات خۆشتر دەباری. بەری ئاسمان یەکپارچە دووکەڵێکی رەش بوو. پەیتا پەیتا بریسکەی دەداو جار جار وەعەرزیش دەکەوتن. بریسکەکان هەریەك بۆ سانیەیەکیش

بووایە، دنیایان رووناك دەكردەوەو لە پاش هەر بریسكەیەكیش دڵ و دەروونی حەمەد بە تیشكی زەردی برنجە رووناك دەبووەوە.

ئاورەكە بە باشی گرتی. حەمەد لێكدا لێكدا چیلكەو چاڵ و داروباری دەخستە سەر ئاگرەكە. هەر كە دارەكان وشك دەبوونەوە گڕیان دەگرت. بڵێسە گەورەكان زمانیان دەردەكێشاو تێكیانەوە داویشت.

حەمەدو خەجیج جلەكانیان داكەندو بەسەر بڕەدارێكیان دادان. لە پاشان بڕە دارەكەیان لە نیزیك ئاگر راگرت. خەجیج شەرمی دەكرد. نەیدەتوانی دەرپێ و ژێركراسەكەی داكەنێ.

حەمەد:

"دایان كەنە... لەسەرمان هەڵدەلەرزی..."

خەجیج بە حاڵەتێكی وەك پاڕانەوە سەیرێكی حەمەدی كرد:

"ئەمانە لەبەرم دا وشك دەبنەوە."

حەمەد بەسەری دا نەڕاند:

"لەبەرت دا وشك نابنەوە... هەتا ئەمانە لەبەرت دا وشك دەبنەوە، ئەتۆ لە سەرمان دەمری."

خەجیج كە دیتی حەمەد تووڕە بووە، دەستی كرد بە داكەندنی ژێركراسەكەی. شانەكانی خڕو گەنم رەنگ بوون. ژێر كراسەكەی كە داكەند، خێرا فڕێی دایە نیزیك ئاورەكەو هەردوو مەمكی بە هەردوو دەستی داپۆشی.

شانی دەلەرزین. ملی وەك ملی قوو بڵێند و جوان بوو. دوو لسپ لە مووی سەری بادرابوون و چووبوونەوە بناگوێی. كەزییە رەش و لوولەكانی درێژ بوون و دەگەیشتنە پشتێندی. مەمكی لە مستی و لە نێو قامكەكانی دەرپەڕیبوون. لە جێی مندارە مووی لەشی، زیپكە زیپكەی چكۆڵە دروست ببوون. پاش ئەوەی گەرمی هاتەوە، ئەو وردە زیپكانەش لەنێو چوون. لەشی ساف و لووس بووەوەو هاتەوە سەر رەنگی خۆی.

حەمەد چاوی لە خەجیجەوە بڕیبوو، تاسەیەكی دوور لە توانا سەرتاپای لەشی دەلەرزاند:

"خەجیج! ..."

خەجیج لەدەنگی بانگ كردنی حەمەد، لەو چەشنە بانگ كردنە، لەرزی، دەنگەكە شتێكی پێ دەگوت. خەجیج ماناكەی تێگەیشت.

خەجیج:

"حەمەد... ئێستا لە دێی دا قیامەتێك بەرپا بووە مەپرسە... حەتمەن هەموو جێیەك لە ئێمە دەپشكنن... دەترسم بمان بیننەوە."

ئەو ترسە لە دڵی حەمەدیش دا هەبوو, بەڵام وەسەر خۆی نەدێنا:

"لەو لێرەوارەدا ناتوانن ڕمان بیننەوە... لە خۆڕا مەترسە! ..."

خەجیج:

"ئەمن چووزانم... ئەمن دەترسم."

ماوەیەکی زۆر قسەیان نەکرد. بارانەکەش وادیار بوو کەمێك نەرم تر دەباری. ئاورەکە بەرە بەرە زیاتر ببوو, تەنانەت تەختە بەردەکانی دەوروبەریشیان گەرم بوون. گڵی دەوروبەریشیان وشك بووەوە.

خەجیج کراسەکەی کە وشك بووەوە لەبەر کردو دەرپێیەکەی داکەند. حەمەد لاقە توورت و پڕ گۆشتەکانی ئەوی دیت. ئەو تاسەیە کە ماوەیەك بوو بە جێی نەدەهێشت لە ڕادەی توانا دەرچوو. دیسان هەر بەو ڕاوێژو دەنگی پێشوو بانگی کرد:

"خەجیج!."

خەجیج:

"حەمەد دەترسم."

حەمەد لێی نیزیك بووەوە. دەستی گرت, ئەوەندە توند کە یەشاندی. خەجیج هەروا خۆی دەکێشایە دوا. حەمەد بە هەموو تینی خۆی خەجیجی لە باوەش گرت. ماچی کرد. خەجیج لە پڕ خۆی ڕاپسکاوت. حەمەد ئەوی بۆ بن لا ئەشکەوتەکە ڕاکێشا. لێوە گۆشتنەکانی خەجیج کەمێك کرابوونەوەو چاوەکانی لەسەر یەك دانابوون. دەست و لاقی خەجیج ئیدی تینیان نەمابوو. تەنیا بەسپایی‌یەوە دووپاتی دەکردەوە:

"حەمەد, دەترسم, بەرم دە."

بڵێسە ئاگرەکان بۆ لایان دەهاتن. بڵێسە ئاگر بەردەکانیان دەلستەوە. ماوەیەکی پێ چوو هەتا وەخۆ هاتنەوە.

حەمەد دەستی خەجیجێ گرت, ویستی ڕاستی کاتەوە... خەجیج نەختێك ڕاست بووەوە... پاشان دووبارە لەسەر پشتی ڕاکشا. ترسەکەی نەمابوو. هەناوی شل و لەشی ماندوو بوو. ئەمجار بۆخۆی ڕاست بووەوە. پشت و لاق و کەفەڵە تۆزاوی‌یەکانی تەکاند.

خەجیج ئیدی کچ نەبوو...

## (٩)

دایکی خەجیج بەری بەیانی وەخەبەر هات. تەماشایەکی سەر جێیەکەی خەجیجێی کرد. بن لێفەکە پڕ بوو. ئیدی خەیاڵی تەخت بوو.

پاش دنیا رووناك بوون وەختێك خەجیج وەك رۆژان لە جێی نەهاتەدەر, دایکی یەکسەر دڵی داخورپا. ترسەکەی بەجێ بوو. کاتێك لێفەکەی وەلادا, وەك بریسکە لەسەری دابێ, راتڵەکی.

خەجیج سەرینێکی بەدرێژەوە لە جێیەکەی دا دانابوو و لێفەی بەسەر هەڵکێشابوو. لەوەڕا دیار بوو کە خەجیج شەوێ رەدوو کەوتوەو ئەو فێڵەشی بۆیە کردوە کە درەنگ پێ بزانن.

لێفە بە دەست, رەق رامابوو. کاتێك مێردەکەی بانگی کرد, وەخۆی هاتەوەو لێفەکەی بەردا.

لە دێهاتی دەوروبەری توورووس داب وایە وەختێك کچێك رەدوو دەکەوێ, خاوەن کچ دەچێتە بەر دەرکی ئەو کەسانە کە ئەسپ, یان گاجووت, یان کەڵەشێریان دزراوەو دەست دەکا بە جنێودان بە هەموو ئاوایی. بە هەموو چاوچنۆکان و بە هەمووی ئەوانە کە چاویان بەرایی نادا بەختەوەریی کەسانی دیکە ببینن.

ئەو جنێودانە چەندین سەعات درێژەی دەبێ. بەڵام لادێییەکان جوابێك نادەنەوە, هەروا بزانە هیچ نەبووە. پاش ماوەیەك خاوەن کچ رقەکەی دەنیشێتەوەو ئۆقرە دەگرێ, جا ئەودەم بە لەباری لە مەسەلەکە دەکۆڵنەوەو سرت و خورت و وتوویژ دەست پێدەکا.

ژنە:

"کچەکە رۆیشتوە!... ئێستا چ بکەین؟."

مێردەکەی بە دەنگێك کە بە ئاشکرا لێی دیار بوو پێی خۆشە جوابی دایەوە:

"خوایە شوکور، خوایە شوکور... هیچ پێم خۆش نەبوو کچەکەم بە نسیب ئەو خوشکەزا کەچەڵەی عەبدیخان بێ... بەڵام چار نەبوو، بێ دەسەڵاتی پشتی شکاندبووم، خوایە شوکری تۆ تەواو ناکەم!."

ژنە:

"بەسپایی، بەسپایی... با دەنگت نەچێتە دەرێ... ئەگەر عەبدیخان ببیستێتەوە کە پێت خۆش بووە، وادەزانێ کە بۆخۆمان کچەکەمان رەدوو خستوە... بەخوا کەوڵمان دەکا."

پاشان هەروا کە باو بوو دایك لە ماڵێ دەرپەڕی و دەستی کرد بە زمانەلاڵەو لەخۆدان، بەڵام بە زۆری. نە دەیتوانی بەو جۆرە کە باو بوو سنگی خۆی بکوتێ و نە دڵیشی دەهات تووکان لە کەس بکا. هات و هاوارێکی ساز نەکردبوو، هەروا بە چەپ و راست دا دەگەڕاو زمانی بەستڕابوو، بەڵام بە درۆ:

"چت پێ کردم رۆڵە... رەبی خوا هیچی چاکت بۆ نەکا کچم... خوایە ئیفلیج و زەلیل بی وەك نابڕووی منت لە پێش چاوی دەرودراوسێیان برد... رەبی لە هەردوو چاوان کوێر بی چ کچێکی!..."

مێردەکەی بە تووڕەیی بانگی کرد:

"وەرە ژووریێ کچێ... چاکی کرد رەدوو کەوت... رەدوو ئەو کەسەی کەوتوە کە دڵی دەیەویست، ئێستا هەرچی دەبێ با ببێ... هەراو هوریا ساز مەکە، راست بچۆ ماڵی عەبدیخان و قسەکەی بۆ باس بکە، بە خۆڕاییش تووکان لە کچەکە مەکە. وەرە ژووریێ کچێ."

ژنە بە قسەی مێردەکەی کرد. چارشێوێکی رەشی بەسەر خۆی‌دا داو چووە لای عەبدیخان.

وەختێك عەبدیخان چاوی پێی کەوت:

"ئەتۆ چی و ئێرە چی خوشکێ؟... زۆر لەمێژە ئیدی سەرمان لێنادەی... وەرە دانیشە بزانم باس و خەبەر چیە؟."

ژنە دانیشت و دەستی کرد بە گریان.

وەختێك عەبدیخان چاوی بە چارشێوی رەش کەوت، بە جارێك دڵی داخورپا.

بە سەرلێشێواویەوە پرسی:

"چ بووە خوشکێ؟."

ژنە جوابی نەدەدایەوەو سەری هەڵنەدێناو هەروا دەگریا.

عەبدیخان نەڕاندی:

"بڵێ بزانم چ سندانێکتە؟..."

ژنە وەڵامی نەدایەوە.

عەبدیخان لە فکرەوە چوو:

"ناکا بووکەکەم بەڵایەکی بەسەر هاتبێ؟."

ژنە:

"خان..."

خان:

"بڵێ."

ژنە دووپاتی کردەوە:

"خان، خانی خۆم."

دووبارە بێدەنگ بوو، لەبەر هەنیسکان قسەی بۆ نەدەکرا.

خان:

"کچێ چ سندانێکتە؟... بۆ قسە ناکەی؟... بۆ پیاوی شێت دەکەی؟."

ژنە فرمێسکەکانی سڕی:

"ڕەدوو کەوتوە... شەوێ ڕەدوو کەوتوە... سەرینی لە جێیەکەی خۆی نابوو."

عەبدی خان گوڕاندی:

"ناوا، ها؟... بووکی عەبدی لێدەدا لەگەڵ ورتکە خۆرێکی بەر دەرگای دەڕواو ڕەدوو دەکەوێ... چارەنووسی عەبدی ئەوە بوو، ها؟."

پاشان گەڕایەوە پێلەقەیەکی توندی بە کەلەکەی ژنەکەدا دا:

"ئەم دێیە ئاور تێبەر دەدەم...، کارێك دەکەم بە داستان بیگێڕنەوە... هەموو ئەم دێیە ئاور تێبەردەدەم."

تاوێك ڕاوەستاو لە فکرەوە چوو. پاشان قۆڵی ژنەی گرت و داهاتەوەو بە سرتە لێی پرسی:

"هەتیوەکەی دوونە هەڵی گرتوە؟."

ژن فرمێسکی چاوی بە لکی چارشێوەکەی سڕیەوەو سەری بە نیشانەی ئەرێ ڕاوەشاند.

عەبدیخان خۆی بەسەر پێوە نەدەگرت. پیاوەکانی بانگ کرد. هەموو ئاوایی بانگ کرد. زەبرێکی گەورە لە ئابڕووی ئەو درابوو. دەبوو تۆڵەی بکاتەوە:

"ئێستا دەبینن، ئێستا نیشانی دەدەم... ئەی بێژووی پێنەزان...ئێستا دەبینن چ بەلایەکی بەسەر دێنم... دەڵێم لەت و پەتی بکەن... لەتك و پەتکەکانیشی ورد ورد بکەن..."

قسەکە لە هەموو ئاوایی گەڕا. هەموو ئاوایی دەتگوت زەماوەندی تێدایە. ژن و کچ و منداڵ و جحێڵ هەموویان لە خۆشییان هاواریان دەکرد، بەڵام دوور لە چاوی عەبدیخان... بەڵام دوور لە چاو و گوێی ئەو...

دێهاتیەکان لە پێش چاوی عەبدیخان و پیاوەکانی خۆیان زۆر خەفەتبارتر لەوانیش نیشان دەدا. دەنگیان دەرنەدەهات. بە سرت و خورت قسەیان دەکرد.

باران یەك تەکان دەباری. دێهاتیەکان لەبەر باران کۆببوونەوە، لێك هاڵابوون و قسەیان دەکرد. لەم سووچ و ئەو قوژبن دەستە دەستە کۆزیلکەیان بەستبوو. لەبەر باران هاتوچۆ لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ دەست پێ کرابوو... لەبەر باران وتووێژی بە سرتەو پچە پچ دەستی پێکردبوو... هەموویان خووسابوون، دەتگوت هەموویانت لە ئاو هەڵکێشاوە...

زۆری پێ نەچوو خەبەرەکە بە دێهاتی دەوروبەریش گەیشت و دێهاتیەکانی دەوروبەریش روویان کردە ئاسیاب چەشمەو پێش هەموویان خوشکەزاکەی عەبدیخان...

هەریەکە تفەنگە رەشکەیەکیان بە دەستەوە بوو. دەزگیران، دەتگوت ئاگری گرتوە. جنێودانەکەی، هات و هاوارەکەی دێیان پڕ کردبوو. دەیگوت:"دەکوژم، دەبڕم... راستەڕێ چووە ماڵی حەمەد.

لەو نێوەدا دوونە لە ژوورەکەی خۆی دا بە کزی دانیشتبوو. دەتگوت ئاگای لە هیچ نیە... دەزگیران هەر بەو توندییە کە تا ئەوێ هاتبوو، دابەزی و چووە ژوور. قژی دوونەی گرت و هەتا بەردەرکی عەبدیخان رای کێشا.

عەبدیخان چاوی بە دوونە کەوت. نەیتوانی پێشی رقی خۆی بگرێ. هات و دوونەی وەبن چەکمەکانی داو دەستی کرد بە پێلەقە لێدان.

دوونە متەقی لێوە نەدەهات. هەموو گیانی لە قوڕ دا ون ببوو. چاویشی لەبەر قوڕ هیچیان نەدەدی.

عەبدیخان پاش ئەوەی دوونەی بەرەڵا کرد، وەرگەڕایە خوشکەزاکەی، ئەویشی لە ژێر چەکمەکانی دا سووەوە. پاشان ئەویشی بەرەڵا کردو دەستی کرد بە پیاسەو جوینی سمێڵەکانی. دووبارە دەهاتەوە سەر دوونەو وەبەر پێلەقانی دەدایەوە. خوێنی زاری دوونە لەگەڵ قوڕ تێکەڵ دەبوو، وەك تیریژۆیەکی سوور بە سەرەوژێریدا دەهاتە خوار.

عەبدیخان هەموو گیانی ببووە پارچەیەك رق و قین. بێئەوەی قسەیەك بكا لەحەساریّ دا دەهات و دەچوو. ئیدی چاوی بە كەس هەڵنەدەهات. ئەوانی دیكەش چاویان بریبووە عەبدیخان كە هەروا لە حەساریّ دا هات و چۆی دەكرد. هەموو چاوەڕیّ بوون بزانن چ دەكا.

هەروەخت عەبدیخان دەیەویست بڕیارێك بدا, لسپێك لە مووی ریشی لە قامكی شادەی دەهاڵاندو رایدەكێشا. ئێستاش خەریك بوو ئەو كارەی دەكرد.

وەختێك گەڕایەوە نێوخەڵكەكە هەموویان متەقیان لێبڕا. هیچ كەس دەنگی لێوە نەدەهات. هەمووان تەماشای ئەویان دەكرد.

عەبدیخان ئەو لسپە مووەی لە قامكی هاڵاندبوو, بەرەڵا كردو دەستی كرد بە داهێنانی ریشی:

"گوێتان بكەنەوە. ئەوان دەبێ هەر لەم دەوروبەرانە بن. یان لە نێو بەردەڵانن یان لە نێو لێرەوار. دەبێ بەگیریان بێنین. بەڵام بەو قەڵەباڵغییە نابێ. دە كەس بەسە... كاتێك بەگیرتان هێنان, ئەگەر من لەوێ نەبووم نابێ بیان كوژن... دەبێ بیان هێننەوە لای خۆم. بۆخۆم دەبێ تەمبێیان بكەم. ئەمن دەبێ نیشانی بدەم كەسێك بووكی عەبدیخان هەڵبگرێ, سزای چیە!."

وەختێك قسەی عەبدیخان تەواو بوو, یەكێك لە لادێییەكان كە ناوی رۆستەم بوو, هاتە نێوەڕاستێ. رۆستەم كابرایەكی گرۆێ و كەچەڵ و لووت زل بوو:

"لەمن بپرسە تا پێت بڵێم خان... دوێنێ شەوێ باران نەباریبوو؟..."

چەند دێهاتی یەكدەنگ جوابیان دایەوە:

"بەڵێ باریبوو."

رۆستەم پرسی:

"چما شوێنی بنیادەم لەنێو قوڕ دا دیار نیە؟."

وەڵامیان دایەوە:

"بەڵێ, دیارە."

"چ دیار بێ و چ دیار نەبێ... لەوانەشە بە نێو بەردەڵان دا رۆیشتبن و شوێنیان دیار نەبێ... بەڵام ناكرێ زۆر دوور كەوتبنەوە... حەتمەن دەیان گرینەوە... بەڵام ئەگەر شوێنیان..."

عەبدیخان:

"سێ كەسیش بۆ لای شاری وەڕێ كەون... جارێك چووبووە شار..."

پاشان ئاوڕی دایەوە سەر ڕۆستەم:

"کێ دەتوانێ شوێنیان هەڵگرێ؟."

"عەلیەشەل دەناسی خان؟..."

چەند دەنگ پێکەوە:

"ئەگەر عەلیەشەل بیهەوێ، باران باریبێ و نەباریبێ، دەتوانێ شوێنیان هەڵگرێ... لەسەر گڵی وشك و لەسەر بەردی ڕەق... عەلیەشەل ئەگەر بیهەوێ دەتوانێ شوێنی تەیری ئاسمانیش وەبینێ!."

ڕۆستەم:

"دەتوانێ شوێنی تەیری ئاسمان وەبینێ، بەو شەرتە بە حاڵ سەری باڵی لە زەوی خشابێ... ئەگەر نەختێك سەری باڵی لەزەوی خشابێ، دەتوانێ شوێنی تەیری ئاسمان بدۆزێتەوە."

عەبدیخان دەستووری دا:

"عەلیەشەل لە هەر کوێیەکە دەسبەجێ وەیبینن."

گوتیان:

"خان، عەلیەشەل لێرەیە."

عەلیەشەل کە لاقی چەپی لە دوای خۆی ڕادەکێشا، لەنێو ئاپۆرایەکە جیا بووەوەو هاتە پێشەوە:

"خان، خەفەتی ئەو شتانە مەخۆ... هەر دڵ لە دڵ مەدە... ئەگەر حەمەدۆك پێی لە زەوی نابێ و ڕای کردبێ، بۆت دەگرمەوە. ئەگەر حەمەدۆك نەبووبێتە تەیرو بە حەوادا نەفڕیبێ، بۆت دەدۆزمەوە. خەمی ئەو شتانە مەخۆ خان."

هاوولاتەکانی عەلی پەیتا پەیتا تەعریفی عەلیان دەکرد، هەم بۆ خان و هەم بۆ ئەوانی دیکە:

"هەموو دزەکانی گوندی ئێمە عەلی دۆزیونیەوە..."

"پازدە ساڵە لە گوندی ئێمە کەس نەوێراوە دەرزییەك بدزێ..."

"خۆ شوێنی نێچیر لەسەر بەردو گابەرد نامێنێتەوە؟... بەڵام لەگەڵ عەلی بچووە ڕاو... شوێنی حەیوان لەسەر بەردی ڕەق دەدۆزێتەوەو دەیگرێ و ڕاستەڕێ دەتباتە ئەو جێگایە کە حەیوانەکە لێی دەلەوەڕێ."

"خان، ئەتۆ عەلیەشەل ناناسی."

"لەم دەوروبەرە، تۆوی سەگلاوکی بڕیوەتەوە."
"سەگلاوکیش ناتوانێ لە چنگ عەلی دەرباز بێ."
"حەمەدۆك ببێتە تەیری ئاسمانیش پەیدای دەکاتەوە."
"ئەوە دەڵێی چی!... سێ ڕۆژەڕێ بۆنی بنیادەمی دەناسێتەوە!..."

حەسۆش کە کاری بە هیچ کارێك نەبوو و خۆی لە هیچ گێرەوکێشەیەك وەرنەدەدا، لەوێ بوو. دەزانن کام حەسۆ؟ هەر ئەو حەسۆ شێلمە. حەسۆ لەمێژ ساڵ بوو عەلیی دەناسی. چەندین ساڵ پێکەوە جووت و گایان کردبوو. دەیزانی عەلیەیەشەل چ شوێن گێڕێکە. لە جێ دا لەو دەوروبەرە کێ هەبوو عەلیەیەشەل نەناسێ... عەبدیخانیش زۆری ناوی عەلی بیستبوو. ئەگەر دێهاتییەکان هێندەیان پێهەڵدەگوت، بۆیە نەبوو عەبدیخان بیناسێ، هەر بۆ ئەوە بوو تەعریفی بکەن.

حەسۆ دیتی کە عەلی بەڵێنی دا شوێنی حەمەد هەڵبگرێ. عەلیەیەشەل ئەگەر بیویستبایە، دەیتوانی حەمەد لە هەر جێیەك بێ، بەگیری بێنێ. هەر جێیەك بێ... لە هەر ڕێیەك دا بێ، لە هەر ئەشکەوت و کێوێك بێ!..."

ئەو دەیتوانی حەمەد لە هەر جێیەك بێ، وای بدۆزێتەوە، هەروا بزانە بۆخۆی شاردوویەتەوە!...

حەسۆ دەیەویست ڕێگایەك وەبینێ، عەلیەیەشەل بەرێتە قوژبنێك و چەند قسەیەکی لەگەڵ بکا. عەلیەیەشەل قسەی ئەوی لە عەرزی نەدەدا، دڵی ئەوی نەدەشکاند... لەمێژ ساڵ بوو نان و ئەکیان پێکەوە خواردبوو. عەلیەیەشەلیش هەموو گیانی ببوو بە گوێ و گوێی بۆ ئەو هەموو تەعریفە هەڵخستبوو کە لێیان دەکرد.

هەروەخت لادێییەکان تەعریفیان دەکرد، ئەویش بە خۆڕانانەوە جوابی دەدایەوە:
"بە هیوای خوا... لە بن سێبەری خان..."
ئەگەر گوتبایان:"لە دنیادا پیاوی وەك عەلیەیەشەل پیاو نیە..."
ئەگەر گوتبایان:"لە دنیادا پیاوچاکی وەك عەلیەیەشەل دەست ناکەوێ."
ئەگەر گوتبایان:"خوا پیاوی وەك عەلیەیەشەلی دروست نەکردوە..."

عەلی بە خەیاڵیشی دا نەدەهات. بە هیچ جۆر گوێی لەم قسانە نەبوو. بەڵام ئەگەر گوتبایان "شوێن هەڵگری وەك عەلی دەست ناکەوێ." ئەودەم لە خۆشییان لە کەوڵی خۆی دا نەدەگونجا.

دێهاتییەکانی دەوروبەر، هەروەخت کاریان بە عەلی دەبوو، یەك دوو ڕۆژ پێشتر، لەم لاو لەولا بە جۆرێك کە بە گوێی عەلی بگاتەوە، باسیان دەکرد: "شوێن گێڕی وەك عەلی لەدنیادا دەست ناکەوێ... عەلی لە شوێن گێڕان دا لینگەی نییە... هەموو خاکی ئەدەنە بپشکنە، داخوا لینگەی عەلی پەیدا دەکەی!... دایکی زەمانە تەنیا شوێن هەڵگرێکی بووە، ئەویش عەلییەشەلە..."

پاشان وەختێك دڵنیا دەبوون کە عەلی ئەم قسانەی بیستووەتەوە، دەچوونە لای. عەلییش بێ مەحتەل بوون وەدوای کارەکەیان دەکەوت. عەلی ئەگەر خۆشی بە کوشت دابایە، کاری ئەو کەسانەی کە تەعریفی شوێن گێڕیی ئەویان کردبوو، نەدەخستە پاش گوێ.

وەختێك کە شەلە بۆ شوێن هەڵگرتن بەرەو ماڵی خەجیج وەڕێ کەوت، حەسۆ لە پشتەوەڕا خۆی گەیاندێ:

"عەلی ڕاوەستە، دوو قسەم پێتە."

عەلی وەرگەڕا. وەختێك چاوی بە حەسۆ کەوت خۆشحاڵ بوو، و دەستیان لە ملی یەکتر کرد:

"لەکوێ بووی کاك حەسۆ... ئەوەندەم وەڕەزی کردبووی هەر مەپرسە... ئەمڕۆ دەمەویست بێمە لات. دەی، باس و خەبەر؟... ئیشەڵڵا ئەو کوڕەی وەبینم، شەوێك دێم میوانت دەبم. دیتنەوەشی کارێکی نیە... ئیشەڵڵا شوێنەکەی دەدۆزمەوە."

حەسۆ:

"بەدوا من دا وەرە عەلی، مەیەڵە کەس پێ بزانێ. لەوانەیە خان لێمان وەشك کەوێ."

عەلی بە نیگەرانییەوە کەوتە دوای حەسۆ. بارانێك کە تا ئێستا کەمێك نەرم دەباری، سەرلەنوێ بە ڕێژنە دایدایەوە.

لەبەر دەرگای ماڵی عەبدیخان، خەریك بوون ئەسپیان بۆ زین دەکرد. چما دەکرێ بە سواری شوێنی کەسێك بدۆزرێتەوە؟... بەڵام عەلییەشەل چاویشت بەستبا، دەیتوانی ئەو جۆرە شوێنانە بدۆزێتەوە.

حەسۆ لە تاریکایی پەنای ماڵێك دا ڕاوەستا. بە ناڕەحەتی و دڵ پەشاوی تەماشایەکی عەلیی کرد:

"برالە دەقیقەیەك دانیشە... دانیشە با پێت بڵێم؟ ئەتۆ چۆن دڵت دێ ئەو بەستەزمانەی بدەیە دەستی خان؟ چۆن پێت حەیف نیە؟... مەکە برالە. مەکە... ئەو

حەمەدە کوڕی برایمی ڕەحمەتییە... لەبیرتە برایم چەند پیاوی چاك بوو؟ چەندەی تۆ خۆش دەویست؟ بە خوا ئێسکەکانی لە قەبر دا دەلەرزن، مەکە... ئەمن دەزانم، ئەگەر بتەوێ، هێندەی چاو لەسەر چاو دانێی دەی‌بینییەوە، وای دەبینییەوە هەروەك بۆخۆت حەشارت دابێ. بەڵام دەزانی چ بەڵایەکی بەسەر دێنێ؟... هەر بەڵایەك بەسەر حەمەدی بێ، خەڵك بە نی تۆی دەزانن. بزانە چت پێ دەڵێم عەلی! ئەتۆ ئەمڕۆ ئەوانە بە لاڕێ دا بەرە. ئەگەر حەمەد ئەمڕۆ دەرفەتی هەبێ، ئیدی کەس ناتوانێ بیگرێ. حەمەد چەند ساڵ لەمەوبەر کە هێشتا منداڵ بوو، ڕای کردبوو، و چووبووە گوندی کەسمەو لەلای سلەمان مابووەوە. هەموو کەس دەیگوت حەمەد مردووە. نازانم شەش مانگ بوو یان ساڵێك دواتر بوو کە من دیم و خەبەری ساغی و سلامەتیی ئەوم دا بە دایکی... بەڵێ، هەموو کەس دەیگوت حەمەد مردووە. ئێستا تۆش ئەمڕۆ بە لاڕێیان دا بەرە، با ئەمڕۆ حەمەد دەرفەتی هەبێ خۆی بگەیەنێتە جێگایەك.

خوا دەزانێ لەم بارانەدا بەستەزمانانە لە چ کونێك دا خۆیان شاردوەتەوە... لەو قیامەتەدا خوا دەزانێ پەنایان بۆ کوێ بردوە. حەتمەن خەریکن لەسەرمان ڕەق دەبنەوە... ئێستا دەڵێی چی عەلی؟... دەست لەم کارە هەڵگرە."

عەلی هەروا گوێی بۆ قسەکانی ڕاگرتبوو، ڕەنگێکی هێناو برد. بەڵام چەند دەقیقە لەمەوبەر زۆر خۆشحاڵ بوو... خۆشحاڵ لەوە کە شوێنی دەگێڕا... ئەویش لەبەر چاوی خەڵکی دێیەکی تەواو. خۆشحاڵ لەوە کە هەڵاتووەکانی دەدیتەوە...

ئەو جوابی قسەکانی حەسۆی نەدەدایەوەو چاوی لە زەوییەوە بڕیبوو. هەرچی عەلییش بێدەنگ دەبوو، حەسۆ لەسەری دەڕۆیشت:

"ئەدی عەلی، ئەدی برالە... ئێستا بەستەزمانانە لێك هاڵاون و دەلەرزن... خوا دەزانێ لە ژێر چ دارێك... ئەوان ئێستا لەبەر بارانن... بارانێك کە وەك چۆمێك دەڕژێتە سەریان... ئەم چۆمەش ڕاوەستانی بۆ نیە... براکەم، کاك عەلی... ئێستا ئەو بەستەزمانانە خوا دەزانێ چۆن دەترسن. پیاو زگی پێیان دەسووتێ... ئەو بارانە بێبەزەیییەش هەتا بۆی دەکرێ دەبارێ... لانی کەم خوا بکا زگی بەوان بسووتێ‌و دەقیقەیەك ئارام بگرێ... خۆزگە دەقیقەیەك ڕاوەستابا... خوا دەزانێ ئێستا ئەگەر مەلێك بەسەریان دا بفڕێ، چەند دەترسن... مشکێك لەبەر پێیان دەربەڕێ...، چاویان بە مارمێلکەیەك بکەوێ... بەخوا زراویان دەچێ... ئێستا ئەو بەستەزمانانە هیچ حاڵیان نیە کاك عەلی. دەڵێن ئێستا نا ئێستا دەگەنە سەرمان... ئێستا نا ئێستا دەمان بیننەوە... ئەمانە ئاشقە ڕووتەن کاك عەلی...

ئەمانە یەکتریان دەوێ... پیاو نابێ کاری بە کاری ئاشقە رووتـان هـەبێ, گوناهـە... ئەمانـە دڵدارن, هەرکەس لێکیان بکا, چاکەی نایەتەڕێ... دەستی رەق دەبـن... وەك داری وشـکیان لـێدێ... دەستی ئەو کەسانە کە دڵداران لێك دەکـەن وەك داری وشـکیان لـێدێ, گوێـت لـە قسەی من بێ عەلی, هەر ئەمڕۆ ئەمانە بە لارێ دا بەرە. عەلی, ئەگـەر ئـەم ئاشـقە رووتانـە رزگار بکەی, بزانە کە هەر لە ئێستاوە قەسرێکت لە بەهەشت بۆ ئامادە کراوە... بەخوا هـەر ئێستا ئەگەر دەست لەم کارە هەڵبگری, لە بەهەشتێ دا کۆشکەکەت بۆ ئامادە دەکەن. ئێستا دەڵێی چی عـەلی؟... ئەحلەتی هەموو خەلکی ئـەم ئاوایی‌یـە بۆخـۆت دەکـرِی, یـان گـوێ بـۆ قسەی من رادەگری؟... بەڵێنم پێ دەدەی عـەلی؟."

حەسۆ چاوی بڕیە چاوی عـەلی. تەماشایەکەی مانای ئەوەبوو کە:

"ئەم کارە بە دەست تۆیە عەلی..."

بەڵام عەلی زاری نەدەکردەوە. حەسـۆ سـەرلەنوێ دەستی عـەلیی گرت:

"با پێت بڵێم عـەلی, ئەمانە لە منداڵی‌یەوە یەکتریان خۆش دەویست. کـچەکە ئەگـەر رۆژێك حەمەدی نەدیبایە, نە ئاوی بە گەروودا دەچووە خوارێ و نە خەو لە چاوی دەکەوت و کاروپیشەی دەبوو بە گریان. ئەمانە خوا کردوونیە دەزگیران عـەلی. دەبێ بزانی خـوا... پێم گوتی حەمەد چووبووە گوندی کەسەە... لەو رۆژەوە کە حەمەد رۆیشت تا رۆژێك کـە هاتەوە ئەو کچە نەخۆش کەوت و لە جێی دا خەوت. بەستەزمانە شێت ببوو... مەسـەلە ئاوایە عـەلی, مەسـەلە بەم جۆرەیە برالە, ئێستا پاشماوەکەی بەدەست تۆیـە... لـە پاشـان کچەکەیان بە زۆر بۆ خوارزا کەچەڵەکەی عەبدی‌خان خواست, ئەوانیش رێگایەکیان نـەبوو جگە لە هەڵاتن. ئێستا خۆت زانی بە کاری خۆت. تەیرێك پەنای بۆ چڵە چەقڵێك بـردوەو ئەویش مەڵەکەی پەنا داوە... ئێستا حەمەدیش پەنای بۆ تۆ هێناوە عەلی... عەلی وەرە پیاو بەو مەبە باعیسی ئەم دوو دڵدارە... ئەگەر ئەم کارە بکەی لە کـن عەبـدی قـەدرت زیاد دەبێ, بەڵام هەموو ئاوەدانی دەبێتە دوژمنت. رەنگە بڵێی ئەگەر عەبدیم هەبێ, بـە گۆڕی بابی ئەوانی دیکە, بەڵام مەسەلە وا نیە عەلی. ئـەمن هەرچـی دەبـوو پێـت بڵـێم, گوتم, ئێستا ئیدی خۆت دەزانی و خۆت."

عەلی بێ‌ئەوەی جوابێك بداتەوە هەڵستا. روخساری شەکەت و خەماوی دیـار بـوو. حەسـۆ لەدواوە دووپاتی کردەوە:

"تەواوی ئاوەدانی لێت دەبێ بە دوژمن عەلی!."

عەلی وەڕێ کەوتبوو. حەسۆ دووبارە خۆی پێ گەیاندەوەو بە گوێی دا چپاند:

"عەلی... ئەو کەسانەی عاشقە ڕووتان لێك بکەن، چاکەیان نایەتەڕێ... لێیان مەبە بە چەقڵی مەم و زینان عەلی... هەرکەس هێلانەی خەڵك تێك بدا، بۆخۆشی هێلانەی بەسەر دا دەڕووخێ عەلی... لە خۆشیی ئەوەی ئەم دوو دڵدارە پێك گەیشتوون، هەموو ئاوەدانی جێژنی لە دڵ دا دەگەڕێ. ئەگەر ببیە کۆسپی ڕێگایان، خوا دەتکا بە دارێکی وشك. دێیەك بە هەموو دانیشتوانیەوە دەبێتە دوژمنت. چما نەتدی چیان بەسەر دایکی ئەو کوڕە هێنا؟ ئێستاش لەنێو خۆڵ و خوێن دا کەوتوە، لەوانەشە تا ئێستا... عەلی ئیدی خۆت دەزانی."

لەو نێوەدا ئەسپەکە زین کرابوو، بانگی عەلی‌یان دەکرد. لاوێك هەوساری ئەسپەکەی گرتبوو و چاوەڕوانی عەلی بوو. نیو باڵتویەکی ڕەشیشیان بە بەن سامۆتەی ئەسپەکەوە هەڵواسیبوو.

باران هێشتا دەباری.

هەموو دێهاتی‌یەکان بە ژن و پیاو و گەورەو چووکەوە کۆببوونەوە. هەموویان چاویان بڕیبووە عەلی. عەلی قورسایی و مۆلەق ماویی سەدان جووت چاوی لەسەر شانی خۆی هەست پێ دەکرد. وەك هەمیشە لاقە شەلەکەی وەژان کەوت. چەند ئێشێکی لە توانا بەدەر بوو. هەروەخت عەلی تووشی گیروگرفتێك دەبوو و بەدەستیەوە دادەما، لاقە شەلەکەی وەژان دەهات. ژانیش چ ژانێك؟...

تەواوی ئاوایی، بە بەردو خاك و ئینسان و ئاژەڵەوە تووکی لە عەلی دەکرد. بەرامبەر بە ماڵی خەجیج لەبن دارتووەکە، شوێنی دووکەس لە پەنای یەکتر دەبینرا. عەلی شوێنەکەی دۆزیەوە. لە پێش دا سێ چوار جاری دەوری ماڵی خەجیج و ئەوان دا. تەواوی منداڵە وردکەی ئاوەدانییش بە دوایەوە بوون. لە پاشان ڕێیەکەی گۆڕی و چووە نێو دێ. ماوەیەکیش بە نێو کەلێن و قوژبنی ئاوایی دا گەڕا.

دووسێ کەس لە دێهاتی‌یەکان لە پەنا حەسۆ ڕاوەستابوون و لێیان پرسی:

"چیت بە شەلە گوت؟."

حەسۆ بە سەربەرزی‌یەوە جوابی دەدانەوە:

"هەرچی پێویست بوو بیڵێم، پێم گوت... پێم وا نیە عەلی قسەی من لە عەرزی بدا."

حەسۆ وەختێك دیتی کە عەلی لە نێو دێ دا دەگەڕێ و لەم لاو ئەولا ورد دەبێتەوە، دڵخۆش بوو. عەلی شوێن هەڵگرێك نەبوو کە بۆ دیتنەوەی شوێنی حەمەدو خەجیج لەنێو

ئاوایی دا بگەڕێ. ئەو دەیتوانی هەر ئەو شوێنەی کە دیتبوویەوە, بگرێ و بەری ئەدا هەتا دەیان بینێتەوە. دیتنەوەی ئەو شوێنە بۆ ئەو وەك هەڵوەشاندنی گۆرەوی‌یەك کە سەرە بەنەکەی دۆزیبێتەوە, ئاسان بوو.

گەڕان و هەڵسووڕانی عەلی‌یەشەل خەبەرێکی خۆش بوو.

ئەم قسانە زار بە زار لە دێی دا دەگەڕان:

"ئەگەر عەلی نیازێکی خەراپی بووایە لەنێو دێی دا نەدەگەڕا."

"کێ دەڵێ؟."

"کێ؟."

"حەسۆ شێلم."

"شەلە هەروا لەنێو دێ‌دا دەگەڕێ... زگی بە عاشقە رووتان سووتاوە. حەتمەن هەموویان بە لارێ دادەبا... هەی خۆش بی عەلی‌یەشەل!."

عەلی‌یەکەچەڵ:

ئەمن عەلیی دەناسم . ئەگەر بڵێن شوێنی بابت هەڵگرە، ناڵێ نا... ئەگەر بزانێ بابی بگرن لە داریشی دەدەن، دیسان دەست لە کارەکەی هەڵناگرێ، شوێنی هەڵدەگرێ و دەی‌دۆزێتەوە. ئەگەر بە عەلی‌یان گوتبێ شوێنی حەمەدی وەبینێ، کار لە کار ترازاوە... عەلی‌یەشەل هەموو هۆش و بیری لەلای کارەکەیەتی... بەدەست خۆشی نیە... عەلی‌یەشەل دەیەوێ پیاوی چاك بێ، حەز دەکا بەزەیی بە ئاشقە رووتان دا بێتەوە، پێی خۆشە زگی پێیان بسووتێ، هەموو ئەمانە راستن، بەڵام عەلی‌یەشەل ناتوانێ بەدوای شوێن دا نەڕوا... بەدەست خۆی نیە... شوێنەکە ئەوی بەدوای خۆی رادەکێشێ و دەیبا... وەختێك سەرە بەنەکەی دیتەوە، ئیدی کەس ناتوانێ پێشی بگرێ... ئەگەر بزانێ دەکوژرێ، ئەگەر کەلاکی خۆی لەپێش چاوی خۆی ببینێ، ناتوانێ وەدوا شوێن نەکەوێ... ئەگەر هەتا ئاخری نەڕوا ئۆقرە ناگرێ."

حەسۆ:

"باشە عەلی... ئەمەی ناو دەنێی چی کە دووجار زیاتر نێو ماڵەکە گەڕا؟... بەمە دەڵێی چی کە سەعاتێکە لە نێو دێ دا دەگەڕێ؟ ئاخر خۆ حەمەد کە کچەکەی هەڵگرتوە بە دەوری ماڵان دا نەی گێڕاوە... ئەو کەسەی کچێك هەڵدەگرێ، ئاور ناداتەوە دوای خۆی. عەلی‌یەشەلیش لەوانە نیە شوێنی لێ ون بێ... ئەویش بەو بارانە... ئەمن پێم گوت ئەگەر دەست لەم کارە هەڵنەگرێ، ئیدی چاوی بە چاوی من ناکەوێتەوە..."

عەلیبەکەچەلّ لە فکرەوە چوو. لە روخساری دا خۆشحالّی و هیوایەك دەخوێندرایەوە:

"خوا بکا ئەخلاقی گۆرابێ. رەنگە بە خۆراییش نەبێ کە هەر خەریکە لەنێو دێ دا دەگەرێ... ئافەریم عەلیبەشەل... بزانم چ دەکەی."

عەلیبەشەل هەر رۆیشت و گەرایەوە. لەبەر مالّەکان هەر دابەزی و لە عەرزی ورد بووەوە، تەماشای بەردانی کرد، بۆ دیتنەوەی شوێنەکە هەرچی پێویست بوو بیکا، کردی. بەلاّم نەگەرایەوە تەوجێیە کە یەکەم شوێنی لێدیتبوو. عەلی دەترسا ئەگەر جارێکی دیکە چاوی بە شوێنەکە بکەوێ، خۆی پێ رانەگیرێ و وەدوای شوێنەکە بکەوێ. وەك ئەوەی شوێنێکی دیکەی هەلّگرتبێ لە ئاوایی وەدەرکەوت. بە دلّی دادەهات ئەسپەکەی دەنگ بداو بە لینگدان روو بکاتە بیابان...

چاوی بریە لێرەوار. ماوەیەکی زۆر تەماشای کرد. شوێنی حەمەدو خەجیج بەرەو دارستان رۆیشتبوو. دەتگوت دووکەسی لە بەرچاون کە خەریکی ئاشقێنین. هەموو شتێك لە مێشکی دا دەگۆرا.

باران هێدی هێدی دەباری.

دووبارە سەری ئەسپەکەی بۆلای مالّی خەجیج و ئەوان وەرگێرا. گەرایەوە. لە پەنای تەیانەکە بەرامبەر بە مالّی خەجیج راوەستا. شوێنی کالّەیەکی درێژ لەسەر عەرزی دیار بوو. لە دلّی خۆی دا گوتی:

"ئەم کالّەیە دەبێ نوێ بێ... بەدرێژی تووکەکەی رادیارە لە پێستی جوانەگا دروست کراوە... لە پێستی جوانەگایەك کە زستانێ لە سەرمان مردوە."

دووبارە ئەوانەی هاتنەوە بەرچاو کە لەنێو لێرەوار پێکەوە خەریکی ئاشقێنی بوون. باران نەرم نەرم لە سەرو روخساریانی دەدا. هەستی کون پشکنین وەك ئاگر لە هەموو گیانی بەربوو.

هەروا لە فکرەوە چوو بوو و ئاگای لە خۆی برابوو، کە یەکێك لە دێهاتییەکان هاتە لای و گوتی:

"چتە عەلی؟... هەروا راماوی و راوەستاوی؟... عەبدی خان نیگەرانە... دەلّێ بۆچی هەروا لە نێو دێیدا هەلّدەسوورێ؟... هەر ئەمە بوو هێندەتان تەعریف دەکرد... ئاوا شوێن دەگێرێ؟."

ئەوان سەرگەرمی قسان بوون کە عەبدیخان بە سواریی ئەسپ و بە لینگدان گەیشتە پەنایان و ئەسپەکەی راگرت:

"چیە کاکی شوێن گێر... ماشەللّا لەو شوێن گێرانەت، ئەم دەزانی لە شوێن گێران دا لینگەت نیە!..لە بەیانییەوە تا ئێستا دەلّێی دەتەوێ دێیەکە بکرِی، هەروا تەماشای دارو دیوارەکەی دەکەی... ئێستاش دەترسم لەبن تەیانەکە خەوت لێ بکەوێ."

عەلیپەشەل چاوی دەرپەڕین. بە گورجی سەری ئەسپەکەی بۆلای عەبدیخان وەرگێڕا:

"بلێ لە رەعیەتەکان بپرسن داخوا کاڵەی نوێی لە پێ دابووە، کاڵەیەك کەلە پێستی جوانەگای مندارەوە بوو دروست کرابێ؟."

خان رووی کردە رەعیەتەکان:

"راست دەکا؟".

یەکێك لە دێهاتیەکان:

"بەڵێ خان، هەوەڵی زستانێ جوانەگای سمایلی مندار بوو... سمایلی ئاشەوان دەڵێم... حەمەد زیڵووە چەرمێکی لێ کریبوو.

خان گەرایەوە لای عەلیپەشەل:

"بەڵێ عەلی... ئێستا هونەری خۆت نیشان بدە بزانم."

عەلی سەری داخست و بە چوار ناڵ لە ئاوایی وەدەرکەوت، عەبدیخان و حەوت ـ هەشت سواریش بەدوایدا.

لەبەردەڵانەکەدا عەلی لەغاوی ئەسپەکەی توند کرد. ئەوانیش راوەستان.

شوێنەکە بۆلای گابەردەکان رۆیشتبوو. عەلی واقی وڕما. جێ پێیەکان بەرەو لێرەوار بوون، بەڵام... جوان سەیری ئەو شوێنەی کرد کە لەسەر گابەردەکە دیار بوو:

"ئەمانە بە کەلێنە شاخەکان دارۆیشتوون... دابەزن، بەسواری شوێنیان هەڵناگیرێ."

هەموو ئەسپەکانیان بۆ نەفەرێك بەجێهێشت و وەدوای عەلی کەوتن. لە نێو دوو بەردی گەورەدا پەڵە عەرزێکی چکۆلەیان دی. لەو تۆزە عەرزە دا سێ گوڵی زەرد پشکوتبوون. ئەم پەڵە زەوییە گڵە رەش بوو، لەبەر رەشییان بریسکەی دەدا. گوڵە زەردەکانیش بریسکەیان دەدا. یەکێك لە گوڵەکان داهاتبووەوە سەر زەوی. عەلی ئەم گوڵەی نیشانی ئەوانی دیکەدا:

"دەزانن بۆچی ئەم گوڵە کەوتووەتە سەر زەوی و دووەکانی دیکە بە پێوە وەستاون؟... دوێ شەو، لای نیوەشەوێ یەکێك پێی لێناوە... هەرکەسیش بووبێ کاڵەی لەپێدا بووە... بڕوانن، شوێنی لێوی کاڵەکەی کەوتووەتە سەر گوڵەکە..."

هەموویان داهاتنەوەو تەماشایان کرد. بەڵام هیچ کامیان شوێن و نیشانەیەکی لێوەکاڵەکەیان لەسەر گوڵەکە نەدی.

پاشان عەلی هەستا بەنێو بەردەکان دا دەستی کرد بە هاتوچۆی ئەم لاو ئەولا. عەبدی خانیش بەدوای دا... وەختێك عەلی گەیشتە پەنا گابەردێکی نووك تیژ، راوەستا:

"لێرەوە گەڕاونەوە."

چوونەوە لای ئەسپەکان. لەوە بەدوا، ئەو شوێنانەی دەچوونەوە لای لێرەوار بە باشی دیار بوون، بەجۆرێك کە ئەوانی دیکەش دەیانتوانی شوێنەکە بگرن و بەدوای دا بڕۆن.

کاتێك گەیشتنە پەنا دارستان، عەلی لەغاوی ئەسپەکەی کێشا. لەپێش دا ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، دوایە وەك خۆڵەمێشی لێهات، ئەمجار ڕەش داگیرا.

لێرە شوێنەکان بۆلای بەردەلانەکە گەڕابوونەوە. ئەمە وەك شوێنەونکە دەچوو... وەك شوێنی ئەوانە دەچوو کە نازانن دەبێ بچنە کوێ... شوێنەکان تاوێك ڕاست دەچوونە پێش...، دوایە بۆ لایەکی دیکە وەردەگەڕان...

عەلی وەختێك دیتی شوێنەکان بۆ ئەم لاو ئەولا دەچن و دێنەوە جێی پێشوویان زگی پێیان سووتا. بەدڵی عەلی داهات کە:

"چۆنە عەبدی بەرمە ئەوسەری لێرەوار و ئەو بەستەزمانانە لە شەڕی ئەو ڕزگار بکەم؟..."

لە تەنیشت مووره دارێك گیایەك سەوز ببوو. ئەم گیا تەڕو تازەیە بۆلای مووره دارەکە چەما بووەوە. لە پشتەوەشی کۆتەرە دارێکی چکۆلە لە عەرزی ڕۆ چووبوو.

باران سەر لە نوێ توندی کردەوە. عەلیەشەل ئەو نیوباڵتۆیەی بە بەن سامۆتەی ئەسپەکەیەوە هەڵاوەسرا بوو، بەسەر شانیدا دا. ئەوانی دیکە بێدەنگ بوون.

عەبدی خان:

"عەلی، خەریکە درەنگمان لێ دادێ... دیسان شوێنەکەت لێ ون بوو؟."

"نا... بڕۆن."

عەلی بەرەو دارستان لێی خوڕی. ئەم جارە هەر بەراستی شوێنەکەی ون کرد.

گەرایەوەو ڕووی کردە عەبدی:

"شوێنەکەیانم لێ ون بووە."

عەبدی خان نەڕاندی:

"هەر ئەوە بوو هونەرەکەت؟... ئەوەبوو؟..."

دەزگیران لەدوای هەمووانەوە دەسکی دەمانچەی ڕووتی لەدەست دا بوو.

عەلیەشەل قسەکەی عەبدی خانی زۆر لە دڵ گران هات:

"ئێستا شوێنەکەیان دەبینمەوە. دەبێ هەر لەم نزیکانە بن. لەم دەوروبەرانە تووشی تۆفان بوون. زۆر بە دەوری خۆیان دا سووڕاون. ئەگینا شوێنەکەیانم ون نەدەکرد."

ماوەیەك گەڕا هەتا سەر لەنوێ شوێنەکەیانی دۆزیەوە. لێرەوارەکە چڕو پڕ بوو. ئیدی ئەسپەکان دەرنەدەچوون. ئەسپەکانیان بەرەڵا کردو بە پێیان ڕۆیشتن.

عەلی:

"ئەوەتا... لکێکیان لەم دارە شکاندوە."

لە پاشان لە پڕ وەکەیف کەوت:

"نزیك بووینەوە... لێرەش باوەشێك دارو چیلکەیان کۆکردوەتەوە. شوێنەکەیان بەرەو بەردەڵانە."

جگە لە عەلیپەشەل و عەبدیخان هەموویان تەڕ ببون.

عەبدی ڕووی کردە خوشکەزاکەی:

"ئەتۆ بۆچی نیو باڵتۆی خۆت نەهێناوە؟."

بەڵام ئەو حەوسەلەی جواب دانەوەی نەبوو. چەکەکەی جۆرێك بەدەستیەوە گرتبوو دەتگوت ئێستا لێی دەکەوێ.

عەلیپەشەل ڕووەو بەردەڵان غاری دا. لەخۆشییان خەریك بوو هەناسەی لێ بڕێ. ئەوانی دیکەش بە دوای دا غاریان دا.

عەلی:

"دینەوە, بەسپایی... دەبێ لەبن ئەو شاخە خۆیان حەشار دابێ... بەسپایی, لەسەرەخۆ."

عەبدیخان لە دواوە هاواری دەکرد:

"لە کوێن عەلی؟... دۆزیتنەوە یان نا؟... بۆ قسە ناکەی؟."

عەلی دەنگی لێوە نەدەهات. عەبدیخانیش خۆی گەیاندێ. هەناسەی سوار ببوو. چووە پەنای عەلی و دەستی کرد بە ڕوانین.

عەلی دەستی کرد بە قسە:

"لێرە ئاوریان کردوەتەوە. جلەکانی خۆیان بەسەر ئەم دارەدا ڕاهێشتوەو وشکیان کردوونەوە. ئاوریان بە شەمچە هەڵنەکردوە, ئەستێ و بەردیان لێداوەو ئاوریان پێهەڵکردوە..."

چووە پشتەوەی شاخەکە, ئەو جێگایە کە بارانی وێنەکەوتبوو و گڵەکەشی وشك بوو. داهاتەوە سەر زەوی. ماوەیەکی زۆر تەماشای گڵەکەی کرد. شوێنی کەفەڵی کچەکەی لەسەر عەرزی ناسیەوە. هەورازتریش شوێنی شان و پشتی دیار بوو. ئەوانی دیکەشی بانگ کرد:

"وەرن, وەرن... بڕوانن..."

هەموویان لە هەموو لایەکەوە داهاتنەوە سەر زەوی. عەبدیخان بەسەرسوڕمانەوە تەماشای روخساری عەلیی کرد. نەیدەزانی عەلی مەبەستی چیە؟

عەلی:

"کار لەکار ترازاوە."

خان تێگەیشت، بەلام پرسی:

"یانی دەتەوێ بلێی چی عەلی؟."

عەلی:

"بڕوانە خان! ئەمە شوێنی کەفەلی کچەکەیە، ئێرەش شوێنی شان و پشتی... ئێرەش جێی سەریەتی. ئەم خەتانە دەبینی خان! ئەمانەش جێی مووی سەرنی. مەبەستم ئەوەیە ئەو کارە کە...

عەبدیخان رەنگی گۆڕا. ماوەیەك هەروا حەپەسا. پاشان وردە وردە هاتەوە سەرخۆی:

"ئێستا دەلێی ئەمانە چوونە کوێ؟."

"دەبێ هەر لەم دەوروبەرانە بن. ئێستا دەیان بینینەوە."

خەریك بوو هەتاو ئاوا دەبوو.

عەبدیخان:

"دەترسم تاریکمان لێ دابێ."

عەلی:

"ئەمانە دوو سەعاتێك زیاتر نیە لێرەڕا رۆیشتوون... بە دوو سەعاتانیش لەنێو ئەم لێڕەوارەدا نابێ زۆر رۆیشتبن. ئەمانە برسییشیانە. لەبەر ئەو ئاورەی خۆیان لێگەرم کردبووەوە وردکە نانێك نەڕژابوو. ئەگەر نانیان پێ بایە، حەتمەن دەیان خوارد."

دەزگیران کز دامابوو. لە باران دا خووسابوو. دەلەرزی و شەقەشەقی ددانی دەهات.

دەزگیران:

"ئاورێك بکەینەوەو خۆمان گەرم بکەینەوە. خەریکە لە سەرمان دەمرین."

ئەوانی دیکەش:

"راست دەکا خان! لە سەرمان رەق بووین."

عەبدیخان لە دین دەرچوو:

"ئێمە دەچین ئەوان دەبینینەوە. ئێوە لێرە بن خۆتان گەرم بکەنەوە... ژن لە ئێوە بەغیرەت ترن."

خان و عەلی خۆیان بە نێو لێڕەوار دا کرد. عەبدیخان دەمانچەکەی هەڵکێشا... دەزگیران وەختێك دیتی خان زۆر تووڕەیە, دەستی لە خۆ گەرم کردنەوە هەڵگرت و وەدوای کەوت.

بەرە بەرە دنیا تاریك دەبوو. عەلی شوێنەکەی هەڵگرتبوو. شوێنی پێیان ئەوەندە ئاشکرا دیار بوو کە بە تاریکیش دەکرا وەدوایان بکەون.

خەریك بوون لە هەڵاتووەکان نیزیك دەبوونەوە. چونکە بەرە بەرە شوێنی پێیەکانیان تازەتر دەبوو. لەبن دەوەنێك دەنگێك هاتە بەر گوێ. گوێیان هەڵخست. وردە وردە تاریکتر دەبوو.

عەبدی:

"ئەو دەوەنە بپشکنن..."

عەلی:

"لێرەن, خان!."

لەنەکاو دەنگی زیڕەی ژنێك بەرز بووەوە.

عەبدی هاواری کرد:

"حەمەدی نەکوژن. بیگرن و بۆم بێنن... ئەمن بۆخۆم بە دەستی خۆم... ئەمن دەزانم چی لێدەکەم. وریا بن تاڵە موویەك لە سەری کەم نەبێتەوە."

حەمەد لە پشت دەوەنەکە خزیبوو. دەسکی دەمانچەکەی لە دەستیدا بوو. دەمانچەکە لە گیرفانی راستی پانتۆڵەکەی دا بوو. لە هیچ شتێك و لە هیچ کەس نەدەترسا:

"مەترسە خەجیج... تۆ نادەمەوە بەمانە."

لە پشت دەوەنەکە هەستاو راوەستا. رووی کردە ئەوانە کە بە ترسەوە لێی نیزیك دەبوونەوەو گوتی:

"تەسلیم... تەسلیمم."

عەبدی:

"ئێوە مەچنە پێش... راوەستن لەپێش دا بۆخۆم بچمە پێش و سەروسەکوتی سەگی ببینم."

ئەوان پاشەوپاش کشانەوە. عەبدی و دەزگیران پێش کەوتن. حەمەد لەنێو دەوەنەکەدا چەقیبوو. دنیا تەواو تاریك ببوو. حەمەد وەك تارماییەك دیار بوو.

عەلیەشەل, تاوێك پێش ئێستا لەوە کە توانیبووی شوێنەکە هەڵگرێو بیان بینێتەوە, زۆر خۆشحاڵ بوو... بەڵام ئێستا کە دەیدی وەزع چۆنە, غەمێکی کوشندە دڵی داگرتبوو.

هەمیشەش هەروا بوو. هەر لەوێ لەسەر مووره دارێك دانیشت و دەستی لە نێو دەستانی گرت. سەرکۆنەی خۆی دەکردو خەفەتی دەخوارد:

"ئیدی تۆبە... تازه ئەو کارەی ناکەم... ئیدی تۆبە... بەستەزمان حەمەد!."

عەبدیخان:

"هەتیوه غەك بەحەرامە... ئاوا؟... قەرار نەبوو ئاوام لەگەڵ بکەی... ئێستا دەتبەمەوە ئاوەدانی... بزانە چت لێدەکەم..."

راست لەو کاتەدا دەنگی راکێشانی چەخماخی چەکێك بیسترا, بەڵام نەیان هێشت. عەبدی رووی کرده ئەوانی دواوەو بە سەری دا نەڕاندن:

"ئاخر من پێم نەگوتن کارێکتان پێ نەدابێ؟..."

حەمەد مووی لێنەدەبزووت. هیچ نەش خەجلابوو و نەدەترسا. راست وەك بەرد... راوەستابوو و تەماشای دەکرد. لەو کاتەدا دەستی راستی کە لە گیرفانی پانتۆڵەکەیدا بوو, جووڵا. بێ پەلەپەل و دڵەخورپە دەمانچەکەی دەرهێنا. ئەوەندە لەسەرەخۆ بوو, دەتگوت قوتووه سیغارێك لە گیرفانی دێنێتەدەر. دەمانچەکەی بەرەو عەبدی راگرت. ئەوەندە ئارام بوو دەتگوت هیچ نەقەوماوە. دەتگوت قەرار نیە هیچیش روو بدا. دوو فیشەکی تەقاند.

عەبدیخان هاواری کرد:

"ئای مردم..."

ئەو خەریك بوو دەکەوت کە لوولەی دەمانچەکەی بۆ لای زاوا کەچەڵە راداشت و سێ جار دەستی لێکێشا. ئەویش هاواری کرد:

"ئای کوژرام..." و کەوت.

حەمەد دەمانچەکەی لەگیرفانی هاویشتەوەو هەروا بە ئارامی رووی کرده ئەوانی دیکە:

"خەجیج لێرەیە. ئەگەر موویەك لە سەری کەم بێتەوە, ئەمن دەزانم و ئێوە."

پاشان خەجیجی بانگ کرد:

"ئەتۆ بچۆوە ماڵێ. پاشان بۆخۆم بەدوات دا دێم و دەتبەم. دەتبەمە جێیەك کە کەس نەتوانێ مان دۆزێتەوە, ئەتۆ راستەرێ بچۆوە ماڵێ. ئەمانە ناتوانن موویەك لە سەری تۆ کەم بکەنەوە."

دەستیان کرد بە تەقە لە حەمەد. حەمەد بە دەنگی تەقەکە سەری سوڕما. چونکە زۆر لەمێژ بوو ئەوان دوور کەوتبوونەوە. ئەوان تەقەیان لە تاریکایی دەکرد.

لای نیوەشەوێ لە دارستانەکە دەرکەوت.

باران هێشتا نم نم دەباری.

## (١٠)

یەکێك بەسپایی و بەشکۆوە لە دەرکەی دەدا... نەختێك رادەوەستاو سەرلەنوێ دەستی پێ دەکردەوە.

ژنە، مێردەکەی لە خەو هەستاند:

"هەستە... هەستە، یەکێك لەدەرکەی دەدا."

پیاوەکە خەواڵوو بوو، چەند جار ویستی هەڵستێ، بەڵام سەری خۆی رانەدەگرت و دەکەوتەوە سەر سەرین.

دووبارە لە دەرکەیان دا، بەڵام کەمێك توندتر.

ژنە دووپاتی کردەوە:

"هەستە، هەستە... لە دەرکەی دەدەن."

پیاوەکە هەستاو بە خەواڵوویی بۆ لای دەرگا چوو و بانگی کرد:

"کێیە؟."

لە دەرێ ڕا جواب درایەوە:

"بیکەوە، ئەمنم."

دەنگەکە دەلەرزی، پیاوەکە گەرووی پاك کردەوەو دیسان پرسی:

"ئەتۆ کێی؟."

"دەرگاکە بکەوە دەمناسی."

پیاوەکە دەرگای کردەوە:

"کەوایە وەرە ژوور..."

ئەوەی لە دەرکەی دەدا بە هەڵەنگوتن هاتە ژووری... ژووری هۆدەکە تاریك بوو...
کابرا بانگی ژنەکەی کرد:
"کچێ هەستە ئەو چرایە هەڵ کە, میوانمان هاتوە."
پاش تاوێك چرا هەڵ کرا. ژنەکە هاتە لایان. میوان لەبەر باران خووسابوو. جلەکانی بە لەشیەوە نووسابوون. ژن و مێرد بە سەرسوڕمانەوە تەماشای ئەو میوانەیان دەکرد. میوان وا تەڕ بوو دەتگوت لە ئاوێیان هەڵکێشاوە.
ژنەکە چاوی لە میوانەکە نەدەگوێزتەوە. سەرەنجام وەقسە هات و پرسی:
"میوانەکەمان ئاشنا دیارە!... بەڵام نایناسمەوە."
پیاوەکە زەردەخەنەیەکی هاتێ. ئەو هەمیشە پێکەنینی لەسەر لێوان بوو:
"هەرچەند چاوم باش نابینێ, بەڵام لە پێش چاوی منیش بێگانە نیە."
پاشان دەستی خستە سەر شانی میوان و گوتی:
"میوان کێی؟ بێگانە نی, بەڵام نات ناسمەوە."
میوان:
"مامە, ئەمن حەمەدۆکم."
سلەمان بانگی ژنەکەی کردەوە, کە چووبوو داران بێنێ:
"کچێ وەرە بزانە کێ هاتوە, وەرە..."
ژنە بەخۆشحاڵیەوە پرسی:
"کێیە؟."
"حەمەدۆکی خۆمانە. ماشەڵڵا بزانە بووەتە چ پاڵەوانێك... ئەمنیش ئەم ڕۆژانە هەر بیرم دەکردی حەمەد. دەمگوت داخوا ئەو منداڵە چی بەسەر هاتبێ, وادیارە دڵم خەبەری داوە کە ئەم ڕۆژانە پەیدا دەبی."
ژنە:
"ئەرێ, کوڕم. مامت ئەم ڕۆژانە هەر لە بیری تۆدا بوو, هەر باسی دەکردی."
سلەمان زۆر پیر ببوو... برۆیەکانی درێژو لوول دراوو سپی بوون و کەوتبوونە سەر چاوانی. ریشیشی درێژ ببوو وەك باوەشە لۆکەیەك دەکەوتە سەر سنگی. ئەم سەروسیمایە سامێکی تایبەتیی دەدا بە مام سلەمان.
ژن کراس و دەرپێیەکی پیاوانەی هێناو لە پێش حەمەدی دانان:

"کوڕم، کراس و دەرپێیەکانت بگۆڕە. دەنا باپەڕ دەبی."

حەمەد چووە سووچێکی تاریکی هۆدەکەو خۆی رووت کردەوە... لە پاشان بە تونێی کراس و دەرپێیان هات لەبەر ئاگر دانیشت.

سلەمان:

"دەی حەمەد، باس و خەبەر؟."

حەمەد:

"زۆرم وەڕەزی کردبوون، بەڵام چارە چیە؟ بۆخۆتان دەزانن."

سلەمان سەری خستە سەر حەمەد:

"دەی باشە، ئاخرەکەی ئەو دێیەت دیتەوە یان نا؟."

حەمەد پێکەنینێکی تاڵی هاتێ:

"نا، نەکرا."

پاش ئەم قسەیە باوەشێك تیشکی زەرد لە مێشکی حەمەد دا درەوشا.

سلەمان:

"پرسیار باش نیە، بەڵام سەیرە بەو شەوە درەنگە... و بەم سەروسیمایەوە!"

حەمەد:

"بۆت باس دەکەم مامە... چارەی دەردی من بە دەست تۆیە. لە دنیادا ئەتۆ نەبێ هیچ کەسم نیە. جگە لە تۆ کەس شك نابەم دەردی خۆمی پێ بڵێم، کەسم نیە یارمەتیم بدا...، هەربۆیەش هاتووم."

ژنە:

"سەرمات بووە کوڕم، ئێستا دەچم جامێك شۆرباوت بۆ تێدەکەم... زۆرت سەرمایە."

حەمەد وەختێك جامە شۆرباوە گەرمەکەی بەدەستەوە گرت، چەند ساڵ پێشتری وەبیر هاتەوە. ئەودەمیش هەر لەم گۆشەیەو هەر لەبەر ئەم ئاگردانە دانیشتبوو و لەسەرمان هەڵدەلەرزی. وەبیری هاتەوە کە چۆن شۆرباوەگەرمەکەی خواردبوو و گەرمی هاتبووەوە. ئەو وەخت تەنیا بوو... ئەو وەخت دەترسا... بەڵام ئێستا بێباك بوو. لێبڕاو بوو. دنیایەکی فرەوان تری هەبوو. تامی ئازاد بوونی دەچێشت. لەو کارەی کردبووشی هیچ پەژیوان نەبوو.

ژنە:

"ئێوە دانیشن قسەکانتان بکەن، ئەمن دەچم دەنووم."

سلەمان:

"باشە، بۆم باس بکە بزانم حەمەد..."

حەمەد:

"عەبدیم کوشت. خوشکەزاکەشیم هەر کوشت."

سلەمان پێی سەیر بوو:

"کەنگێ؟."

حەمەد:

"هەر ئەمشەو، سەر لە ئەنگۆڕێ."

سلەمان بڕوای نەکرد. بە بێباوەڕییەوە پرسی:

"بەڕاستیتە؟... بە هیچ جۆر وەك پیاوکوژان ناچی."

حەمەد لە سیرێ هەتا پیوازێ هەموو شتێکی بۆ سلەمان گێڕایەوە. کەڵەبابی پارشێوێ دەیان خوێند کە حەمەد قسەکانی تەواو کرد.

سلەمان:

"دەستت نەڕزێ. چاکت کرد... ئێستا نیازت هەیە چ بکەی؟."

حەمەد:

"دیارە نیازم نیە بچم خۆم تەسلیمی دەوڵەت بکەم... دەمەوێ بچمە شاخی."

سلەمان:

"ئەتۆ جارێ بنوو. کاتێك هەڵستای فکری لێدەکەینەوە.

حەمەد:

"دەترسم لێرە لە داو کەوم و لەنەکاو بەسەرم دا دەن."

سلەمان:

"بە ئەقڵی کەس دا نایە، کەسێك پیاوی کوشتبێ بێت و دوو هەنگاو لەولاتر لە دێیەك خۆی بشارێتەوە..."

حەمەد:

"ئەرێ وەڵڵا..."

سلەمان:

"ئەگەر ئەوان بە دواتەوە بن، حەتمەن دەچنە دێهاتی زۆر دوور، روو لە کێوان دەکەن."

چەند جەواڵی نەخشین لە پەنا دیواری هەڵپەسێرابوون. سلەمان بانگی حەمەدی کرد:

"وەرە حەمەد وەرە... وەرە ئەم جەواڵانە لابەین. دەمەوێ جێگات لە پشت ئەم جەواڵانە بۆ راخەم. کێ دەزانێ چ دێتە پێش، ئێمە دەبێ فکری هەموو شتێك بکەین."

ماوەیەك پێکەوە خەریکی جەواڵەکان بوون و پاش و پێشیان کردن، هەتا جێیەکیان کردەوە کە نەفەرێك بتوانێ لێی بخەوێ.

سلەمان:

"ئێستا بچوو لەو پشتەی بخەوە. ئەگەر پێت خۆشە مانگێك بنوو. کەس لێرە شکت بۆ نابا. ئێستا جلێکیشت بەسەر دا دەدەم با بە تەواوی خاترجەم بی... بنوو هەرچەندی پێت خۆشە بنوو."

حەمەد بێ ئەوەی قسەیەك بکا لە جێی خزی.

سلەمان توند دەرگاکەی داخست و چووە کن ژنەکەی. ژنەکەی نووستبوو. هەڵی ئەستاند:

"کچێ، جێگای حەمەدم لە پشت جەواڵەکان راخستوە. نە کوڕم، نە بووکم و نە هیچ کەسی دیکە نابێ بزانێ حەمەد لێرەیە.

ژنە:

"باشە."

پاشان ئەویش سەری کردە سەر سەرین و نوستەوە.

حەمەد لە جێی دا ماوەیەك یادی خەجیجێی کردەوە. وەبیری هاتەوە کە عەبدی چۆن کەوتە سەر زەوی. عەبدی هەر بە بیریشی دا نەدەهات کە شتی وای بەسەر بێ. پاشان وەبیری هاتەوە کە خوشکەزاکەی عەبدی چۆنی هاوار کرد... چۆنی چنگەکڕکە لەزەوی دەکرد... چۆنی قەپاڵە لە دارو بەردو خاك و خۆڵ دەگرت و پاشانیش چۆن لە نێو خوێنی خۆی دا تلایەوە... لەو نێوەدا شتێکی دیکەشی وەبیر هاتەوە. وەختێك هەموان تفەنگیان پێوە دەنا، پیاوێکیش لەسەر کۆلکەدارێك دانیشتبوو، سەری لە نێو هەردوو دەستانی گرتبوو و لە گژ فکران ڕا چووبوو. هەروا بە چەپ و راست دا دەجووڵاو دیار بوو لەگەڵ خەفەتێکی گەورە دەستەویەخەیە.

هەرچی فکری لێدەکردەوە سەری لەم مەسەلەیە دەرنەدەچوو. ئەو پیاوە کێ بوو؟ پاشان هەموو شتێکی لەبیر چووەوە. وەك ئەوەی ئێستا لە دایکی خۆی بووبێ، مێشکی خاوێن بوو، رووناك بوو، هەروا بزانە هیچ کارەساتێکی تووش نەبووە، خەوی لێکەوت.

وەختێك وەخەبەر هات زۆر بە کەیف بوو. هەرچی ببوو، ببوو. وەختێك دوێنێ شەوی وەبیر هاتەوە، هەر ئەو بریسکەی بە قەد نووکە دەرزییە هات و لە چاوانی دا قەتیس ما.

سلەمان:

"گوێت لێ بێ حەمەد! ئەمن بەیانی چوومە نێو دێ و کەمێك گوێم هەڵخست، خەبەری بریندار بوونی عەبدی گەیشتوەتە ئێرەش. لەوانەیە بێن ئێرەش بگەڕێن. دەبێ ئەمشەو پێکەوە بچینە شاخی و یاخییەکان وەبینین."

لە سەرو سیمای حەمەد ڕا دیار بوو کە ئەو پێشنیارەی زۆر پێ خۆشە.

سلەمان:

"دۆردووە شێت" خزمی ئێمەیە. زۆرم چاکە لەگەڵ کردوە. دەڵێم ئاگای لێت بێ. بەڵام لە سێ مانگ زیاتر لەلای دۆردوو مەمێنەوە. پیاوێکی زۆر بێمێشکە. نایەڵێ لەوە زیاتر لە کێوان بژی... هەمیشە بە دوایەوەن. زوو یان درەنگ دەیکوژن. لە جێ دا یاغیی وەك ئەو ساڵێك زیاتر ناتوانێ بژی. پێم سەیرە هەتا ئێستاش نەیان کوشتوە. بەڵام ئەگەر لە من دەپرسی، زۆری پێناچێ کە دەیکوژن... پاشان دەبێ جێیەکی دیکە وەبینی و بچیە ئەوێ. ئەتۆ دەبێ یەك دوو مانگ ئەزموون پەیدا بکەی و پاشان بۆخۆت دەستەیەك دروست بکەی. دیسان پێت دەڵێم، ئەگەر لەبەر خاتری تۆ نەبایە هەتا سەد ساڵی دیکەش چاوم بە چاوی نەدەکەوت. لەگەڵ ئەو بێمێشکە زۆر تێنەکەوی! ئەو یاغی نیە، چەتەیە... دزە... پیاوکوژە... بەڵام قسەیەك بۆ خوا بکەین، دۆردووش لە جێ دا کوڕێکی خەراپ نەبوو. لادێیییەکانی خۆیان بوونە هۆی ئەوە کە ببێتە ئەو جانەوەرە... ڕۆژێکیان دۆردوو بە میوانی دێتە دێیەکەی خۆیان، ئەودەم هاووڵاتە نامەردەکانی خۆی دەیخەنە داوی ژاندارمەوە... پیاو هەق بڵێ زۆریان ناپیاوی لەگەڵ کرد. بە کورتی دۆردوو بە هەر جۆر دەبێ لەدەست ژاندارمری ڕادەکاو خۆی دەگەیەنێتە چیا. بەڵام پاش ئەو نامەردییەی لەگەڵی کرا، ئیدی جۆرێك هار بووە کە بەزەیی بە کەس دانایە... لەوە گەڕێن... تۆ تەنیا یەك دوو مانگ بە هەر جۆرێك بووە لەگەڵی رابوێرە."

حەمەد:

"دەستەی دۆردووە شێت چەند کەسن؟... زۆرن؟."

سلەمان:

"هەرچی نانەجیب و زۆڵ و بیژووی ئەم نێوە بووە، لە دەوری دۆردوو خڕ بوونەوە... هەرچی زنجیری پساندوەو لە زینـدان رای کـردوە... ئێستا گـوێ گـرە حەمـەد چـەند قسەیەکت پێ بڵێم و ئامۆژگاریت بکـەم با تـەکلیفی خـۆت بزانـی... ئـەتۆ هێشتا منداڵی... بەڵام گەورە دەبی و پێ دەگەی. ئەمن نازانم چەند دەتـوانی لـە کێـو وەمێنـی یان نەمێنیەوە... ئەمەیان تەنیا خوا دەزانێ. باش گوێ بگرە بزانە دەڵێم چی. حەتمـەن بە کەلکت دێ. ئەمن زۆر لەگەڵ یاغییان ژیاوم. دەزانم دوارۆژیـان چیە... دوارۆژی زۆر کەسیشیانم بە چاوی خۆم دیوە. وەختێك خۆت گەیاندە دەستەی دۆردووی، نابێ دەسبەجێ لەگەڵ هەموویان ببیە دۆستی گیانی گیـانی... هەرکـە چـوویە نێویـان، زۆربـەیان دێـن، دەورەت دەگـرن و وا نیـشان دەدەن کـە دۆسـت و هـاورێتن، دڵـسۆزیت بـۆ نیـشان دەدەن، دەردی دڵیانت پێ دەڵێن. نهێنیەکانیانت لەلا دەدرکێنن، بـەکورتی رەفتارێکـت لەگـەڵ دەکەن، کە پێت وابێ هەموویان دۆستی گیـانی گیـانیتن. لـە جێ دا بنیـادەم هـەموویان وان... بەڵام ئەتۆ نابێ نەدیو و نەناسیو لەگەڵیان ببیە خۆماڵی. نابێ هەرچی لـە دڵـت دایە دەسبەجێ بۆیان هەڵرێژی. بە کورتی هەرچی زیـاتر خـۆ راگـری و کـارت بـە کاریـان نەبێ، قەدرت لەلای وان دەچێتە سەرێ... هەتا دەتوانی سەنگین بە. یـاغی دەبێ لـەنێو ئاواڵەکانی دا قەدری هەبێ... دەبێ ئاواڵەکانی حیسابی لەسەر بکـەن... بەڕاسـتی چیم دەگـوت؟... هـا... دەمگـوت دەم و دەسـت لەگـەڵ هـەموویان مەبـە بـە دۆسـت و خۆماڵی... ئەگەر نوختەیەکت لێوەبینن، هەتا ئاخری عومرت لەدەلینگت بەردەبن...، ئەودەم ئیدی لە لای ئەوان بایی پووڵە رەشـکەیەك قـەدرت نیـە... رۆژ لـە رۆژ چـاکتریان دەناسی. پیاوان دەبێ بە رەفتـارو کردارىـان بناسـی، نـەك لـە رووی قسەیانەوە... پـاش ئەوەی ماوەیەك بە شکۆوە لە نێویان ژیای و هەموویانت بـاش ناسـی، ئـەودەم تێدەگـەی کامەیان بۆ ئەوە دەبێ پشتی پێ ببەستی و لەگەڵی ببیە دۆست و خۆماڵی. ئەگەر زاربڵاو بی، بزانە ئەوە دوژمنی گیانتە. پێت وا نەبێ کێو و زیندان فەرقیان هەیە. هەم چیاو هەم زیندان هەردووکیان سەرۆکیان هەیەو ئەوانی دیکە نۆکەری سـەرۆکن و چـەندیش نۆکـەری نزم و بێقیمەت!... سەرۆکەکان وەك بنیادەم دەژین، بـەڵام نۆکـەرەکان عـەینی سـەگ... تۆ دەتوانی ببیە سەرۆك، بەڵام نابێ ئەوانی دیکە بە کۆیلەی خۆت بزانی. ئەوەی کـە پێم گوتی لە گوێتی بگرە. ئێستا هەر بگەیـە چیا، دۆردووە شـێت دەسـبەجێ دەمانـچەیەکی ماوزەرت دەداتە دەست، چەکەکانی دیکە دوایە خۆت پەیدایان دەکـەی... ئـەمن ئێـستا دەچم سۆراغێکی دەکەم بزانم دۆردوو لە کام لایە."

سلەمان هەستاو چووە لای دێهاتیەك کە هاوکارو خەبەرهێنی دۆردووە شێت بوو، هەواڵی دۆردووی لێپرسی.

دۆردوو خەڵکی گوندی "سپیەبی" بوو. سلەمان لەمنداڵیەوە دەیناسی. بابی چووبووە شەڕو ئیدی نەهاتبووەوە، لەبەر ئەوەی لەگەڵ سلەمان خزم بوون، سلەمان زۆری یارمەتیی ژن و منداڵەکەی کردبوو. ئەوی راست بێ، سلەمان بوو کە نەیهێشتبوو لە برسان بمرن. دۆردوو بە منداڵییش قۆشمەیەك بوو کەس باشاری نەدەکرد.

ئێستا پێنج ساڵ بوو دۆردوو لە شاخی بوو. ماڵ نەمابوو نەیسووتێنێ، هێلانە نەمابوو تێکی نەدا. دێهاتیەکانی ئەو مەڵبەندە هاواریان بەدەستیەوە گەیشتبووە ئاسمان. کەس نەیدەوێرا تخوونی مەڵبەندی ژێر دەسەڵاتی ئەو بکەوێ. هاوار بۆ ئەو کەسەی دەکەوتە داوی دۆردوو. دارو نەداری لێدەستاند، رووت و قوتیشی دەکردەوەو، جا بەرەڵای دەکرد. هەرکەسی وەدەست کەوتبایە کراس و دەرپێیەکەشی لەبەر دادەکەند. دۆستایەتی و ئاوەڵەتییشی نەدەزانی. گوێی لە قسەی براو دایك و بابیشی نەبوو. راستیەکەی ئەوەبوو سلەمان دەترسا حەمەدی بەرێتە لا. چونکە هیچ دوور نەبوو بە ئەقڵی دا بێ و هەر لە جێ حەمەدی بکوژێ.

سلەمان:

"جێگای ئەو سەگبابەم دۆزیەوە. دەڵێن لە "گردەدووکەڵ"ە. ئێمە دەبێ بچینە گردەدووکەڵ و سێ جار تەقە بکەین. پاشان تفەنگچیەکانی دۆردوو دێن و دەمانبەن. با پێت بڵێم حەمەد... ئەمن زۆر بڕوام بەو شێت و شوورە نیە، بەڵام هەرچی بێ، زۆری دڵی من دەوێ. لەم دەوروبەرانەش دەستەیەکی دیکە شك نابەم... سەد بریا هەبووایە..."

پاش خۆرئاوا، سلەمان لە پێشەوەو حەمەدیش بەدوای دا وەڕێ کەوتن. کاتێك لە ئاوایی چوونەدەر، سلەمان وەرگەڕایەوەو سەری خستە سەر حەمەد:

"حەمەد، ئیدی تۆ خەریکی یاغی دەبی. نەکا سبەینێ بەسەرت دا بێ و بێیە سەردانی مامە سلەمانت."

حەمەد:

"پێش هەمووان دەبێ بەسەر تۆدا دەم. چما ئەمن هاوکاری دۆردووە شێت نیم؟."

سلەمان قاقایەکی کێشا:

"باشە، باشە..."

حەمەد:

"مەگەر درۆ دەکەم؟."
سلەمان کردیە راستی:
"حەمەد, رۆلەم... ئەگەر کارێکی خەراپت کردبایە. ئەگەر جگە لە عەبدی تەقەت لە کەسێکی دیکە کردبایە, بۆخۆم تەحویلی دەولەتم دەدای."
حەمەد:
"چما ئەمن دەمتوانی جگە لە عەبدی تەقە لە کەسێکی دیکە بکەم؟."
سلەمان لە نەکاو راوەستاو یەخەی حەمەدی گرت و چاوی لە چاویەوە بری:
"گوێت لێ بێ کورم, گوێ بگرە حەمەدۆك, ئەگەر رۆژێك ببیسم بێ گوناهێك یان کەسێکت کوشتوە کە گوناهێکیشی کردوە, بەلام گوناهێکی وا نەبووە, یان خوا نەخواستە ئەگەر بە گوێم بگاتەوە کەسێکت لەبەر پوولەکەی کوشتوە, ئەودەم بزانە کە رۆژی قیامەتیش هەر ئاوا یەخەت دەگرم."
حەمەد:
"ئیدی ئەمن کەس ناکوژم."
سلەمان هەروا کە توند یەخەی حەمەدی گرتبوو لە سەری رۆیشت:
"ئەگەر رۆژێکیش ببیسم, تووشی کەسێکی وەك عەبدیخان بووی و نەت کوشتوە, دیسان دەستی من و یەخەی تۆ... ئەگەر سەد عەبدیخان ببینی, دەبێ هەر سەدیان بکوژی... ئەگینا رۆژی قیامەت ئەئاوا یەخەت دەگرم."
حەمەد پێکەنینێکی هاتێ:
"قەولت پێدەدەم ئەگەر سەدی وەك عەبدیخانم چنگ کەوێ, هەر سەدیان دەکوژم."
بەری بەیانی باران کردبوویەوە. رێگاکان قوڕ بوون. ئەوان ئێستا گەیشتبوونە شاخی. ئەم بنارانە خیزەلان بوون. خیزو وردە بەرد لەبەر پێیان دا دەخزی. هەوا بۆنی داری گەندەل و پووشی رزیوی لێدەهات. ئەستێرەکان زەلام زەلام بوون و ئەلقەیەك رووناکایی دەوری دابوون... تەیرێك هەیە وەك کاریلە دەهیرێنێ... جار بە جار دەنگی ئەو مەلە دەبیسترا. وەختێك کە هەورازتریش چوون, کۆترە باریکەیەك خوێندی.
گەیشتنە نیزیك لوتکەی گردە دووکەل.
سلەمان:
"حەمەدۆك, دەمانچەکەت دەربێنەو سێ فیشەك هەلتۆقێنە."

ئەم قسەیەی کردو دانیشت. هەناسەی سوار ببوو:
"داد لە دەست پیری... ئای جحێڵی لە کوێی... دنیایەکی خۆش بووی..."
لەو نێوەدا حەمەد سێ دەمانچەی هەڵتۆقاندن.
دەنگی گوللەیەك لە دوور لە کێوەکان دا دەنگی دایەوەو جوابی حەمەدی دایەوە.
سلەمان:
"ئای ئەژنۆم... زووبە کورم، دەبێ زووتر وەسەر کەوین."
حەمەد قۆڵی سلەمانی گرت.
پاشان لە نیزیك خۆیان تفەنگێك هاوێژرا.
سلەمان هاواری کرد:
"چتانە توخمە سەگینە؟... نەکا خەریك بن بمکوژن."
دەنگی کوڕە جحێڵەیەك هات:
"ئەتۆ کێی؟."
سلەمان:
"وەرە پێش کوڕە، وەرە پێش... بمبە لای ئەو شێت و شوورە."
لە پشت بەردەکەی لای راستیانەوە پیاوێك هاتەدەرێ:
"ئێوە بوون تەقەتان کرد؟."
سلەمان بە بێتاقەتی‌یەوە جوابی دایەوە:
"ئێمە بووین... شێتە لە کوێیە؟."
پیاوەکە دەست لەسەر چەك بە دەنگێکی پڕ لە سەرسوڕمانەوە پرسی:
"بە ئاغام بڵێم کێ هاتوە؟."
سلەمان:
"بڵێ مام سلەمان، لە گوندی کەسەوە."
کابراکە سلەمانی ناسیبوو، دەسبەجێ وەڵامی دایەوە:
"ئیشەڵڵا دەبووری مام سلەمان، لە دەنگت ڕا نەتمناسیەوە."
سلەمان:
"پیرییە ئیدی، هیچی لەگەڵ ناکرێ، پیاویش دەگۆڕێ... ئەتۆ کێی کوڕم، نات ناسمەوە."
"ئەمن جەبارم، کوڕی مستەفا، لە گوندی "کاراجادورن". لە بیرت نیە مام سلەمان لەگەڵ بابم دەهاتین و کورتانمان پێ دەدرووی. لەبیرمە هەم کورتانت بۆ دەدرووین و هەم گۆرانیت بۆ دەگوتین."

سلەمان:

"سەیرە, سەیرە! ... ئەتۆش یاغی بووی؟... خەبەرم نەبوو."

"باش ڕێ کەوت."

پاش ئەم قسەیەش هاواری کردو خەبەری دا:

"مام سلەمانە... لە کەسەرِا هاتوە..."

دەنگەکە لە شاخان دراو لە چیادا دەنگی دایەوە. لەبەر زارکی ئەشکەوتێك ئاوریان کردبووەوە, حەوت, هەشت کەسیش لەدەوری ئاگرەکە هالآبوون و تفەنگەکانیان خاوێن دەکردەوە. ئەو شاخەی ئەوان لە بنی دانیشتبوون, نووك تیژو بە قەد سپیدارێکیش بلیند بوو.

بلێسەی گەورە گەورەی ئاگر لەسەر شاخەکان نەخشی جۆراوجۆرو سامناکیان دەکێشان. حەمەد وەختێك شاخ و ئاگرو ئەشکەوت و ئەو پیاوانەو چەکەکانیانی دی, هەستی بە نامۆیی کرد. لەتاریکایی دا دەنگی پێ‌یەك هات. یەکێك لەوانەی لە دەوری ئاگرەکە دانیشتبوون, بە دەنگی پێی ئەو کەسە کە نیزیك دەکەوتەوە, راپەڕی. کەڵەگەت بوو. سێبەری کەوتە سەر ئەو شاخە کە نەخش و نیگارێکی زۆری بلێسە ئاگرەکان سەمایان لەسەر دەکرد. سێبەرەکەی لەسەر شاخەکە دەبزووت. بۆ لای ئەوان هات.

سلەمان:

"پێم وایە شێتەی خۆمانە."

جەبار:

"بەڵێ. خۆیەتی, ئاغامە..."

دۆردوو نەڕاندی. دەنگی دەتگوت زەنگوڵەیە:

"بەخێراتی مام سلەمان... چۆنە بەو شەوە درەنگە؟... ئاکا هاتبی رەگەڵمان کەوی؟..."

لە پاش ئەم قسەیە دەستی سلەمانی گرت, ماچی کردو لەسەر نێوچاوانی خۆی دانا.

سلەمان:

"شێتی جندار... بیستوومە بوویە پادشای ئەم کێوانە... دەڵێن کەس ناوێرێ قسەت لە قسە بکا... پێت خۆش بێ لێ‌دەدەی, پێت خۆش بێ دەکوژی..."

دۆردوو:

"راستە مام سلەمان... بە خوا نایەڵم بنیادەم بەم دەورووبەرانەدا رابرێ. دەمەوێ قەدەغەی بکەم کە هیچ کەس بەم دەورووبەرەدا تێ‌نەپەڕێ. نامەوێ لەمەودوا بنیادەم لاقی وە

خاکی ئێرە بکەوێ. باجی هەموو ئەو ڕێیانەی دەچنەوە ماراش دەبێ بە منن بگا. با گوندی سپیەبی باشم بناسێ. با بزانن دۆردووە شێت کێیە."

سلەمان:

"دیسان خەریکی شێتە شێتەی؟."

دۆردوو:

"ئەگەر خەلکی سپیەبی کارێك بکەن کە جارێکی دیکە دلم لێیان بیەشێ، بەخودا سپیەبی ئاور تێبەردەدەم. هێندەی چاو لەسەر چاو دانێی ئاداری بەسەر پاداریەوە نایەلم، نایەلم ئاورگی ئاوەدانی تێدا بێنێ، وای لەگەل خاك تەخت دەکەم کە گیاشی لێ شین نەبێتەوە."

سلەمان تەشەری لێدا:

"لێ وەبرە شێتە... ئەم قسە قۆڕانە چین؟."

دۆردوو:

"وادیارە ئەتۆش منت نەناسیوە مام سلەمان! ... ئەتۆش نازانی ئەمن کێم..."

سلەمان:

"بۆچی... دەتناسم شێتی توخمسەگ، دەتناسم... بابی پوولە ڕەشکەیەك ئابڕووت بۆ یاغی و یاغیگەرییش نەهێشتۆتەوە... خەبەرم هەیە."

دۆردوو:

"ڕاوەستە چەند سالی دیکە پێ بچێ... لێم گەڕێ کەمێك باری خۆم ببەستم... ئەو وەخت دەزانی یاغی بە کێ دەلێن و یاغیگەری بە چی دەلێن..."

سلەمان:

"ئیشەللا تا ئەودەم ئەمن دەمرم و یاغیگەریی تۆ نابینم... خۆ ئێستاش ناوبانگی چەتەیی و پیاوکوژی و تالان و بڕۆی تۆ دنیای پڕ کردوە."

دۆردووە شێت:

"دەیبینی، ئیشەللا دەیبینی."

سلەمان توورە بوو:

"ئەگەر وەك تا ئێستا ڕەفتارت کردوە هەروا بڕۆیە پێش، درەنگ یان زوو دەتکوژن و منیش تەنیا تەرمەکەت دەبینم... حەیف بۆ جوانیت... دەزانی زۆرم دلی تۆ دەوێ شێتە؟."

دۆردوو:

"دەزانم مام سلەمان... دەزانم... لە هاوکارەکانم بپرسە. ڕۆژ نیە باست نەکەم و یادت نەکەمەوە. بە هەمووانم گوتوە ئەگەر گیانم هی خوایە, گۆشت و ئێسکم هی مام سلەمانن."

پاشان رووی کردە هاورێکانی:

"وانیە کوڕینە؟."

هەموو پێکەوە جوابیان دایەوە:

"بۆچی..."

سلەمان:

"ئەمن پێم خۆش نەبوو ئەتۆ یاغی بی, ئەویش لەسەر چی؟... بە هەرحاڵ... ئێستا کار لە کار ترازاوە. بەڵام ئەگەر بۆ ناو و ناوبانگ چووبیە شاخی, بەڕاستی شێتی‌یە..."

دۆردوو:

"ئێستێ دانیشە مام سلەمان... دانیشە با چایەك بخۆینەوە."

سلەمان دەستی بە ئەژنۆیەوە گرت و دانیشت:

"حەیف کە قەدری جوانیی خۆتان نازانن تووتکە سەگینە... لەو کێو و شاخەدا بە خەساری دەدەن."

پاشان تەماشایەکی دۆردووی کردو پێکەنی:

"دیارە قەدری گیانی خۆت باش دەزانی شێتە! ئەم هەموو "پەریوەشان"ەت لەکوێ بووە؟... (گیایەکی بۆنخۆشە, وێ دەچێ کەنێرە بێ - وەرگێڕ).

مەڵۆ مەڵۆی پەریوەشانیان تەخت کردبوون و وەك دۆشەکی نەرم بە ئەندازەی ئەلقەی خەرمانەیەك لە چواردەوری ئاورەکە رایان خستبوون. بۆنی خۆشی پەریوەشان لەو شەوەدا بڵاو ببووەوە. بۆنی پەریوەشانیش هەروەك پەریوەشان خۆی نەرم و دڵگیرە...

دۆردوو بە خۆڕانانەوە جوابی دایەوە:

"تۆ خۆش بی, پەیدا دەکەین... ئەم کێوانە هەموو پاوانی خۆمانن."

سلەمان قاقایەکی کێشا:

"هەی شێت و شوور, هەی... ئاوا؟... کەوابێ مەزرای پەریوەشانیشت خستوەتە سەر قەباڵەکەی خۆت..."

حەمەد هەموو گیانی ببووە گوێ. هەموو یاغییەکان تەقیلەی سووریان لەسەر بوو. تەقیلەی سوور کڵاوی باوی یاغییەکانە. تەقیلەی سوور نیشانەی یاغیبوون و چەتەییە. تا ئێستا یاغییەك کڵاو گەرگەری یان شاپۆی لەسەر نەناوە. کێ تەقیلەی لەم کێوانە کردوەتە باو؟... کەس نازانێ... رەنگە ئەو رۆژانە کە فەرمانی لابردنی رووپۆش و گۆڕینی جل و بەرگ دەرچووە، ئەو یاغییانە کە لە کێو و بەندەنان بوون ئاگایان لەو ئاڵوگۆڕە نەبووبێ و دوایەش هەر کەس چووبێتە چیا بە چاولێکەریی ئەوان تەقیلەی لەسەر نابێ."

پاش ئەوەی سلەمان دانیشت، هەموو یاغییەکان یەك بە یەك هاتن و بەخێرهاتنیان کردو دەستی سلەمانیان ماچ کرد. هەمووشیان بە سەرسوڕمانەوەو بە چاوی گاکرین لە حەمەد ورد دەبوونەوە. حەمەد لە پشتەوەی سلەمان دانیشتبوو. کوشم هەڵاتبوو و چکۆڵە دیار بوو.

سلەمان:

"ئەگەر دەتانەوێ بزانن ئەم کوڕە کێیە، ئێستا پێتان دەڵێم. ناوی حەمەدۆکە. پیاوێکی لە دەست کوژراوە، بۆیە هێناومەتە ئێرە."

لەو نێوەدا حەمەد سەری داخستبوو و چووکتریش ببووەوە.

دۆردوو تەماشایەکی سلەمانی کردو چاوێکیشی لە حەمەد کردو بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

"هاتوەتە گەڵ ئێمە؟"

سلەمان:

"ئەگەر قبووڵ بکەن بەڵێ...، ئەگەریش نا، بۆخۆی بە تەنیا بەرەی خۆی لە ناو دەردێنێ."

دۆردوو:

"پێی لەسەر چاومان... وەختێك تۆ هێناوتە مام سلەمان، لەسەر سەرمانی دادەنێین."

لە کۆڵەپشتەکەی تەقیلەیەکی دەرهێناو بۆ حەمەدی هاویشت. حەمەد کە بە رواڵەت را دیار بوو هۆشی لەسەر خۆی نیە، تەقیلەکەی لە هەوا قۆزتەوە.

دۆردوو:

"بیکە سەرت پاڵەوان... ئەمە تەقیلەکۆنی خۆمە. جارێ هەر ئەوەمان هەیە... دوایە تەقیلەی باشترت بۆ پەیدا دەکەین."

پاشان رووی کردە مام سلەمان و بە دزییەوە زەردەیەکی هاتێ:

"ماشەڵڵا زۆریش مندالە."

سلەمان ئەم قسەیەی پێ خۆش نەبوو:

"بەڵێ زۆر منداڵە, بەڵام عەبدی حەل ساڵەی خوارد... پێتان وا نەبێ کەری دزیوەو هاتوەتە شاخی."

دۆردوو بە سام و سەرسوڕمانەوە پرسی:

"تەقەی لە عەبدیخان کردوە؟... بەڕاستی؟... لە عەبدیخان... سەیرە... سەیرە..."

سلەمان:

"بەڵێ... ئەدی پێت وابوو چیە؟."

دۆردوو بە چاوێکی بێ بڕواوە تەماشایەکی حەمەدی کرد:

"وا دیارە تفەنگت نیە برام... چاکت کرد کە مشووری عەبدیت خوارد. دەستت خۆش بێ. دەڵێن خوێنی خەلکی پێنج دێی مژیوە, ڕاست وەك زەروو..."

پاشان ڕووی کردە جەبار:

"جەبار, ئەو تفەنگەی لە تاڵانی دوایی دا دەستمان کەوتبوو, لە کوێت شاردوەتەوە؟ لە هەر جێیەکت شاردوەتەوە بیهێنەوە... دوو ڕیز فیشەکدان و فیشەکی تەواویش بێنە."

دۆردوو باوەڕی نەدەکرد کە ئەو بستە منداڵە تەقەی لە عەبدی کردبێ. هەر بۆیە بە گومانەوە سەیری دەکرد.

سلەمان تێگەیشت:

"پێت وا نەبێ هەر لە عەبدیی داوە..., خوشکەزاکەشی کوشتوە. ئێستا تێگەیشتی؟."

سەرسوڕمانی دۆردوو دوو چەندانە بوو:

"لە هەردووکیانی داوە؟... هەی دەستت نەڕزی هەی."

ئێستا ئیدی حەمەد زۆر کز دامابوو و لە پەنا ئاگرەکە زۆر چووکتر دیار بوو. وەك ئەوە دەچوو سەرمای بێ.

چای گەرمیان لە ئیستیکانی نێوقەد باریك کردو بۆ حەمەدو سلەمانیان دانا. سلەمان وەك بابێکی دڵسۆز داهاتەوە سەر حەمەد:

"ئێستا ئیدی بوویە یاغی حەمەدۆك, دەبێ ئاگات لە خۆت بێ."

پەیتا پەیتا داریان دەخستنە سەر ئاگرەکە. ئاگرەکە وردە وردە گەورەو گەورەتر دەبوو. هەتا گەرما زیاتر دەبوو, بۆنی پەریوەشان زیاترو خۆشتر لە هەوادا بلاو دەبووەوە.

ئەستێرەکانی ئاسمان لەبەر ڕووناکایی ئاگر چووکتر دیار بوون. هەر هێندەی نووکی دەرزی.

دۆردوو:

"غەمت نەبێ مام سڵەمان.،. هەتا من ماوم کەس ناتوانێ موویەك لە بەری کەم کاتەوە."

سڵەمان بە دڵسۆزی و بەزەیی‌یەوە لەسەر تا بە خواری دۆردوو ورد بووەوە:

"دۆردوو... ئەتۆ بە لاقی خۆت بەرەوپیری مردن دەچی."

دۆردوو پێکەنی:

"بۆچی مامە؟."

سڵەمان:

"ئەگەر یاغی یاغی بێ، لەسەر کێوی ئاگری وا ناکاتەوە. ئەگەر دوژمنت مێروولەش بێ، نابێ بە کەمی بگری... ئەوەی تۆ دەیکەی مانای ئەوەیە ئەجەلی خۆت بانگ دەکەی."

دۆردوو قاقایەکی کێشا:

"ئەوە دەڵێی چی مام سڵەمان؟... ئەو کێوە جگە لە ئێمە کەسی پێوە نیە، کێ دەمان بینێ؟..."

سڵەمان:

"جارێك نابینن، دوو جار نابینن، بەڵام جاری سێیەم چی؟... داستانی تۆش هەروەك داستانی کوللەیە."

دۆردوو:

"لە جێ دا نامان بینن... پاشان ئەگەر بشمان بینن، کامە ژاندارمە دەوێرێ بێتە سەر دۆردووە شێت؟... ئای، مام سڵەمان، ئای... ئەتۆ هێشتا دۆردووە شێتت نەناسیوە... دۆردووە شێت هەڵۆی ئەم شاخانەیە. کێ‌دەوێرێ لاق لە کەوشی دۆردووە شێت بکا."

سڵەمان:

"باشە. دەی‌بینین شێتی کەللەشەق!."

دۆردوو بۆ ئەوەی قسەکە بگۆڕێ، بای دایەوە سەر حەمەد:

"کاتێك تەقەت لە عەبدی خان دەکرد، دەستت نەدەلەرزی؟."

حەمەد:

"نا... بە هیچ جۆر."

دۆردوو:

"نیشانەت لە کوێی گرت؟."

حەمەد:

"ڕاست لە سنگی... لە ڕاستی دڵی..."

حەمەد پاش ئەم قسەیە، ئەوەندە هەستی بە تەنیایی کرد هەر باسی مەکە. دەتگوت هەموو ئەو شتانەی لە دەوروبەری بوون لە نەکاو پاك بوونەوەو لەنێو چوون. ئەو دۆردووە شێتەی هیچ خۆش نەویست. ڕەنگە ئەو هەست بە تەنیایییەش هەر لەوەڕا هاتبێ...

ئاگرەکە تاریك بوو. دەم و چاوی ئەوانەی لەبەر ئاگر تفەنگەکانیان خاوێن دەکردەوە لە تاریکایی دا ون بوو. ئەو سێبەرانەی لەسەر شاخەکە دەبزووتن، بوونە غوول و پاشان لەنێو چوون. بایەکی دەهات شۆق و بڵێسەی ئاگرەکەی بۆ لای خۆرئاوا لار دەکردەوە. حەمەد چاوی بە سلەمان کەوت. سلەمان خۆشحاڵ و بە دەماغ بوو. دەم و چاوە ڕیشدارەکەی لەبەر شۆقی بڵێسە ئاگرەکان هەر دەمە ڕەنگێك دیار بوو. حەمەد دیتی کە سلەمان بڕوای پێیەتی. هەستی تەنیایی و نامۆیییەکەی کەمتر بوو. پاشان خەو دایگرت و هەر لەو جێیەی لێی دانیشتبوو خۆی مات کرد.

سلەمان:

"کوڕینە... ئەمنیش هەر لێرە دەخەوم. حەمەدیش خەوی لێکەوتوە."

دۆردوو:

"مامە... ئەمن باڵتۆیەکی سەربازیی زۆر باشم هەیە... پێی دادە با سەرمای نەبێ."

سلەمان:

"بیهێنە."

سلەمان لایەکی باڵتۆکەی بە خۆیدا داو لایەکەی دیکەشی بەسەر حەمەد هەڵکێشا.

پاشان هەموو یاغییەکان خەوتن، جگە لە یەکێکیان کە لەسەر شاخەکە ئێشکی دەکێشا.

کاتێك حەمەد لە خەو هەستا، ئەوەندە لەشی گران بوو دەتگوت بووەتە بەرد. لە سەرمان ڕەق ببوو. هێشتا هەتاو نەکەوتبوو، ئاخر کوا وەختی هەتاو کەوتن بوو؟...

یاغییەکان بەڕیز لەبەر ئاگر خەوتبوون و هێشتا پرخەپرخیان دەگەیشتە ئاسمان.

بە چوار دەوری خۆی دا چاوی بۆ ئێشك گر گێڕا. کەسی نەدی. لەبەر پرخە پرخی یاغییەکان پیاسەش نەدەکرا. دەڵێن ئەوانەی ترسی شتێکیان هەیە لە خەوێ دا پرخەیان دێ. ڕەنگە ئەم قسەیە ڕاست بێ. پاش چەند ڕۆژ ئەمە یەکەم جار بوو کە حەمەد دەترسا. ئێستا

ئەگەر دوو کەس, بەڵێ... تەنیا دوو کەس هاتبان, دەیانتوانی هەمووی ئەوانە کە پرخەپرخیان دەگەیشتە ئاسمان لە چاو لێک نانێک دا قەڵت و بڕ بکەن و سمێڵیان بادەن و لێدەن بڕۆن. فیشەکی وەبەر تفەنگێ داو ئێشک راوەستا.

لە پێش دا دۆردوو, و دوای ئەویش ئەوانی دیکە لە خەو هەستان. سلەمانیش وەخەبەر هات.

دۆردوو بە دەم چاو گلۆفینەوە بانگی ئێشک گری کرد:

"ئێشک گر!."

حەمەد لە شاخی هاتە خوار:

"فەرموو ئاغام. هیچ خەبەر نین. کەسیش دیار نیە."

دۆردوو:

"تۆی حەمەدۆک؟ ئێشک گر تۆی؟..."

حەمەد:

"بەڵێ."

دۆردوو:

"ئەتۆ تازە هاتووی حەمەد, جارێ زوویە... ئیشەڵلا وەختی ئەوەش دێ کە ئێشکت پێ بگرین."

حەمەد:

"خەوم لێنەدەکەوت, چووم نۆرەم لە هاوکارەکەم وەرگرت..."

دۆردوو:

"ئەرێ... راستە... ئەوانەی تازە دێنە شاخی هەتا حەوتوویەک خەویان لێناکەوێ... نامۆیی دەکەن, دڵیان تەنگ دەبێ, لە هەموو شتێک ناهومێد دەبن, دەڵێی لەم دنیایەدا تاق و تەنیان."

سلەمان هەروا بە خەواڵوویی سەری خستە سەر دۆردوو:

"ئافەریم شێتە... ئافەریم... ئەم دەزانی هێندە تێدەگەی."

دۆردوو:

"مام سلەمان... ئەتۆش ماشەڵلا ئەمن بە شیاوی هیچ شتێک نازانی... باشە چ بکەین؟..."

خەریک بوو دنیا رووناک دەبوو. هێشتا هەتاو خەبەریشی نەبوو. بەڵام لوتکەی چیای رووبەروویان روون ببوو. لوتکەکە رووناک بوو, بەڵام داوێنی کێوەکە هێشتا تاریک بوو. دوایە رووناکایی لە لوتکەی کێوەکەڕا بەرەوخوار خزی. نەختێک دواتریش سووچێکی هەتاو لە کێوەکەی دیکە وەدەرکەوت.

سلەمان وەلامێکی دۆردووی نەدایەوە. ماڵ ئاوایی لە هەمووان خواست و نێوچاوانی حەمەدی ماچ کردو وەڕێ کەوت.

دۆردوو بە دوای دا غاری دا:

"مام سلەمان... چایەکم لە کن بخۆوە جا بڕۆ... بەخوا ئەگەر بێڵم چای نەخۆیەوە بڕۆی... نایەڵم..."

سلەمان:

"خوا بە زیادی کا کوڕم... خوا بت پارێزێ."

دۆردوو قۆڵی سلەمانی گرتبوو، بەری نەدەدا:

"چای نەخۆیەوە نایەڵم بڕۆی... پاش هەزار ساڵ جارێك هاتوویە چیا، دەتەوێ بە زارو لێوی وشکەوە بەڕێت کەمەوە؟... بە خوا چای نەخۆیەوە نایەڵم بڕۆی..."

سلەمان لەدڵی خۆی دا گوتی: "بەو ئاسانیە پیاو لە دەست ئەم شێت و شوورە رزگاریی نابێ."

پاشان ملی بە لاوە ناو گەڕایەوە.

دۆردوو دەستووری دا:

"ئاورەکەی خۆش کەن."

سلەمان:

"دووکەڵەکەی دیار دەبێ."

دۆردوو:

"ئەدی چ بکەین؟ مەگەر پیاو بێ ئاگر دەژی؟ باشە ئەتۆ شارەزای، پێم بڵێ چ بکەین؟."

سلەمان:

"ئەمن ناتوانم هیچ فێری تۆ بکەم کوڕم، بۆخۆت دەبێ چارەی هەموو کارێك بدۆزیەوە."

دۆردووە شێت فکرێکی کرد. سەری بە راست و چەپ دا جوولاند. کاکۆڵە رەشەکانی لە ژێر تەقیلە هاتبوونەدەرو لەسەر نێوچاوانی شەپۆلیان دەدا.

سلەمان لەسەر قسەکانی رۆیشت:

"ئەچی زوڵم لە فەقیرو هەژاران بکەی دۆردوو... هەرچی پێت خۆشە لەگەڵ مل ئەستوورو ناتەجیبەکانی بکە، بەڵام کارت بە خەڵکی بێگوناح نەبێ. بە ئازایەتیی خۆت مەنازە، ئەختێك ئەقڵت وەکار خە، ئەگینا ئەجەل هەمیشە بەدواتەوەیە. ئێرە چیایە دۆردوو. چیا وەك قەوەزی ئاسنینە."

چایەکە زوو ساز بوو. یەکەم چایان لەئیستیکانێکی نێوقەند باریك دا بۆ سلەمانی دانا. هەڵمی چای لە سەرمای بەربەیانی دا بڵاو بووەوە...

سلەمان هەڵستا:

"حەمەد خێرتان بۆ دەداتەوە. ڕۆژەکانی پێشدا کارتان بە کاری نەدابێ، نەکا حەمەدم نارەحەت بکەن. پاش چەند ڕۆژان ڕادێ."

وەڕێ کەوت. گۆچان بە دەست لە کێوی چووە خوار. پشتی چەمابووەوە، بەڵام خێرا، وەك جحێڵی چاردەساڵە لە کێوی دەچووە خوار.

حەمەد چاوی پڕ بوون لە ئاو. لە دڵی خۆی دا گوتی:"خوا دەزانێ کەنگێ جارێکی دیکە دەت بینمەوە... لەوانەشە دیدار ئاخرەتی یەکتر بین." چاوی تەواو پڕ بوون لە فرمێسك:"لەم دنیایەدا... لەم دنیایەدا پیاوی چەند باش باش هەن."

هەتاو بڵیند ببوو و هەموو جێیەکی گەرم داهێنابوو.

حەمەد لەبن بەردێك بە خەفەتباری دانیشتبوو. دۆردوو بانگی کرد:

"وەرە حەمەدۆك... وەرە تفەنگەکەت تاقی بکەوە. هەتا ئێستا تەقەت بە تفەنگی وا کردوە؟..."

حەمەد:

"تەنیا چەند جار."

دۆردوو:

"ئەو خاڵە سپیپەی سەر ئەو شاخە دەبینی؟."

حەمەد:

"بەڵێ دیومە."

"تفەنگێکی پێوە نێ بزانم."

حەمەد قۆنداغی تفەنگەکەی لە شانی قایم کرد. سێرەی لێگرت و تەقاندی.

دۆردوو:

"لێت نەدا حەمەدۆك."

حەمەد قەڵس ببوو:

"چۆن؟... چۆن لێم نەدا؟..."

دۆردوو شانی هەڵتەکاند:

"چووزانم... نەت هەنگاوت و ئەها."

حەمەد لێوی خۆی بە ددانی گەزت. سەرلەنوێ قۆنداغەکەی لە شانی قایم کرد. سێرەی لێ‌گرت و دەستی لێ کێشا.

دۆردوو:

"ئەمجار راست لە نێوەڕاستێت دا."

دووکەڵێکی نەرم لە خاڵە سپییەکە بەرز بووەوە.

حەمەد بە سەرسوڕمانەوە لە خۆی پرسی:

"باشە, تفەنگی هەوەڵ بۆ لێی نەدرا؟..."

دۆردوو:

"باشە, حەمەدۆك... قەت فیشەکت بە خەسار ناچێ؟..."

حەمەد زەردەیەکی هاتێ:

"چووزانم..."

دەم و چاوی دۆردوو راکشاو و باریك بوون. هەرچەند جحێڵ بوو, بەڵام دەم و چاوی پڕ لە چرچ و لۆچ بوون. زاری زۆر گەورەو لێوەکانی زۆر تەنك بوون. شوێنی سووتاوێك لەسەر روومەتی راستیڕا هەتا بن مووی لاجانگی راکشابوو. چەنگەی باریك بوو, بەڵام زۆر بەهێز دیار بوو. هەمیشە پێدەکەنی, بەڵام پێکەنینێکی مەیلەو تاڵ:

"حەمەدۆك, دیارە زۆرت کار لە دەست دێ."

روخساری حەمەد وەك روخساری منداڵێك سوور هەڵگەڕا. سەری داخست. لە خوارێڕا سێ جاریان فیتوو لێدا. هەموویان گوێیان هەڵخست.

جەبار:

"خەبەرهێنەکەیە دێ ئاغام."

تاوێك دواتریش خەبەرهێنەکە بە هەناسەبڕکە گەیشتە جێ و راستەڕێ چووە لای دۆردوو:

"چواربێنج سوار, لە "چاناکلی"یەوە بەرەو "ئاك یۆڵ" لە رێیە دان... سەرو وەزعیشیان خەراپ نیە... دەبێ پووڵ و پارەیەکیان هەبێ."

دۆردوو رووی کردە پیاوەکانی ـ کە هەموویان خەریك بوون خۆیان ساز دەکرد ـ و دەستووری دا:

"هەمووتان زووتر ساز بن. زووتر... فیشەکیش زۆر هەڵگرن... دۆردووە شێت دەیەوێ چەند وەجاخی دیکە کوێر کاتەوە."

له پاشان رووی کرده حەمەد:

"بڕوانە حەمەدۆك."

خاڵێکی سپی لەسەر شاخەکە کردە نیشانەو دەستی لێ پێدا هێنا. شاخەکە لە دووکەڵ دا نووقم بوو. پاشان دووکەڵەکە بڵاو بووەوە.

"چۆن بوو حەمەدۆك؟."

"ڕاست وە نێوەڕاستێی کەوت."

دۆردوو:

"ئەرێ ڕاست لە نێوەڕاستێ."

دۆردوو چاوێکی لەوانی دیکە داگرت و لەسەری ڕۆیشت:

"یەکەمین نێچیرت خەریکە دێ حەمەدۆك, ئاگات لە خۆت بێ."

حەمەد جوابێکی ئەم قسەیەی نەدایەوە.

دۆردوو:

"کوڕینە ئامادەن؟."

ئەوانی دیکە:

"ئامادەین."

کاتێك بە نێو لێڕەوارە چڕەکان دا تێپەڕین و گەیشتنە جادە, لای نیوەڕۆیە بوو. لە قەراخ ڕێگا هەر یەکەی پەنجا میتر دوور لەوی دیکە, بۆسەیان نایەوە. یەکێکیشیان زۆر دوورتر لەوان لەلای پێشەوە ئێشك ڕاوەستا.

کەمێك دوایە پیاوێکی پیر بە ولاغێکەوە لە جادەدا دەرکەوت. ولاغەکە ئەوەندە لەڕو لاواز بوو کە لە ڕۆیشتن دا لاقی تێك دەهاڵان. پیرەپیاوەکەش ریشدار بوو, سمێڵە سپیو درێژەکانی بە دووکەڵی سیغار وا زەرد هەڵگەڕابوون کە لە دوورەوە دیارییان دەدا. دەم و چاوی پڕ لە چرچ و لۆچ و لاقەکانی نوقمی تۆزو خۆڵ بوون و پانتۆڵە فش و فۆڵەکەی لەبەر با, دەتگوت بەبەنێکەوە هەڵواسراوە, دەهات و دەچوو.

پیرەپیاو ساغ و بە دەماغ بوو. وا بەرێ دا دەڕۆیشت دەتگوت سەما دەکاو بەناره ناریش گۆرانییەکی دەگوت. جار جار لەبەر خۆیەوە زەردەخەنەیەکی دەهاتێ, ئۆینێکی دەردێناو گۆرانییەکەی دەست پێ دەکردەوە.

دۆردوو گوراندی:

"تەسلیم بە، دەنا دەتکوژم."

گۆرانی‌یەکە لەپڕ بێدەنگ بوو و مامەپیرە هەر لەوێ لە جێی خۆی چەقی:

"تەسلیمم بابە، تەسلیمم... چت لێ‌قەوماوە؟."

دۆردوو لە بۆسەکەی دەرپەڕی و چووە نێوەڕاستی جادە:

"رووت بە."

پیرەپیاو پێی سەیر بوو:

"رووت بم؟... چم لەبەر دایە هەتا دای‌نێم؟."

دۆردوو:

"هەرچی لەبەرت دایە..."

پیرەپیاو پێکەنی:

"توخوا گاڵتەم پێ مەکە. ئاخر ئەم جلانەی مـن بـە کـەڵکی چـیی تـۆ دێـن؟. لـێم گـەڕێ وەدوای کاری خۆم بکەوم. ماندووم. پاژنەی پێم خەریکە دەقەڵشێ لێم گـەڕێ بـڕۆم ئاغـا. لـێم گەڕێ بڕۆم ئاغای خۆم..."

دۆردوو نێوچاوانی تێك نا:

"رووت بە، مەحتەڵمان مەکە."

کابرا نەی‌دەزانی گاڵتەی لەگەڵ دەکا یان بەڕاستی‌یەتی. دوودڵ بوو. وەك سەگێك کە کلکە سووتە بۆ خاوەنی دەکا، چاوی بڕیە چاوی دۆردوو.

دۆردوو تووڕەتر بوو:

"زوویە وەجووڵێ."

پیرەپیاو هێشتا باوەڕی نەدەکرد کە بەڕاستی‌یەتی‌و زەردەی دەهاتێ. دۆردوو برۆی تێك نـان و پێلەقەیەکی توندی بە لاقی پیرەدا دا. پیرەپیاو لە تاوان هاواری کرد.

دۆردوو:

"زوویە، دایانکەنە."

پیرەپیاو دەستی کرد بە پاڕانەوە:

"ئاغا گیان! ئاغای خۆم. چی داکەنم... ئەگـەر ئەوانـەی لەبـەرم دان دایـان کـەنم رووت و قووت دەبمەوە."

پیرەپیاو دوای ئەم قسەیە، قامکی شادەی لە زاری راکرد، مژی و دەری هێنایەوەو لە پێش دۆردووی راگرت:

"بروانه... ئاوام لىَ‌دێ. لەبنەوە هیچم لەبەر دا نیە کە بتوانم جلەکانم داکەنم... وەرە دەستت ماچ کەم, لاقت ماچ کەم... ئاخر ئاغا گیان, جلەکانی من بە کەلکی چیت دێن... وەرە بکەومە بەر پێت... و لە کۆڵم بەوە..."

دۆردوو:

"ئاپیاو, پێت دەڵێم جلەکانت داکەنە, کەچی دەستت کردوە بە ئاغاگیان, ئاغاگیان؟..."

پیرەپیاو کەمێك پاڕایەوەو دوایە گریا:

"پێنج مانگ لە غەریبایەتی بووم, چووبوومە چوکووراوا... چووبووم بۆ کار کردن..."

دۆردوو هاتە نێو قسەکەی:

"کەوابێ دیارە پووڵ و پارەشت پێیە."

پیرەپیاوی بەستەزمان دەگریاو وەك منداڵان چڵمی هەڵدەلووشی:

"پێنج مانگ لە غەریبایەتی دا بابم بە گان دراوە... رۆژ تا ئێوارێ لە نێو مێش و مەگەز دا کارم کردوە..."

دۆردوو دووپاتی کردەوە:

"کەوابێ, دیارە پووڵ و پارەشت پێیە."

پیرەپیاو:

"پێمە, بەڵام شتێکی وا نیە... بەو سەری پیری‌یەم لە مەرەزە کارم کردوە, لەنێو قوڕو چڵپاو دا کارم کردوە... ئەوەی لە چوکووراوا کێشاومە, بۆ حەوت پشتم بەسمە... ئێستا خەریکم دەچمەوە ماڵێ. مەکە ئاغای من, مەکە ئاغا گیان... ئاخر چۆن بە رووت و قووتی بچمەوە لای ژن و منداڵم؟."

دۆردوو تووڕەتر بوو:

"باشە چاکتر... یاڵڵا دایان کەنە."

کابرا نەیدەزانی چ بکا. دۆردوو خەنجەرەکەی هەڵکێشا. خەنجەر لەبەر خۆرەتاو دەستی بە بریسکانەوە کرد... نووکی خەنجەرەکەی نەختێك لە لەشی پیرەپیاوەکە راکرد. کابرا دەرپەڕی و هاواری کرد:

"رەحمت بێ... بە چاوان, ئێستا دایان دەکەنم. رەحم بە ژن و منداڵەکەم بکە... جلەکانم بۆ تۆ, گیانم بۆخۆم... ئێستا دایان دەکەنم..."

ئەوانی دیکە لە بۆسەکانیان دا پێدەکەنین. تەنیا حەمەد بوو کە ئەم کارەساتەی پێ خۆش نەبوو. هەر ئەو بریسکەیەی رقی پڵینگی سەرلەنوێ هاتبووەوەو لە چاوی حەمەد دا جێگیر ببوو. حەمەد لە دوورەوە بێزی هەڵدەستا.

پیرەپیاوە بەستەزمانەکە بە پەلەپەل دەستی کرد بە داکەندنی چاکەت و پانتۆڵەکەی.

دۆردوو:

"ئافەریم پیرەپیاو... زووتر... ئەتۆ کە دەتەوێ دایان کەنی بۆچی ئەوەندە خەفەتان بە پیاوی دەدەی؟..."

پیرەپیاو هەر بەو دەستە لەرزۆکانەی جلەکانی داکەندو لە گۆشەیەك داینان.

دۆردوو نووکی خەنجەرەکەی ئەختێك زیاتر لە لەشی مامەپیرە راکردو ئەراندی:

"دەرپێیەکەشت داکەنە... کراسەکەشت داکەنە."

پیرەپیاو دەلەرزی و بەدەم دەست تێك هاڵانەوە کراسەکەی دادەکەند.

"بە چاوان کاکە، بە چاوان ئاغا... مەمکوژە، کراسەکەشم دادەکەنم."

پیرەپیاو کراسەکەشی داکەند. ژێرکراسی نەبوو کە دایکەنێ... پاشان ملی بە لاوە نا. بە حاڵەتی پاڕانەوە تەماشای دۆردووی کرد.

دۆردوو:

"زووبە... پێویست نیە لەچاومەوە رامێنی... دەرپێیەکەشت داکەنە."

کابرا بە زەحمەت توانی دەرپێیەکەی داکەنێ. دەستی وا دەلەرزین دەتگوت باڵ لێك دەدا. دەستی بە پێش خۆیەوە گرت و رای کردە کن ولاغەکەی.

ولاغ لە قەراغ جادەی راوەستابوو و دەلەوەڕا. پیرەپیاو دەستی راستی هەروا بە پێش خۆیەوە گرتبوو، بە دەستی چەپی هەوساری ولاغەکەی گرت. لاقەکانی تووکن و وەك داری رەق وابوون. ماسولکەکانی لاقی وەك ئێسکی سپی دەرپەڕیبوون. زگی تێقوپاو و بە چرچ و لۆچ بوو. تووکی سنگی سپی بوو. چلکن بوو. شانی چەمابوو. هەموو لەشی هێندی کێچ و گەنە بیگەزن خاڵ خاڵ ببوو. خاڵ خاڵی سوور... هێندێك لە خاڵەکان بە قەد نینۆکی قامکە چکۆلەیەك دەبوون.

پیرەپیاو حەسیرێکی رزیو و چلکن بوو. حەمەد بە دیتنی ئەم وەزعە زیاتر زگی پێ سووتا.

لەو نێوەدا خەبەرهێنەکە کە ئەختێك دوورتر چاوەڕێ و گوێ قوڵاغ بوو، خۆی گەیاندە دۆردوو:

"خەریکن دێن."

دۆردوو:

"سوارەکان خەریکن دێن."

ئەوانی دیکە هێشتا لە بۆسەکانیان دا بەو پیرەپیاوە رووت و بەدبەختە کە بە دوای ولاغەکەی دا دەڕۆیشت پێدەکەنین.

پیرەپیاو، هەرچەند هەنگاو دەڕۆیشت و بە ترس و خەفەتەوە ئاوڕێکی وەسەر جلەکانی دەدا. دیسان چەند هەنگاوێك دوورتر دەکەوتەوەو دووبارە دەگەڕایەوە.

"دۆردوو بانگی کرد:

"وەرە پیرە، وەرە... وەرە شت و مەتەکانت هەڵگرەو بڕۆ... نێچیرەکانی ئێمە خەریکن دەگەنێ... شانست هەبوو. وەرە شتەکانت هەڵگرە..."

هەر ئەو پیاوە پیرە کە ئەوەندە هیلاك و مردەلۆخە دیار بوو، لەگەڵ بیستنی ئەم قسەیە، بەخێرایی و زیتی و زرینگییەك کە هیچ وەخت لە کەسێکی وا چاوەڕوان نەدەکرا، بە غاردان خۆی گەیاندەوە جلەکانی و جلەکانی کە بریتی بوون لە بوخچەیەکی کۆن و دڕاو و چڵکن و رزیو لەبن هەنگڵی ناو بە غار خۆی گەیاندەوە ولاغەکەی. ولاغ لە پێشەوەو پیرەپیاو بەدوای دا غاریان دەدا...

حەمەد نێوچاوانی گرژ و تاڵ بوو. دەستەکانیشی دەلەرزین. پێی خۆش بوو هەموو فیشەکەکانی بێ ئەوەی یەکێکیشیان بە خەسار بچێ، لە مێشکی دۆردوو بەتاڵ بکا. بەڕاستی، بە زەحمەت پێشی خۆی گرتبوو کە وا نەکا.

دۆردوو، ئەمجارە بە دەنگێکی نێرتر نەڕاندی:

"تەسلیم."

هەر پێنج سوار وێکڕا لغاوی ئەسپەکانیان توند کرد.

دۆردوو رایگەیاند:

"ئەگەر یەك هەنگاوی دیکە هەڵێننەوە، ئەگەر مووتان لێ‌ببزوێ، تەقەتان لێ‌دەکەم. بەخوا نایەڵم یەکێکتان بە زیندوویی دەرچێ."

پاشان دەستووری بە هاوکارەکانی (کە لە بۆسەکانیان دا دانیشتبوون) دا:

"ئەمن دەچمە پێشێ. ئەگەر موویان لێ‌بزووت هەمووتان لە هەموو لایەکەوە وەبەر دەسرێژیان بدەن."

لەسەرەخۆ، هەروا بزانە هیچ نەبووە، بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە لە سوارەکان نیزیك بووەوە:
"دابەزن."
سوارەکان بێ ئەوەی متەقیان لێ بێ، دابەزین.
زین و رەختی ئەسپەکان زیوکاری کرابوو. سوارەکان هەموویان بە سەرو سیما بوون. دوو کەس لە سوارەکان وەك شارستانییان دەچوون. یەکیان کوڕێکی حەڤدە ساڵە دیار بوو.
دۆردوو دەستووری بە هاوکارەکانی دا:
"سێ کەستان وەرنە پێشێ."
راست لەو کاتەدا کوڕە حەڤدە ساڵەکە لە بانگی گریانێی دا:
"توخوا مەمکوژن... هەرچی بتانەوێ دەیدەم... مەمکوژن."
دۆردوو رووی کردە منداڵەکە:
"بێچووە شێر، ئەگەر بتەوێ گیانت دەربەری، دەبێ رووت و قووت بیەوە.
کوڕەکە لە ئەکاو هاواری کرد:
"ئەودەم نامکوژن؟..."
ئەمەی گوت و دەستی کرد بە داکەندنی جلەکانی و بە شێوەی سوپاس کردن پەیتا پەیتا دەی پرسی:
"کەوابێ نامکوژن؟..."
کوڕێژگە لە چاو لێك نانێك دا جلەکانی و تەنانەت کراس و ژێرکراس و دەرپێیەکەشی داکەندو بردنیە لای دۆردوو:
"فەرموو."
ئەوانی دیکەش بێ ئەوەی قسەیەك بکەن رووت بوونەوە. تەنیا دەرپێیەکانیان دانەنا.
دۆردوو:
"بەرێزان دەبێ دەرپێیەکانیشتان داکەنن... ئەسڵی کار دەرپێیەکانە."
هیچیان قسەیان نەکرد. لێکرا دەرپێیەکانیشیان داکەندو دەستیان بە پێشیانەوە گرت و وەڕێ کەوتن.
چەتەکانیش جل و بەرگ و ئەسپەکان و هەموو شتەکانیان هەڵگرت و روویان کردەوە چیا.
وەختێك لە بناری وەسەر دەکەوتن، دۆردوو رووی کردە حەمەد:
"شانست باشە چکۆڵ. ئەمڕۆ دەسکەوتمان خەراپ نەبوو. هەزارو پێنسەد لیرە پووڵی نەغدیان پێ بوو، ئەسپ و جلەکانیشیان شیرنییەکەی... جلەکانی ئەو کوڕە راست بە

ئەندازەی خۆتن... نوێ نوێ... جاشەکەرەت دیبوو چ زەرەزەرێکی دەست پێ کردبوو؟...
دیار بوو زۆری روحی خۆی خوش دەویست."

کاتێك گەیشتنە نیزیك "شاخەرەش" دۆردوو دابەزی و هەرکە دابەزی جلەکانی ئەو کورەی لەبەر حەمەد کردو دەستی کرد بە تەماشا:

"ماشەڵڵا، ماشەڵڵا... جلەکانی ئەم توتکە سەگەت چەند لێ‌جوانن... راست بوویە منداڵە مەدرەسەیی‌یەك..."

حەمەد لەم جلانەدا کە هی کەسێکی دیکە بوون، خۆی بە خوێری و چکۆڵە دەهاتە بەرچاو. خەریك بوو دەخنکا. لە شەرمان دەتگوت دارزی. نەیدەزانی چ بکاو بۆ کوێ بچێ. پرسیارێك کە بە درێژایی ئەم رێگایە لە دڵیدا بوو و نەیدەوێرا دەری برێ، سەرەنجام درکاندی:

"باشە هەموو شتێکی ئەوانەمان ئەستاند... بەڵام تێ‌نەگەیشتم بۆچی دەبوو دەرپێ‌یەکانیشیان لێ‌بستێنین؟..."

پاش ئەم پرسیارە ئەختێك ویژدانی ئاسوودە بوو، ئەگەر بۆ تەنیا تاوێکیش بووبێ، جلەکانی ئەو کورە غەریبەیەی لەبیر چوونەوە.

دۆردوو بەم پرسیارە پێکەنی:

"لەبەر خاتری ناوەکەیەتی... لەم وڵاتە هیچ یاغی‌یەکی دیکە دەرپێ لە پێی خەڵك داناکەنێ... ئەمن دەرپێ‌یەکانیشیان لەپێ دادەکەنم تا دیار بێ ئەمانە دۆردووە شێت رووتی کردوون..."

## (١١)

گەرمای پاش باران دەستی پێکردبوو، گەرمایەکی شەدارو لە شانان گران... تەرمی خوێناوی و قوڕاویی "وەلی"یان لە حەساری ماڵی عەبدیخان لەسەر جلێك درێژ کردبوو. جلە تەڕو خوێناوییەکانی بە لەشیەوە نووسابوون. مێشە شینکە شڵخەیان لەسەر دابوو. باڵیان وەك تەڕایی دەبریسکایەوە.

مردوو وەك غەریب، وەك تەنیا دەچێ... زەردو بێڕەنگ و هەردوو دەستی بەوەزعێکی خەفەتبارەوە کەوتبوونە سەر زەوی.

یەکێك لە گوللەکان شانی چەپی عەبدیخانی سمی بوو. گولله پاش کون کردنی شانی، کەوانەی کردبوو و لەژێر ئێسکی شانیدا مابووەوە. گوللەکەی دیکە وە ڕانی چەپی کەوتبوو، و بێ ئەوەی لە ئێسکی بدرێ لەودیوێ دەری کردبوو.

برینەکانی عەبدی خان هەر لەو لێڕەواره بە دەستی حەکیمی ئاوایی برژابوونەوەو بەسترابوون. بۆیە عەبدیخان خوێنێکی وای لێنەهاتبوو، بەڵام داد لە دەست ژانی ئەو گوللەیە کە لە ژێر ئێسکی شانی دا گیری کردبوو... ئەم ژانە زۆری ئازار دەدا. سەر دڵیشی پێیەوە دێشا.

عەبدی دوو کوڕی چاردەو شازدەی ساڵەی هەبوون. کوڕەکان و خزمەکان و نۆکەرەکان لە دەوری عەبدیخان هاڵابوون. هەموو چاوەڕێ بوون خان وەقسە بێ و شتێك بڵێ. بەڵام عەبدیخان جار جار لەسەرەخۆ ناڵەیەکی دەکردو هیچی نەدەگوت. ژنەکانی لە ژوور سەری دانیشتبوون بە بێدەنگی دەگریان.

عەبدی خان لە نەکاو بە ترس و نیگەرانییەوە چاوی هەڵێنان و پرسی:

"خوشکەزام چۆنە؟... وەلی لە چ حالٚ دایە؟."

ژنەکان بە هەنیسك دانەوە جوابیان دایەوە.

عەبدی خان:

"کەوابوو یانی..."

یەکێك لە رەعیەتەکان:

"بۆخۆت خۆش بی خان... خوا سێبەری تۆمان لەسەر کەم نەکاتەوە."

چاوەکانی عەبدی خان بریسکەیەکیان دا:

"ئەو نەحلەتی‌یە؟..."

نەیتوانی قسەکەی تەواو بکا. دێهاتی‌یەکان ملیان بە لاوە ناو بە دەنگێکی نەرم جوابیان دایەوە:

"رای کرد."

عەبدی لە چاوانیانەوە راماو پرسی:

"ئەو سەلٚیتەیە چی؟..."

وەلاٚمیان دایەوە:

"گرتمان. هێنامانەوە."

عەبدی خان چاوەکانی لێك نان و سەری نایە سەر سەرینەکەو دەستی کرد بە نالٚین. پاش ماوەیەك دووبارە چاوی هەلٚێناو پرسی:

"خۆ لە کچەکەتان نەدا؟."

وەلاٚمیان دایەوە:

"نەخەیر خان, هیچمان لێ‌نەکرد."

"چاکتان کرد. نەدەبوو پتەیەکیشتان لێ‌دابایە."

وەلاٚمیان دایەوە:

"دلٚنیا بە خان, پتەیەکیشمان لێ‌نەداوە."

"چاکتان کردوە."

هەمووان دەیان زانی کە عەبدی خان, ئەگەر خەتایەکی لە رەعیەتێك دیبایەو لێی نەدابایە, حەتمەن نەخشەیەکی دیکەی هەبوو. هەمووان دەیان زانی کە ئەو جۆرە کەسانە هەتا مردن ناچار بوون سزای ئەو خەتایە بچێژن. ئەگەر بە لێدان تەمبێ کرابان نیشانەی ئەوەبوو کە گوناحەکەیان لەبیر دەبرایەوە. بەلاٚم ئەگەر لێدانیان نەخواردبایە, بەو مانایە بوو کە تا ماون دەبێ رەنج بکێشن.

ئەو لادێییانەی خەتایەکیان دەکرد، دەرکی ماڵی عەبدیخانیان بەجێ نەدەهێشت بۆ ئەوەی لێدانێکیان بەرکەوێ و رزگاریان بێ.

خان دووبارە چاوەکانی لێك نانەوە. دەم و چاوی زەردو درێژ بوون. پاش ماوەیەك کاتێك سەرلەنوێ چاوی کردنەوە، بە خۆی نەبوو شەپۆلێکی خۆشحاڵی بە روخساری دا هات و رابرد.

پرسی:

"هەموو ئەوانەی لە لێرەواری لەگەڵ من بوون، لێرەن؟."

گوتیان:

"بەڵێ خان، بێجگە لە عەلیپەشەل و رۆستەم"

بە توندی دەستووری دا:

"برۆن ئەوانیش وەبینن و بیان هێننە ئێرە."

تاوێك دواتر دەنگی شیوەن و گریان لە حەساری بەرز بووەوە. دایك و باب و هاوولاتەکانی وەلی خەبەریان زانیبوو و هاتبوون. دایك خۆی بەسەر تەرمی قوڕاوی و خوێناویی کوڕەکەی دا کێشابوو، تەرمی کوڕەکەی ماچ دەکردو لە سەرو سنگی خۆی دەدا. بابی دەتگوت دڵۆپێك خوێن چیە، لە لەشی دا نیە. رەنگی بەردابوو. دەستێکی لەسەر دڵی دانابوو، و لە سووچێك راوەستابوو. بە هەزار زەحمەت دایکەکەیان لەسەر تەرمەکە هەڵگرت و بردیانە قەراغێك. بابیش کە توانای جووڵانی نەبوو، بە زەحمەت تەکانێکی دایە خۆی. بابی وەلی پیاوێکی داڵەگۆشتی کەڵەگەت بوو. دەم و چاوی زۆر درێژو نێوچاوانی زۆر پان بوو. کراسێکی بێیەخەو گوڵدۆزیکراوی لەبەردا بوو. پانتۆڵەکەی قوماشێکی دەزووی خەت خەت بوو. کاڵەیەکی چەرمی خاوی لەپێدا بوو. هێشتا تووکەکەی بەرنەدابوو. کاتێك لە جێی خۆی هەستا گێژ و بێ واز لەقوژبنێك راوەستا. بە بێوازی هەردوو دەستی بەردابوونەوە... غەمێکی ئەوەندە تاڵ لە چاوانی دا دەخوێندرایەوە هەر باسی نەدەکرا. هەرچەند دەیکرد نەیدەتوانی چاو لە تەرمی کوڕەکەی بکا. دڵی بەرایی نەدەدا.

یەکێك هاتە لای، چووە بن پیلی و بردیە ژوور سەری عەبدیخان. کاتێك عەبدی خان چاوی پێی کەوت، بە داخ و خەفەتەوە سەری راوەشاند:

"قەزاو قەدەر! ..."

باوك لە پڕ پێشی فرمێسکەکانی بەرەڵا کرد:

"چ قەزاو قەدەرێك؟... قەزاو قەدەری چی عەبدیخان؟... ئەمە نە قەزاو قەدەرەو نە هیچ... پشیلەش، سەگیش، باڵندەش ئەوەندەی سەر بخەیەسەر، جارێك دەترسێ، دوو جار

دەترسێ... بەڵام جاری سێیەم دەست لە گیانی خۆی دەشواو پێت هەڵدەپرژێ و لەت و پەتت دەکا. پیاو نابێ ئەوەندە تێن بۆ خەڵکی بێنێ عەبدیخان... باشە, رایان کرد, کرد... لە کۆڵیان بەوە هەر جەهەننەمێك دەچن با بچن..."

پاش ئەم قسانە سەرلەنوێ بێحاڵ کەوت و دیسان وەك مردوویەك کە تاقە دڵۆپێك خوێن لە لەشی دا نەبێ, لەجێی خۆی رەق بوو. دەتگوت لەو وەختەوە هاتوەتە ژوورێ, نە جووڵەی لێهاتوەو نە قسەیەکی کردوە... هەروا وەك بەردی رەق بێدەنگ و مات بوو.

عەبدیخان ددانی لە چیرەوە بردن:

"بریا لە پێش دا دەمزانی... ئەگەر دەمزانی ئەو زۆڵی ناپاکە سەرەنجام ئەم بەڵایەم بەسەر دێنێ! ... ئێستاش راوەستە بزانە چ دەردێکیان دەدەمێ... شەرت بێ کارێکیان پێ بکەم هەم ئەو نەحلەتێیەو هەم ئەو سەڵیتەیە رۆژی سەد جار مەرگی خۆیان بە ئاوات بخوازن... رۆژی هەزار جار... چما لێیان دەگەڕێم؟... پێت رایە لێیان خۆش دەبم؟... بەخوا سەرەوبن هەڵیان دەواسم و کایان لەبن لووتی دا دەسووتێنم... راوەستە با بۆم هەڵکەون, ئەودەم دەیبینی!."

پاشان رووی کردە دەوروبەرەکەی:

"وەدوایان کەوتن یان نا؟."

"ئێوارێ وەدوایان کەوتوون."

"خەبەرتان بەژاندارمری داوە؟."

"ئێوارێ خەبەرمان داوە."

"ژاندارمە هاتوون یان نا؟."

"هەتا ئێوارێ دەگەنە جێ... خەبەریان بە دەوڵەت داوە, چاوەڕێن مەئمووری لێکۆڵینەوەی دەوڵەت بگاتێ. دەبێ پزیشکی حکوومەتیش بێ."

"بەڵێ, حەتمەن دەبێ دوکتۆر هەبێ... حەتمەن... پێش ئەوەی ئەمانە بگەنە جێ خەبەر بدەن هەموو ئەوانەی دوێنێ ئێوارێ لەگەڵ من لە جەنگەڵ بوون, بێنە ئێرە... خەبەر بە هەموان بدەن... هەموویان بێننە ژوورێ..."

یەکێك لە پیاوەکان:

"عەلیپەشەل و رۆستەم لە دەرێن, ئەوانیش ئێستا دێن."

"کەوابێ هەموویان لێرەن."

"بەڵێ خان."

عەبدیخان:

"کەوابێ بە هەموویان بڵێن زووتر بێن و ئەوانی دیکەش بچنە دەرێ."

بابی وەلی هەر بەو بێحاڵی و بێ وازییە هەستاو لە سەرەخۆ چووە دەرێ. تەنانەت ئاوڕیشی وەسەر عەبدیخان نەدا. ئەوانی دیکەش بە دوای وی دا لە هۆدەکە وەدەر کەوتن.

لە جیاتی وان، ئەوانەی دوێشەو چوویبوونە لێرەوار ژوورەکەیان پڕ کرد. هەموویان لە دەوری عەبدیخان کۆزیلکەیان بەست. هەموو دەیان زانی قسەی عەبدی خان ئەوە دەبێ کە ئاواو ئاوا شایەتی بدەن.

هەروەخت کاربەدەستی دەوڵەت و ژاندارمە دەهاتنە وێ، ئەمانە حەقیان نەبوو لە خۆیانەوە هیچ بڵێن. ئەو شتانەی دەیان گوتن، عەبدیخان فێری دەکردن و ئەمانیش قسەکانیان لەبەر دەکردو وەك بلبل بۆ ژاندارمەو کاربەدەستەکەی دەوڵەتیان دووپات دەکردنەوە. کاتێکیش ئەوەی لەبەریان کردبوو، تەواو دەبوو، ئەگەر پرسیارێکی دیکەیان لێکرابایە، دەیانگوت:

"لەوەندە زیاتر هیچ نازانین."

هەر پرسیارێکیان لێکرابایە، وەڵامیان هەر ئەمە بوو:

"نازانین."

عەبدیخان تەماشای روخساری هەموویانی کرد. هەموویان رەنگیان زەرد هەڵگەڕابوو. پاشان چاوی لەوان هەڵگوازت و چاوی بەردانەوە. ماوەیەك هەروا بێدەنگ مایەوە. کاتێك سەری بەرز کردەوە سەرلەنوێ چاوی لە یەك یەکیانەوە بڕی. بەحاڵ و دوو بەلا لێوی بزووتن. بە دەنگێکی کزەوە گوتی:

"باش گوێتان بکەنەوە براینە... لە پێش دا دەست لەسەر ویژدانی خۆتان دانێن... هەموتان داتان نا...؟ زۆر باشە... ئێستا هەر بەو جۆرە کە ویژدانتان لەبەر چاوتانە بیر بکەنەوە... هەرچی دەپرسم جوابم بدەنەوە... ئەگەر ئەو سەگەی بە ئێسك و وردکە نانی دەرکی خۆتان گەورە بووە، رۆژێك هار بێ و ژن و منداڵتان بگرێ، چی لێدەکەن؟... وەڵامی ئەم پرسیارەم لێتان دەوێ، بەڵام دەستتان لەسەر ویژدانتان بێ... یەك قسەش بە پێچەوانەی ویژدانتان مەکەن..."

ماوەیەك چاوی لە چاوی هەر کامێکیانەوە بڕی:

"ئێستا پێم بڵێن... ئەگەر ئێوە بوونایە چتان دەکرد؟."

پاش ئەم پرسیارەش دیسان خێرا چاوێکی بە هەموویان دا گێڕا:

"چتان لێ دەکرد؟."

لادێیی‌یەکان کە نەیاندەزانی بڵێن چی، جوابیان دایەوە:

"ئەوەمان دەکرد کە دەبوو بیکەین."

عەبدی‌خان چاوی لە چاویان کرد:

"یانی چۆن؟."

"هەر جۆرێك تۆ بفەرمووی خان... هەر جۆرێك تۆ بتەوێ."

خان، وەك ئەوەی دێهاتی‌یەکان شتێکی زۆر گرنگیان گوتبێ، قسەکەیانی پەسند کرد:

"ئافەریم براینە... سەگی دەرگای خۆم کوڕی کوشتووم... یەکیان هەڵاتوەو... بەڵام دەگیر دەکەوێ. ئەگەر ببێتە تەیرو بە باڵان بفڕێ، دیسان دەگیرم دەکەوێ... رزگار بوونی نیە... بەڵام شەریکە گوناحەکەی لێرەیە... لەجێ دا هەر بەڵایەك بەسەر ئێمە هاتوە، لەبن سەری ئەو کچە دایە... وەلی خان کچەکە کوشتی... وانەبوو؟... هەموومان بە چاوی خۆمان دیتمان کە کچەکە دەمانچەکەی لەوەلی خان دا... وەلی، کچەکە کوشتی... حەمەدۆك تەقەی لە من کردو کچەکەش لە وەلی... هەردووکیشیان دەمانچەی شەش تیریان پێ بوو... چما هەمووتان بە چاوی خۆتان نەتان دی کە لە پێش دا کوڕەکە سێرەی لە من گرت و تەقەی لێ‌کردم و پاشانیش کچەکە سێرەی لە وەلی گرت و تەقەی لێ‌کرد؟."

عەبدی بانگی کرد:

"کوڕینە... یەکێکتان بێتە ژوور..."

کوڕە گەورەکەی عەبدی‌خان هاتە ژوور:

"ئەو دەمانچەیە بێنە کوڕم."

کوڕەکە دەمانچەیەکی نوێی لە نێو دۆڵابی‌یەك دەرهێناو دایە دەست باوکی. عەبدی‌خان چەکەکەی وەرگرت و بەوانی دیکەی نیشان دا:

"هەمووتان باش تەماشای بکەن. ئەمە هەر ئەو شەش تیرە نیە کە لە کچەکەتان نەستاند؟... ئەمە هەر ئەو شەش تیرە نیە کە کچەکە وەلیی پێ کوشت؟... باش سەیری بکەن، بزانن خۆیەتی یان نا..."

چەکەکە دەست بە دەست گەڕاو گەیشتەوە دەستی عەبدی‌خان.

عەبدی‌خان پرسی:

"هەمووتان دیتان؟."

گوتیان:

"بەڵێ دیتمان خان."

"ئەمە هەر ئەو شەش تیرەیە کە بە دەست کچەکەوە بوو... هەر ئەو شەش تیرەیە کە کچەکە وەلیی پێ کوشت... وەختێك وەلی کەوت، دەمانچەکەش لە دەست کچەکە کەوتە خوار. پاشان حاجی داهاتەوەو شەش تیرەکەی هەڵگرتەوە. کچەکەش هەر حاجی گرتی. وا نیە؟... هەمووتان بە چاوی خۆتان نەتان دی؟ حاجی... ئەوەی دەیڵێم وایە یان نا؟."

حاجی پیاوێك بوو قوڵەبنە، رەنگ شین، لووت شەپیوور، زۆر پیر بوو، کوێن لەبەر، پیس و چڵکن و چاو نەشۆرو تیغ لێنەدراو... هەر دەتگوت لە سەرانگوێلکان هەڵگێراوەتەوە.

حاجی:

"راستە، دەبەرت مرم... هەروا بوو کە فەرمووت... وەختێك شەش تیرەکە لە دەستی کچەکە بەر بووەوە، بۆخۆم داهاتمەوەو هەڵم گرتەوە. کچەکە پێی پێوە نا هەڵێ... یانی دەستی کوڕەکەی گرتبوو و بە جووت رایان دەکرد. مەبەستم لە کوڕەکە هەر ئەو حەمەدە زۆڵ و ناپاکەیە. بەڵێ خان گیان... دوو بە دوو دەستی یەکتریان گرتبوو و هەڵدەهاتن... من لە دواوە خۆم گەیاندێ و خەجیجم لە پشتەوەرا گرت، نەمهێشت دەرچێ. خەجیج لە پێش چاوی خۆم بە دەمانچە لە وەلیخانی دا."

حاجی ئەم قسانەی کردو سەری داخست. وەك ئەوەی فرمێسکی هاتبێ، چاوی پاك کردنەوەو لە سەری رۆیشت:

"ئەی وەلی گیان، وەلی خان... لەو دنیایەدا خەراپەت بۆ کەس نەبوو، وەلی خان گیان... سەرەنجام ناپیاوان ئەمەیان بەسەر هێنای... خوێنیان رشتی... وەلی خان گیان... هەمیشە ناپیاوان، پیاوان دەکوژن وەلی خان گیان، تا ئێستا کێ دیویە پیاو پیاوان بکوژێ... ناپیاوان کوشتیانی وەلی خان گیان... بە قوربانی ئەو تەرمەت بم کە بە گوللەی سەڵیتەیەك کەوتە سەر زەوی وەلی خان... چەتیوە خوا نەناسە لە پێش چاوی خۆم گوللەی لە سنگت دا وەلی خان گیان... چ دەست و چەکێکیشی بوو حەرامزادەیە... خوا دەزانێ چ کافرێك فێری سێرە گرتنی کردبوو وەلی خان گیان..."

عەبدیخان:

"هەمووتان گوێتان لێبوو؟... مەگەر وا نەبوو؟... چما هەرچی گوتی وشە بە وشەی ڕاست نەبوو؟... زەکەریا, لەگەڵ تۆمە... زەکەریا چما بە چاوی خۆت نەتدی؟."

زەکەریا:

"هەمووی ڕاست بوو خان... ڕاست ئەو جۆرە بوو کە حاجی گوتی."

"عەلیەشەل... تۆش چاوت لێ بوو, وا نیە؟."

عەلیەشەل لەمێژ بوو دەیەویست پۆرگی دڵی بدڕێ:

"ئەمن؟... ئەمن هیچم نەدی خان... هیچ شتێك... ئەمن هەر ئەوەندە دەزانم کە شوێن گێڕان بۆ من بوو بە ژانەسەر. دێهاتیەکان ئیدی تەماشای چاوی من ناکەن... نە دێهاتیەکانی خۆمان, نە دێهاتیەکانی ئێوە... منداڵەکانیشم کە دەم بینن ڕووم لێ وەردەگێڕن. ژنەکەم وەختێك تەماشام دەکا, بێزی لێم هەڵدەستێ. حازر نیە یەك وشەش قسەم لەگەڵ بکا. ئەمن هیچم نەدیوە خان, هیچ شتێك... هەر ئەوەیە کە پێم گوتی. ئەمن حەمەدیشم نەدی تەقە لە تۆ بکا."

عەلیەشەل پاش ئەم قسانە هەستاو بە ڕق هەستاوی و بۆڵە بۆڵەوە لە هۆدەکە وەدەرکەوت. هەموو گیانی ببووە یەکپارچە ڕق و سەرکێشی. عەلیەشەل وەك پارچە ئاگرێك لە ژووری چووەدەر.

عەبدیخان لە هیچ کەس چاوەڕوانی ئەو جۆرە جوابەجەنگی و سەرکێشیە نەبوو. تێك چوو. خەرفا. لێوی پێ داچۆڕان. کاتێك کەمێك هاتەوە سەرەخۆ, دەهری بوو. سەری ڕاوەشاند. دەتگوت دەیەوێ وەدوای عەلی بکەوێ. لە نێو جێیەکەی هاتە دەرو نەڕاندی:

"عەلیەشەل, عەلیەشەل... ئیدی ئەتۆ لەم دێیە جێت نیە... هەر گەیشتیەوە نێو دێ, سڕوسیپاڵی خۆت تێك نێ و هەر جەهەننەمێك دەچی, بچۆ. تاقە ڕۆژێك خۆت بگنخێنی, پیاوەکانم دەنێرم ماڵەکەت بەسەر دا وێران بکەن. گوێت لێبوو گوتم چی؟... گوێت لێ بوو عەلیەشەل؟..."

لە پاشان لەبەر خۆیەوە دەستی کرد بە پرتەو بۆڵە:

"بێشەرمانە... نمەك نەناسانە... بێ ناموسانە..."

ئەمجار زاری کەفی کرد:

"هەمووتان دیتان, وا نەبوو؟."

هەمووان یەکدەنگ جوابیان دایەوە:

"بەڵێ دیتمان خان, ڕاست ئەو جۆرە بوو کە فەرمووت."

"دەستتان لەسەر ویژدانتان دانێن... براینە, هاوولاتینە... بستە منداڵێك تەقەی لە مـن کردوە... خەجاڵەتیی نەکێشاوە... تەقەی لە ئاغای پێنج دێیان کردوە... لە ساحەبی پێنج ئاوەدانیيان... ئەویش لەسەر کچەتیوێك... ئەگەر ئەمن کوژرابام, ئێوە چیتان بەسەر دەهات؟ باش بیری لێبکەنەوە, ئەگەر من لەنێو چووبام وەزعی ئێوە چی لێدەهات... کچێك کە من ویستوومە ببێتە بووکم وەدوای قوون رووتێك بکەوێ و بڕوا؟ ئاخر ئەمە لە چ کتێبێك دا نووسراوە؟ دەستتان لەسەر ویژدانتان دانێن... ویژدانی خۆتان بکەنە حەکەم... گوێتان لە دەنگی ویژدانتان بێ... هەرچی ویژدانتان دەڵێ وا بکەن..."

"مووسا تەمبوو":

"هەر ئەوەیە کە خان فەرمووی... دەستمان لەسەر ویژدانمان دانا."

خان ئافەریی پێ گوت:

"ئافەریم مووسا, بارك الله."

"قەدیرەکەچەڵ":

بۆ خاتری ئاغامان هەر کارێك بێ دەیکەین... هەموومان دەستمان لەسەر ویژدانمان دانا."

خان:

"خوا هەمووتان بپارێزێ... ئەمساڵ لە هەمووتان تەنیا چواریەکێك ملکانە وەردەگرم... حەیوانەکانیشم بە خۆتان بەخشی... بۆخۆتان... ئێستا بچن باش دەستتان لەسەر ویژدانتان دانێن تا بتوانن باش وەڵامی حکوومەت بدەنەوە..."

هەموویان بە پێکەنین و خۆشحاڵییەوە لە هۆدەکە وەدەرکەوتن:"چوار یەکێکی بەرهەم... گاجووتەکانیش بۆ خۆیان... شانسیان هێنابوو..."

هەموویان لە حەسارێ پەنجا میترێك دوور لە تەرمەکە دانیشتن و خەریکی لەبەرکردنی شایەتییەکەیان بوون:

"حاجی بوو... ئەدی حاجی خۆی بوو کە داهاتەوەو شەش تیرەکەی لە عەرزی هەڵگرتەوە... کچەکە دەستی کوڕەکەی گرتبوو و بە جووت هەڵدەهاتن... لەپڕ دەستی کچەکە لە دەستی کوڕەکە بەر بوو... ئێمەش گەیشتینە سەری و گرتمان..."

حاجی قسەکەیانی بڕی:

"نا... وا نەبوو. بڵێن: حاجی ـ واتە من ـ گەیشتە سەریان و لە پشتەوەڕا باوەشی بە کچەکەدا کردو نەیهێشت دەرچێ... لە پاشان دەڵێن وەختێك حاجی ـ واتە من ـ گەیشتە سەریان و لە پشتەوەڕا باوەشی بە کچەکە دا کرد, کوڕەکە ـ واتە حەمەدۆك ـ دەستی کچەکەی بەرەڵا کردو خۆی دەرباز کرد..."

حاجی گەیشتە سەریان و لە پشتەوەڕا باوەشی بە کچەکە داکرد. وەختێك حاجی کچەکەی گرت, کوڕەکە ـ واتە حەمەدۆك ـ دەستی کچەکەی بەرەڵا کردو هەڵات."

"کچەکە زۆریش دەست ڕاست بوو. کەس نەیدەزانی ئەو حەرامزادەیە سێرەگرتن لە چ خوانەناسێك فێر بووە... سێ گوللەی لەسەر یەك لە سنگی وەلیخان دان, یەك گوللەش چییە, بە خەساری نەدا... وەختێك وەلی خان کەوتە عەرزی, دەمانچەکەش لە دەستی کچەکە پەڕی و کەوتە سەر زەوی... پاشان حاجی داهاتەوەو شەش تیرەکەی هەڵگرتەوە."

حاجی:

"ڕاست بوو... ئە ئاوا. ئێستا دانیشن و ئەمانە باش لەبەر بکەن, تا ئەگەر حکوومەت هات لە نەکاو لەبیرتان نەچێتەوە."

لای پاش نوێژێ, لە پێش دا دوو ژاندارمە بە تفەنگ و سەرەنێزەوەو بە دوای وانیش دا پزیشکی حکوومەت و بازپورس و وەکیل باشییەکی ژاندارمری لەبەر دەرگایماڵی عەبدیخان دابەزین.

لێفەیەکی چیتی گوڵداریان بەسەر تەرمەکە هەڵکێشابوو. دەستی زەردی مردووەکە لە لێفەی هاتبووە دەر.

دوکتۆر لاوێکی چاوشین و ڕەنگ کچۆڵە بوو. کاتێك لە ئەسپەکەی دابەزی, لێفەکەی وەلادا, بە قێزو بێزەوە تەماشای مردووەکەی کرد. پاشان لێفەکەی بەسەر هەڵکێشایەوە:

"دەتوانن بیشێرن."

هەموویان چوونە ژوورێ. لە پەنای عەبدیخان دانیشتن. هەموویان نێوچاوانیان تێك نابوو. هەرسێکیان لە شار زۆریان ناوی عەبدیخان بیستبوو. وەکیل باشی بۆخۆی یەکێك لە دۆستە باشەکانی عەبدیخان بوو, و لە هەموو دەرفەتێك بۆ دەربڕینی دڵسۆزی و هەستی هاودەردیی خۆی کەلکی وەردەگرت:

"ئەتۆ خەمت نەبێ خان... سەری تۆ سەلامەت بێ, بۆخۆم قاتلەکەت بۆ دەگرم... بۆخۆم دەیهێنمە بەردەستت. بە سزای خۆی دەگا, هەر بیریشی لێ‌مەکەوە... چوار ژاندارمـەم وەدوا خستوون... لە هەر کوێ بێ دەیگرن خان!..."

وەکیل باشی تاپییشی لەگەڵ خۆی هێنـابوو. تاپیەکـەی لـە کۆڵەپشتەکەی دەرهێنـاو لەسەر پنەی نان کردنێی دانا. دوایە ژاندارمەیەکیان بە دوای خەجیج دا نارد.

خەجیج هات, لێپرسینەوە دەست پێ کرا. خەجیج رووداوەکەی بەو جۆرە کە بوو گێڕایەوە.

لە پاشان نۆرەی شایەتەکان هات. پێش هەمووان حاجی شایەتیی دا. ئەویش مەسـەلەکەی بەو جۆرە کە خان دەیەویست, باس کرد:

"کاتێك حەمەد تەقەی لە عەبدیخان کـرد, لـە نـەکاو چـاوم بـەم کـچە ـ واتـە خـەجیج ـ کەوت, دیتم شەش تیرێکی بە دەستەوەیەو سێرەی لە وەلیخان گرتوە. تا ئەمن ویستم بجـوولێم سێ جار رووەو وەلیخان دەستی لـێ‌کێشا. دەست راستییەکەشی شـتێکی سـەیر بـوو! کاتێـك وەلیخان گوتی : ئای کوژرام و کەوتە زەوی, خەجیج هەر لەوێ رەق بوو و شـەش تیرەکـەی لـە دەست کەوتە خوار. منیش داهاتمەوەو دەمانچەکەم لەنێو قورێ دەرهێنایەوە. حەمـەد دەسـتی کچەکە ـ واتە دەسـتی ئـەم خەجیجـە ـ ی گـرت و دوو بـە دوو رایـان کـرد. وەدوایـان کـەوتم و گەیشتمە سەریان. باوەشم بە هەردووکیان دا کرد. حەمەد کـچەکەی بـەرداو بۆخـۆی رای‌کـرد. بەڵام کچەکەم گرت و نەم هێشت رابکا. چما دەکرا بێڵم رابکا؟. بەرەڵام نـەکرد. بـەخوا ئەگـەر هێشتبام رابکا."

خەجیج لەم شایەتییە تێك ڕابوو. حاجی مەبەستی چی بوو؟ سەری لـێ دەرنەدەکرد:

بازپورس:

"خەجیج! دەڵێ ئەتۆ وەلیت کوشتوە. قسەیەکت هەیە؟."

خەجیج:

"پیاوێك بەو زەلامییە چۆن بە من دەکوژرا؟."

قسەکانی حاجی یەکیشیان راست نەبوو, مەبەستی حاجی چ بوو؟ پاشان پرسیار لە زەکەریا کرا. ئەویش راست قسەکانی حاجیی دووپات کردنەوە, نـە وشـەیەك زیـادو نـە وشـەیەك کـەم. شایەتەکانی دیکەش جگە لە قسەکانی حاجی شتێکیان نەگوت.

خەجیج هەستی کرد ئەو ماستە بێ موو نیە. دڵی لەرزی. ترسا. گریانی هات.

بازپورس چەکەکەی بە شایەتەکان نیشان داو پرسی:

"ئەمە بوو ئەو چەکەی لە دەستی خەجیج دا بوو؟."

گوتیان:

"بەڵێ ئەمە بوو."

ئەو شەوە لە ماڵی عەبدیخان مانەوە. دوو دوو دۆشەکیان لەسەر یەك بۆ راخستبوون. چەند بەرخیان بۆ سەر برین و بۆیان کردنە تەندوور کەباب.

بازپورس هەموو جارێ کە بۆ کارێك رێی دەکەوتە دێهاتی کێوپارە، داوای تەندوورکەبابی دەکرد. بێگومان باشترین خواردەمەنی کە لە گۆشت دروست دەکرێ، هەر ئەو تەندوورکەبابەیە.

شەوێ، خەجیجیان لە ژووری تەنیشت خۆیان دا زیندانی کرد. خەجیج کە هەتا ئەو شەوە بیری لە هیچ شتێك نەکردبووەوە، ئەو شەوە سەری وەسەر ئەژنۆی کردبوو و لە گژ فکران راچووبوو. هەتا بەیانی هەر بەو جۆرەی سەری لەنێو ئەژنۆیانی گرتبوو و دەگریا.

بەیانی خەجیجیان لەو ژوورە کە تێیدا زیندانی کرابوو، هێنایەدەر. دوو ژاندارمەکە خەجیجیان وەپێش خۆیان داو کەوتنەرێ. خەجیج رەوانەی بەندیخانە کرابوو.

خەجیج هۆشی بەسەر خۆیەوە نەمابوو. نەیدەزانی چ روودەدا. نەیدەزانی چیی لێدەکەن؟ وەرێ کەوتبوون. خەجیج لاقەکانی تێك دەئاڵقان. ئەمە دووهەمین جار بوو کە خەجیج دەچووە جێگایەکی زۆر دوور لە دێیەکەی خۆیان. جاری یەکەمیان پشتیوان و خۆشەویستەکەی خۆی لەگەڵ بوو. لەو سەفەرەدا دەیزانی دەچێتە کوێ و بۆچی دەچێ. لەو سەفەرەدا بەنیازی پەیداکردنی کێڵگەیەکی چکۆڵەو خانوویەکی گەرم دەچوو. بەڵام لەم سەفەرەدا دڵی پڕ بوو لە نائومێدی و ترس. نەیدەزانی ئەو خەڵکە چیی لەگەڵ دەکەن. کاتێك لە ئاوایی وەدەر کەوتن، تەنانەت دایکیشی نەهاتبوو بەرێی بکا... دەستە خوشکەکانیشی نەهاتبوون. ئەمە زۆر ناخۆش و زۆر تاڵ بوو.

فکرو خەیاڵ بەریان نەدەدا. هێندێ جاریش نە هیچ تێدەگەیشت، نە هیچی دەدی و نە بیری لە هیچ دەکردەوە. تەنیا ئەوەندە بوو، هەرکات وەهۆش دەهاتەوەو چاوی بەو دوو ژاندارمەیە دەکەوت کە لە تەنیشتیەوە دەرۆیشتن، دەلەرزی. دوارۆژ لەبەرچاوی تاریك بوو و هەتا هەنگاوێك دەچووە پێش، هەنگاوێك زیاتر بە تاریکایی دا دەرۆیشتە خوار. لە پێش چاوی خۆی حکوومەتێکی دەدی وەك دێو... ژاندارمەکان و دو پیاوی دیکەی حکوومەت...

رۆژی دواتر وەختێك گەیشتنە شار، خەجیج ئیدی هێزی لێبڕابوو. ماندوو بوو. بەرێگا دا نەدەڕۆیشت، رادەکێشرا. دیتنی شار نەختێك دڵخۆشی کرد. هەستی ئەمین بوونەوەیەك لە دڵیدا پەیدا بوو. ترسەکەی کەمتر بوو. حەمەدی وەبیر هاتەوە. حەمەد هەمیشە باسی گڕێکی زەردی بۆ کردبوو. لە پرتەقاڵ و بەردڕێژی بلووریین و بۆنی کەباب هێندێ شتی بۆ باس کردبوو... گوتبووی لەسەر یەکێك لە خانووەکان ژوورێکی چکۆڵەی دیوە وەك هێلانە لەك لەك، کە لە شووشەی رەنگاوڕەنگ دروست کرابوو. داخوا ئەو خانووە لە کوێ بێ؟ گوتبووی کە هەتاو کەوتبووە سەر شووشەی ماڵێك، شووشەکە رەنگی سوور سوور هەڵگەرابوو... دەتگوت پەنجەرەکە لە مووروووە سوورکە دروست کراوە... لەپڕ حەمەدی وەبیر هاتەوە. دڵی تەزی. داخوا حەمەد ئێستا لە کوێ بێ؟ ئەگەر حەمەدیان گرتبایە حەتمەن دەکوژرا. خەجیج لە دڵی خۆی دا گوتی:"بەستەزمان، حەمەد... لەسەر من وای لێهات..."

تەختی سمیت کراوی ژووری زیندان هەتا گوێزینگی لاقی ئاوی تێدا راوەستابوو. بۆچی وابوو؟ بۆچی ئاویان تێکردبوو؟... کەس نەیدەزانی. ئێرە بۆنیشی زۆر ناخۆش بوو، دەتگوت بۆنی ئاودەستانە. تاریکیش بوو، وەك پاشخانە. تەنیا پەنجەرەیەکی هەبوو کە ئەویشیان توند توند داخستبوو.

خەجیجیان لە ژوورێ هاویشت. خەجیج هەر لەوێ شەوی بە ڕۆژ کردەوە، بەڵام دیارە خەو لە چاوی نەکەوت... هەر جێی خەوتنیشی لێنەبوو، بەڵام ئەگەر دڵی خۆش بووایە، دەیتوانی بەسەر پێشەوە بخەوێ. دەتگوت لە تاریکایی‌یەك دایە کە هێندی دەریایەکی پڕ لە ئاوە. چاوی هەر لە دەرگا بوو. پێی وابوو ئەگەر دەرگا بکەنەوە بەرەڵای دەکەن. وای دەزانی هەرچاوی بە رووناکایی بکەوێ، هەموو دەردەکانی ئارام دەگرن.

پێی وابوو کە دەبێ رۆژ بووبێتەوە. نە لە کەلێنی دەرگاو نە لە هیچ کونێکی دیکەوە رووناکایی‌یەك نەدەهاتە ژوورێ. بەڵام وا دەهاتە بەرچاوکە دەبێ رۆژ بێ.

لە نەکاو دەرگا کرایەوە، رووناکایی وەك دۆڵپایەکی قورس کەوتە سەر لەشی و گێژی کرد. ماوەیەکی پێ چوو هەتا توانی کەم کەمە بێتەوە سەرەخۆ. ژاندارمەیەك قۆڵی گرتبوو و دەیبردە دەرێ.

دەرێ پڕ بوو لە خەڵك. کاتێك خەجیج هاتە دەرێ، هەمووان سەریان بۆ لای ئەو وەرسووڕاند. لەنێو هەرواو هۆریادا ئەم قسەیەشی گوێ لێبوو:"ئەم کچەیە کە دەزگیرانەکەی خۆی کوشتوە..." تێگەیشت کە ئەو خەڵکە بۆ دیتنی ئەو کۆ بوونەوە. سەری هەڵنەبڕی تەنانەت ئاوڕێکیشی وەسەر نەدان. ئیدی لە ژاندارمەکانی دەوروبەری نەدەترسا. تەنانەت بوونی ئەوان ورەشی پێ دەدا.

خەجیجیان بردە لای قازییەکی زۆر پیر. قازی لەو قازییانە بوو کە هەزار تاقیکردنەوەیان دیوەو لە هەزار ئاو پەڕیونەوە. سمێڵی بە پشت و زەلام و ملی پڕ لە چرچ و لۆچ بوو. پاش پرسین و نووسینی ناو و شۆرەتی خەجیج پرسیاری کرد:

"تۆ بەوە تاوانبار کراوی کە وەلیی کوڕی مستەفات کوشتوە... قبوڵتە یان نا؟."

خەجیج بە ساویلکەیی وەڵامی دایەوە:

"بە خوا من نەم کوشتوە... ئەمن بە چی دەتوانم پیاوی بکوژم؟... ئەمن هەر ئاوێرم دەست لە چەك و چۆڵە وەردەم..."

قازی، خەڵکی دێهات و ژنە لادێییەکانی باش دەناسی. لە ماوەی چەندین ساڵ دا لانی کەم هەزار جار گوێی لە قسەیان ببوو. قازی دەسبەجێ تێگەیشت کە خەجیج بێگوناحە... تێگەیشتبوو، بەڵام چارەی نەبوو دەبوو رای‌بگرێ، چونکە دەلیلەکان زۆر بەهێز بوون.

بەندی ژنان ژوورێك بوو کە پاشان خرابووە سەر خانووبەرەی بەندیخانە. سپی‌کاریی دیوارەکان هەڵوەریبوو. دیوارەکانی پڕ بوون لە پڕیشکە خوێن. هەتا ئەمڕۆ هەزاران مێش و مەگەز بەدیوارەکانیەوە پلیشابوونەوە. ئەم پڕیشکە خوێنانە هی مێش و مەگەزەکان بوون. میچ و دارو هەڵاش و پەنجەرەو تەواوی دارو دیوارەکەی رزیبوون و خەریك بوون دەپووان... هەموو جێیەکی بۆبرشی لێ دەهات. بۆمیزی لێ‌دەهات. تەنەکەیەکیان لە پاش دەرگاکە دانابوو. بەندییەوانەکە بە خەجیجێی گوتبوو کە ئەگەر شەوێ کاری دەرێی هەبێ، دەتوانێ لەو تەنەکەیەی بکا.

خەجیج بە بێ‌وازی و بێ ئیشتیا پاروویەکی لەو نانە کردەوە کە بەندییەوانەکە بۆی هێنابوو. خستیە زاریەوە، جوی و جوی... بەڵام نەیتوانی قووتی دا، تفی کردەوە.

رۆژی دوایەو رۆژی دواتریش هیچی پێ نەخورا. ئێرە بۆ ئەو دنیایەك بوو سەرانسەر ئەشکەنجەو ئازار. نەیدەتوانی خووی پێوە بگرێ.

رۆژی سێهەم دایکی هات. دایکی ئەوەندە گریابوو چاوەکانی ببوونە گۆمی خوێنێ. دایکی لە پشت پەنجەرەی بەندیخانە دانیشتبوو، دەگریاو دەیگوت:

"کچێ خۆم، کچێ خۆم... کیژە پەنجە بەخەنەکەم... ئەمە چ بەڵایەك بوو بە سەرت هات کچێ خۆم... کارت بە کاری کوڕی خەڵکی چ بوو... بۆچی کوڕی خەڵکت کوشت کچێ خۆم؟..."

خەجیج بۆ یەکەم جار زاری کردەوەو بە رق و سەرکێشییەوە جوابی دایەوە:

"ئەمن چۆنم کوڕی خەڵك کوشتوە؟... ئەمن هەتا ئەمڕۆ چەکم بە دەستەوە گرتوە؟... خۆ هیچ کەس نەزانێ ئەتۆ دەزانی!..."

ئەم تووڕەیی و سەرکێشییە کەمێك دایکەکەی هێدی کردەوە. هەر بە ئەقڵی دا نەهاتبوو کە لەوانەیە کچەکەی ئەو کارەی نەکردبێ. سەرلەنوێ دەستی پێ کردەوە:

"ئەمن چووزانم کیژی دەست و پێ بەخەنەم. هەموو خەڵك دەڵێن خەجیج وەلیخانی کوشتوە. ئەمن چووزانم کیژی دەست و پێ بەخەنە. دەچمە لای عەریزەنووس و عەریزەی پێ دەنووسم... دەڵێم بنووسە کچەکەم لە چەك و چۆڵە دەترسێ... عەبدیخان وەڵامی ناردوە، گوتوویە بە دایکی خەجیجێ بڵێن بە خۆڕایی خۆی ماندوو نەکا. نە عەریزە بنووسێ و نە هیچ بکا... بەڵام بە دزیی عەبدیخان دەچمە لای عەریزەنووس کیژی دەست و پێ بە خەنەم... ئەگەر بزانم سەرم دەبڕێ، دیسان دەچمە لای عەریزەنووس. ئەدی کیژی دەست و پێ بەخەنەم، دەزانم ئەتۆ گوناحت نیە. ئەو کافری خوانەناسە، ئەو حەمەدە روحمی بە کوڕی خەڵك نەکردو کوشتی... ئێستا خەریکن بەسەر کچی منی دا دێنن. ئەو کافرە خوانەناسە بوو کە ماڵی لێوێران کردم. حەمەد بوو کە هێلانەی لێتێك دام... دەچمە لای عەریزەنووس کیژی دەست و پێ بەخەنەم... ئەمن ئەوە دەڕۆم، دەست و پێ بە خەنەم گیان، ئەوە دەڕۆم."

بوخچەیەکی پڕ لە خواردەمەنیی بە دەستەوە بوو کە لەدێ ڕا هێنابووی لە پەنجەرەوە وەژووریی نا:

"ئەمن دەچمە لای عەریزەنووس... دەڵێم عەریزەیەکم بۆ بنووسێ با حکوومەت بیخوێنێتەوەو بزانێ کە کچەکەم بێگوناحە... حکوومەتیش بنیادەمە... روحمی هەیە... بەخۆڕایی تۆ لە بەندێ دا ڕاناگرێ کچێ خۆم."

بە دیتنی دایکی دڵی کرایەوە. پاش ئەوە بۆ یەکەم جار توانی دەرەوە ببینێ. خانوویەکی تازە کە سەری بە سواڵەت داپۆشرابوو. سواڵەتەکان خاوێن بوون و بریسکە بریسکیان دەهات... لە پشتەوەی خانووەکە گومبەزو منارە بەرزو باریکەکانی مزگەوت... لە تەنیشت دیوارێك پەڵە هەنجیرێك بە گەڵای پان و ئەستوورەوە، و دوایە حەسارێکی گەورەو پڕ لە تۆزو خۆڵ... لە پشت پەنجەرەوە ئەو کەسانەی دەدی کە لە حەسارێ دا بۆ ئەم لاو ئەو لادا دەچوون... حەمەد هەموو ئەمانەی بۆ باس کردبوو، و لەبارەی سووری و بریقەداریی سواڵەتەکانەوە زۆری قسە بۆ کردبوو.

بەندییەوان هات و دەرگای کردەوە. پیاوێکی زۆر تووڕەو تۆسن بوو. بە قەڵسییەوە خەجیجی بانگ کرد:

"دەتوانی بێیە دەرێ بایەکت لێ بدا."

بەندییەوان هەموو رۆژێ ئەو کارەی کردبوو. رۆژێ دوو جار بەیانی و ئێواریێ بۆ با لێدران دەرگای کردبووەوە... بەڵام ئێستا یەکەم جار بوو کە خەجیج هەستی دەکرد بای دەرەوەی وێ دەکەوێ و لەو باوێکەوتنە لەزەتی گەڕانەوە بۆ سەر دنیای هەست پێ دەکرد.

پەنجەرەی بەرزی ئەو ژوورە کە خەجیجی تێدابوو، رووی لە دەروازەی زیندان بوو. یەك دوو کەس لە بەندییەکان کاتێك دیتیان خەجیج نەختێك وەخۆی هاتوەتەوەو هۆشی لە کن خۆیەتی، بانگیان کرد:

"خوشکێ... هۆ خوشکێ... هەر کەس چارەنووسێکی هەیە، زۆری بیر لێمەکەوە... بەڵام کابرات باش لەنێو برد...! بەڵێ، خوشکێ، ئەوین و ئەویندارێ ئەم قسانەشی هەیە... ئاشقەڕووتە بوون زۆر کاران بە پیاوی دەکا، هەر خۆش بن ئاشقەڕووتەکان!..."

خەجیج جوابی نەدانەوە، هاتەوە ژوورێ... کەوتەوە بیری حەمەد.

دایکی چووە لای فەخریخانی عەریزەنووس. فەخریخانی عەریزەنووس لەو شێتە هەمیشە مەستانە بوو. هەموو کەس ئەوی بە "فەخرییەشێت" دەناسی.

فەخریەشێت چەندین ساڵ دەفتەردار ببوو، بەڵام لەمێژ ساڵ بوو لەسەر بەرتیل خواردن لەسەر کار وەلا نرابوو، هەر لەو کاتیشەوە ببووە عەریزەنووس. داهاتی فەخری لە عەریزە نووسییەکەی دووسێ هێندەی دەفتەرداریەکەی بوو. خەڵك باوەڕیان وابوو کە:"فەخریخان لە وەکیلیش شارەزاترە". شەو و رۆژ سەرخۆش بوو، و هەموو عەریزەکانی بە مەستی دەنووسین.

فەخرییەشێت سەری وەسەر مێزێکی کۆن و چلکن کە تایپەکەی لەسەر دانرابوو، کردبوو و خەریك بوو ویژینگی دەدان. لە دەوروبەری، بۆنی ئارەق مێشکی پیاوی دەگرت. وەختێك هەستی پێی ئەو ژنەی بیست، سەری هەڵێنا. بە هۆی چەندین ساڵ کارکردن و خووپێگرتنەوە دەنگی پێی ئەو کەسانەی بۆ عەریزەنووسین دەهاتنە لای، لە دوور ڕا دەناسی. دەزگای عەریزەنووسییەکەی فەخرییەشێت لە پەنای دوکانی قەسابێك بوو. بۆیە هەمیشە خەڵك بە لای دا دەهاتن و دەرۆیشتن. فەخرییەشێت بە دەنگی لاقی هیچ کام لەوانە سەری هەڵنەدەبڕی، بەڵام هەستی پێی موشتەرییەکانی خۆی لەدوورەوەو لە نێو ئەو هەموو دەنگە دەنگەدا دەناسییەوە. سەری هەڵدەبڕیو چاوی لە چاوی موشتەرییەکەیەوە دەبڕی و یەکەم قسەی ئەمە بوو:

"باشه، بلێ بزانم..."

کاتێك دایکی خەجیجێش لێی نیزیك بووەوە، فەخریەشێت سەری بەرز کردەوە:

"باشە، بلێ بزانم..."

ژنە لە پیادەڕێیەکەدا دانیشت و پاڵی وەدیوارەکەوە دا:

"خوا بکا بە قوربانی تۆ فەخریخان... مەپرسە چ بەڵایەکمان بەسەر هاتوە."

فەخریخان میدادەکەی لە زاری خۆی راکردبوو، خەریك بوو دەیژی.

"دەسەر سەرت گەرێم فەخریخان، خوا تاقە کچێکی دابوومێ فەخری خان...، تەنیا ئەو تاقە کچە... تەنیا کچێکی پەنجە بە خەنەم هەبوو دەردو بەڵات لە من کەوێ... ئەدی.... خەجیجم... تاقانەکەم... لە بەرت دەمرمەوە ژاندارمەکان کچەکەمیان گرت و هاویشتیانە نێو بەندیخانە، فەخریخان... کچەکەم گیراوە خوایە مەرگم رەپێشت کەوێ."

فەخریخان بەسپایی و لەسەرەخۆ میدادەکەی لە زاری دەرهێنا:

"بلێ بزانم خوشکێ، کچەکەت لەسەر چی گیراوە. ئەمەم بۆ باس بکە..."

"بە قوربانی منداڵەکانت بم فەخریخان، گوێ بگرە با پێت بلێم... کچەکەمیان بۆ خوشکەزای عەبدیخان خواست و نیشانەمان کرد، بۆ وەلیخان... بەلێ فەخریخان گیان... بە برای خۆم بلێم کەوبارە پەروباڵ خەناویەکەمیان بۆ خوشکەزای عەبدی خان نیشانە کرد... ئیدی، ئیدی چیت بۆ باس بکەم فەخریخان گیان! تۆمەز کچەکەمان لەگەڵ ئەو هەتیوە زۆڵەی دوونە ـ دەزانی بە کێ دەڵێم فەخریخان؟... حەمەدۆك، ئەو کافری خوانەناسە...ـ بەلێ فەخریخان، تۆمەز کچەکەمان لەگەڵ حەمەدۆکی بەڵالێدراو یەکتریان خۆش ویستوە...، باشە، ئێمە چووزانین بە قوربانت بم... سەرت نەیەشێنم فەخریخان، شەوێکیان دوو بە دوو لێیان داوە، رۆیشتوون، تۆ خوایە! بریا لاقی شکابایەو ئەو دەردەی بەسەر ئێمە نەهێنابایە. خۆ عەلی شوێن هەڵگری دەناسی؟... لە دنیا دا کێ هەیە نەیناسێ فەخریخان؟... هەر ئەو عەلیەشەلەی دەڵێم... ئاغایەکی بە من و بە تۆ، ئەو عەلیەشەلە شوێنیان هەڵدەگرێ و هەردووکیان هەرتاوا کە لە ئەشکەوتێ دا دەست لە ملانی یەکتر بوون، دەخاتە داو... کوڕەکەش دەمانچەی هەڵدەکێشێ هەم لە عەبدیخانی دەداو هەم لە خوارزاکەی... ئاغایەکی بە من و بە تۆ پاشانیش لێدەداو دەڕوا... بە برای خۆم بلێم هەتیویان بۆ ناگیرێ و ئێستاش کە ئێستایە بۆیان نەگیراوە. بە قوربانت دەبم، کە دەستیان وە حەمەد راناگا، دێن کچەکەی من دەگرن و دەیخەنە بەندیخانەوە... ژاندارمەکان، ئەدی دەبەرت مرم ژاندارمەکان کچە نازەنینەکەمیان گرت و خستیانە بەندیخانە... هەرچی بەسەر ئێمە هاتوە، ئەو حەمەدۆکە بۆتە

باعیس، رەبی خوا کوێری کا فەخریخان. ئەو هەتیوە بوو بە باعیسمان فەخریخان... ئێستا دەڵێن وەلیخان کچێ من کوشتوویە... هەموو دێهاتییەکانیش هەروایان شایەتی داوە، بە قوربانی منداڵەکانت بم. تەنیا ئەو عەلییەشەلە گوتوویە کە ئەمن ناتوانم شایەتی بدەم، ئەوانی دیکە هەمووان شایەتییان داوە... بە ئاغای خۆم بڵێم، عەبدیخانیش دەستووری دا عەلییەشەلیان لە ئاوەدانی دەرکرد... ئیدی چت بۆ باس بکەم فەخریخان گیان، ئەمن باوەڕم کرد کە کچەکەم وەلیخانی کوشتوە... ئاخر هەموو دێیەکە وا دەڵێن... ئاخر خۆ هەموو دێیەکە دوژمنی ئێمە نین فەخریخان گیان...تۆمەز ئەو عەبدییە خوانەناسە دێهاتییەکانی ناچار کردوە کە وا بڵێن... دێهاتییەکانیش خۆ ناتوانن قسە لە قسەی عەبدیخان بکەن... منی قوڕبەسەریش هیچ سەر لەو جۆرە شتانە دەرناکەم فەخریخان گیان... بۆیە باوەڕم کرد. پاشان بە دوای کچەکەم دا هاتم و لە بەندیخانە دیتمەوە... بەڵام کیژە پەنجەبەخەنەکەم، کیژە تاقانەکەم شتێکی دیکە دەڵێ فەخریخان گیان. ئەو دەیگوت دایە چما ئەمن دەزانم چەك بەدەستمەوە بگرم؟ کیژە پەنجەبەخەنەکەم ڕاست دەکا فەخریخان، یاخوا مەرگم ڕەپێشت کەوێ کچی من، تاقانەی من نازانێ چەك بەکار بێنێ... وەبیرم هاتەوە کە کەوبارە پەڕوباڵ خەناوییەکەی من ئەوەندە لە چەك دەترسێ کە ناوێرێ تەماشاشی بکا. بابیشی رقی لەچەك دەبێتەوە، فەخریخان گیان، ئەوەتا خۆمان ناسیوە چەکمان لە ماڵێ دا نەبووە فەخریخان گیان... هەموویان شایەتییی بە درۆ دەدەن دەسەر سەرت گەڕێم... هەمووان قسەیان کردوە بە یەك کە کچە نازدارەکەم لەنێو بەرن، بە قوربانی منداڵەکانت بم... ئەمەیە بەڵایەك کە بەسەر ئێمە هاتوە، بە قوربانت بم خوایە... کچێ من لە تفەنگ دەترسێ... ئەگەر چاوی بە تفەنگ بکەوێ زراوی دەچێ... ئەمانە بۆ حکوومەت بنووسە فەخریخان گیان... بنووسە کە کچەکەم لە تفەنگ دەترسێ... ئەوجۆرەی کە گوتم بۆ حکوومەت بنووسە..."

فەخریخان پەڕە کاغەزەکانی هەڵگرت و خستیە نێو تایپە شەق و شڕەکەی. تەقەتەقی تایپ بەرز بووەوەو فەخریخان یەك تەکان عەریزەی لە پێنج پەڕ دا تایپ کرد. کاتێك کارەکەی تەواو بوو رووی کردە دایکی خەجیج:

"گوێ بگرە خوشکم... گوێت لێ بێ با بۆت وەخوێنم... بزانە چ عەریزەیەکم بۆ نووسیوی."

فەخریخان سیغارێکی بە لێوەوە بوو کە هەر لەم سەری لێوییەوە دەیبردە ئەوسەرو دەیهێنایەوە، بەدەم سیغارکێشانەوە هەموو نووسراوەکەی یەك تەکان خوێندەوەو پرسی:

"چۆنە؟."

دایك:

"دەستت خۆش بێ یاخوا... زۆر باشت نووسیوە فەخریخان."

فەخریخان:

"خوشکم، ئەگەر کەسێکی دیکە بووایە پازدە لیرە کەمترم لێنەدەستاند، بەڵام ئەتۆ دە لیرە بدە... بەخوا عەریزەیەکم بۆ نووسیوی بەرد گوێی لێبێ رادەچەنێ... بەخوا بۆ بەردی بخوێنەوە دەبێ بە ئاو..."

دایك لە حاڵێك دا دەستی دەلەرزین، پووڵێك کە لە لکی بوخچەکەی بەستبوو و گرێ لەسەر گرێ وێی دابوو، کردیەوە:

"دەستت نەرزی فەخریخان، ئیشەڵڵا ئەگەر بەردیش بن، کاریان تێدەکا."

فەخریخان لە کاتێك دا دە لیرەیییە قوراوییەکەی لە دەستی دا دەسووڕاند، جوان بۆ دایکی خەجیجێی باس کرد کە دەبێ عەریزەکە بەرێتە کوێ و بیدا بە کێ و چ بڵێ. وەختێك دایکی خەجیج هەستا بڕوا، گوتی:

"دەبێ بمبووری فەخریخان، ئیشەڵڵا ئەگەر جارێکی دیکە هاتمەوە، هێلکەت بۆ دێنم... ڕۆنەکەرەشت بۆ دێنم..."

دایە هەستاو رۆیشت. ئەو جێیەی دۆزیەوە کە دەبوو عەریزەکەی بداتێ. هەر لەوێ چووە لای یەکێك لەو کەسانە کە کچەکەییان گرتبوو و هێنابوویانە ئێرە. لە پێش دا ترساو دوایە قسەی خۆی کرد:

"کاکی خۆم، بە قوربانت بم یاخوا... کچەکەمت بۆچی گرت و هێناتە ئێرە... بۆچی خستتە بەندیخانە... کچێ من کە نازانێ چەك بە دەستەوە بگرێ، چۆن دەتوانێ پیاوی بکوژێ؟... کچێ من لە تفەنگ دەترسێ... بەمنداڵییش وەختێك چاوی بە تفەنگ دەکەوت، دەترساو بە گریانەوە خۆی لە باوەشی من داویشت و خۆی دەشاردەوە. عەریزەیەکم هێناوەتە خزمەتت، عەریزەکە فەخریخان بۆی نووسیوم، بزانە چی نووسیوە... بگرە بیخوێنەوەو کچەکەم وێدە بیبەمەوە. وەرە با بەری پێت ماچ کەم براڵە، کیژی پەنجەبەخەنەی من هیچ گوناحی نیە... ئاشقی ئەو حەمەدە خوانەناسە بووەو ڕەگەڵی کەوتوە... ئەوەندە... هەموو کچێك شتی وای بۆ دێتە پێش براڵە... کچەکەمم وێدە بیبەمەوە... وەرە با بەری پێت ماچ کەم..."

بازپورس بە تووڕەیی:

"زۆری لەسەر مەڕۆ. عەریزەکەت دانێ و بڕۆ. دەبێ ڕاوەستی هەتا دادگا نەزەری خۆی دەدا."

پاش ئەم وەڵامەش دیسان دەستی کردەوە بەنووسین.

وەختێك دایك گەیشتەوە بەندیخانە ئێوارە بوو. خەجیج لە بەیانییەوە چاوێکی ببووە چوار چاو و چاوەڕوانی بوو:

"عەریزەیەکیان بۆ نووسیوم بۆ بەردی بخوێنییەوە دەبێ بە شاو، ئەگەر بۆ ئاسنیش بخوێندرێتەوە خۆی ڕاناگرێ. هەر ئەوەندە حکوومەت عەریزەکە وەخوێنێ، ئازادت دەکا کچم. هەر بێخوێننەوە دەزانن بێگوناحی. گوتم لە عەریزەکەدا بنووسن کە تۆ لە تفەنگ دەترسێی. نووسییان کە ئەو وەختی منداڵ بووی ئەگەر چاوت بە تفەنگ دەکەوت هەڵدەهاتی و خۆت لە باوەشی من دا دەشاردەوە. فەخریخانی عەریزەنووس بۆی نووسیم... عەریزەیەکی بۆ نووسیم کە ئەگەر بۆ کەسێکی دیکەی نووسیبایە بیست لیرە کەمتری لێنەدەستاند، بەڵام دە لیرەی لە من وەرگرت. نۆشی گیانی بێ، حەڵاڵی بێ. سەدەقەی سەری تۆ بێ. هەرچی هەمە بە قوربانی کیژە نازدارەکەم... با حکوومەت عەریزەکەم بخوێنێتەوە..."

خەجیج:

"خوا بکا."

پاشان چاوی لە چاوی دایکی هەڵەنگوت و سەریداخست:

"دایەگیان... دایە... جارێکی دیکە ئەگەر هاتی خەبەرێکی حەمەدم بۆ بێنە... باشە دایەگیان؟... خەبەرێکی حەمەدم بۆ دێنی؟... دەڵێی چی دایەگیان؟."

دایکی تووڕە بوو:

"دەڵێم ژەهرەمارو ساردە سندان..."

خەجیج سەری هەڵبڕی. بە پاڕانەوەوە لە چاوی دایکیەوە ڕاما:

"دایە، دایەگیان... دایکە شیرنەکەم.... بڕوانە، لە بەندیخانەدا خەریکم دەڕزم... ئەگەر حەمەد نەبێ ئەمن دەمرم دایەگیان... ئەتۆ دەتەوێ بمرم دایکی شیرنم؟."

دایك:

"دایمو ژەهرەمار، دایمو ساردەسندان، ئیشەڵڵا خەبەری سیرمە سیرمە بوونیت بۆ دێنم... ئیشەڵڵا خەبەری جوانەمەرگ بوونیت بۆ دێنم..."

خەجیج لە پرمەی گریانی داو فرمێسکی بە لێشاو هاتنە خوار. دایك لەپڕ بێدەنگ بوو. خەجیج ماوەیەکی زۆر گریا. دایکی هیچی نەگوت. دوایە خواحافیزیی لە کچەکەی کرد:

"خەریکە هەتاو ئاوا دەبێ کچە سوور... ئەمن دەبێ وەڕێ کەوم."

خەجیج:

"دایە..."

دایك راوەستا. چاوی پڕ ببوون. دەنگی دەلەرزی:

"باشە دایەگیان... لەبەر خاتری تۆ، بە خاتری گوڵی روومەتت وا دەکەم خەبەرێکم لێ‌دەست کەوێ... نازانی چەندیان لە دایکی دا... لەوانەشە بمرێ... بەستەزمان دوونە..."

پاشان وەڕێ کەوت:

"مەترسە دایەگیان، فەخری‌خان عەریزەیەکی بۆ نووسیوم کە هەر مەپرسە..."

دڵنیا بوو کە عەریزەکە کاری خۆی دەکا.

## (١٢)

تاریك و تەڵەمێك بوو چاو چاوی نەدەدی. لێڕەوار بانگی دەکرد. لێڕەوار وەك دیوارێکی ڕەش بەرامبەر بە تاریکایی ڕاکشابوو. زۆر دوور لەنیزیك لوتکەی کێوی، ئاگرێکی چکۆڵە هەڵدەبوو و دەکووژایەوە. لە تاریکایی دا بە کۆمەکۆمە دەچوونە پێش. زۆریان دەنگە دەنگ دەکرد... شەو بۆبرشی لێدەهات، بۆنی کاج... بۆنی ئارەق... بۆنی هەڵترشان... جار جار یەك دوو ئەستێرە لە ئاسمان تروسکەیەکیان دەداو دەکووژانەوە.

لە چەند مانگی ڕابردوودا زۆر ماڵیان تالان کردبوون، زۆریان چەتەیی کردبوو و لەگەڵ ژاندارمەکان بەشەڕ هاتبوون. ژاندارمەکان وازیان لە هەموو دەستەکانی دیکە هێنابوو، و بەدوای دەستەی دۆردووە شێت دا دەگەڕان.

دۆردووە شێتیش گاڵتەی بە ژاندارمەکان دەکرد. سەری دەخستە سەریان. فریوی دەدان و زەبری لێدەدان. حەمەد لە ماوەیەکی کەم دا خۆی نیشان دابوو و سەرنجی دۆردووە شێت و هاوکارەکانیی بۆی لای خۆی ڕاکێشابوو.

لە تاریکاییدا دەنگی دۆردوو بیسترا:

"هەر لێرە دەمێنینەوە. لە ماندوویی و شەکەتییان حاڵمان نەماوە. دوو ڕۆژە هەر ئاوا غار دەدەین. ئەمەش وەزع نیە... هەر لێرە دەمێنینەوە."

ڕق و سەرسەختی و کەللەشەقی لە دەنگی دا دیار بوو. حەمەد لێی چووە پێشێ:

"بەسپایی، بەسپایی قسە بکە ئاغام."

دۆردوو بە قەڵسی جوابی دایەوە:

"چما چ دەبێ؟."

ئەگەر یەکی دیکە لە هاوڕێکانی ئەم پێشنیارەی کردبایە، زۆری پێ ناخۆش نەدەبوو. بەڵام لە داخی حەمەدی دەهری بوو کە هێشتا نەهاتبوو، دەرسی یاغیيەتیی بەو دەگوت.

حەمەد:

"ئەگەر دوژمنت مێروولەش بێ..."

دۆردوو:

"باشە... دوایە؟."

حەمەد تێگەیشت کە دۆردوو گاڵتەی پێ دەکا، بەڵام وەسەر خۆی نەهێناو لەسەری ڕۆیشت:

"ئەگەر مێروولەش بێ بە هیچی مەزانە."

دۆردوو حەوسەلەی نەما. قسەکەی پێ بڕی:

"ئافەریم حەمەدۆك... پێمان وابوو کوێخا سلەمان هاوکاری بۆ هێناوین... تۆمەز سەرلەشکری بۆ ناردووین... تۆ حەقت بەسەر ئەم کارانەوە نیە."

جەبار لە لای چەپی حەمەدەوە دەڕۆیشت. بە تەواوی پشووی سوار ببوو:

"حەمەد ڕاست دەکا ئاغام، ئەگەر لەنێو لێڕەوار وەمێنین گەمارۆمان دەدەن... ژاندارمەکان بە دوامانەوەن، دەسبەرداریشمان نین... بەخوا بکەوینە گەمارۆیان، وەك کەوبارە خرمان دەکەنەوە... وەکیل باشی عاصم لەمێژە لە دەرفەتێکی وا دەگەڕێ... بەسپایی..."

حەمەد:

"ئەرێوەڵڵا ڕاست وەك کەوبارە..."

جەبار:

"ژاندارمەکان یەك و دوو نین... زۆر زۆرن... دێهاتیيەکانیشیان لە پشتن، یاغیيەکانی دیکەش کە دوژمنی ئێمەن، یارمەتیی ئەمانە دەدەن... بە هەموویان ناوێرین."

حەمەد:

"نەخەیر، پێیان ناوێرین... فیشەکمان نەماون."

دۆردوو هەر لەو جێی لێی بوو ڕەق ڕاوەستا:

"هیچ کەس هەقی نیە هەنگاوێك بەولاوەتر بڕوا."

دەنگی وەك دەنگی زەنگوڵە لە لێڕەواری گەڕا:

"دوو ڕۆژە وەك سەگ ڕادەکەین...، ڕاست وەك سەگ."

هاوکارێکیان تێدا بوو بە ناوی نایب رەجەب. کەس نەیدەزانی کەنگێ نایب یان وەکیل باشی بووەو لە کوێوە هاتوەو چەند ساڵە یاغی بووە. هیچ کەسیش لەبارەی رابردوویەوە پرسیاری لێنەدەکرد. چونکە زۆر تووڕە دەبوو. ئەوەندە تووڕە دەبوو, لەوانەبوو کابرای بکوژێ. هەر لە جێ دا لە کەسانێك کە سەبارەت بە رابردووی پرسیاریان لێ‌کردبایە, نیزیك نەدەبووەوە, ئەگەر چار ناچار تووشیشیان هاتبایە, بە هیچ جۆر نەیدەدواندن و بە جۆرێك تەماشای دەکردن, دەتگوت چل ساڵە دوژمنی خوێنیی یەکترن. پەنجا ساڵ زیاتر تەمەنی بوو, تەنیا شتێك کە هاوکارەکانی لەبارەی ئەوەوە دەیانزانی ئەوەبوو کە رۆژێك هاوکاری ئەحمەدەزلە بووە. پاش دەرچوونی لێبووردنی گشتی زۆر کەس تەسلیم ببوونەوەو چەکەکانیان تەحویل دابوونەوە, بەڵام ئەو تەسلیم نەببوو. نیزیکەی دوو ساڵ بە تەنیا لە کێوان دا گەڕابوو. پاش دوو ساڵ کە چەند دەستەیەکی تازە دروست ببوون, رەگەڵ وان کەوتبوو. دەستەیەك نەبوو کە نایب رەجەب هاوکاریی لەگەڵ نەکردبێ. هەموو دەستەکان ئەویان دەناسی و خۆشیان دەویست و رێزیان بۆ دادەنا. نایب رەجەب لەوانە نەبوو هاوکاری یەکجارەکیی هیچ دەستەیەك بێ. ئەمڕۆ پێی خۆش بوو هاوکاری دەستەی دۆردوو بوو, ئەگەر سبەینێ پێی خۆش نەبووایە, دەیتوانی بچێتە گەڵ دەستەی "یووزجوو" کە دوژمنی خوێنیی دۆردوو بوو. دوو زمان نەبوو. کەم قسە بوو. هەروەخت بیویستایە دەیتوانی رەگەڵ دەستەی "رەشۆ کوردە" بکەوێ. هەموو دەستەکان پێی ئەویان لەسەر چاویان دادەناو کەسیش لێی نەدەپرسی بۆچی هاتی؟... و بۆچی دەڕۆی؟... و چووبایە گەڵ هەر دەستەیەکیش, ئەو دەستەیە زۆری پێ خۆش دەبوو, چونکە هەموویان پێ و قەدەمی ئەویان بەخێر دەزانی.

لە یاغی‌یەتی دا مامۆستا بوو. خوا بەو رۆژە نەکا کە لە پێك هەڵپڕژانێك دا بەشدار بووایە... دەستی بەجۆرێك وەکار دەکەوت دەتگوت تیربارە...

دەنگی بۆڕو ناسیاوی نایب رەجەب لە تاریکایی دا بەرز بووەوە:

"دۆردوو... کوڕەکان راست دەکەن... دەبێ لە لێرەوار دەرچین و بچینە لای گابەردەکان."

دۆردوو نەڕاندی:

"نایب رەجەب, نایب رەجەب... گوتم هیچ کەس حەقی نیە هەنگاوێك بەولاوەتر بچێ."

جەبار:

"دۆردووخان... ئەگەر هیچ کارێکیان پێ نەکرێ, دەتوانن گەمارۆمان بدەن و لێرەوارەکە ئاگر تێبەردەن..."

دۆردوو:

"هیچ کەس حەقی نیە هەنگاوێك بەولاوەتر بچێ."

جەبار:

"مەکە خان!..."

"هەر ئەوەیە کە گوتم."

"شپرزەمان دەکەن."

دۆردوو:

"چما ئەمن سەرۆك نیم؟."

جەبار:

"بۆچی؟ بەڵێ... ئەتۆ سەرۆکی."

حەمەد:

"بەڵێ, هەی."

ئەوانی دیکەش هەر ئەو قسەیەیان دووپات کردەوە.

حەمەد:

"خان! شتێك دەڵێم, بەڵام دڵت نەیەشێ."

دۆردوو پێکەنی:

"فەرموو بزانم سەرلەشکر!."

حەمەد:

"هەر ئەبێ بچینە جێیەك کە دارو درەختی زۆر بێ و کەندو قووڵ و شاخ و داخیشی هەبێ."

دۆردوو:

"هیچ کەس حەقی نیە هەنگاوێك بەولاوەتر بچێ."

پاش ئەم قسەیە دۆردوو هەر لەو جێیەی لێی راوەستابوو, دانیشت. ئەوانی دیکەش دانیشتن. ماوەیەکی زۆر کەس متەقی نەکرد. ئەو سیغارانەی لە دەستی یەك دوو کەسیان دا بوون, لە تاریکایی دا وەك ئەستێرە دەدرەوشان. کەس دەنگی هەناسەشی نەدەهات.

جەبار هەستایە سەرپێ. باوێشکێکی داو بۆ لای سەرێ وەرێ کەوت. حەمەدیش بە دوای دا رۆیشت.

جەبار لە پەنای دارێك هەڵتروشکاو میزی کرد. حەمەدیش هەروا. جەبار کە کارەکەی تەواو بوو, هەستاو بە دوای ئەودا حەمەدیش هەستا.

کاتێك تەماشای دوای خۆیانیـان کـرد رووناکایی‌یـەکی چـکۆڵەیان دی. پێیـان سـەیر بـوو. حەبەسان. دۆردوو بە چیلکەو چاڵی کاج ئاگرێکی کردبـووەوەو لەبـەر رووناکـایی ئاگرەکـە وەك سێبەرێك دەجوولاً.

حەمەد:

"بە دەستی خۆی خەریکە خۆی بە کوشت دەدا."

جەبار:

"ئێستا نایب عاصم هیچ... خەڵکی گوندەکانی ئەم نێوە نێوە لە هـەمووان خـەراپترن... دەرپێمان لە پێی هەمووان داکەندوە."

حەمەد:

"لەو رۆژەوە کە من هاتووم لانی کەم دەرپێی پێنسـەد کەسمان لە پێیان داکەندوە."

جەبار:

"لانی کەم، ئەگەر ئەو جلانەی لەبەر خەڵکمان دادەکەند دابامان بـە لادێیـیـە هـەژارەکان، هـەر شتێك بوو... لەوانە بوو رزگاریان بێ... بەخۆڕایی نیە کە ئەمجارە رزگاریان بۆ نیـە، دوو رۆژە کـە لە دەرەوە هیچ کەس یارمەتیمان نادا... ئەگەر وەدەست خەڵکی سپی‌یەبی بکەوین، بەخوا هەر لـە حـەوا قووتمـان دەدەن. زوڵـم... دۆردوو خەراپـە ئـەماوە نـەیکردبێ، بـەلاً ئـەماوە بەسـەر خـەڵکی سپی‌یەبیی نەهێنابێ. زوڵم... چەندی ئەزیەت و ئازاری ئەو دێهاتی‌یە هەژارانە داوە..."

حەمەد:

"دەزانی چیە برالە، پیاو نابێ زۆر سەر بخاتە سەر خەڵك. کابرای بکوژی پێی چاکترە لەوەی هەموو رۆژێ گاڵتەی پێ بکەی. بەخوا مردن خۆشترە لەوەی پیاو بە رووت و قووتی بگەڕێتەوە نێو دێ و بچێتەوە لای ژن و منداڵی. دۆردوو نابێ ئەو کارە بکا. دڵی هەموو کەس، هەرکەس بێ، سووچێکی هەیە کە لە شووشەش ناسکترە. نابێ بیشکێنی، نابێ کارێك بکـەی غـیرەت و ئابرووی خەڵك زەدەدار بکەی. ئـەمن ئەمانـە لـە رووی تاقیکردنـەوەوە دەڵـێم. عەبـدی‌خانیش پیلەی بە من گرتبوو، لە کۆڵم نەدەبووەوە، گاڵتەو سووکایەتیی پـێ دەکـردم، سـەری دەخـستە سەرم... پیاو نابێ خەڵکی ئەوەندە بە چووك بزانێ..."

لە گەڕانەوەدا لە قولکەیەکی بچووك کەوتن. تا ئەژنۆیان چوونە نێو ئاو. بۆنی پنگەڵ لە ئاوەکـە هەستا. بۆنی پنگەڵ لـە شـەو هەسـتا. ئەسـتێرە تروسـکەیان دەدا. عـەرزو عاسمـان بـۆنی پنگـەڵی لـێ‌دەهات. لە گۆلاوەکان، لە ئەستێران و لە دارستانی کاج، بۆنی پنگەڵی سەوز هەڵدەستا...

حەمەد:

"خۆزگە بتوانین شێتەی رازی بکەین و بیهێنینە ئێرە."

جەبار:

"کەللەشەقێکە لینگەی نیە. ئەگەر خۆت بکوژی هەنگاوێك بەم لاوەتر نایە."

ئەو ئاگرە کە دۆردوو هەڵی کردبوو، بە چاکی گرتبووی و مەشقەڵی لێ هەڵدەستا. مەیدانێك بە پانایی جۆخینێك کەوتبووە بەر تیشکی ئاگر. بڵێسە ئاگر دەچوونە ئاسمان. مووورەدارەکان بە قرچەقرچ دەسووتان.

دۆردوو بە پێکەنینەوە لە دەوروبەری ئاگرەکە هاتوچۆی دەکرد:

"بڕواننە ئەم ئاگرە... پیاو دڵی دێ ئەم ئاگرە بەجێ بێڵێ و بچێتە جێیەکی دیکە؟... لە جێی دیکە ئەم ئاگرە دەست دەکەوێ؟..."

جەبار:

"بریا ئەم ئاگرە نەیگرتایە."

دۆردوو:

"بڕوانە چ ناڵە ناڵێکیەتی..."

جەبار:

"بریا..."

دۆردوو نێوچاوانی تێك نا:

"لێوەبڕە جەبار، بەسیەتی."

شەویان هەر لەوێ، لەبەر ئاگرەکە بەسەر برد. جگە لە دۆردوو هیچ کامێکیان لە ترسان خەویان لێنەکەوت. هەموویان ترسی ئەوەیان هەبوو کە شەوێ لە خەودا گەمارۆ بدرێن و بکوژرێن. بەو ترس و دڵەخورپەیەوە کێ خەوی لێدەکەوت؟...

شەوێ سێ کەسیان لە نێو خۆیان دا بە نێشك گر دانابوو: نایب رەجەب و حەمەدو عەلیەچکۆڵ، ئەوانی دیکە بەرواڵەت خەوتبوون، بەڵام چ خەوتنێك؟... هەر تەنیشتاو تەنیشتیان کردو تینیان بۆخۆیان هێنا کە بخەون، بەڵام نەبوو. پێش هەمووان جەبار هەستاو چوار مێردەکی لەبەر ئاگر دانیشت. پاش جەباریش ئەوانی دیکە... بەڵام دۆردوو ئاسوودەو بێخەیاڵ، لە شیرن خەوێك دابوو، کە هەروا بزانە "زەمانی محەمەدی مهدییەو گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخۆنەوە". ئەوانی دیکە بێ ئەوەی قسەیەك بکەن دانیشتبوون و چاویان لە ئاورەکەوە بریبوو.

لەگەڵ بەرەبەیان تەقە دەستی پێ کرد. لە هەر چوار لاوە گوللە دەباری. ئەوان لە دوێنێ ئێوارێوە چاوەڕوانی ئەم پێشهاتە بوون. هەموو سات و کاتێك دەیانگوت ئێستا وەختیەتی... بۆیە هیچ سەریان سوڕ نەما. لەبەر ئاورەکە لاچوون و لە پەنایەك سەنگەریان گرت.

حەمەد لە حاڵێك دا گوللە بە ویزە ویز بە بن گوێی دا تێدەپەڕین، بە زەحمەت خۆی گەیاندە پەنای دارێك. لای پشتی وەکیل باشی عاصم ئاوەڵا بوو. حەمەدیش راست روو بە پشتی وەکیل باشی عاصم سەنگەری گرتبوو. حەمەد سێرەی لێ‌گرت. دڵی پێك دا هات. لوولەی تفەنگەکەی وەرسووڕاند. سێرەی لە جێیەکی دیکە گرت و فیشەکێکی بە خەسار دا.

حەمەد لەبەر خۆیەوە پێکەنی، پاشان بانگی کرد:

"وەکیل باشی، وەکیل باشی، باش دانەمەزراوی. گوللە دەتگرێتەوە..."

وەکیل باشی هاتەوە سەرخۆی. لە چواردەوری گوللە دەباری. بەڵێ جێیەکەی باش نەبوو... و راست لەو لەحزەیەدا گوللەیەك کڵاوەکەی هەڵگرت.

وەکیل باشی:

"ئەگەر وەچنگم دەکەوی... ئەگەر دەکەویە..."

حەمەد:

"وەکیل باشی، ئەمن حەمەدۆکم پێ دەڵێن. تەنیا ئەجەلت وەچنگت دەکەوێ. ژن و منداڵت هەیە وەکیل باشی، بگەڕێوەو برۆ... وەدوای کارو گوزەرانی خۆت کەوە."

وەکیل باشی:

"حەیف کە..."

راست لەو لەحزەیەدا گوللەیەك چەرمی دەستیی لەگەڵ خۆی برد. چەرمی ئەو دەستەی کە تفەنگی پێ‌گرتبوو... خوێن لەدەستی هەڵچۆڕاو رژایە سەر زەوی و دووبارە هەر ئەو دەنگە بەرز بووەوە:

"بگەڕێوە وەکیل باشی... وەدوای کارو گوزەرانی خۆت کەوە. وازمان لێ‌بێنە وەکیل باشی. مەهێڵە خوێنت بە دەستی ئێمە برژێ. زۆر لەمێژە وەدوای ئێمە کەوتووی."

هەر چواردەوری وەکیل باشی عاصم ئاوەڵا بوو. بە ترسەوە پاشەکشەی دەکرد. بیری دەکردەوە ئەو کەسەی کڵاوەکەی بە گوللەیەك هەڵگرت و ئەوەی چەرمی دەستیی بە گوللە هەڵگرت، بە ئاسانی دەیتوانی بیکوژێ. ئەو حەمەدۆکە کێ بوو؟ ئەگەر بەم جۆرە کەوتبایە

چنگی دۆردووه شێت لەمێژ بوو کوژرابوو. حەمەدۆك!... ئەم ناوەی قەت نەبیستبوو. زۆر حەمەدی دەناسین, بەڵام حەمەدۆك کێ بوو؟...

وەکیل باشی عاصم بەسپایی تێی ڕاخوڕی:

"ئێستا دەتکەمە حەمەدۆکێك, بۆخۆت کەیفی پێ بکەی..."

ئەم تێ ڕاخوڕینە خۆمانەو شیرن بوو:

گوللە دەباری. گوللەی سوورو چەور لە بەرەبەیان دا دەباری. دۆردوو بە دەوری خۆی دا دەسووڕا. گیانی لەسەر لەپی دەستی دانابوو و تەقەی دەکرد. جاروباریش تاریك دەستی رادەگرت و دەستی دەکرد بە جنێودان بە وەکیل باشی:

"وەکیل باشی, وەکیل باشی پێت وا نەبێ دۆردووه شێت هەڵدێ. دەمەوێ بە قوون رووتی بتنێرمەوە لای یاوەرەکەت. ئەگەر بە قەد نووکی دەرزی سەروکەللەتم لێ دیار بێ, دەرپێیەکەت چووە وەکیل باشی."

وەکیل باشی عاصم و ژاندارمەکان و لادێیییەکان دەوران دەوریان گەمارۆ دابوون. راست لە قەوەز کەوتبوون...

دۆردوو تێ گەیشت کە لە داو کەوتوون. بە زگە خشکە خۆی گەیاندە حەمەد. لە نێو هاوکارەکانی دا پتر لە هەمووان باوەڕی بە حەمەد هەبوو. ئەو جێیەی لێی لە داو کەوتبوون لە هەر چوار لاوە گوللە دەیگرتەوە. ئەگەر توانیبایان کەمێکی دیکە بێنە پێش و ئەلقەی گەمارۆیەکە تەنگتر بکەنەوە, دەیانتوانی هەموویان بکوژن.

دۆردوو بۆ یەکەم جار لە تەواوی عومری خۆی دا ئەختێك وە پەلەقاژە کەوتبوو. داوەکە لەو داوانە نەبوو. ئەوانیش لە دۆردوو دەترسان و نەیاندەوێرا ئەڵقەی گەمارۆ تەنگتر بکەنەوە. ئەوان سەریان سوڕ مابوو کە چۆنە دۆردوو لەم سووچی لێرەوارەدا, لەم سووچە بەر ئاوەڵاو بێ پەناگەیەدا لەگەڵیان بەرەوڕوو بووە. سەریان لێ شێوابوو. پێیان وابوو حەتمەن فێڵ و تەڵەکەیەکی تازەی بەکار هێناوە...

هەر ئەم ترسە, ئەوانیشی لە جێی خۆیان رەق راگرتبوو. بەهیچ جۆر بە مێشکیان دا نەدەهات کە دۆردوو هەمرو جێگایەك بەجێ بهێڵێ و لە جێیەکی ئاوا خۆی بە تەڵەوە بکا... هەمووان پێیان وابوو ئەمە فێڵێکی تازەیە لە فێڵەکانی دۆردوو...

دۆردوو شەڵاڵی ئارەق بوو و هەناسەبڕکەی وێکەوتبوو:

"وەزع خەراپە... هیچ کامێکمان دەرناچین."

لەو نێوەدا یەکێك هاواری کرد:

"ئای دایە... کوژرام."

دۆردوو:

"ئەمە یەکەم بوو. نایب رەجەبمان چوو."

دۆردوو لەسەری رۆیشت:

"لە هیچیان ناترسم. بەڵام ژاندارمەیەکیان تێدایە پێی دەڵێن "چوار رێیان". یەکی دیکەشیان تێدایە کە خەڵکی دێهاتی خۆمانە, "مەستانەڕەش"... ئەگەر ئەم دووانە نەبوونایە, لەوانی دیکە نەدەترسام. درم پێ دەدان و دەردەچووم. بەڵام ئەم دووانە غەیری ئەوانی دیکەن... ئەمانە دەرزی بە گوللەی هەڵدەگرن."

حەمەد ئاوڕی دایەوە پشت خۆی:

"تفەنگی من گەرم بووە. دەستی ناوێرێتێ... دەبێ چ بکەم, تەگبیرم چیە؟."

دۆردوو:

"دیارە زۆرت تەقە پێ کردوە... دەنا تفەنگت تفەنگی چاکە. جارێ تەقە مەکەو تفەنگەکەت دەگڵی راکە با سارد بێتەوە. بەڵام مەیەڵە زۆر سارد وەبێ, چونکە دوایە ساردو گەرمێ دەکاو کارێکت دەداتە دەست."

حەمەد:

"تفوو... تفوو..."

دۆردوو بە هێدی و هێمنی لەسەری رۆیشت:

"خەراپ گەمارۆ دراوین برالە, ئەتۆ چاو لە من مەکە. ئەمن زۆرم ئەو شتانە دیوە. تاقیکردنەوەم زۆرە. هەر جۆرێك بێ دریان پێ دەدەم و دەردەچم. ئەگەر کوژراشم باکم نیە... بەڵام ئەمن غەمی ئێوەمە... نامەوێ ببمە باعیسی ئێوە... حەز ناکەم ئێوەش ببنە قوربانیی شێتی و نەزانیی من... دەبێ خوا لە هاواری ئێوە بێ... ئەمن دەتوانم خۆم رزگار کەم, بەڵام نامەوێ پاشملە خەڵك بڵێن دۆردوو خۆی رزگار کردو هاوڕێیەکانی بە کوشتن دا."

حەمەد:

"هیچ رێیەکم بە فکردا نایە... چارەمان نیە, جگە لەوە کە هەر جۆرێك بووە هەتا ئێوارێ راوەستین."

هەر لەو وەختەدا دوو گوللە لەبەردەمی دۆردوو لە عەرزی دران و تۆزو خۆڵیان هەڵستاند.

حەمەد:

"ڕێگایەکمان نیە, جگە لەوە کە هەر جۆر بێ هەتا ئێواری ڕایبوێرین."

دۆردوو ئەو جێگایەی کە گوللەکانی لێدرابوون, نیشان دا:

"ئەم گوللانە کاری مەستانەڕەشن. ئێستا هەردووکمان دەنگێوێ. حەتمەن جێگایەکمانی دیوە."

حەمەد:

"خان, نەکا نایب ڕەجەب مردبێ. پێت چۆنە هەر جۆرێك بووە سەرێکی لێهەڵێنین؟."

دۆردوو:

"ئێستا ڕاوەستە... ببزووین کابرا هەردووکمان دەپێکێ."

دەوروبەریان بە گوللە دابێژرابوو.

دۆردوو:

"ئەمگوت؟... ئەمن مەستانەڕەشی بێناموووس دەناسم."

حەمەد:

"جانەوەرێکی سەیرە."

دۆردوو:

"ئەگەر دەسبەجێ جێیەکەمان نەگۆڕین..."

بە زگە خشکە خۆیان گەیاندە پەنا دارێکی زەلام.

هەموو فکرو هۆشی حەمەد لە لای نایب ڕەجەب بوو:

"نایب ڕەجەب هیچ دەنگی لێوە نایە. بریا بە جۆرێك خۆمان گەیاندبایە کنی..."

پشت سەریان گوللەباران بوو. گوللە لکە دارەکانیان تێك دەشکاندو هەڵیان دەوەراندن.

بە زگە خشکە خۆیان گەیاندە ژوور سەری نایب ڕەجەب. نایب ڕەجەب لەسەر کەلەکەی ڕاستی ڕاکشابوو و لە خوێن دا نوقم ببوو. کاتێك چاوی بە دۆردوو و حەمەد کەوت, ددانی پێك داگرتن و زەردەیەکی کرد:

"کوڕینە... وریای خۆتان بن... لانی کەم سەدو پەنجا کەسێك دەبن... ئەمن بەجێ بێڵن و فکرێك بۆخۆتان بکەن... قیسمەتی ئێمە ئەمە بووە..."

تەماشای برینەکەیان کرد. نایب گوللەی لە ئەستۆی درابوو... گوللەکە لە ملی تێپەڕیبوو و بە بن ئێسکی شانی دا بێ ئەوەی ئێسکەکە بشکێنێ, دەری کردبوو. بەڵام ئەو جێی گوللەکەی لێدەرچووبوو, بە جارێك هەڵتەکابوو.

نایب ڕەجەب:

"دەمەوێ شتێکتان پێ بڵێم. ئاگاتان لە جەبار بێ. زۆر پیاوە. دەرەقەتی لەشکرێك دێ. ئەگەر ئەو نەبایە منیان دادەبێژت. وەختێك دیتی منیان وەبەر دەسرێژ دا. فێڵێکی کردو گوللەکانی بۆ لای خۆی وەرسووڕاند. کاتێکیش من بریندار بووم, ئەوانی بە جۆرێك گوللەباران کرد کە سەریان لێ‌شێوا.

کراسی نایب ڕەجەبیان لەبەری دادڕی. برینەکەیان بۆ بەست. نایب ڕەجەب وەك لە خەوێ دا قسان بکا درێژەی پێ دا:

"سبەینێ... سبەینێ ئەڵقەی گەمارۆیەکە..."

حەمەد:

"ناکرێ نایب!... ئەگەر بمانەوێ ئەڵقەی گەمارۆیەکە بشکێنین, حەتمن دەمان پێکن. ئێستا کە لەم وەزعە داین لێمان دەترسن. یان دەتوانین خۆمان بگەیەنینە ئێوارێ, یان دەکوژرێین."

نایب ڕەجەب لە فکرەوە چوو. بۆ ئەوەی لە تاو دەردی خۆی هاوار نەکا توند توند ددانی بە جەرگی خۆیدا گرتبوو:

"پێم وایە ڕاست دەکەی حەمەد. ئەگەر یەك نەفەریشمان بێهەوێ ڕابکا, ئەوانی دیکە بە کوشت دەدا. کوڕەکان خڕکەنەوە. هەموویان سوێند بدەن کە سەنگەر چۆڵ نەکەن. ئەگەر وا نەکەن, هەمووتان دەکوژرێن. دەبێ لە پێشیان ڕاوەستێ. باوەڕ ناکەم بوێرن بێنە پێشتر. ئەگەر توانیبایان تا ئێستا هاتبوون. دەترسن داوێکمان بۆ نابنەوە."

حەمەد:

"با ببزووین کاك دۆردوو... دەبێ کوڕەکان خڕکەینەوە."

نایب ڕەجەب:

"بەڵام لە هەتیوی زاڵای وریا بن. زۆر ترسەنۆکە. ئەگەر ئاگاتان لێی نەبێ, لەوانەیە هەڵێ و تووشی بەڵایەکتان بکا..."

دۆردوو:

"با بچین کوڕەکان خڕ بکەینەوە. عەلیەچکۆڵ و جەبار تەقەی بکەن و سەریان گەرم بکەن هەتا ئێمە کارەکەمان تەواو دەکەین."

پاشان فیتوویەکی لێ‌دا. ئەم فیتووە نیشانەی خڕ بوونەوە بوو. بەڵام هاوکارەکان لەو قیامەت و گوللەبارانەدا حاڵی نەبوون ئەم فیتووە مانای چیە."

کوڕی زالآ:

"لەم تاوریارانەدا چۆن دەکرێ خڕ وەبین؟... هیچ کامێکمان بە زیندوویی لەم کوشتارگایە دەرناچین... نایب رەجەبیش رۆیشت..."

لە پێش دا عەلیەیەچکۆڵ، دوایە وسووە سوورو ئەمجار "گدووك" خۆیان گەیاندە دۆردوو.

دۆردوو:

"هەتیوی زالآی لە کوێیە؟."

دەنگەکە بەدگومانیی لێدەباری.

عەلیەیەچکۆڵ:

"خەریکەدێ، ئەمڕۆ هەموو ئەمڕۆ خۆی بە عەرزییەوە مەلآس داوەو لەرزیوە. یەك فیشەکیشی ناویشتوە."

دۆردوو:

"بڕوانە من... پێم وابوو لە هەمووان ئازاترە."

لەم وەختەدا کوڕی زالآش بە زگەخشکە خۆی گەیاندە لای ئەوانی دیکە. دەستەکانی شەلآڵی خوێن بوون.

دۆردوو رووی کردە جەبارو عەلیەیەچکۆڵ:

"ئێوە ئەوەندەی دەتوانن تەقە بکەن... سەریان گەرم بکەن، با ئێمە قسەکانمان بکەین."

لە کاتی وتووێژەکانیان دا تاوێك تەقە بێدەنگ بوو، هەر ئەمە وەکیل باشی عاصمی خستە شك و گومانەوە. ئەمە یەکەم جاری نەبوو کە لەگەڵ دۆردووە شێت بەرەوڕوو دەبوو، بەلآم هیچ جارێکیش نەیتوانیبوو لە پێشەوە دەستی دۆردوو بخوێنێتەوەو بزانێ نەخشەی چییە. دۆردوو لەوانە نەبوو. هەرچەند کارەکانی شێتانە دەکرد، بەلآم جاری وا هەبوو ئەوەندە زیرەکانە کاری دەکرد کە ئەندازەی نەبوو کەسێك کە پێوی بەرەنگاربوونی وەکیل باشی عاصمی ـ ئەویش لەو سووچە لێڕەوارە چۆڵ و بەرناوەلآیەدا ـ لە خۆی هەڵسووبێ، یان دەبێ ئەجەل هەڵی گرتبێ، یان دەبێ زۆر حۆل و نەزان بێ، و یان دەبێ فرت و فێڵێکی لە بن سەری دا هەبێ... بەلآم یاغییەکی وەك دۆردووە شێت کە دەیتوانی ببێتە دەزوو و بە کونی دەرزییش دا تێپەڕێ، ئەقڵ نەیدەگرت بە بێ نەخشەو حیساب و کیتاب لە جێیەکی وادا لەگەڵی بەرەوڕوو بێ. بە باوەڕی وەکیل باشی عاصم حەتمەن کەڵەکێك لە کاردا بوو. هەر لەحزەیەك چاوەڕێ بوو دۆردووە شێت وەك ئەجەل بگاتە سەری... و لەو حاڵەدا ئەو دەبوو چ بکا؟... ئەمە پرسیارێك بوو کە

وەکیل باشی عاصم جوابەکەی بۆ نەدەدرایەوە. ئەگەر پاشەکشەی دەکردو دەگەڕایەوە، هەموو ئابڕوو و ئیعتیبارەکەی دەبوو بە پووڵە ڕەشکەیەك. ئەگەر هەر لەوێش مابایەوە، درەنگ یان زوو دەکەوتە داو و مردنی مسۆگەر بوو... داخوا ئەو گوللەیە کە کڵاوەکەی لەسەر هەڵگرتبوو، یان ئەو گوللەیە کە چەرمی دەستی بردبوو، مانای چ بوو؟... داخوا ئەم دوو گوللەیە وشیار کردنەوەیەك بوون؟... کە قسەکانی حەمەدیشی وەبیر دەهاتنەوە، بە تەواوی گێژ دەبوو. ئەو کەسەی ئەو گوللانەی پێوە نابوو، ئەگەر حەزی کردبایە، هەر ئەوودەم مشووری ئەوی خواردبوو. بەڵام نەیدەتوانی بگەڕێتەوە. پاش ماوەیەکی زۆر دۆردووە شێتی بەگیر هێنابوو... ئەگەر ئەمجاریش لە دەستی دەرچووبایە، تازە کەنگێ دەیتوانی بەو ئاسانییە بەگیری بێنێتەوە؟

وەکیل باشی عاصم:

"هاوڕێیان... کەستان لە جێی خۆتان مەبزوون... ڕاوەستن بزانین ئەخشەی ئەم شێت و ماخولیایە چیە... لە گەمارۆ دایە. لە چنگمان دایە... بەڵام بە دەستی خۆی، خۆی خستوەتە چنگی ئێمە... ئەگینا زۆر لەمێژ بوو خۆی گەیاندبووە بەردەڵانی "گردبنەوەش"..."

سەرجووخە پاڕایەوە:

"ئەو گەوادە شێتە باش دەناسم. کەللەکەرێکە لە دنیادا لینگەی نیە. بەسەری دا هاتوەو لێرە ماوەتەوە. فێڵ و تەڵەکەیەکیش لە کار دا نیە. زۆر بە خۆی دەنازێ و بڕایەوە. ئەگەر گەمارۆیەکە تەنگتر بکەینەوە بەخوا لە دەستمان دایە."

وەکیل باشی عاصم:

"حەرامزادەیەکی وەك ئەو شێتە کە چەندین ساڵە یاغییە، هەروا بە مفتێ لە جێگایەکی وادا کلکی بە تەڵەوە نابێ... چما لە دارستان جێگا قات بووە؟... بۆچی نەچووەتە جێگایەك کە پڕ بێ لە سەنگەرو دارو درەخت؟ دەبێ بزانی کە فێڵێکی لە بن سەر دایە. دەبێ ڕاوەستین."

سەرجووخە:

"وەکیل باشی، وەرە مەردی خوا بە بەقسەم بکە. کوڕە ئەو زۆر لەخۆی باییە. وەرە با ئەڵقەی گەمارۆی لێ تەنگتر بکەینەوەو خەلاسی کەین... وەڵڵا چەند هەنگاوی دیکە بچینە پێش، لە چنگمان دایە..."

وەکیل باشی بە دەنگێکی فەرماندەرانە جوابی دایەوە:

"هیچ کامتان لە جێی خۆتان مەبزوون."

کاتێك عەلی‌یەچکۆڵ و جەبار سەرلەنوێ دەستیان بە تەقە کردەوە، وەکیل باشی پێی سەیر بوو. چ باس بوو؟...

دۆردوو:

"هاورێیان، نابێ لە تەنیشت یەکتر دوور کەوینەوە. دەبێ هەموومان لە یەك جێوە تەقە بکەین. ئەگەر بگەنە سەرمان و لوولە تفەنگەکانیان لەسەر نێوچاوانمان رابگرن، دیسان نابێ لە تەنیشت یەکتر ببزووین. هەمووتان بەڵێن دەدەن؟."

هەموو پێکەوە گوتیان:

"بەڵێن دەدەین."

دۆردوو:

"کەوابوو دەبێ جێیەکی باشتر بدۆزینەوە... جێیەك کە بتوانین باشتر سەنگەر بگرین."

حەمەد:

"ئەمن جێگایەك بدۆزمەوە؟."

"باشە تۆ بیدۆزەوە."

لەو وەختە دا حەمەد هاواری کرد:

"راکشێن."

لەگەڵ گوتنی ئەم قسەیە بۆخۆشی خۆی لە عەرزی دا. ئەوانی دیکەش درێژ بوون. گوللە بە ویزەویز بە بن گوێیان دا تێدەپەڕین.

دۆردوو:

"دیتوویانین... تازە نایەڵن هەناسەمان دەربێ."

ماوەیەکی زۆر هەروا لەپەڕوو راکشابوون و موویان لێنەدەبزووت. لە راست و چەپیان گوللە دەکەوتنە زەوی و بە ویزە ویز تێدەپەڕین.

کوڕی زاڵا هێشتا هەر دەلەرزی:

"ئاخ، ئاخ... حەمەد ئەنگوواوە."

کوڕی زاڵا لە ترسان چاوی پێ دەرپەڕیبوون.

دۆردوو:

"نا بابە."

حەمەد کە دیتی باسی ئەو دەکەن، رووی بۆ لای ئەوان وەرگێڕا:

"چ بووه؟."

کوڕی زاڵ له حاڵێك دا لێوه لەرزەی گرتبوو و شەقەشەقی ددانی دەهات وەڵامی دایەوە:

"هەموو سەرو لەشت خوێناوییە, بریندار بووی."

حەمەد:

"هیچ جێیەکم نایەشێ."

دەستێکی بەسەری دا هێناو تەماشای کرد. دەستی خوێناوی بوو. دڵی بە توندی کەوتە لێدان. له هەموو ئەندامی لەشی دا بۆ برین گەڕا. برینێکی دیکەی پێوه نەبوو.

دۆردوو هاتە تەنیشت حەمەد. ڕەنگی پەڕیبوو. دەستی بەسەر سەری حەمەد دا هێنا. برینەکەی دیتەوە:

"گولله وەسەرت کەوتوه... بەڵام شتێك نیه, نەختێك چەرمی هەڵگرتوه."

حەمەد به زەردەخەنەیەك جوابی دایەوە:

"وازی لێبێنه... دەسکەوتە... ئەمە یەکەمین دەسکەوتمانه."

هەڵستاو چووە نێو لێرەوار. وا دەرۆیشت هەروا بزانه هیچ نەبووه. نەختێك دواتریش بانگی کرد:

"وەرنه ئێره."

ژاندارمەکان هەروا گولله بارانیان دەکردن, بەڵام ئەوانی دیکەش خۆیان گەیاندە لای حەمەد.

ئێره قوولکەیەك بوو که دنیایەك داری بڕاویان تێدا خڕ کردبووەوە.

دۆردوو:

"ئێره باشه... با مووره دارەکان دەربێنین."

لەپڕ له پشت سەریان تۆفانێك هەڵستا. گەڵاکان هەڵوەرین و لك و پۆپەکان تێك شکان. لەجیاتی ئەوەی مووره دارەکان له قوولکەکە بێننه دەر, له چاولێك نانێك دا خۆیان هاویشته نێو قوولکەکەو دەستیان کرد به تەقە. لەهەردوو لاوه وەك تەرزه گوللەیان بەسەر یەکتر دا دەباراند. نیزیکەی نیو سەعاتێك وەزعەکە بەو جۆره بوو, پاشان هەردوو لا ـ دیار نەبوو لەبەر چیه ـ تەقەیان ڕاگرت.

دۆردوو ئیدی هیچ نەدەترسا. چونکه ئەگەر بیان ویستایه بێنه پێش. هەتا ئێستا دەهاتن. ئەگەر لەمەودواش بڕیاریان دابایه ئەڵقەی گەمارۆیان لێ تەنگتر بکەنەوە, هێندەی نەمابوو

رۆژ ئاوا بێ. هەر جۆرێکیش بایە دەیانتوانی هەتا خۆرئاوا خۆیان رابگرن. ئیدی نابێ لەبەر ئەو وەکیل باشی‌یە رابکەن.

پاشان عەلی‌یەچکۆڵ و جەباریش خۆیان گەیاندە قوولکەکە.

وەختێك جەبار گوتی:"ئەدی نایب رەجەب کوا؟."، هەموویان کەوتنە پەلەقاژە.

حەمەد:

"پێویست ناکا لێك توورە بن. ئەمن دەچم دەی‌هێنم."

هەموویان بێدەنگ بوون.

بە زگە خشکە لە قوولکەکە چووە دەر. ماندوو بوو. لەبەر شەکەتی‌یان هەناسەی نەدەهات. گەیشتە پەنای موورە دارێك و هەر لەوێ خۆی درێژ کرد. نەی‌دەتوانی لە پەنای موورە دارەکە دوور کەوێتەوە. نەی دەزانی لە کوێ و لە چ لایەك را تەقەی لێ‌دەکرێ، بەلام هەرچی بوو، هەموو گوللەکان لەو موورەدارە دەدران.

خۆی فڕێ دا. جێگایەکی زۆر ئێشا. پێی وابوو کە حەتمەن ئەنگوواوە. ترسا. دەستی بەم دیو ئەودیوی خۆی دا هێنا. دەستی بەسەر جێگا ئێشاوەکەی دا هێنا. بریندار نەبوو.

کاتێك گەیشتە ژوورر سەری نایب رەجەب، هەموو جێ‌یەکی شەتڵی خوێن بوو. دەست و لاقیشی هەڵدڕ ببوون.

وەختێك نایب رەجەب چاوی بە حەمەد کەوت، گوتی:

"کوڕە، ئەوە چتە؟ هەموو لەشت خوێنە."

حەمەد زەردەخەنەیەکی کرد، بەلام سەروچاوی ئەوەندە لە خوێن دا شەلاڵ بوون کە زەردەخەنەکەی نەبینرا:

"یاڵلا نایب رەجەب، بەدوای تۆ دا هاتووم."

نایب رەجەب:

"کوڕم، ئەتۆ فکری خۆت بکەوە. ئەمن ئەوە لێرەم. لە هەر چوار لاوە گەمارۆیان داون. ئەو شێت و شوورە هەموومانی تووش کرد. هیچ کامتان ناتوانن لەم گەمارۆیە دەرباز بن. بۆ هەر لایەك پێ هەڵێنیەوە گوللەیە. وەکیل باشی عاصم ئیدی عاقڵ بووە. ئەمن هەر لێرە بەجێ بێڵن. بڕوانە کوڕم، حەمەد... ئەتۆ کوڕێکی باشی، ئەگەر لەم شەڕە بە ساغی دەرچووی دۆردووی بەجێ بێڵەو هاوکاریی مەکە... ئەمن لەوە سەرم سوڕماوە کە لە نیوەڕۆ لای داوە، کەچی ئەوان هێشتا ئەڵقەی گەمارۆکەیان تەنگتر ناکەنەوە... پێم وایە دەستی ئێمەیان خوێندوەتەوە."

حەمەد:

"دەترسن."

رەجەب:

"سەیرە."

حەمەد:

"لەوە دەترسن کە نەکا تەڵەیەکمان بۆ دانابن. هەموویان پێیان وایە. ئیدی نازانن کە دۆردووە شێت لەبەر کەریەتیی خۆی تووشی ئەم گرفتارییە بووە. بە هیچ جۆر باوەڕ ناکەن... ناتوانن بڕوا بکەن کە دۆردوو دەستی پێ لە ئاگرەکە هەڵنەگیراوەو خۆی تووشی ئەم رۆژ رەشییە کردوە... یاللا هەستە نایب، هەستە با بڕۆین... ئەگەر کوژراین پێکەوە دەمرین و ئەگەر دەریش چووین، پێکەوە دەمێنین."

نایب رەجەب:

"حەمەدم، ئەگەر ئەمجاریش نەمردبام..."

حەمەد:

"برینەکەت سەخت نیە نایب، چاك دەبیەوە."

حەمەد هێزی لەکۆڵ کردنی نایبی نەبوو، بەلام نایبی کەڵەگەت و بەخۆوەی لە کۆڵێ کرد. پاش ئەوەی چەند هەنگاوێك رۆیشتن دایانا.

نایب تێگەیشت کە حەمەد تاقەتی پێی ناشکێ:

"کوڕم، وا نابێ، پێویست نیە لە کۆڵم بکەی، وەرە بن پیلم."

حەمەد:

"باشە."

دەچوونە پێش و دڵۆپە خوێنیان لێدەڕژانە سەر زەوی. سەرلەنوێ دایاننەوە بەر دەسڕێژ... راکشان و خۆیان بە عەرزەوە چەسپاند. وادیار بوو دیتبوویانن. لە راست و چەپیان گوللە لە عەرزی دەدران.

نایب رەجەب:

"دووبارە وەگەڕ کەوتنەوە... پێم وایە گەوادانە ئەقڵیان هاتووەتەوە کەللەیان."

وەختێك بە هەزار کوێرەوەری گەیشتنە قوولکەکە، دوو کەسی دیکەش ئەنگوا بوون. کوڕی زالاو عەلییەچکۆڵ بریندار ببوون. کوڕی زالا هەروا دەلەرزی و دەگریاو هات و هاواری وەرێ خستبوو. وەك مێژۆکە دەلەرزی...

دیار بوو کە ئەلقەی گەمارۆ تەنگتر کراوەتەوە. گوللەکان نیزیکتر دەکەوتن. لەو نێوەدا مەستانەڕەش ـ هاوولاتی دۆردووـ ش پەیتا پەیتا دەی‌نەڕاند:

"دۆردووە شێت... گوندی سپیەبی ئێستا دەبینی چ پیاوێکی. ئەتۆ بۆخۆت خاڵە مەستان دەناسی... کەوابوو هێندە بە خۆت مەنازە..."

دۆردووە شێت کە ئەم قسانەی دەبیست, لە دین دەردەچوو. بەلام جوابی نەدەدایەوە. ماوەیەك هەر بەو جۆرە تەقەیان لێکتر کرد.

مەستانە ڕەش:

"چ ژەهرەمارێکتە دۆردوو؟... زمانتت قووت داوەتەوە؟."

دۆردوو ئیدی خۆی پێ ڕانەگیرا. ڕاست بووەوە:

"خاڵ ئاغا, ئاغا مەستانەڕەش... ئەمن تۆ باش دەناسم. ئەتۆش من باش دەناسی. ئەگەر تونکەی ژنەکەتم پێ نەکردیە کلاو و لەسەرم نەنای, ئەودەم هەرچی پێت خۆش بوو, بیڵێ. بەخوا ئەگەر ئەوەم پێ نەکرێ, ناوی خۆم دەگۆڕم. ئیدی ناوی دۆردووە شێت لەسەر خۆم هەڵدەگرم."

ڕاست لەو کاتەدا, حەمەد دۆردووە شێتی توند بۆ لای خۆی ڕاکێشا. دۆردوو کە بە پێوە ڕاوەستابوو, خێرا بەسەر حەمەد دا کەوت. ئەگەر تەنیا یەك لەحزە, تەنیا نیو سانیەی دیکە بە پێوە ڕاوەستابا, یەك جێ پێنج گوللەی وێ دەکەوتن, چونکە ڕووبەڕووی خۆی مەستانەڕەش و چوار کەسی دیکە سێرەیان لێ گرتبوو. هەر پێنج تفەنگ پێکەوە تەقین, بەلام دۆردوو لە جێی خۆی نەمابوو.

نایب ڕەجەب:

"شێتی دەویت باب, ئەگەر جارێکی دیکە کەریەتی وا بکەی, یەکەم گوللەت بۆخۆم لێ دەدەم."

دۆردووە شێت پێکەنی:

"ئەتۆ ئەگەر دەتوانی تەقە بکەی, بۆچی سێرە لەوانی دیکە ناگری؟."

نایب ڕەجەب حەمەدی نیشان دا:

"خوا بە قوربانی ئەم بستە منداڵەت کا, ئەگەر ئەو نەبووایە ئێستا دەتزانی چیت بەسەر هاتوە."

حەمەد لەپڕ دڵی کرایەوە. تەماشایەکی دۆردووی کرد. دۆردووش چاوێکی دۆستانەی لەو کرد.

کاتێك دۆردوو دیتی کە خوێن بە دەست و سەروچاوی حەمەدەوە وشك بووەتەوە, لەبەر خۆیەوە زەردەیەکی هاتێ. ئەو ڕۆژەی کەوتەوە بیر کە حەمەد هاتبووە لایان... وەبیری هاتەوە چۆن بە بێدەنگی لە پاش مام سلەمان دانیشتبوو... لە پاش مام سلەمان خۆی

شاردبووەوە... وەبیری هاتەوە چەند وردو چکۆڵە دیار بوو. چاوی دۆردوو بە خۆشەویستی‌یەك روون بوونەوە. لە دڵی خۆی دا گوتی: بنیادەم!... نابێ کەس بە کەم بزانی... بڕوانە، هەمووی بستێك دەبێ، دوو رۆژە یاغی بووە، بەڵام ئەمڕۆ لە یاغی‌یەکی پەنجا ساڵەش بە ئەزموونترو وەستاترە...!

لە رووبەڕوویان گورەیەك هات:

"تەسلیم بن."

دۆردوو:

"وەرگرە مەستانەڕەش، ئەمەش بۆ تۆ...!"

مەستانەڕەش وەك گایەك هۆڕاندی و کەوت.

دۆردوو:

"نایب رەجەب، لێرەش دا بە هەڵە چووم؟."

نایب رەجەب:

"دەستت نەرزی...، بەڵام پێم وایە هەمووتان سوێندتان خواردوە کە یان تا لێرە بکوژرێن..."

دۆردوو:

"بەڵێ، سوێندمان خواردوە... لەم قوولکەیە هەنگاوێك ناڕۆینە دەر. چما بۆخۆت نەتگوتبوو؟."

نایب رەجەب:

"خەریکن وەبەر تیربارمان دەدەن. خەریکن خاشەبڕمان دەکەن. ئیدی هومێدی رزگاربوونمان نیە، یان دەبێ بکوژرێین، یان دەبێ تەسلیم بین."

حەمەد بە ترس و سەرسوڕمانەوە پرسی:

"یان مردن یان تەسلیم؟."

هەر ئەو تیشکەی برنجەیە جارێکی دیکە لە مێشکی دا شەپۆلی داو پڕشنگی هاویشت و رۆیشت.

نایب رەجەب:

"حەمەدۆك، ئەگەر رێگایەکی دیکەت پێ شك دێ، بیڵێ."

حەمەد:

"ئەگەر ئەتۆ نەزانی، ئەمن لە کوێ دەزانم نایب؟."

نایب رەجەب لە فکرەوە چوو. برینەکەی ئیدی سارد ببووەوەو دەبرژایەوە. برینەکەی وا دەبرژایەوە، کە دەرفەتی بیرکردنەوەشی پێ نەدەدا. نایب سەری داخستبوو و هەروا لێوی خۆی دەگەزی و دەیگەزییەوە.

پاشان نایب رەجەب سەری هەڵبڕی و یەك یەك چاوی لە هەمووان کرد:

"پێشنیارێکم هەیە. ئەگەر بتوانین جێبەجێی بکەین نەجاتمان دەبێ. ئەگەر کارێك کە من دەیڵێم بیکەین، وەکیل باشیعاصم دەسبەجێ دەچێتەوە خزمەت جەناب یاوەرەکەی."

گوتیان:

"دەڵێی چ بکەین؟."

نایب رەجەب:

"سێ نارنجۆك... ئەگەر پیاوێکتان تێدا بێ بتوانێ سێ نارنجۆك باوێتە ئەو تیربارە، وەکیل باشی عاصم ئیدی زیاتر لێرە نامێنێتەوەو دەچێتەوە خزمەت جەناب یاوەرەکەی."

جەبار کە خەریك بوو بەستەی دادەڕنییە تفەنگەکەی وەرسووڕاو جوابی دایەوە:

"بۆ ئەو کارە هەموومان پیاوین... چونکە بلێی و نەڵێی هەموومان دەکوژرێین... ئێستا با بەوجۆرە نەکوژرێین و بەم جۆرە بکوژرێین."

حەمەد:

"رێگایەکی دیکە نیە؟."

نایب رەجەب:

"دوا هیوای من هەر ئەوەیە کە گوتم."

حەمەد:

"کەوابێ، من دەچم."

هەر ئەو بریسکە پۆڵایە، هەر ئەو بریسکەی بە قەد نووکە دەرزییە هاتەوە نێو چاوەکانی. هەر ئەو تیشکی برنجەیی رەنگە لە مێشکی دا وەك هەورە تریشقەیەك درەوشاو رابرد. هەناوی بۆ ماوەیەکی زۆر کورت شەپۆلێکی بەختیاریو تاڵیی پێدا هات.

دۆردوو:

"بزانم، پیاوەتیی خۆت نیشان بدە."

حەمەد لە قوولکەکەی دەریەڕی:

"دوو نارنجۆکی دیکەم بدەنێ."

دوو نارنجۆکی دیکەی لە جەبار وەرگرتن. خۆی فڕێدا. هەرچی هێزی هەیبوو لە لاقانی کردو غاری دا. گوللە بە ویزە ویز بە بنانگوێی دا تێدەپەڕین. خۆی گەیاندە بن بەردێك، دۆردوو و ئەوان پێیان سەیر بوو. گوتیان ڕەنگە ئەنگوابێ. لەبن بەردەکە گلۆوکە زەردە پشکووتبوون، زەردو تەڕو تازە. بەردەکە گەورەو خڕەبەرد بوو. پاڵێکی پێوەنا. بەردەکە تلی دەدا. بەردەکەی کردە سەنگەر. دەستی کرد بە تل پێدان.؟. بەردەکە گوللەباران کرا. هەراو هۆریایەك بەرز بووەوە. حەمەد تێگەیشت کە بەو سەوپەرە بەردینەوە ناتوانێ گیانی خۆی دەرباز بکا. پەنجا میتر ئەولاتر دارێك لە پەنای قوولکەیەك بوو. بۆ ئەوەی خۆی فڕێ داتە ئەوێ، ڕاست بووەوە. وەك گوللەیەك خۆی هاویشتە نێو قوولکەکە. نێو قوولکەکە بۆنی گڵ و گەڵای ڕزیوی لێدەهات. گوڵێکی بنەوشەییش لە قوولکەکەدا هەبوو، بەڵام حەمەد ناوەکەی وەبیر نەهاتەوە. بۆنی ئەو گوڵە بنەوشەییەش هەر بەرز ببووەوە. ئەو گوڵە هەر لە بن بەردان دەڕوێ. هەرگیز لە جێی دیکە ناڕوێ. پەڵە هەورێك لەسەر یەکێك لە کێوەکان دەسووڕا. ڕووناکایی کەوتبووە سەر قەراخەکانی. دەتگوت پەراوێزی تێگیراوە.

کاتێك حەمەد دەنگی تیرباری لە پشت سەری خۆیەوە بیست، هۆشی هاتەوە سەر خۆی. ڕووبەڕووی خۆی تەمباسکە گلێك هەبوو وەك تەپۆلکە. لە پشتەوەی ئەویش تەمباسکێکی دیکە هەبوو. تەمباسکەکەی پشتەوە کەمێك لەوەی پێشەوە گەورەتر بوو. دیار بوو تیربارەکەیان لە نێو ئەو دوو تەمباسکە دامەزراندبوو... دەبوو دەور لێبداتەوەو خۆی بگەیەنێتە تەمباسکی پشتەوە. ئەوێ هەمووی دارو درەخت بوو.

هەستاو وەڕێ کەوت. دەتگوت لەسەر جادەیەك پیاسە دەکا. ئەوانەی ئەویان وا ئارام و بێ باك دیت، زمانیان ڕەق بوو.

هێندەی چاو لەسەر چاو دانێی نارنجۆکەکانی هاویشتە تیربارەکە. ئەمە یەك... ئەمە دوو... ئەمەش سێ... بە دەنگی تەقینەوە زەوی لەرزی، دنیا لە دووکەڵ دا نوقم بوو.

بە غار خۆی گەیاندەوە هاوڕێکانی. هەتاو خەریك بوو ئاوا دەبوو. قسەیەکی نەکرد. تەماشای کەسیشی نەکرد. چاوی بڕیبووە تاقە نوختەیەك. ڕوانینەکەی تیژ بوو. دەم و چاوی چووك ببوونەوە.

تەقە کەمتر بوو... پاشان بوو بە تاك و تەرا...

حەمەد ڕاست بووەوەو ڕاوەستا:

"وەکیل باشی عاصم، وەکیل باشی عاصم... تۆق تۆقیلەکەت بەرە چاکی بکەوەو وەرەوە. لێرە چاوەڕوانتم."

لەو بەرەوە دەنگێك نەهات.

دۆردوو لە نایب رەجەبی پرسی:

"نایب، ئەتۆ ئەم نێوە نێوە باش شارەزای... لەم نیزیکانە دێ و ئاوەدانی دەست دەکەوێ؟."

نایب:

"نا."

دۆردوو:

"کەوابێ دەبێ هەتا بەردەڵان بڕۆین... خوا بە فریامان بگا."

نایب رەجەب:

"دەبێ وەرێ کەوین. هەتا دەگەینە بەردەڵان نابێ پشوو بدەین. منیش بەو پیری و برینداری‌یەم لەگەڵتان دێم... نابێ راوەستین."

بەری بەیانی وەختێك لە بەردەڵان نیزیك بوونەوە، هیچ کامێکیان خۆیان بە سەر پێوە نەدەگرت. عەلی‌یەچکۆڵ بەدرێژایی ئەو رێگایە هەر جنێوی دابوو و قسەی کاڵی گوتبوو. بەڵام دیار نەبوو لەگەڵ کێیەتی... هێشتا هەر جنێوی دەدا. نایب رەجەب ئیدی هێزی لەبەر بڕابوو. هەرچەندی ددانی بە جەرگی خۆی دا گرت، نەیتوانی پێشی خۆی بگرێ و هاواری لێ‌بڵیند بوو.

دۆردوو برینداروو بێ‌هێزو ماندوو لەسەر گابەردێك دانیشت. لەسەرەخۆ سیغارێکی پێچایەوەو دایگیرساند. پاش ئەوەی چەند مژی لێ‌دان، رووی کردە حەمەد:

"دەزانی لەم دنیایەدا ئارەزووم چ بوو؟."

حەمەد:

"نا."

دۆردوو:

"ئارەزووم ئەوەبوو ئەو مەستانەڕەشە کە کوشتم، سەرم بڕیبایە، مێزەرێکم لەسەر نابایەو بردبام لە نێوەڕاستی مەیدانەکەی گوندی سپی‌یەبی هەڵم واسیبایە. ئاخر ئەو نامەردە چی لە ئێمە دەویست؟... ئەتۆ پێم بڵێ حەمەد... چ وردە حیسابێکی لەگەڵ من هەبوو؟."

جەبار بانگی کرد:

"ئێوە هەرچی دەڵێن، بڵێن... ئەمن ئەوە لە برسان دەمرم."

دۆردوو:

"ئەگەر بتوانی فکرێك بۆ برسیەتیەکەمان بکەیەوە، پێت دەڵێم زۆر پیاوی."

جەبار:

"بێدەنگ بن... گوێ هەڵخەن... لەو دوورە دەنگی سەگوەڕ دێ... ئەو دەوروبەرە دێ و مێی لێی نین... کەوابوو ئەم سەوەڕە لە کوێوە دێ؟."

نایب رەجەب هەروا بە دەم ناڵینەوە جوابی دایەوە:

"کاك جەبار... ئەمن لە ژیانی خۆم دا کەرم زۆر دیون، بەڵام هەتا ئەمڕۆ کەری وەك تۆم نەدیوە."

"بۆچی، چۆن؟."

نایب رەجەب:

"چونکە ئەم دیوە."

جەبار:

"وەڵڵا تەواومان کرد... وادیارە چاك لەبەر چاوی نایب کەوتووین."

نایب:

"ولاغ... هەر بەڕاستی تێنەگەیشتی ئەو سەوەڕە هی کوێیە؟."

جەبار:

"باشە بە چی بزانم، خۆ من ساحەب سەگ نیم."

"ولاغ... ئەم سەوەڕە لە رەشماڵی تورکمەنەکانەوە دێ. "یۆرووکەکان" لەم دەوروبەرە چادریان هەڵداوە، سەگەکان هی ئەوانن... ئێستا حاڵی بووی؟."

جەبار:

"بەڵێ، حاڵی بووم."

نایب رەجەب:

"بارك الله."

جەبار:

"کەوابێ من و حەمەدۆك دەچین نانیان لێوەردەگرین... لەگەڵم دێی حەمەد؟."

دۆردوو:

"بۆخۆتان دەزانن... ئێمە هەر لێرە ئاگرێك دەکەینەوە. با هەتا ئێوە دێنەوە نەختێك گەرممان بێتەوە."

حەمەد:

"بڕۆین جەبار... با بڕۆین... بەڵام هەرکەس ئێمە بەم سەرو سەکوتەوە ببینێ, یان بە قەرەچیمان تێدەگا, یان وا دەزانێ سەگین و کەلاکمان هەڵدڕیوە..."

جەبار:

"گوێ مەدەیە... تاوێك بە دەم و چاوی خۆمان دا دەکەین, تەواوە."

لە بەردەڵان ڕا هەتا بەستەکە بێ ئەوەی قسەیەك بکەن ڕۆیشتن. دیار نەبوو بۆچی نەیان دەوێرا تەماشا سەروچاوی یەکتر بکەن. ئەمیان دەترسا چاو بۆ لای ئەوی دیکە وەرگێڕێ و ئەوی دیکەش هەروا... وادیار بوو هەردووکیان گوناحبارن, وادیار بوو هەردووکیان گوناحێکی گەورەیان کردوە.

پاشان جەبار دەستی درێژ کرد، قامکە چکۆلەی حەمەدی گرت. حەمەد لە سەرەخۆ سەری هەڵبڕی و تەماشای کرد. جەباریش تەماشای چاوی حەمەدی کرد. تاوێك هەر لە جێی خۆیان ڕاوەستان و چاویان لە چاوی یەکترەوە بڕی.

حەمەد:

"جەبار، ئەم کابرایە پیاوێکی باش نیە... ئێمە بۆچی وەدوای کەوتووین؟"

جەبار:

"چ بکەین؟ ئێمە سوێندمان خواردوە که هەتا ماوین لەگەڵی بین... هەرچی بێ چاوو گوێمان لەلای دۆردوو کراوەتەوە."

وەختێك گەیشتنە تاوڵەکان هەتاو ڕمبێك بڵیند ببوو. پێنج شەش سەگی زەلام لە قەراغ تاوڵەکانەوە بۆیان هاتن.

جەبار:

"هۆی...، ئەم سەگانەمان لێ دەرکەن."

چەند منداڵ لە چادرەکان هاتنە دەرێ و هەر چاویان بەوان کەوت بە هەڵاتن گەڕانەوەو هاواریان کرد:

"یاغی... یاغی هاتن."

بە دەنگی منداڵەکان لە پێش دا ژنەکان و دوایەش پیاوەکان هاتنە دەرێ.

حەمەد چووە لای ئەو دار بە دەستانە کە لە پێش یەکێك لە چادرە گەورەکان کۆ ببوونەوە:

"بەیانیتان باش."

دار بەدەستە تورکمەنەکان بە سەر سوڕمانەوە تەماشای ئەم یاغییە چکۆلەیان کرد. بە پێچەوانەی حەمەد، جەبار پیاوێکی زەلام و بە خۆوە دیار بوو.

یەکێك لە مەڕدارەکان کە پیاوێکی ریشدار بوو جوابی حەمەدی دایەوە:

"بەخێراتن کاکینە، فەرموون بۆ ژووریٚ."

سەریان دانواند و چوونە ژووری چادریٚ.

هەر کە وەژووری تاوڵی کەوتن حەمەد لەجێی خۆی وشك بوو. جوانی نێو چادرەکە حەمەدی گێژ کرد بوو. لە عومری خۆی دا ئەمە یەکەم جار بوو کە ژووری تاوڵێکی دەدی. وا گێژ ببوو کە گوێی لە بەخێراتنی ئەو پیاوە پیرە نەبوو کە لە ژووریٚ دانیشتبوو. چاوی بە مۆلەق وەستا بوون. لای پشتەوەی تاوڵەکە پڕ لە جەواڵ و تێری نەخشین بوو... نەخشی رەنگاوڕەنگ لەسەر جەواڵەکان هەڵدەفڕین... زۆر زۆریش خێرا هەڵدەفڕین... رەنگ و نەخش هەنگامەیەکیان ساز کرد بوو، هەر مەپرسە... ئەو هەموو روناکاییە لە کویٚ ڕا دەهاتە نێو ئەم تاوڵە؟ تیشکی هەمەڕەنگ تێك دەچرژان و پێکەوە یارییان دەکرد.

حەمەد چاوی بڕیە یەکێك لە جەواڵەکان. ماوەیەکی زۆر نەیتوانی چاو لەو جەواڵە وەرگێڕیٚ. لەسەر یەکێك لەو جەواڵانە نەخشی ژمارەیەکی زۆر تەیری خۆشەویستی کێشرابوو، تەیری چکۆڵە چکۆڵە... رەنگە هەزار دانە دەبوون. هەموویان دەندووکیان بە دەندووکی یەکترەوە نابوو... هەموو سەوز و شین و زەردو سوورو بنەوشی. حەمەد چاوی پڕ بوون. تەیرە رەنگاو رەنگەکان لەبەر چاوی هەڵدەفڕین وهەڵدەفڕین.

چڵە تاوڵەکە نەخش و نیگاریان لیٚ هەڵکەندرابوو و چەند شووری باڵداریان لەسەر چەقاند بوون کە سەرتاسەر لە سەدەف دروست کرابوون. مووی شوورەکان دەبریسکایەوە...

جەبار نقورچێکی لە حەمەد کوتا:

"خەوت لیٚ کەوت؟... هەستە."

حەمەد وەخۆ هاتەوەو زەردەخەنەیەکی کرد:

"هەتا ئێستا نێو ماڵی چادرێکم نەدیبوو. دەڵێی بەهەشتە... چەند جوانە."

جەبار:

"ئەم تاوڵە هی کێیە؟."

پیرە پیاوێکی ریش سپی و دەم بە پێکەنین و روو خۆش، لە ژووری تاوڵیٚ بەرەو روویان دانیشتبوو.

پیرە پیاو:

"هی منە... بە من دەڵێن "کەریم ئۆغلی"."

جەبار:

"ناوی تۆم بیستوە... کەوابوو کەریم ئۆغلی تۆی؟..."

کەریم ئۆغلی بە بڕوایەکی تەواوەوە کە هەمیشە بە خۆی هەبوو، جوابی دایەوە:

"خۆمم."

جەبار:

ناوتم زۆر جار بیستوە ئاغا. بەڵام یەکەم جارە کە دەت بینم. ئاخر ئەتۆ ئاغـای عەشـیرەتی "ساچی کاڕاڵی" نی؟."

کەریم ئۆغلی:

"بۆچی."

بۆنی شیرێکی تازە دۆشراو کە خەریك بوو بکوڵـێ، ژووری چادرەکەی پڕ کردبوو.

پیرە پیاوەکەو جەبار تەماشای چاوی یەکتریان کرد. پاشان پیرە بانگی خێزانی کرد:

"کچێ، ئەم لاوانە رەنگە برسی‌یان بێ... نەختێك زووتر وەبزوو."

ژنە:

"شیر لەسەر ئاوری‌یە... ئێستا وەکوڵ دێ، هەر ئێستا..."

حەمەد زەردەیەکی هاتێ:

"بۆنم کردبوو..."

جەبار:

"هی چی؟."

"بۆنی ئەو شیرە کە لە دەرێ وەسەر نراوە."

جەبار:

"منیش بۆنم کردبوو. هەموو کەس بە برسیەتی لووتی باش بۆن دەکا."

دەم و چاوی سوورهەڵگەڕاوی کەریم ئۆغلی سوورتریش هەڵگەڕان، بە دەنگێکی تێکـەڵ بـە شەرمەوە رووی کردە حەمەد و جەبار:

"کوڕینە، وادیارە لە شەڕ ڕا دێنەوە."

جەبار:

"وەكیل باشی عاصم ئێمەی لە داو خستبوو. شوكور بۆ خوا كە نەجاتمان بوو."

حەمەد:

"ترسەنۆك بوو... ئەگەر ترسەنۆك نەبووایە هەموومانی وەك كەوبارە دەگرت."

جەبار:

"ئەرێ... بەڵام گوللەكانی بە خەساردا."

ژنەكە سفرەی هێناو لە نێوەراستی تاوڵێ داینا. كەریم ئۆغلی بە پێكەنینەوە سفرەكەی بڵاو كرد.

حەمەد بۆ یەكەم جار خۆی لەگەڵ شتێك و جێیەك بە نامۆ دەهاتە بەرچاو. ئەم نامۆییە لە خۆی بوو. خۆی لە خۆی نامۆیی دەكرد. چاوی بەتفەنگەكەی كەوت. لەپاشان سەرو سەكوتی خۆی هێنایە پێش چاوی. تەواوی سنگی لە راست و چەپ فیشەكدان بوو... چەند نارنجۆك و قەدارەیەكی گەورە بە لای راستی پشتێندەكەیەوە هەڵاوەسرابوون. تەقیلەیەكی رزیو و چڵكنی بە سەرەوە بوو... لە هەمووش خراپتر ئەوە كە تەقیلە كۆنی دۆردووە شێت بوو... لە دڵی خۆی دا گوتی:"ئیدی یاغی بووین... لەمەودواش هەتا مردن دەبێ یاغی بین... ئاوا؟..."

لە پێش دا جامە شیرەكەیان لەنێوەڕاستی سفرەكە دانا. شیرەكە هەڵمی لێ هەڵدەستا، هەڵمێكی شین... سەری شیرەكەش هەڵدەقرچاو توێی دەبەست. پاشان شیلەو دوایەش قاورمەی گۆشتیان هێنا... هەردووكیان لەپڕ زاریان پڕ بوو لە ئاو. وەك دوو منداڵ تەماشای یەكتریان كرد و پێكەنین. كەریم ئۆغلی تێیان گەیشت. ئەویش پێكەنی. ددانەكانی كە وەك شیر سپی بوون لە زاری دا درەوشان:

"فەرموون كوڕینە... شەرمێ مەكەن، نۆشی گیانتان بێ."

هەردووكیان تاویان دایە ئەو كەوچكانەی لە پێشیان بوون. لە پێش دا پەلاماری شیری گەرمیان دا. بە دوو شاڵاوی دیكە نانی سەر سفرەكەیان هەڵلووشی. سەر لە نوێ نانیان هێنا. شیرەكەش تەواو بوو. دووبارە شیریان هێنا. ,

پاش ئەوەی هەروا بە پەلە نانەكەیان خوارد، سوپاسی پیرە پیاوەكەیان كرد:

"خوا بە زیادی كا."

پیرە پیاو هێشتا هەروا لە سەرەخۆ خەریكی نان خواردن بوو:

"نۆشی گیانتان بێ... باشە... جحێڵی ئەم جۆرە شتانەشی هەیە." پاشان پیرە پیاو بە پشتە دەستی سمێڵەكانی پاك كردنەوەو لە سەر سفرەكە هەستا:

باشە... لەگەڵ سیغار چۆنن؟...فەرموون سەرو سیغاریش بکێشن."

جەبار:

"ئێمە هیچمان سیغارکێش نین."

کەریم ئۆغلی سیغارەکەی بە لێویەوە ناو چەرخەکەی لێ دا. بۆنێکی خۆش لە پلیتەکەی هەستاو لە چادرەکە گەڕا:

"دەمەوێ شتێکتان پێ بڵێم بەو شەرتە پێتان ناخۆش نەبێ...و دڵیشتان شتێکی دیکە نەڵێ."

حەمەد:

"فەرموو ئاغا... دڵمان چ دەڵێ؟."

کەریم ئۆغلی کەمێك بە زمان هەڵەنگوتنەوە لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

"ئێوە لەو کێو و بەندەنانە نە دایکێکتان هەیەو نە ماڵ و حاڵێك... شەڕیشتان توش بووە. هەموو جلەکانتان و سەرو چاوتان نوقمی خوێنە. جلەکانتان دانێن، منداڵەکان دەسبەجێ بۆتان دەشۆن. زووش وشك دەبنەوە... منداڵەکان دەتوانن بە ئاوریش وشکیان کەنەوە. ئێوەش جارێ لە جلەکانی من لەبەر بکەن... لەمێژە دەمەویست پێتان بڵێم، بەڵام دەترسام فکر بکەنەوە کە کەریم ئۆغلی دەیەوێ ئێوە رووت بکاتەوەو لە گیرتان بخا. لە ماڵێ کەریم ئۆغلی کەس ناوێرێ پری چاوان تەماشای میوانان بکا. هەتا کەریم ئۆغلی ماوە، هیچ کەس ناتوانێ لە گوڵ کاڵتر بە میوانەکانی بڵێ... ویستم ئەمانە بزانن."

جەبار:

"ئێمە کەریم ئۆغلی دەناسین... نەدەبوو لە سەر ئێمە وابیر بکەیەوە خان..."

حەمەد:

"بەڵێ خان... نەدەبوو فکری وا بکەیەوە."

کەریم ئۆغلی:

"بۆچی... بۆچی... بنیادەم هەرچی بێ شیری خاوی خواردوە... هەروەك دەتوانێ چاکە بکا، ئەوەندەی لە دەستی بێ، هەروا دەتوانێ خەراپەش بکا."

بوکێکی چاو رەش و چاو بە کل و گوڵ گۆنا، بۆ هەر کامێکیان دەستێك کراس و دەرپێی هێنا. کراس و دەرپێیەکان هێشتا بۆنی سابوونیان لێ دەهات.

کەریم ئۆغلی:

"ئەمن دەچمە دەرێ، ئێوە خۆتان رووت کەنەوە."

کەریم ئۆغڵی چووەدەر.

حەمەد:

"لەم دنیایەدا پیاوی چەند باش هەیە."

کەریم ئۆغڵی لە دەرێ ڕا بانگی کرد:

"کوڕینە خۆتان رووت کردەوە؟... بێمە ژوور؟."

حەمەد:

"لـێ بووینەوە."

کەریم ئۆغڵی هاتە ژوورێ. تەماشایەکی حەمەدی کرد:

"با برینەکەت ببینم..."

حەمەد:

"شتێك نیە، گوللە کەمێك لە پێستی سەرمی بردوە..."

کەریم ئۆغڵی رووی کردە جەبار:

"ئەتۆ هیچت نیە؟."

جەبار:

"نا، سوپاس بۆ خوا."

کـەریم ئـۆغڵی چـووەدەر. پـاش چـەند دەقیقـە بـە پیاڵەیـەك و نـەختێك کۆنـەوە گەرایەوە. بۆخۆی مەڵحەمی دروست کرد بوو. سـەری حەمـەدی دەرمـان کـردو دەسـتی کرد بە پێچانی:

"هەتا دوو رۆژی دیکە برینەکەت سارێژ دەبێتـەوە. ئێمـەش بـە جحێڵـی زۆر جـار برینـدار بووین... هەمووی لەبیر دەچێتەوە."

سەری حەمەدی لە جەڕاحێك وەستایانەتر پێچا.

حەمەد سوپاسی کرد:

"دەستت خۆش بێ ئاغا."

کەریم ئۆغڵی:

"مەترسە... برینەکەت نەختێك ئەستوور بووە، چلکی کـردوە... بـەڵام مەڵحەمەکـە زوو چاکی دەکاتەوە."

کەریم ئۆغڵی حاڵەتێکی سەیر منداڵانەی هەبوو. کاتێك دەیەویست شتێك بڵێ شەرمی دەکرد و ڕەنگی سوور هەڵدەگەڕا، پێدەکەنی و سەری دادەخست... دیسان هەربەو حاڵەتی منداڵانەیەوە لە حەمەدی پرسی:

"ڕۆڵە گیان... ئەگەر پێت ناخۆش نەبێ، دەمەویست شتێکت لێ بپرسم... ئەتۆ هەر بەراستی یاغیی؟... بەڕاست بەڕاست؟... یان هەر..."

جەبار پێکەنی:

"نا ئاغا... حەمەدۆك لاسای یاغییان دەکاتەوە."

حەمەدیش زەردەیەکی هاتێ:

"ئێمە بە شیاوی یاغییەتی نازانی؟.

کەریم ئۆغڵی:

"ببوورە ڕۆڵە گیان... لەبەر ئەوە نیە کە پێم چکۆڵە بی، بەڵام وا دیارە شازدە ساڵ زیاتر نی... دەبووری..."

حەمەد بە خۆڕانانەوە جوابی دایەوە:

"هەژدە ساڵم."

کەریم ئۆغڵی:

"زۆرم پێ خۆشە بزانم... حەز دەکەم بزانم چۆن بووە کە لەم تەمەنەدا یاغی بووی؟."

جەبار:

"کەری ئاغای خۆی دزیبوو و فرۆشتبووی. پاشان لە ترسی ئەوەی ئاغا دارکاریی بکا، هات و ڕەگەڵ ئێمە کەوت. ئێمەش وەرمان گرت، گوتمان کە دزێکیشمان لەگەڵ بێ، خەراپ نیە. لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان بە کەڵکمان بێ..."

پیرە پیاو تێگەیشت کە جەبار گاڵتەی پێدەکا. دڵی یەشا. لە پرسیارەکەی هەزار جار پەژیوان بووەوە. بێدەنگ بوو. ئیدی هیچی نەگوت.

جەبار وەختێك دیتی کەریم ئۆغڵی بەو گاڵتەیە دڵی ئێشاوە، لە سەری ڕۆیشت:

"ئاغا...، تۆ ناوی عەبدی خانت بیستووە؟... ئاغای ئاسیاب چەشمە؟."

کەریم ئۆغڵی:

"چاکی دەناسم. بیستم کە تەقەیان لێ کردوە... دەڵێن بۆخۆی نەمردوە، بەڵام خوشکەزاکەی کوژراوە."

جەبار:

"ئەوەی کە دەی‌بینی، تەقەی لە عەبدی کردوە."

کەریم ئۆغڵی ماوەیەکی زۆر لەسەرتاپای حەمەد ورد بووەوە:

"سەیرە ... سەیرە... هیچ وەك پیاو کوژان ناچیٚ... حەمەدۆك... سەیرە... سەیرە..."

حەمەد:

"خان، ئەگەر کەمێکی دیکەمان لەو مەڵحەمە بۆ دروست بکەی بۆ هاوکارەکانمانی دەبەین... ئەوانیش هێندێکیان بریندارن..."

"مەڵحەم حازرو ئامادەیە... رۆنیشتان بۆ دروست دەکەم... مەڵحەمی شیفاشمان هەیە... هەر ئێستا..."

حەمەد:

"خوا خێرت بنووسیٚ خان."

کەریم ئۆغڵی مەڵحەمێکی زۆری لەنێو کوتە جاوێکەوە پێچا. هێندێکیشی مەڵحەمی شیفا دروست کرد و هێنای دای بە حەمەد.

حەمەد و جەبار وەڕیٚ کەوتن.

کەریم ئۆغڵی:

"سەرم لە کاری تۆ دەرناچیٚ حەمەدۆك... لێت ناوەشێتەوە یاغی بی. بەڵام چارە چیە؟... کار لە کار ترازاوە... کیٚ دەزانیٚ هەر بنیادەمێك چیی لە چارە نووسراوە..."

حەمەد و جەبار:

"خوا حافیز خان."

کەریم ئۆغڵی:

"بەخێرچن... ئەگەر رێتان لەم دەوروبەرانە کەوت، سەرمان بدەن، با چاومان پێك بکەوێتەوە..."

حەمەد و جەبار وەڕیٚ کەوتن. هەر کامێکیان توورەکەیەکی بە دەستەوە بوو. توورەکەکان قوورس بوون. کەریم ئۆغڵی ئەم توورەکانەی پڕ کرد بوو لە نان و پەنیر و رۆنەکەرە.

جەبار:

"چەند پیاوی چاکە..."

حەمەد:

"پیاوی چاك و بەس؟."

لەپڕ حەمەد راوەستا. شتێکی وەبیر هاتەوە:

"جەبار, کراس و دەرپێیەکانی خانمان لەبیر چوو بیاندەینەوە... با بگەڕێینەوە."

جەبار:

"گوێی مەدەیە, خۆ ئێمە نەمان دزیون, لەبیرمان نەبووە..."

حەمەد:

"نابێ... با بگەڕێینەوە."

جەبار پێکەنینێکی هاتێ:

"کەریم ئۆغلی حەقی بوو... یاغییەتی و تۆیان نەگوتوە."

حەمەد:

"باشە چ بکەم, خۆ هەموو کەس بە یاغییەتی لە دایکی خۆی نابێ..."

جەبار:

"کەوایە با بگەڕێینەوەو کراس و دەرپێیەکانیان وێ دەینەوە."

حەمەد:

"ئەرێ, با بگەڕێینەوە."

بە غاردان گەڕانەوە لای چادرەکان. کەریم ئۆغلی بە سەرسوڕمانەوە لەبەر دەرکی تاوڵێ پێشوازیی لێکردن:

"چ بوو؟... بۆچی گەڕانەوە؟."

حەمەد:

"لەبیرمان چوو کراس و دەرپێیەکانت وێ دەینەوە."

کەریم ئۆغلی:

"ترسام. گوتم نەکا شتێك قەومابێ. کراس و دەرپێیەکان پیرۆزتان بن... پێویست ناکا دایان نێنەوە."

حەمەد:

"ئاخر چۆن دەبێ؟."

کەریم ئۆغلی:

"بەڵێ دەبێ... ئەگەر دایان نێنەوە دڵم دێشێ."

وەختێك لە بەردەڵان نیزیك دەبوونەوە، خەریك بوو شەو دادەهات. لە دوور، لەسەر كێوی، لەنێو گابەردەكان ئاورێكی گەورە كرابووەوە.

جەبار:

"پێم وایە، ئەم ئاورە هی كوڕەكانی خۆمانە."

حەمەد:

"هی كوڕەكانی ئێمە؟."

جەبار:

"حەتمەن... ئەم جۆرە ئاورە كاری دۆردووییە... بۆ ئەوەی رقەبەری لەگەڵ وەكیل باشی عاصم بكا، ئەم ئاگرەی كردوەتەوە."

حەمەد:

"ئەمن ئیدی ناتوانم برۆم جەبار... فیتوویەك لێدەو خەبەرداریان بكە."

جەبار دوو قامكی لە زاری راكردن و فیكەیەكی بۆ كردن.

حەمەد:

"ماشەڵڵا چ فیكەیەك... رۆژەرێیەك دەڕوا."

لەحزەیەك دواتر لە لای ئاگرەكە دەنگی تەقەیەك هات و پاشانیش دەنگی تەقەیەكی تێكڕایی...

حەمەد:

"ئاكا خەبەرێك هەبێ."

جەبار:

"دۆردوو خانە شێتە جێژنی گرتوە. هەروەخت كەیفی هەبێ، ئاوا تەقە دەكا."

بە دەنگی فیكەكە كەس بە پیریانەوە نەهات. حەمەدو جەبار نیگەران بوون. كاتێك گەیشتنە نیزیك ئاورەكە دیتیان شەلاڵی ئارەقن. دۆردوو و ئەوانی دیكە راست بوونەوەو بە پیریانەوە هاتن. دۆردوو كاتێك پێیان گەیشت، دەمانچەكەی هەڵكێشاو گوتی:

"بەخۆشی سەرتان." و یەدەگێكی هەڵتۆقاندن.

دۆردوو:

"ئەگەر درەنگتر هاتبانەوە هەموومان لە برسان دەمردین... بڕوانن، نایب رەجەب هێشتا هەر دەناڵێنێ... بەخوا ئەگەر لەبەر برینەکەی بێ؟... لە برسانە، بەخوا لەبرسانە..."

ئاگرەکە هێندەی جێجێخوونێك دەبوو. بڵێسەکان بالاًپیاوێك بەرز دەبوونەوەو تێك دەئالقان. دەنگی قرچە قرچی سووتانی دارەکان بەرز دەبووەوە. کاتێك دار ئاگر دەگرێ، بۆنێکی خۆشی لێدێ. وەك بۆنی سووتانی ئار... سووتانی داری تەڕیش دنیایەکی دیکەی هەیە. داری تەڕ ماوەیەك لە نێو بڵێسە ئاورەکان دا خۆی رادەگرێ و رادەوەستێ. لە پاشان لە پڕ لە نێوەڕاستێ دا لەت دەبێ و لە نێو مەشقەڵی ئاور دا ون دەبێ.

یەکەم کاری حەمەد ئەوە بوو کە راستەڕێ چووە ژوور سەری نایب رەجەب:

"چۆنی نایب."

نایب ناڵاندی:

"برینەکەم ئیدی تەشەنا بووە... ئەمن ئیدی رزگاریم نایە... دەبێ بمرم... خەریکم دەمرم..."

حەمەد پاشان چووە لای عەلییەچکۆڵ:

"ئەتۆ چۆنی براله... چۆنی عەلییە چکۆڵ خان؟."

عەلییەچکۆڵ زاری وەك سندووقێکی پڕ لە جنێو کردەوە:

"دایك و خوشکی هەرچی یاغی و فیشەك و دێ و ئاوەدانی و دارو سەنگەرو بەردو گابەردو برینە... ژنی عەبدیخانیش... برینەکەی خۆشم... گوێت لێ بوو حەمەد؟... دەڵێن عەبدیخان نەمردوە... گمواده وەك سەگ گیان سەختە... خەمت نەبێ، بۆخۆمان دایکی... خوشکی ئەو خوشکەزایەشی... دەڵێن ئەو مردوە..."

حەمەد:

"مەڵحەم و رۆنم بۆ هێناون. ئەمانە کەریم ئۆغلی بۆتانی ناردوە. ئەم رۆن و مەڵحەمە بۆخۆی دروستی کردوە... بە دوو رۆژ برینەکانتان چاك دەکاتەوە..."

عەلییەچکۆڵ:

"خوشکی رۆن و مەڵحەمەکەی ئەویش..."

حەمەد:

"قسەی کاڵ مەکە عەلییەچکۆڵ... حەتمەن قازانجی هەیە..."

عەلییەچکۆڵ:

"ئیشەڵلا..."

نایب رەجەب کەمێك راست بووەوە:

"کەریم ئۆغڵییشتان وا دیارە زۆر بە چاو و راوە... دوو رۆژەکە هیچ، ئەگەر ئەم برینانەی من بە مانگێکیش چاك بکاتەوە کڵاوەکەم هەڵداوێم و نایگرمەوە."

حەمەد پاش ئەوەی برینی هەردووکیانی کردەوەو دەرمانی کردن، چوو لەبەر ئاگرەکە دانیشت:

"سەیر ماندوو بووم..."

دۆردوو:

"حەمەد... بزانە جەبار دەڵێ چی... دەڵێ وەختێك حەمەد چاوی بە تاوڵی کەریم ئۆغڵی کەوتوە، لە سەیران زاری پێ داپچڕاوە."

حەمەد:

"راست دەکا... ئەمن تا ئێستا چادری وام نەدیبوو. ژوورەکەی دەتگوت کۆشکی بەهەشتە..."

جەبار:

"بەڵێ... کەریم ئۆغڵییە... بە خۆڕایی پێی ناڵێن کەریم ئۆغڵی... ئەدی دەتەوێ تاوڵی کەریم ئۆغڵی وەك کۆشکی بەهەشت نەبێ و چادری من وەك کۆشکی بەهەشت بێ؟..."

دۆردوو:

"ئەتۆ دەتناسی؟."

جەبار:

"ناویم زۆر بیستبوو... دەیانگوت زۆر پووڵدارە... بە چاوی خۆشمان دیتمان، دەڵێن کروورێك زیاتر پووڵی هەیە..."

حەمەد:

"پیاوی چەند چاك لەم دنیایەدا هەن... فکری هەموو شتێکی کردەوە. برینەکەمی دەرمان کردو بەستی. زگمانی تێر کرد. فەرمانی دا جلەکانیان بۆ شتین و یەکی دەستێك کراس و دەرپێشی داینێ."

جەبار:

"لەو خانە بەڕێزانەیە... ناو و ناوبانگی هەیە..."

دۆردوو:

"ئێستا کە ئەوەندە بە ناو و دەنگە، بۆچی ئێمە تا ئێستا ناویمان نەبیستوە؟."

جەبار:

"کەریم تۆغڵی سەرۆکی دەوارنشینەکانە... ئەوان لە جێیەك بەند نابن... هەمیشە لە کۆچ و کۆچبار دان."

حەمەد:

"لەجێیەك بەند بن و بەند نەبن، پیاوی چاکن... ئەستوندەکی چادرەکەیان لەسەری ڕا تا خواری سەدەفکاری کرابوو. ئەویش چ سەدەفێك، سەدەفی ساغ و ڕەسەن."

دۆردوو بەسەرسوڕمانەوە:

"تیرەگی چادرەکەی لە سەری ڕا تا خواری سەدەفکاری بوو؟... ئەویش سەدەفی ساغ و ڕەسەن؟... سەیرە... کەوابێ دیارە کابرا بەڕاستی پوولدارە..."

حەمەد:

"بەڵێ... پێت وا نەبێ تاوڵەکەی تەنیا یەك دیرەکیشی هەبوو. دە دیرەکی زیاتر لەبەردا بوو، لەوانە بوو بگاتە پازدە دیرەکیش... یەکێك لە بووکەکانی نانی بۆ ئێمە هێنا... ملیوانکەیەکی لە ملیدا بوو، لانی کەم پەنجا دانە پێنج لیرەیی پێوە بوو... بە کورتی ئاغا زۆر پوولدارو زۆریش سەرورووخۆش بوو..."

جەبار:

"وەختێك تێگەیشت حەمەد تەقەی لە عەبدیخان کردوە، هەروا لە حەمەد ورد دەبووەوەو بیری لێدەکردەوە. چاوی لە حەمەد نەدەگوێزتەوە... وا نەبوو حەمەد؟."

"بەڵێ... هەروا تێمەوە ڕامابوو."

دۆردوو چاوی بریبووە بڵێسە ئاگرەکان و متەقی نەدەکرد. هیچیشی نەدەپرسی. لە گێژ فکران ڕاچووبوو... لە سەرو سیمای ڕا دیار بوو نیازێکی هەیە. هەموو وەختێك ئەوکاتەی خەیاڵێك لەسەری دەداو لە فکرەوە دەچوو، لە سەروسیمای ڕا دیار بوو.

وەختێك دۆردوو بێدەنگ بوو، ئەوانی دیکەش بێدەنگ بوون. پاشان دۆردوو بە تووڕەییەوە بەوانی دیکەی گوت:

"ئێوە بخەون... ئەمشەو من و عەلیەیچکۆڵ و نایب ڕەجەب نێشك دەگرین."

چما کەس دەیوێرا لەو جۆرە وەختانەدا قسە لە قسەی دۆوردوو بکا... هەڵیدەکێشایە دەمانچەو تەقەی لێدەکرد. ئەگەر بابی خۆشی بووایە... ئەوانی دیکە قسەیەکیان نەکرد، هەستان و چوون لەبن گابەردەکە لە پەنای یەکتر درێژ بوون و خۆیان مات کرد.

جنێوەکانی عەلیەچکۆڵ هێشتا تەواو نەببوون, بەڵام کەمتر بوون. جارجار جنێوێکی دەداو بێدەنگ دەبوو... ناڵە ناڵی نایب رەجەبیش بێدەنگ بوو.

هێندێك کەس هەر زگماك خوێن شیرین و لەبەر دڵانن. نایب رەجەبیش یەکێك لەو جۆرە کەسانە بوو. هەر دەڵێی بۆیە هاتوونە سەر دنیا کە خەڵکی دیکەیان خۆش بوێ. داخوا ئەوانە بۆ ئەوەی خەڵك خۆشی بوێن, شتێکیان لە خەڵکی دیکە زیاترە؟... نا, بۆ وێنە ئەم نایب رەجەبە پیاوێکی خۆش مەجلیسە؟... نا. پیاوێکی دەم بە پێکەنین و قسەخۆشە؟... نا, زار بە پێکەنین و قسەخۆشیش نیە. ئەمە خۆی نهێنیەکە. نایب رەجەب سێ ساڵ بوو لەگەڵ دەستەی دۆردوو بوو. پێشتریش دوو سێ مانگ لە دەستەیەکی دیکەدا بوو. هەموو کەس لەوە کە نایب رەجەب سێ ساڵ لەگەڵ دۆردوو هەڵی کردوە, سەریان سوڕمابوو.

یەکەم رۆژ کە نایب رەجەب لەگەڵ دۆردووە شێت بەرەوڕوو ببوو, پێی گوتبوو:

"بروانە کوڕە, ئەگەر تۆش وەك ئەو گەوادانە ئاقڵ بای دوو مانگ زیاتر لە نێو دەستەکەت دا نەدەمامەوە, کاری ئەو زۆرزانانە ئەوەیەکە هەروا بە تەڵەوە بن و گوللەیان وێ بکەوێ. تێگەیشتی؟..."

دۆردووش گوتبووی:

"بەڵێ, تێگەیشتم."

لەو رۆژەوە تا ئەمڕۆ, نایب رەجەب لەو بارەیەوە قسەیەکی دیکەی نەکردبوو.

دۆردووە شێت هەرکارێکی کردبوو, نایب رەجەب رەخنەی لێنەگرتبوو. چەند جاریش لە خوت و خۆڕایی بریندار ببوو, دیسان قسەی نەکردبوو.

لەنێو هاوکارەکان دا هیچ کەس ئاگای لە رابردووی ئەو نەبوو. راوێژی قسەکردنی وەك خەڵکی دەوروبەری "ئانتەپ" دەچوو, بەڵام زۆریش نا. دیار بوو ماوەیەکی زۆر لە ئانتەپ ژیاوە. زۆر جار لەبارەی ئانتەپەوە شتی دەگێڕایەوە.

لەبارەی ژیان و رابردوویەوە قسە زۆر بوون. هێندێك کەس دەیانگوت: شەوێکیان نایب لە خەو راپەڕیوەو بانگی ژنەکەی کردوە:"کچێ... ئەو تفەنگەم بۆ بێنە, هێندێك نان و پێخۆریشم بۆ لە دەسرۆکەیەکەوە پێچە. ئەمن دەڕۆم...". ژنەکەی دەسبەجێ تفەنگەکەی بۆ هێناوە, پڕی دەسرۆکەیەکیش نان و پێخۆری بۆ تێناوەو داویەتە دەستی. نایبیش تفەنگی لە شان کردوەو گوتوویە:"کچێ ئەو کڵاوە چەرمەشم بۆ بێنە. ئەمن دەچمە شاخی, گەردنم ئازا کە." ژنەکەی سەری سوڕ دەمێنێ و دەڵێ:"چت لێ قەوماوە کوڕە... شەیتان چووەتە کلێشەت؟... بەو نیوەشەوە راست بوویەوەو دەڵێی دەچمە شاخی... وا دیارە لەسەری داوە...

پەنا بە خوا..." نایب رەجەب دەڵێ:"دەمەوێ بچمە شاخی نافرەت... ئەمن رۆیشتم." دەڵێن ئەو رۆیشتنی پێی رۆیشت, ئیدی گەڕانەوەی لە دوا نەبوو..."

هێندێکانیش دەیانگوت:"نایب رەجەب لە زاواکەی زویر بووە, چونکە بیستوویەتی زاواکەی جنێو بە کچەکەی دەدا... و رۆژێك کە بە بەردەرکی زاواکەی دا دەڕوا, بە گوێی خۆی گوێی لێدەبێ کە زاواکەی بەکچەکەی دەڵێ:"ئەو بابە وا لێکراو و وا پێکراوەت..." و نایب رەجەب هەرلەوێ ڕا راستەڕێ روو لە چیا دەکا, چونکە دڵی بەرایی نادا زاواکەی بکوژێ..."

هێندێکی دیکە دەیانگوت:"نایب بابایەکی پووڵدار بوو, بەڵام زۆری پێ ناخۆش بوو ماڵیات بدا. هەرکاتێك چاوی بە باجگری دەوڵەت دەکەوت نۆبەتێی دەهاتێ و دەکەوت و بە کورتی بۆ ئەوەی چاوی بە باجگری دەوڵەت نەکەوێ وەکێوان کەوتوە..."

هێندێ کەسیش دەیانگوت:"خەزووری خۆی کوشتوەو ملی لە کێوان ناوە..."

بە کورتی هەرکەسە شتێکی بۆ ساز دەکردو دەیگوت, کەسیش نەیدەزانی کێ راست دەکاو کێ درۆ.

ئەوەش دیار نەبوو داخوا خەتایەکی کردوە یان نا. بە کورتی, هەر جۆر بوو ئێستا چەند ساڵ بوو لە شاخی بوو و ئەگەر لە گیر کەوتبایە, لانیکەم سی ساڵ زیندانی بۆ دەبڕایەوە. بە جۆرێك ناوی لەگەڵ پیاوکوژی و تاڵان و رێگری تێکەڵ ببوو هەر باسی مەکە...

هەتاو دەرکەوت, پاشان بڵیند بوو و هەموو جێیەکی رووناك کردەوە. دۆردوو هێشتا لە خەو هەڵنەستابوو. هەتاویش لێی دابوو. بەڵام جاران دۆردوو پێش ئەوەی هەتاو لێی بدا, لە خەو هەڵدەستا. بوو بە نیوەڕۆ. دیسان دۆردوو هەڵنەستا. جەبار بۆنی کارەساتێکی بۆ دەهات و لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"حەتمەن خەبەرێك هەیە, ئەگینا ئەم شێت و شوورە تا ئێستا نەدەخەوت... حەتمەن نیازی تاڵانێکی تازەی لەسەر دایە... ئەمە پیشەیەتی کە پێش هەموو تاڵانێکی گەورە زۆر باش دەخەوێ... ئەو جۆرە تاڵانە قوورسەش ساڵێك ـ دوو ساڵ جارێك رێ دەکەوێ... ئێستا خوا دەزانێ خەونی بۆ کێ دیوە."

ئەمرۆ نایب رەجەب زۆر باشتر بوو. وەزعی باش بوو و لەبەر خۆیەوە بە نارەنار گۆرانیەیەکی دەگوت. دەنگی پیرانەو بەسۆز بوو.

نایب رەجەب:

"کوڕینە, ئەم شێت و شوورەی هەڵستێنن... هەڵی ستێنن با پارووە نانێك بخۆین."

حەمەد:

"ئەمن كارێكم پێی نیە."

جەبار:

"ئەمنیش هەروا."

"خەپل" چووە ژوور سەری دۆردوو:

"دۆردوو پاشا... هەستە, دۆردوو پاشا..."

خەپل هەمیشە دۆردووی بە دۆردووپاشا ناو دەبرد. دۆردووش ئەو ناوەی زۆر پێ خۆش بوو. خەپل لە نێو دەستەی دۆردوو دا چەند ئەركی تایبەتیی لەسەر شان بوون, كە یەكێك لەوانە گاڵتەجاڕی بوو. ئەو, گاڵتەجاڕی دۆردووە شێت بوو.

"دۆردوو پاشا... ئەوە نیوەڕۆیە... هەستە درەنگە پاشام."

دۆردوو بە قامكە زلەكانی چاوی هەڵگڵۆفین و هەستا:

"هەر ئێستا دەبێ نانی بخۆین, چونكە دەمانەوێ بڕۆین."

جەبار:

"ئەدی بریندارەكان چ لێبكەین, نایب رەجەب و عەلیەچكۆڵ وەزعیان باش نیە."

دۆردوو رووی كردە بریندارەكان:

"چۆنن؟... دەتوانن لەگەڵ ئێمە بێن؟."

نایب رەجەب:

"ئەمن دەتوانم بڕۆم, دێم... ژانی برینەكەم زۆر كەمترە..."

عەلیەچكۆڵ:

"ئەمنیش هەرچۆنێك بێ دێم, دایك و خوشكی ئەم برینە..."

كۆزیلكەیان بەست, سفرەیان راخست و لە دەوری دانیشتن.

كاتێك سێبەرەكان لەلای شیمالەوە بەرەو خۆرهەڵات درێژ دەبوونەوە, لە بەردەڵانەكە بەودیودا شۆڕ دەبوونەوە. دەنگی حەپەی چوارپێی پۆرووكە دەوارنشینەكان دەهاتە بەرگوێ.

حەمەد:

"ئێستێ دەچینە كوێ؟..."

دۆردوو جوابی نەدایەوە. تەنیا, بە رق هەستاوی چاوێكی لە حەمەد كردو بێدەنگ بوو.

حەمەد ئیدی لەسەری نەڕۆیشت.

وەختێك دۆردوو بەرەولای رەشماڵەكان بای دایەوە، حەمەدو جەبار تێگەیشتن كە نیازی چیە.

جەبار بە گوێی حەمەدی دا چپاند:

"دۆردوو خوێن بەری چاوانی گرتوە."

حەمەد:

"ئەرێ، خوێن بەری چاوانی گرتوە."

جەبار:

"ئەگەر بەڵایەك بەسەر كەریم ئۆغڵی بێنێ، چ بكەین... تەگبیری ئێمە چیە؟..."

حەمەدیش هەر ئەو پرسیارەی دووپات كردەوە:

"ئەرێ، تەگبیری ئێمە چیە؟."

جەبار:

"تەگبیری ئێمە چیە؟."

لە رێڕۆیشتنی دۆردوو ڕا دیار بوو نەخشەیەكی بەدەستەوەیە... و چ نەخشەیەكیش، لەو نەخشە سامناكانە دەم و چاوی دۆردوو هیچ وەخت بە ئاسانی دانەدەگیرسان... ئێستا دەم و چاوی زۆر خەراپ هار ببوون... مێش نەدەوێرا لە دەوروبەری باڵ لێك بدا.

دۆردوو نەختێك هەنگاوەكانی شل كردنەوەو لەجەباری پرسی:

"دەوروبەری كەریم ئۆغڵی چەند تاوڵی دیكەی لێن؟."

دۆردوو سەرلەنوێ توندی كردەوە. كاتێك گەیشتە نیزیك چادرەكان، دیسان هەر ئەو سەگانەی جاری پێشوو بۆیان هاتن. بە دەنگی وەڕینی سەگەكان دیسان منداڵەكان لە چادرێ دەرپەڕین، دوای ئەوان ژنەكان و ئەمجار پیاوەكانیش لە تاوڵێ هاتنەدەر... كەریم ئۆغڵی لە پێش پیاوەكان راوەستابوو و بە دەم یاغییەكانەوە كە هەروا نیزیك دەبوونەوە پێدەكەنی.

مێگەلە مەڕەكان لە دەوروبەری رەشماڵەكان مۆڵ درابوون. مەڕەكان سپی بوون و رەشماڵەكان لەنێو ئەو سپییاییەدا دیمەنێكی جوانتریان هەبوو... مەڕو بەرخەكان بارەباریان دەهات و سەگە زەلام و بە هەیكەلەكانی شوانان، وەك پاڵەوانان دەهاتن و دەچوون. وشترەكان بێخەیاڵ بخیان خواردبوو و كەف لە لمبۆزیان هەڵدەڕژا.

كەریم ئۆغڵی:

"بەخێراتن میوانەكان. خێرو بەرەكەتتان هێنا."

ئەمەی گوت و بە پەرپانەوە چوو و یەك یەك دەستی لەنێو دەستی هەموویان نا.
حەمەد سلاوێکی کردو زەردەیەکی هاتێ. بەلام زەردەکە بە لێوانیەوە وشك بوو. داخوا دۆردوو چ نیازێکی هەبوو؟... پاشان درۆدووی بە کەریم ئۆغلی نیشان دا:
"سەردەستەکەمان ئەمەیە."
کەریم ئۆغلی پیاوێکی دنیادیدە بوو. بە سیلەی چاوی شاوڕێکی وەسەر دۆردوو دا. پاشان تەماشایەکی حەمەدی کرد, بەو مەبەستە کە:"سەرم لەو کابرایە دەرنەکرد."
دۆردوو نێوچاوانی گرژ کردبوو, ملی رەق راگرتبوو, سەری بەرز کردبووەوە... بێ ئەوەی تەماشای دەوروبەری خۆی بکا بەم لاو بەو لادا دەڕۆیشت.
کەریم ئۆغلی:
"گوتت ناوی چیە؟."
حەمەد:
"دۆردووە شێت."
کەریم ئۆغلی سەری سوڕما:
"دۆردووە شێت ئەمەیە؟."
حەمەد:
"بەلێ, خۆیەتی."
لەپڕ زەردەخەنەی سەرلێوی کەریم ئۆغلی سڕ بوو. پێشی چاوانی تاریك بوو:
دەلێن دەرپێش لە پێی پیاوی دادەکەنێ... راستە؟."
حەمەد:
"بەلێ, راست دەکەن."
کاتێك چوونە ژوورێ, دۆردووش لە جوانیی ژووری چادرەکە واقی وڕما... بەلام نەك هێندەی حەمەد. تفەنگێك کە قۆنداغەکەی نەخشکاری کرابوو, بە چلەکەی تاولێوە هەلاوەسرابوو. دۆردوو بە رقەوە تەماشایەکی کەریم ئۆغلیی کرد:
"خان... ئەو تفەنگەی بێنە بزانم... بزانم تفەنگی خانان چۆنە؟."
کەریم ئۆغلی راوێژی پڕ لە قینی دۆردووی بۆ دەرکەوت. دلی لەرزی. دلی خەبەری دەدا کە بەلایەك لێی میوانە. ئەو کابرایە نە روخساری وەك روخساری بنیادەمان بوو و نە چاوی وەك چاوی بنیادەمان دەچوون.
کەریم ئۆغلی تفەنگەکەی هێناو دایە دەستی دۆردوو:

"ئێستا سفرەی دانێن، یان دوایە نانی دەخۆن."
چاوەکانی دۆردوو پڕیشکیان لێ‌دەرپەڕی:
"ئەمن وەختێك بمەوێ کەسێك ڕووت بکەم نە نانی دەخۆم و نە قاوەی دەخۆمەوە، چونکە ئەگەر نمەك گیری بم، ئیدی ناتوانم ڕووتی کەم."
بە رق هەستاوی و تووڕەیی ڕاست بووەوەو ئەوانی دیکەش بە دوای دا دەرپەڕین.
کەریم ئۆغلی بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:
"جارێ با پارووە نانێك بخۆین، دوایە ئەگەر ویستت ڕووتمان کەی بیکە. هەرکەس بێتە ماڵێ کەریم ئۆغلی دەبێ لەسەر سفرەکەی دانیشێ."
کەریم ئۆغلی دەنگی دەلەرزی و سووراییەکی نەرمیش لەسەر گۆنایەوە بەرەو لووت و نێوچاوانی پێوە دەچوو. تاوێك دواتر چەند دەنکە ئارەقیش نیشتنە سەر نێوچاوانی:
"گوێ بگرە دۆردووخان... هەموو ئەم کێوانە پڕن لە یاغی، بەڵام تا ئەمڕۆ هیچ یاغی‌یەك کەریم ئۆغلیی ڕووت نەکردوە... ئەتۆش ئەگەر نیازی تالانت هەیە، فەرموو ئەمە تۆو ئەوەش ماڵەکەی من."
حەمەدو جەبار بەرامبەر بەم وەزعە تێك تەپیبوون. تواببوونەوە. دەتگوت بە مەنجەڵان ئاوی گەرمیان پێدا دەکەن.
دۆردوو:
"ئەمن لەو یاغی‌یانە نیم کە هەتا ئێستا دیوتن."
کەریم ئۆغلی لە جێی خۆی نەدەبزووت. وەك ئەستوندەکی تاوڵەکەی بێدەنگ و بێ جووڵە بوو.
دۆردوو:
"خان... لە پێش دا پووڵەکەت بێنە."
نایب ڕەجەب و عەلی‌یەچکۆڵیش وەك ئەوانی دیکە هەستابوونە سەرپێ. بەڵام دوایە دانیشتبوون و تەماشایان دەکرد. دیار نەبوو بۆچی بنی چاوەکانی نایب ڕەجەب پێدەکەنی.
دۆردوو کاتێك دیتی کەریم ئۆغلی لە جێی خۆی نابزوێ، هەستا وردە وردە لێی نیزیك بووەوەو هەتا هێزی تێدا بوو قۆنداغە تفەنگێکی بە نێو شانی کەریم ئۆغلی‌دا دا.
کەریم ئۆغلی کەوتە سەر عەرز. دۆردوو قۆڵی گرت و ڕاستی کردەوە.
لە سووچێکی دیکەی چادرەکە ژن و منداڵ دەگریان.

دۆردوو:

"باشت گوێ لـێبێ پیره... لێره قسەت ناڕوا. ئاغایەتییەکەشت هـەر لەسـەر عەشـیرەتی ساچی کارالّی دەتوانی بکەی... لەم کێوانە دا تەنیا یەك کەس قسەی دەڕوا. ئـەویش دۆردووه شێتە, تێگەیشتی؟..."

پاشان دەستووری بە خەپل دا:

"هەستە لەگەڵ ئاغای بچۆ پوولّەکانی لـێوەرگرە. تێگەیـشتی؟ ژنـەکانیش هەرچی زێـڕو مێڕیان هەیە لێیان بستێنەو بیهێنە. تێگەیشتی؟."

خەپل:

"تێگەیشتم پاشام."

یەکێك لە ئەرکەکانی خەپل ئەوەبوو, لە هـەموو تالاّنێـك دا ئـەرکی ئـازاردان و دیتنـەوەی جێگای پوولّ و زێڕو ئەغدینە لەئەستۆی ئەو بوو. ئەو لـەو کـارەدا وەسـتا بـوو. هـەر مـالّێکی پشکنیبووی, پوولّەرەشکەیەك چیە تێیدا نەهێشتبوو. خەپل فەتایـەك بـوو لـە هـەر مـالّێکی دابایە, رەگ و ریشەی دەردێنا. خەپل گوێزی بە کلکی دەشکاند.

باسکی کەریم ئۆغلی گرت:

"وەرە بزانم کەریم ئۆغلی. پێم بلێ پوولّەکـەت لـە کوێیـە. ئـەگینا بـە گوللەیـەکی خـەپل ئۆغلی دەچیە گەڕەکی جاو لەبەران."

دۆردوو ئەڕاندی:

"کەریم ئۆغلی, یان هەموو پوولّەکەت دەدەی, یان رووحت..."

ژن و مندالّی تاولّەکانی دیکـەش لـە پـێش چادری کـەریم ئـۆغلیی کۆببوونـەوە. وەختێـك دۆردوو چاوی پێیان کەوت, دەریەڕی و ئەڕاندی:

"یالّلا بچنەوە چادرەکانتان. جارێ زوویە, ئۆرەی ئێوەش دێ."

کـەریم ئـۆغلی چـاوی بـۆ حەمـەدو جـەبار دەگێـڕا. ئـەوان لـە پـشتەوەی کـەریم ئـۆغلی راوەستابوون. وەختێـك ئـاوڕی دایـەوە دوای خـۆی, لەگـەڵ حەمـەد چـاویان تێـك هەلّـەنگوت. حەمەد سەری داخست. کەریم ئۆغلی تەماشای جەباری کرد. لە تەماشا کردنەکەی ڕا دیار بوو کە دەلّـێ:"قـەرار وا نـەبوو, ئـەو رەفتـارەم لەگـەڵ بکـەن!." تەماشـا کردنەکـەی و چـاوەکانی دلّشکاو بوون. دوو دلّۆپ فرمێـسك لـە چـاوەکانی دا قـەتیس مـابوون. وەرگەڕایـەوەو وەپـێش خەپل کەوت. کاتێك گەیشتە گۆشەیەکی دیکەی رەشمالّەکە, ژن و مندالّەکە وەك مەڕ سـەریان پێکەوە نابوو و دەگریان. کەریم ئۆغلی رووی کردە یەکێك لە ژنەکان:

"ئەم سندووقە بکەوە. هەرچی پوولّی تێیدایە دەری هێنەو بیدە بەم کابرایە. هەرچی زێرو گۆیەرۆك و ملیوانکەو ئەنگوستیلەشتان, هەیە دەریان هێنن و وێم دەن."

کەریم ئۆغلّی تێگەیشتبوو کە دۆردوو پوولّە رەشکەیەکیشی پێناهێلّێ. بۆیە وای بە باش زانی هەرچی هەیەتی بە دەستی خۆی بۆی بەرێ.

خەپل بە دەستەیەك ئەسکیناس و کیسەیەك سکەی زێڕەوە گەڕایەوە. ئەمانەی دایە دەستی دۆردوو. کەریم ئۆغلّییش گۆیەرۆك و ملیوانکەو ئەنگوستیلەو پوولّەکەی چارشێوی ژنەکانی کۆکردەوەو هێنانی.

دۆردوو رووی کردە خەپل:

"هەر ئەوەندە بوو؟ هیچ بەجێ نەمابێ."

خەپل بە دلّنیایی وەلاّمی دایەوە:

"هەر ئەوەندەبوو پاشام."

بەلاّم لە تالاّنەکانی دیکە دا وەختێك دۆردوو لێی دەپرسی:"هەمووی ئەوەندە بوو؟." ئەو جوابی دەدایەوە:"نێ دیکەش ماوە پاشام." و لە پاشان دەچوو لیرەیەك یان سکەیەکی زێڕی لە هەر کون و قوژبنێك با, دەدۆزیەوەو دەیهێنا. خەپل هەر مالّێکی بە لانی کەمەوە دە جار, بیست جار سەنگ و سووژن دەناو کاتێك دلّنیا دەبوو کە ئیدی هیچ نەماوە چاوێکی لە دۆردوو دادەگرت و ئەویش حالّی دەبوو کە هیچ شتێك نەماوە. ئەگەر لە کەلێن و قوژبنی مالّێ دا شتێك مابایە, خەپل بە چاوی ساحەب مالّەکە دەیزانی. ئەو لە لێکدانەوەی خۆی دا هیچ وەخت بە هەلّە نەدەچوو...

دۆردووە شێت:

"ئەتۆ پیاوێکی ئاقلّی کەریم ئۆغلّی. چونکە هەرچی هەتبوو بەدەستی خۆت هێنات و دات. ئەگەر نەتدابایە ئێمە لێمان دەستاندی. هەتا ئێستا لەنێو ئەو کەسانەدا کە رووتم کردوون کەسی وەك تۆ ئاقلّم نەدیوە."

کەریم ئۆغلّی وشك ببوو. وەك بەرد لە جێی خۆی رەق ببوو. رەنگی زەرد هەلّگەڕابوو و لێوەکانی دەلەرزین.

دۆردوو سەرلەنوێ نەعرەتەی کێشا. نەعرەتەیەکی توندو یەك قسەو کاریگەر:

"ئەتۆ دابی دۆردووە شێت دەزانی کەریم ئۆغلّی. دابی دۆردووە شێت وەك یاغییەکانی دیکە نیە... هیچ یاغییەکی دیکە ئەوەی ناکا کەریم ئۆغلّی. ئەتۆ بۆخۆت گوتت یاغییەکانی دیکە نایەنە سەرت. دەزانی دابی دۆردووە شێت چیە کەریم ئۆغلّی؟..."

کەریم ئۆغلی وەڵامێکی نەدایەوە.

دۆردووە شێت لەسەری ڕۆیشت:

"دابێ دۆردووە شێت ئەوەیە کە وەختێك کەسێکی ڕووت کرد, دەرپێیەکەشی لە پێ دادەکەنێ... جلەکانت داکەنە کەریم ئۆغلی."

کەریم ئۆغلی لە جێی خۆی نەبزووت.

دۆردووە شێت:

"لەگەڵ تۆمە... دەڵێم جلەکانت داکەنە."

ـ کەریم ئۆغلی هەروا بێدەنگ ڕاوەستابوو و جووڵەی نەدەکرد. دۆردوو لە دین دەرچوو. ئیدی خۆی بەسەر پێوە نەگرت. بەدەوری کەریم ئۆغلی دا دەسووڕاو لە پڕ مستێکی توندی لە بنانگوێی کەریم ئۆغلی داو پاشانیش چەند قۆنداغە تفەنگی پێدا دان... کەریم ئۆغلی گێژ بوو. خەریك بوو بکەوێ. بەڵام دۆردوو پیلی گرت و یەکی دیکە, یەکی دیکە, یەکی دیکە...

"دایانکەنە."

کەریم ئۆغلی بەزمانێکی تاڵ وەقسە هات:

"ئەو کارەم لەگەڵ مەکە دۆردوو... هەتا ئێستا هیچ کەس ماڵ و ژیانی کەریم ئۆغلیی تێك نەداوە... کوڕە هیچی چاکت نایەتە ڕێ دۆردوو."

ئەم قسانە هێندەی دیکەیان دۆردوو لەدین دەرکرد. قۆڵی کەریم ئۆغلیی بەرداو وەبەر پێلەقانی دا. کەریم ئۆغلیی کە لەسەر زەوی کەوتبوو:

"ئەو ڕەفتارەم لەگەڵ مەکە دۆردوو... هیچی چاکت نایەتە ڕێ."

دۆردوو دەهریتر بوو. کەریم ئۆغلیی خستە ژێر پێی خۆی و بە پێلەقە دایگرت:

"ئەمنیش دەزانم هیچی چاکم نایەتە ڕێ کەریم ئۆغلی... هەربۆیەشە دەمەوێ دەرپێیەکەت لەپێ داکەنم. ئێستا کەوایە, لانی کەم با بڵێن دۆردووە شێت دەرپێی لە پێی ئاغای ساچی کاراڵییەکانیش داکەند... تێگەیشتی؟..."

ئەو ژنانە کە لە بن لاپانکی چادرەکەدا کۆببوونەوە و دەگریان. بەو هات و هاوارە هاتنە دەرێ, یەکێك لە ژنەکان خۆی بە سەر کەریم ئۆغلییدا دا. زیڕەی ئەو ژنە دەگەیشتە ئاسمان. خەپل ئەو ژنەی گرت, لەسەر کەریم ئۆغلیی هەڵیچڕی و فڕێی دایە گۆشەیەك.

دۆردووە شێت:

"کەریم ئۆغلی... ئەگەر رووت و قووت نەبیەوە, ئەگەر بە دەستی خۆت جلەکانت دانەنێی و دەرپێیەکەشت دانەکەنی, دەتکوژم."

ژنەکان شیوەن و گریانیان بوو.

کەریم ئۆغلی پاڕایەوە:

"ئەوەم لەگەڵ مەکە... لە پێش چاوی ژن و منداڵم ئەو رەفتارەم لەگەڵ مەکە."

لەحزەیەك چاوی بە چاوی حەمەد کەوت کە هەروا رەق ببوو, دەلەرزی و لێوی خۆی دەکرۆشتن. تەماشایەکی پڕ لە پاڕانەوەی لە حەمەد کرد. کزەیەك لە جەرگی حەمەد هەستا. تەماشایەکی جەباری کرد. چاویان لە چاوی یەکتری بڕی. هەر ئەو بریسکەیەی وەك نووکە دەرزی هاتەوە نێو چاوی حەمەد. جەباریش لە رقان گۆشتی نێو زاری خۆی دەکرۆشت. جەبار هەموو کاتێك کە زۆر تووڕە دەبوو, ئەو کارەی دەکرد, هەتا زاری لە خوێن دەهات.

کەریم ئۆغلی هەروا دووپاتی دەکردەوە:

"ئەوەم لەگەڵ مەکە دۆردووخان... مەکە..."

دۆردوو نەڕاندی:

"رووت بەوە... ئەگەرنا..."

لوولەی تفەنگەکەی لەسەر زاری کەریم ئۆغلی دانا:

"رووت بەوە."

راست لەو دەمەدا هێندەی چاو لێك نێی, حەمەد خۆی گەیاندە دەری تاوڵێ و نەعرەتەی لێدا:

"بزووی دەتکوژم دۆردووە شێت. دەبێ ببووری, بەڵام ئێستا کە وا دەکەی, دەبێ بزانی کە ئاورت دەدەم..."

لە پاشان دەنگی گاڵتە پێکردنی جەباریش بەرز بووەوە:

"نەبزووی ئاغا دۆردوو. کەریم ئۆغلی بەردەو لە رێی خۆت بڕۆ, ئەگینا لێت ئاور دەدەم. نان و نەکمان پێکەوە کردوە دۆردووە شێت. با خوێنت بە دەستی من نەڕژێ."

حەمەد:

"وا مەکە خوێنت بە دەستی ئێمە بڕژێ."

دۆردوو کە بە هیچ جۆر چاوەڕوانی شتێکی وا نەبوو, گێژ بوو:

"چۆن؟ ئاوا؟..."

تفەنگەکەی لە زاری کەریم ئۆغلی هەلگرت و دوو فیشەکی بە لای دەرێوە نان.

خەریك بوو تاریك دادەهات.

حەمەد:

"ئاغا دۆردوو تفەنگ هاویشتن وانابێ."

لەگەڵ ئەم قسەیە دوو گوللە بە ویزەویز بە بن گوێی دۆردوو دا تێپەرین.

حەمەد:

"واز لە کەریم ئۆغلی بێنەو بە رێی خۆت دا برۆ. بەسە ئیدی دۆردوو. ئەوەی تۆ دەیکەی زولمە. بەریدەو برۆ."

دۆردوو:

"کەوابێ ئاوا حەمەدۆك؟... ئاوا؟.."

حەمەدۆك:

"ئەگەر ناتەوێ بکوژرێی، کەریم ئۆغلی بەرەلاکە، لە تاوڵێ وەرە دەرێ و لە رێی خۆت برۆ."

دۆردوو پێلەقەیەکی دیکەی بە کەریم ئۆغلیدا دا:

"یاللا هاوکاران با برۆین."

لە دەرێ رەشایی حەمەدۆکی دی کە لە قوولکەیەك دا سەنگەری گرتبوو:

"ئی من و تۆ بێنێ حەمەدۆك. لەبیرت نەچێ جەبار."

لە پاش هەمووان نایب رەجەب لە تاوڵێ هاتەدەر:

"کورینە زۆرم پێ خۆش بوو، بەراستی کاری چاکتان کرد. ئەمنیش لەگەڵتان وەمێنم؟."

گوتیان:

"بێنەوە نایب... بێنەوە."

دۆردوو:

"ئەتۆش نایب رەجەب؟..."

نایب رەجەب:

"بەڵێ دۆردووخان، ئەمنیش..."

دۆردوو:

"باشە نایب ڕەجەب... تۆش لەبیرت نەچێ. با پێتان قەرزدار بم..."

دۆردوو و هاوکارەکانی پەنجا میتر لـە چادرەکان دوور نەکەوتبوونـەوە کـە لەنـەکاو دۆردوو خۆی لە عەرزی داو نەڕاندی:

"بیزوون، هاوکاران، ڕۆژی ئەوەیە کە یان بمرین یان بمێنین."

ئەوەی گوت و لەسەر یەك شەش فیشەکی بە حەمەدو جەبارەوە نان. بەڵام حەمـەدو جـەبار کە باشیان دەزانی دۆردوو ئەو کارە دەکا, لە قوولکەکە نەهاتبوونەدەر.

حەمەد:

"دۆدرووخان، ڕێگای خۆت بگرەو بڕۆ، مەیکە منداڵ بازاڕی."

دۆردوو نەڕاندی:

"یان ئێوە دەبن، یا من..."

نایب ڕەجەب:

"کوڕە لە ڕێی خۆت بڕۆ. گێچەڵێ بە کوڕەکـان مەفرۆشـە. هـەر ئـەو وەخـت کـە قۆنداغـە تفەنگت بە نێو شانی کەریم ئۆغڵیدا دا, ئەجەلی خۆتت کڕی. عەشیرەتی ساچی کاراڵی ئێستا پێیان زانیوە. ئەگەر لەوە زیاتر مەحتەل بی، ئێستا دارو بەردت لـێ پڕ دەبێ... بـەڕێی خـۆت دا بڕۆ و بیبڕەوە.

حەمەد:

"لە ڕێی خۆت بڕۆ."

جەبار:

"نامانەوێ خوێنت بە دەستی ئێمە بڕژێ، ڕێی خۆت بگرەو بڕۆ."

دەنگی تەقە کۆتایی هات.

جەبار:

"خەریکن گۆڕەهوو دەبن... خەریکن دەڕۆن پووڵەکەی کەریم ئۆغڵی لەنێو خۆیان بەش بکەن."

نایب ڕەجەب:

"با بڕۆن. ئەگەر ساچی کاراڵییەکان هەموویان لەمیلی چاویان دەرنەهێنایـەوە... ئێـستا دەرودەشت و کێو و بەندەن پڕ دەبێ لە تفەنگچی و سوار... ئەگەر ئەم کەریم ئۆغڵییـە خـانی ساچی کاراڵییەکان بـێ... ئێـستا هـەموو عەشـیرەتی ساچی کـاراڵی وەك ڕەوە کوللـە وەڕێ دەکەون و دەگەنە ئێرە..."

حەمەد:

"ئێستا ئێمە بچینە لای کەریم ئۆغلی بڵێین چی؟ چۆن روومان بێ چاو لە چاوی بکەین؟."

جەبار:

"فەقیرە چاکەی لەگەڵ ئێمە کردو خەراپەمان لەگەڵ کردەوە... ئێستا بچین چی پێ بڵێین؟... بڵێین پێت خۆش بوو؟... کەیفت بە پیاوەتیی ئێمە هات؟... بڵێین ئێمە ئاوا خەڵکی رووت دەکەین؟... ئاوا فێڵ لە خەڵك دەکەین؟... لێی گەڕێ حەمەد... باشترە رێی خۆمان بگرین و برۆین, با چاومان بە چاوی نەکەوێ..."

حەمەد:

"ئاخر ئەمن چی پێبڵێم؟... چ بڵێم؟..."

لەو قوولکەیەی کردبوویانە سەنگەر هاتنەدەر. بۆ لای تاوڵێ وەڕێ کەوتن. دەنگی شیوەن و گریان لە چادری کەریم ئۆغلی هەڵدەستا. حەمەد دەرگای تاوڵەکەی کردەوە. یەك دوو کەس لە ژنەکان لەسەر لەگەنێك سەری خوێناویی کەریم ئۆغلیان دەشوشتەوە. هەم دەیان شوشتەوەو هەم تووك و دوعایان دەکرد.

حەمەد بە شەرمێکەوە بانگی کەریم ئۆغلیی کرد:

"کەریم ئۆغلیی خان!."

هەمووان سەریان بۆ لای ئەو وەرسووڕاند. حەمەد ویستی بێ ئەوەی قسەیەك بکا, فیزمالکی بداتێ. بەڵام نەیتوانی.

بە زمان هەڵدەنگوتنەوە:

"ئاغا... ئاغا... لێمان ببوورە... نەمان دەزانی وای لێدێ."

حەمەد پاش ئەم قسانە لە شەرمان هەڵات.

کەریم ئۆغلی بە دوای دا هاواری دەکرد:

ئێستا شێوت نەکردوە کورم, بۆ کوێ دەچی؟... راوەستە شێوەکەت بکە... سەبر کە شێوەکەت بکە جا برۆ... هیچ میوانێك بێ شێو خواردن لە رەشماڵی کەریم ئۆغلی ناڕوا..."

حەمەد خۆی گەیاندەوە جەبارو نایب:

"یاڵڵا هەستن... هەستن با برۆین... ئەمن ئیدی ناتوانم لێرە گیر بم... زگم بە کەریم ئۆغلی دەسووتێ... جەرگم بۆی بووەتە کەباب."

جەبار هەڵستا:

"چ بکەین؟... تازە کار لە کار ترازاوە..."

حەمەد هەناسەیەکی هەڵکێشا:

"بریا ئەو شێتەم کوشتبایە."

جەبار:

"کوشتنی کارێکی ئاسان نیە حەمەد. بەڵایەکە بۆخۆی... ئەگینا من... زۆر لەمێژ بوو کە..."

حەمەد:

"وەختێك گوللەی لێدەدرا تازە دەیتوانی چ بکا."

جەبار:

"گوللەکەتی وێ نەدەکەوت حەمەد... زەمانە تا ئێستا بنیادەمی وای نەدیوە."

نایب رەجەب:

"ئەو کابرایە شتێکی هەیە جگە لە خەلکی دیکەیە... ئەگینا ئەو کارانەی ئەوە دەیانکا, ئەگەر یاغییەکی دیکە کردبانی, رۆژێك زیاتر نەدەژیا. ئەم شێتە شتێکی هەیە جگە لە خەلکی دیکەیە. چاك بوو خۆمان لێ جیا کردەوە. بەلام چەند کابرایەکی بە جەرگ و ئازایە... دەڵێی هەمیشە چاوەڕوانی ئەجەلی خۆیەتی."

حەمەد:

"ئەمنیش هەر لەو حالەتەی ترسام. هەربۆیەش نەمتوانی تەقەی لێبکەم, ئەگینا..."

جەبار:

"ئیدی با باسی نەکەین... ئەم دۆزدوویە شتێکە جیا لە بنیادەمەکانی دیکە."



عەلی:

"چۆنە دوو سەعاتێك لێرە بخەوین؟."

حەسەن:

"زۆرمان نەماوە بۆ دێیەکەی ئێمە عەلی. هەتا نیوەڕۆیە دەگەینە دێیەکەی خۆمان. ئەتۆ شەوێ میوانی ئێمەی. بەیانی وەرێ کەوی, بۆ لای ئێواری دەگەیە دێی خۆتان."

عەلی پیاوێك بوو زۆر کەڵەگەت, گرێ و داڵەگۆشت. فووت لێکردبایە با دەیبرد:

"ئیوەشەو درەنگترە حەسەن. تاریکێکە چاو چاوی نابینێ. زۆریشی نەماوە ڕۆژ بێتەوە، وەرە یەك دوو سەعات هەر لێرە بخەوین."

حەسەن:

"ئەمن ناتوانم عەلی. چوار ساڵە ماڵ و حاڵی خۆم بەجێ هێشتوە. دەبێ بڕۆین."

عەلی:

"ئەمنیش چوار ساڵە ماڵ و حاڵی خۆم بەجێ هێشتوە، بەڵام..."

حەسەن:

"بەڵام چی؟."

عەلی:

"بەڵام شەکەتم."

حەسەن:

"گوێ هەڵخە.. دەنگی چۆڕە چۆڕی ئاوێ دێ... بڕۆ مستێك ئاو بە چاوانتەوە دە، خەوەکەت دەڕەوێ."

عەلی:

"ڕاست دەکەی... ئاوی فێنك ماندووی دەحەسێنێتەوە."

حەسەن:

"ئاو ئاوی دێی ئێمەیە... ئەوەندە ساردە دەڵێی دەنکی تەرزەیە. هێند ڕوونە دەڵێی چاوی قرژاڵییە. وەك بلوور لە ژێر زەوی هەڵدەقوڵێ و دێتە دەر... دەڵێن لە پێش دا چنارێکی زۆر پیری لەسەر بووە... ئەو چنارە منیش دیومە، بە بیرم دێ... ڕۆژێکیان بارانێك دەباری، چۆن؟ ڕەش، دەتگوت مەرەکەبە... لەپڕ ڕووناکایی‌یەکی سەوز لە ئاسمان درەوشایەوە. ئەم ڕووناکایی‌یە سەوزە کەوتە سەر چنارەکە... چووینە سۆراغی چنارەکە، بەڵام شوێنەوارێکی نەمابوو... ببوو بە خۆڵەمێش... بە خوا بە خۆم بە چاوی خۆم دیتم ببووە خۆڵەمێش... ئێستا ئیدی جێیەکەشی دیار نیە..."

عەلی:

"سێ ساڵی ڕەبەق لە چوکووراوا دەردێکم بەسەر هات هەر مەپرسە... بەڕاستی تونێخم هاویشت... بەڵام سوپاس بۆ خوا لە ئاخرییەکەی دا پووڵ و پارەیەکم وەسەر یەك نا."

بە درێژایی ڕێگا، عەلی پەیتا پەیتا ئەم قسانەی دووپات دەکردەوە. ڕەنگە سەد جار باسی کردبێ کە چوکووراوا چۆن جێیەك بوو، لەوێ چەندی زەحمەت کێشابوو، بە هەزارو یەك دەردو

بەلاّ چەندی پوولّ پاشەکەوت کردبوو، و ئێستاش نیازی بوو بەو پوولّە چ بکاو چ نەکا... پاشان ماوەیەك بێدەنگ بوو. ماوەیەك بە بێدەنگی بە ڕێگا دا دەڕۆیشتن، بەلاّم سەرلەنوێ دەستی پێ دەکردەوە. حەسەنیش سەبارەت بە دێیەکەیان، بە منداڵەکانی، بەو چنارە کە ببوو بە خۆڵەمێش، بە چوکووراواو بەو ئاغایە کە لەچوکووراوا هەیبوو، هێندێ شتی دەگێڕانەوەو دووبارە دەیگێڕانەوە.

عەلی:

"دووسەد لیرە لە پوولّەکەم دەدەم بە بابی و دەستی کچەکە دەگرم و دەیهێنمە ماڵێ. دوو جوانەگاشی بۆ دەکڕم. نیازم هەیە کولێجەیەکی ئەستەڕدارو پڕ نێویش بۆ دایکم بکڕم. ئاخر بەستەزمانە سەرمای دەبێ... دەمەوێ سەربانی ماڵەکەشمان هەڵگێڕمەوە. ئەو خانووەی ئێمە، هەر خوا بکا باران نەبارێ، دڵۆپەیەك دەکا هەر باسی مەکە... لەبن دانیشتنی ناکرێ."

حەسەن:

"بەڵێ، دەبێ سەربانەکە سەرلەنوێ سواخ بکەیەوە. خانوو ئەگەر کەوتە دڵۆپە کردن، دەبێ فریای کەوی، دەنا دەڕووخێ."

عەلی:

"مردم لە چوکووراوا... سووتام لە گەرمان. گەرمایەکەی پیاوی دەبرژێنێ حەسەن... سەگباب خێوە جێیەکی زۆر نانەجیبە. ئیدی تۆبە جارێکی دیکە ڕووی تێنەکەمەوە. تووشی نۆبەتێش بووم. لەرزو تایەکەی هێشتا هەر لە گیانم دا ماوە. ئەمساڵ زستانێ هەر خوا دەبێ بە هاوارم بگا."

حەسەن:

"لەرزوتای چوکووراوا دەردی لەدڵی من دایە."

عەلی:

"دەزانی ئەو هەموو کوێرەوەرییەی چوکووراوام بۆ قبووڵ کرد؟... بۆ ئەوەی ژنێ بێنم، جووتێك جوانەگا بکڕم، کولێجەیەکی گەرمیش بۆ دایکم بە دروون بدەم... ئەگەرنا چوکووراوا بۆ ئەوە نابێ دەقیقەیەکیشی لێ بەند بی."

حەسەن:

"ئەرێ، چوکووراوا بۆیە نابێ دەقیقەیەکیشی لێوەمێنی."

عەلی دەیەویست قسەیەك بکا. بەلاّم حەسەن درێژەی پێ دا:

"ئەگەر هەروا برۆین، سبەینێ بۆ نیوەڕۆیە دەگەینە لەوەڕگەی گوندی ئێمە."

عەلی:

"لە هۆ وێ..."

حەسەن:

"لەوێ، کەمێك هەورازتر، نێوەڕاستی دەشتێ..."

عەلی:

"پیرەدارێك هەیە..."

حەسەن:

"کە لك و پۆپەکەی بە دەم ئینسانەوە پێدەکەنێ."

عەلی:

"کە لە دارەکە ڕەت بووین..."

حەسەن:

"کە لە دارەکە ڕەت بووین، دەبێ بە دەستی چەپ دا بادەینەوە..."

عەلی:

"ئەودەم دەگەینە ئەو گۆڕستانە کە..."

حەسەن:

"کێل و بەردەکانی خەرابوون..."

عەلی:

"دارەکەی نێوەڕاستی گۆڕستانت لەبیر چوو."

حەسەن:

"ئەوێ ڕۆژێ کە من لە دێی وەدەرکەوتم، نازانم کێ بوو لە نێوەڕاستی گۆڕستانەکە نەمامێکی بە ئەستووراییی قامکە گەورەی دەچەقاند."

عەلی:

"داری بەستەزمان، تاق و تەنیا لە نێوەڕاستی گۆڕستان..."

حەسەن:

"بەڵێ، تاق و تەنیا."

عەلی:

"ئەگەر تا ئێستا وشك نەبووبێ..."

حەسەن:

"حەتمەن زۆر گەورە بووە... وەختێك من بە پەنای گۆڕستانەکەدا رابووروم، یەکێك دەمبینێ."

عەلی قسەکەی ئەوی تەواو کرد:

"یەکێك کێیە؟... بلێ کوڕی سالحەکوێری و برایەوە."

حەسەن:

"بەڵێ... کوڕی سالحەکوێری... دەمبینێ... چونکە رۆژ تا ئێوارێ کارو پیشەی ئەوەیە لەسەر بەردێك دادەنیشێ و گوێ بۆ چۆرە چۆری ئاوێ هەڵدەخاو لە فکرەوە دەچێ."

عەلی:

"هەر ئەخلاقی وایە، وەنا؟."

حەسەن:

"بەڵێ هەر ئەخلاقی وایە."

عەلی:

"جا، هەر کە کوڕی سالحەکوێری چاوی پێت کەوت، غار دەداو دەچێ خەبەر بە دایکت دەداو..."

حەسەن:

"دایکم بە کۆمە کۆمە وەڕێ دەکەوێ و بە پیرمەوە دێ."

عەلی:

"ئەدی کورەکەت؟..."

حەسەن:

"وەرە ئەختێك دانیشین و ماندوومان بحەسێنینەوە."

دانیشتن. حەسەن پیاوێکی ریوەڵەو لاوازو داڵەگۆشت بوو. ددانە زلەکانی لە نێو لێوانی را دیار بوون. مژۆڵێکی سەیری هەبوون. دەتگوت تۆزو خۆڵیان لێنیشتوە، سپی بوون. شەڵوارێکی دەزووی شینی لەپێدا بوو. شەڵوارەکەی نوێ نوێ بوو. هێشتا بۆنی خەمەکەی لێدەهات. کڵاوەکەشی نوێ بوو. بە سەریەوە وەك کڵاوی خوازراوە دەچوو. کراسە سوورو گوڵدارەکەی زۆر لێجوان بوو. جووتێکی کەوشی پاژنە نووستووی ئەدەنەیی کڕیبوو، بەڵام دڵی

نەهاتبوو بۆ رێگا لە پێی کا. جووتێک کاڵەی چەرمی خاوی لەپێ کردبوو. گۆرەوییەکی ئەستوور کە لە گوندی خۆیانەوە بردبوویە چوکووراوا هەروا نوێ مابوونەوەو کاڵەکەی لەسەر ئەو گۆرەوییانە لەپێ‌کردبوو. گۆرەوییەکانی میرزایی بوون.

حەسەن:

"سەیر ماندوو بووین."

علی:

"ماندوو بووین، بەلام..."

حەسەن:

"هەستە... هەستە با بڕۆین، ئیدی بەسە... باب و باپیرانمان گوتوویانە، دەرمانی رێیە رۆیشتنە..."

عەلی:

"دەرمانی رێیە رۆیشتنە."

حەسەن:

"کورەکەم ئێستا شەش ساڵەیە... وەختێك دەرۆیشتم دوو ساڵە بوو، بەلام ئێستا..."

عەلی:

"شەش ساڵەیە."

حەسەن:

"کورەکەشم لەگەڵ دایکم بە پیرمەوە دێ."

عەلی:

"کورەکەت دەڵێ بابە بەخێرێیمەوو دەچینە ماڵی ئێوە."

حەسەن:

"هەموو خەلکی ئاوەدانی دەرژێنە ماڵی ئێمەو دەڵێن بۆمان بگێرەوە... بۆمان بگێرەوە حەسەن ئاغا کە لە چوکووراوا چەندت پەیدا کردوە؟... منیش دەڵێم هیچ... چوکووراوا بۆخۆی چی هەیە هەتا ئەمن چیم لێ‌گیرکەوێ... دەڵێم رۆیشتین، گەشتێکمان کردو گەراینەوە..."

عەلی:

"رۆژی دواتریش ئەمن هەڵدەستم، جامێك لەو شۆرباوە کە دایکت بۆمانی لێدەنێ، هەڵدەقوورێنم و وەرێ دەکەوم..."

حەسەن:

"وەختێك ئەتۆ رۆیشتی، ئەمنیش دەستی کوڕەکەم دەگرم و دەچمە دێیەکەی تەنیشتمان، جووتێك جوانەگای شاخ کەوانی دەکڕم و دێمەوە دێی خۆمان. پاشان راستەڕێ دەچمە سەر زەوییەکەو بە دەستی خۆم یەك یەك بەردو سندە گڵەکانی لێ‌هەڵدەوێژێرم و ئامادەی دەکەم بۆ کێڵان."

عەلی:

"بەڵێ... سێ گاسنەو چوار گاسنەی دەکەی، راست وەك ئەوەی لە چوکووراوا دەتکرد... خاکەکەی وا خۆش دەکەی وابزانە ئاردە... پاشانیش دای‌دەچێنی."

حەسەن:

"پاشان بەرهەمێکی دەبێ، وەرە سەیرێ... هەر گوڵێکی پەنجە پلینگێك..."

عەلی:

"بۆخۆم دەمەوێ دایکم بەرمە لای خەیات، دەمەوێ کولێجەکەی بە ئەندازەی خۆی بۆ ببڕێ و بۆی بدروێ."

حەسەن روخساری لە روخساری عەلی نیزیك کردەوە. دەنگی هەناسەی ئەوی بیست:

"ئەتۆ چەند ساڵ بوو لە غەریبایەتی بووی؟."

عەلی:

"سێ ساڵ بوو."

حەسەن:

"ئەگەر گەیشتیەوە ماڵێ، دەبێ یەکەمین کارت ئەوە بێ کە دەزگیرانەکەت بگوێزیەوە..."

عەلی:

"بەستەزمانە زۆرم لەسەر راوەستاوە. ئەمساڵ بڕوا شەش ساڵی تەواوە دەزگیرانین. هەر بگەمەوە، دەچم دووسەد لیرەکە بۆ باوکی دەژمێرم و لە مستێی دەنێم... رۆژی دووهەم دەیگوێزمەوە."

حەسەن:

"رێگای هەر ئەوەیە، چاك دەکەی..."

عەلی:

"بە رۆژێك هەموو ئەو کوێرەوەرییانەم لەبیر دەچێتەوە کە لە چوکووراوا چاشتوومن."

لەبەر ئەوەی ڕێیەکەیان هەوراز بوو، ماوەیەك بوو بێدەنگ بوون. وەختێك وەسەر کەوتن و بەو دیو دا شۆڕ بوونەوە، دەشتێکی پان و هەمواریان لێ‌دەرکەوت، زۆر دوور لە نێوەڕاستی دەشتەکەدا دووکەڵێکی گەورە دەچووە حەوا.

لەتەنیشت جادە دەنگێکیان بیست. بە دوای ئەویش دا خڕەی چەخماخی تفەنگیان هاتە بەر گوێ:

"نەبزوون."

حەسەن:

"ئەجەلمان هات."

عەلی:

"ئەجەلمان هات."

حەسەن:

"با هەڵێین. بریندار بین باشترە لەوەی رووتمان کەن. ئەگەر قەرار بێ رووتمان کەن، باشتر وایە بمانکوژن."

عەلی:

"یاڵڵا."

بە جووت پێیان پێوەنا. لە پشتەوەڕا دایاننە بەر دەسرێژ...

هەردووکیان لەسەر زگ خۆیان لە عەرزی دا. هەر ئەو دەنگە کە گوتبووی نەبزوون، سەرلەنوێ هاتەوە بەرگوێیان. نەڕاندی:

"هەر لە جێی خۆتان بن و مەبزوون. ئەوە هاتین."

عەلی و حەسەن هەر لەو جێیە مانەوە بێ ئەوەی موویان لێ‌ببزوێ. لە ترسان هەر هێزی بزووتنیان لەبەر بڕابوو.

حەمەدو جەبار بە غاردان گەیشتنە سەر سەری عەلی و حەسەن.

حەمەد:

"هەستنە سەرپێ."

هەردووکیان وەك دوو تەرمی بێ‌گیان ڕاست بوونەوە.

حەمەد:

"بەم شەوە درەنگە لە کوێ ڕا؟."

حەسەن:

"له چوکووراوا ڕا."

عەلی:

"بەڵێ، لەوێ ڕا."

جەبار بە پێکەنینەوە:

"کەوایە دیارە پووڵی باشتان پێیە... ئەگەر ئێوە نەبن خۆ ئێمە لە برسان دەمرین. باشە، پووڵەکانتان دەرێنن."

حەسەن:

"بمکوژن چاکترە. ڕاست چوار ساڵ..."

جەبار:

"پووڵەکەت دەرێنە."

حەسەن:

"بمکوژە خان."

عەلی:

"دەزگیرانەکەم شەش ساڵی تەواوە چاوەڕێمە، بمکوژە ئاغا. بمکوژی چاکترە."

حەسەن:

"ڕاست دەکا، شەش ساڵە کە..."

جەبار دەستی بردو پڕێسکەیەکی پەڕۆی لەبن باخەڵی حەسەن دەرهێنا. پڕێسکەکە بە ئارەق خووسابوو. کردیەوە. نێو پڕێسکەکەش توێیەك موشەمما بوو و ئەمجارە ئەسکیناسەکان.

جەبار:

"بزانە چەندی پووڵ هەیە... چۆنیشی شاردوەتەوە."

حەسەن:

"گوللەیەکم لە زاری کەو بمکوژە. ناتوانم بە دەستی بەتاڵ بچمەوە کن ژن و منداڵم."

عەلی:

"ڕاست شەش ساڵە... یان دەبێ بمکوژی یان هەنگاوێك هەڵنایەنەوە."

حەسەن:

"چوار ساڵی تەواو ئاوی وەك ژەهرەماری چوکووراوام خواردوەتەوە. تاو لەرزەکەی هێشتا لە لەشم دا ماوە ئاغا."

عەلی:

"لەبەر بەری پێیانت مرم، بمکوژە، بمکوژە ئاغا."

حەسەن:

"بمانکوژن."

حەمەد چاوی پڕ بوون. بە دەنگێکی پڕ لە دڵسۆزییەوە گوتی:

"مەترسن... کەس کاری بە پووڵی ئێوە نیە. جەبار پووڵەکانیان وێ دەوە. وەرن، ئەمە پووڵەکانتان."

حەسەن باوەڕی نەدەکرد. ترسا. بە لەرزە لەرزەوە دەستی درێژ کرد. پووڵەکەی وەرگرت. نەیدەزانی بڵێ چی. تەنیا توانی ئەوەندە بڵێ:"خوا دەوامی عومرتان بدا." و گریان بەری ئەوکێی گرت.

عەلی:

"خوا راوەستاوتان کا."

حەمەد:

"گوێتان لێبێ چ دەڵێم. بە دەشتی "چاناکلی" دا نەڕۆن. دەستەی دزردووە شێت لەو دەوروبەرانەیە. دەرپێیەکانیشتان لەپێ دادەکەنێ. بەخێر چن. ئەتۆش نیشەڵڵا لەگەڵ دەزگیرانەکەت پێك شادو شوکور دەبنەوە."

حەمەد دەنگی دەلەرزی. دەیەویست دیسان قسە بکا، بەڵام نەیتوانی.

حەسەن وەك منداڵان دەگریا، سەری بە هەنیسکانەوە هەڵدەگیرا. هەرچەند دەیکرد پێشی گریانەکەی پێ نەدەگیرا. وەرێ کەوتن:

"خوا دوامی عومرتان بدا. خوا باڵایتان بدا. خوا لە کێو و چیا رزگارتان بکاو بە خۆشەویستانی خۆتان شاد بکاتەوە."

خەریك بوون دوور دەکەوتنەوە. حەسەن جارجار دەگەڕایەوەو سەرلەنوێ دوعای بۆ دەکردن. عەلییش لە پەستا دەیگوت ئامین. دوور کەوتنەوە، بەڵام حەسەن هەروا دەگریا.

عەلی:

"بەسیەتی حەسەن... لێوەبڕە لەو شین و گریانە..."

حەسەن:

"ئەم دنیایە پیاوی چەند باشی تێدان... ئەو یاغییە کورتە باڵایەت دی... ئەگەر فریامان نەکەوتایە، ئەو کابرای کە دەتگوت دێوە، هەموو پووڵەکانی لێدەستاندین."

عەلی:

"نا، لێیان نەدەستاندین."

حەسەن:

"ئەگەر بە دەشتی چاناکلی دا نەڕۆین, ڕاست دوو ڕۆژی دیکە دەگەینەوە دێی ئێمە."

عەلی:

"بەڵام چارە چیە؟."

حەسەن:

"ئەگەر هەموو دەشتی چاناکلیم بدەنێ, ئەگەر ڕێیەکەمان دوو ڕۆژ هیچ, دوو مانگیش دوور کەوێتەوە, بەوێ دا ناڕۆم."

عەلی:

"کەوابێ, با دانیشین نەختێك بحەسێینەوە. ئەگەر وەڕێش کەوتین, باشتر وایە بە جادەدا نەڕۆین, بە لاڕێیەدا بڕۆین..."

دانیشتن.

پاش ئەوەی حەسەن و عەلی لە حەمەدو ئەوان نەدیو بوون, حەمەد گوتی:

"ئەگەر لە پێش دا پووڵەکانمان لێ ئەستاندبان و دوایە کوشتبامانن, زۆریان پێ خۆش دەبوو!"

جەبار:

"ئەو کوڕە کەڵەگەتە چۆن دەپاڕایەوە کە بیکوژین."

حەمەد:

"خوا دەزانێ بە چ هیوایەك چووبوونە غەریبایەتی."

جەبار:

"دەیگوت دەزگیرانەکەی ڕاست شەش ساڵە چاوەڕوانیەتی."

حەمەد:

"ئەگەر بە چاناکلی دا بڕۆن, حەتمەن دەکەونە چنگی دۆردووە شێت."

جەبار:

"حەق نیە ئەو شێتە هەتا ئێستا زیندوویە."

پاشان هاتنەوە جێیەکەی پێشوویان و دانیشتن. نایب ڕەجەب هەر لە پێشداش لە جێی خۆی نەبزووتبوو. نایب کە بریندار بوو, ملی پێچرابوو. ملی بە لایەك دا لار ببووەوە.

نایب باوێشکێکی هاتێ و گوتی:

"کوڕینە... وادیارە ئەمن شتێکم بەسەر دێ... وادیارە دڵم سارد دەبێتەوە, کەوتووەتە لەرزین... ئەگەر مردم..."

پاشان وەك پەژیوان بووبێتەوە, قسەکەی بە ناتەواوی بەجێ هێشت.

حەمەد:

"برینەکەت جۆرێك نیە کە خوانەخواستە پێی بمری."

جەبار:

"ئەختێك سەر بکەوە با خەوت لیێبکەوێ."

نایب بۆ ئەوەی خەوێ لێبکەوێ، چاوی لەسەریەك دانان. پاش ئەوەی ماوەیەك بەو جۆرە رابورد، حەمەد چووە نیزیك جەبارو وەك ئەوەی بیهەوێ نهێنییەکی بۆ باس بکا، گوتی:

"جەبار ئەمن و تۆ ئیدی براین، وانیە؟."

جەبار خۆشحاڵ بوو:

"چما گومانت هەبوو براله؟."

حەمەد:

"لەبەر نیگەرانییان حاڵم نیە... دەڵێی دڵم لەسەر ئاورییەو خەریکە دەسووتێ."

جەبار:

"پێم بڵێ چتە براله. پێم بڵێ با فکری چارەیەك بکەینەوە."

حەمەد:

"ئەوە چەند مانگە ئەمن ئەو کارەم کردوە. دەڵێن خان نەمردوە، هەر بریندار بووەو چاك بووەتەوە. دەمەوێ بزانم خەجیج چی بەسەر هاتوە، دایکم چی بەسەر هاتوە... لە ناڕەحەتییان خەریکە دەمرم... وەدوای ئەو شێت و شوورەی کەوتین، لەم تاڵان بۆ ئەو تاڵان و لەم شەڕو هەرا بۆ ئەو شەڕو هەرا... دەرفەتم نەبوو خەبەرێکی خەجیج و دایکم بزانم."

جەبار:

"دەچینە دێی و خەبەرێکیان دەزانین براله، خەمی ئەو شتانەت نەبێ."

حەمەد:

"ئەو کافرە نەمردوە. حەتمەن بەڵایەکی بەسەر خەجیجێ هێناوە... دڵم وا خەبەر دەدا کاکە... دڵم دەڵێی بریندارە... دەڵێی خوێنی پێ کراوە... دڵم دەڵێ حەمەد رامەوەستە برۆ..."

جەبار:

"با نایب کەمێك چاك بێتەوە، دەچین سەریان دەدەین."

حەمەد:

"دڵم دەڵێ رامەوەستە حەمەد... دەڵێ گیرمەبە... براله..."

## (١٣)

"نیراز" له تەمەنی بیست ساڵی دا بە خۆی و منداڵێکی مەلۆتکەوە بێوەژن بوو. ئەو، مێردەکەی زۆر خۆش دەویست.

لەسەر تەرمی مێردەکەی سوێندی خواردبوو کە:

"لە پاش حوسێن، پیاو لە دنیایەدا لە من حەرام بێ."

قسەکەی قسەی پیاوان بوو. مێردی نەکردەوە.

چەند رۆژ دوای مردنی مێردەکەی، منداڵەکەی بە ژنێکی خزمی ئەسپاردو بۆخۆی نەقیزەی بەدەستەوە گرت. وەردەکەی لەو جێیەوە کە مێردەکەی بەجێی هێشتبوو، دەست پێکردەوە. لە ماوەی مانگێك دا وەردی بڕی و دایچاندو لێبووەوە.

هاوینێش بە تەنیا دەغڵ و دانەکەی رەنێو هێنا. جوان و جوور بوو. هێزی پێدەشکا. هەر بە خەیاڵیشیدا نەدەهات.

منداڵەکەی لەباوەش دەکردو هەروا گاڵتەی لەگەڵ دەکردو بە نێو دێی دا دەگەڕا:

"رەزای من گەورە دەبێ، مامەکانی بێ و نەبێ... رەزای من گەورە دەبێ."

نیراز (وەك دەڵێن) پلاری داویشت.

مامە گەورەکە دەیەویست نیرازێ مارە بکاتەوە.

نیراز دەیگوت:

"مێردی ناکەمەوە. تازە هیچ پیاوی دنیایە نایەنە سەر جێی حوسێنی رەحمەتی. ئەگەر هەتا رۆژی قیامەتێ بمێنم، شوو ناکەمەوە."

پێیان دەگوت:

"ئیراز, ئەمیش برای حوسێنە. خۆ بێگانە نیە. مامی کوڕەکەتە. وەك بابی خۆی داژداریی لێدەکا..."

بەڵام ئیراز لەوانە نەبوو... لە قسەی خۆی نەدەهاتە خوارو نەدەهاتە خوار...

هەر ئەو کەللەرەقیە بوو بە هۆی ئەوە کە شووبراکەی رقی لێداگرێ و ئەو زەوییە کە لە حوسێنی بۆ بەجێ مابوو, لە دەستی دەرێنێ, بێ ئەوەی هیچ حەقێکی بەسەر ئەو زەوییەوە هەبێ. بابیان بە زیندی سەری خۆی ئەو زەوییەی هەیبوو, لەنێو هەرسێك برادا دابەشی کردبوو. ئەم پارچەیەش وەبەر حوسێن, وەبەر مێردی ئیرازێ کەوتبوو. بەڵام چارە چ بوو؟... ئیراز جحێڵ بوو. ڕێگای حکوومەت و پۆستی ژاندارمریی لە کوێ دەزانی؟...

ئیراز بێ زەوی مایەوە. بەڵام هەر جۆرێك بوو سەری خۆی ڕاگرت:

"ئەگەر مامەکانی ڕەزای من زۆریش خوانەناس بن, ڕەزای من گەورە دەبێ... چما ڕەزای من گەورە نابێ؟ چما ڕەزای من ئەگەر زەویی نەبێ, گەورە نابێ؟ خۆ ڕەزای من ئەگەر مامی نین, خوای هەیە."

هاوینان سەپانیی دەکرد. زستانان لەلای ئەو کەسانە کە دەستیان دەگەیشتەوە زاریان دەبوو بە کارەکەر. ڕۆژگاری بەسەر بردو بەسەر برد. منداڵەکەی ئەوەندە جوان بوو, دەتگوت پارچەیە. لای لاییەك, وەك گۆرانییەکی تاڵ, هەمیشە وردی زمانی بوو:

"چما هەتیوی من گەورە نابێ؟."

گەورە بوو.

هەتا گەورە بوو هەموو ڕۆژێ لە دایکی و لە خەڵکی ئاوایی دەبیست کە بۆچی فەقیر بوون و چۆنە کە خاوەنی بستێك زەوی نیە.

گۆرانییەکی تاڵ هێلانەی لە دڵی دا کردبوو. گۆرانییەك کە ئازایەتی و سیکەدانەو توانای دایکێکی لێدەباری:

"چما کوڕی من گەورە نابێ؟..."

ڕەزا بوو بە بیست ساڵە. دەتگوت تووڵە نەمامە. گوندی "ساکارکووی" سوارچاکی وەك ئەو, تەقڵەبازی وەك ئەو و تفەنگچیی وەك ئەوی تێدا نەبوو. لە سەمای "هالای"ش دا لینگەی نەبوو. بەڵام دایك و کوڕ چ حاڵێکیان نەبوو... ئاخر دەکرێ پیاو بۆخۆی زەویی هەبێ, بەڵام سەپانی و سێیەك بەری بۆ خەڵکی دیکە بکا؟

خاکی ساکارکووی زۆر بەرپێژەوە... لە دێیەکانی دەوروبەریش گەورەترە. ساکارکووی دەشتە. لەنێو ئەو دەشتەدا گابەردێکی گەورە هەیە. خەلکی ئەو دەوروبەرە بەو گابەردە دەلێن "ئاداجا". وەختێك هەموو دەشتەکە دادەچێندرێ و سەوز دەبێ، وەختێك هەموو مەزراکان سەوز دەبن، ئاداجا لەنێو ئەو سەوزاییەدا دەتروسکێتەوە.

یەکێك لە زەوییەکانی دەوروبەری ئاداجا، واتە گەورەترین مەزرای ئەو دەوروبەرە ئی باوکی رەزا بوو. ئێرە چەندین ساڵ بوو مامی رەزا دایدەچاند. ئەو زەوییە کە هی حوسێن، واتە هی بابی رەزا بوو...

ئەم خاکە چەورو بەرپێژەوە هەمیشە لە خەون وخەیاڵی رەزادا بوو. لەگۆ فکران رادەچوو و ئەو رقەی لە دڵیدا بوو، رۆژ بە رۆژ زیادی دەکردو لەسەریەوە دەرژا... دەچووە هەر کوێیەك و لە هەر مەزرایەك جووتی دەکرد، ئاداجای لەپێش چاو بوو. چاوی لە داوێنی ئاداجا بوو... داوێنی ئاداجا وەك ئەوین وابوو.

دایکی هەموو رۆژێ هەر هەناسەی هەڵدەکێشاو دەیگوت:

"ئاخ رۆڵەم... مەزراکەی ئاداجا... بابت هەر بەو مەزرایە ئێمەی وەك گوڵ بەخێو دەکرد... رەبی خوا کوێریان کا..."

رەزا ملی بەلاوە دەناو لە فکرەوە دەچوو. هەمیشە بۆنی چەورایی خاکێکی سەوزی لەبەر لووتی دەهات... داخی ئەو خاکە جەرگیی دەبرژاند...

دایکی دەیگوت:

"ئەو مامە خوانەناسەت... ئەو کافرە لەخوا بێخەبەرە... رەبی خوا هیچی چاکی بۆ نەکا..."

ئەم رۆژانە رەزا وەزعێکی دیکەی هەبوو. هەمیشە وا نەبوو. بەیانییان لەگەڵ تاریك و روون لە خەو هەڵدەستێ و وەرێ دەکەوێ... بەرەو ئاداجا وەرێ دەکەوێ و خۆی دەگەیەنێتە ئەو زەوییە کە لە خوارەوەی گابەردی ئاداجایە. لەسەر بەردێك دادەنیشێ و دەکەوێتە فکرێکی دوورو درێژەوە... گەنمەکە هەڵستاوە. جانەوەرەکان لەسەر عەرزی تلاوتل دەکەن. کە هەتاو دەکەوێ هەڵمێك لە زەوی هەڵدەستێ. خەفەتی ئەو خاکە لە هەموو خەفەتان گەورەترە. رەزا ئەنگوستی لەنێو خاکەکە رادەکا. خاکەکە گەرمە. لەنێو قامکەکانی دا گلێك وەك وردەی زێری دەرژێتە سەر زەوی. رەزا لە دڵی خۆی دا دەڵێ:"ئەم خاکە ئی منە." گۆشتی لەشی دەلەرزێ. لە دڵی خۆی دا دەڵێ:"ئەم خاکە ئی منە...، بەڵام بیست ساڵە بێگانە دایدەچێنێ، بێگانە بەرهەمەکەی دەخوا..."

هەڵدەستێتە سەرپێ. ماندوویە. دێتەوە ماڵێ. دایکی دەپرسێ:

"لە بەیانیێیەوە تا ئێستا لەکوێ بووی؟."

رەزا جواب ناداتەوە، نێوچاوانی تاڵە.

ئەم وەزعە راست دوو مانگ درێژەی هەبوو. گەنم ئەوەندە هەستا ئەژنۆی دەگرت. رەنگی گۆڕا. زەردو سەوز تێکەڵ بوو. تاریك بوو. بوو بە سەوزێکی تاریك.

رەزا رۆژێك بانگی دایکی کردو دەستیان کرد بە قسە:

"دایە، چما ئەم زەوییە هی ئێمە نیە؟."

دایك:

بۆچی بابە... ئەدی هی کێیە؟."

رەزا:

"ئەمن دەمەوێ بچمە لای حکوومەت."

دایك:

"ئەمنیش چاوەڕوانی رۆژێکی وا بووم کوڕم."

رەزا:

"لە ریش سپییانم پرسیوە، دەڵێن باپیرم پێش ئەوەی بمرێ، ئەو خاکەی لە بابییەوە بۆی بەجێ ماوە لەنێو کوڕەکانی دا بەش کردوە. خۆ ئەگەر واشی نەکردبایە، بەشی ئێمە هەر دیار بوو."

دایك:

"ئەدی بابە گیان، بەشی ئێمە دیارە."

چونکە مەسەلەکە مەسەلەی میرات بوو، دادگایەکە زۆری نەکێشا، ئەو زەوییە نەرم و بەرێژەوەی لە خوارەوەی ئاداجا بوو، درایەوە بە رەزا.

رەزا کە چەندین ساڵ کوێرەوەری پێیشاندبوویەوە، ئەوەندە خۆشحاڵ بوو، دەتگوت پاش چەندین ساڵ بە دایك و بابی خۆی شاد بووەتەوە، رەزا زەوییەکەی خۆی دەست کەوتبووەوە. کاتێك زەوییەکەی وەردەگرتەوە هاوین بوو. خاك گەرم بوو. خاك برژابوو. گەنم دروابوون و گوڵەگەنمەکان دەبریسکانەوە.

رەزا هەر بەو هاوینە دەست بەکار بوو. جووتە جوانەگایەکی کڕی. جوانەگاکانی تێ کرد. خاك لەبەر نووکی گاسنەکەی دا ورد دەبوو. حەزی دەکرد ئەو خاکە کە بووەتەوە بە ئی خۆی

هەرچەندی بکرێ زووتر وەردو شێو ببڕێ. دەیەویست هەرچی زووترە زەوییەکەی بۆ یەك و سێ و یەك و چل ئامادە بکا.

هاوینان رۆژێ دوو جار جووت دادەبەسترێ. جارێکیان دووسەعات پێش تاو هەڵات و جارەکەی دیکەش لای ئێواران، ئەو کاتە کە شەماڵ هەڵی دەکا. وەرد برینی بەیانییان هەتا رۆژ گەرم دادێ درێژەی دەبێ. کاتێك دنیا بە باشی گەرم بوو، ئیدی جووت ناکرێ. چونکە جوانەگاکان گەی دەگرن و لە جێی خۆیان نابزوون. لەو کاتەدا دەبێ تا لای ئێوارێ لەبن سێبەری دارێك بحەسێنەوە. لای ئێوارێ، ئەو وەختە کە هەورەکانی دەریای سپی وەك بادەوە پەیدا دەبنەوە، سەر لەنوێ جووتی دادەبەستنەوە. ئەگەر مانگەشەو بێ، دەکرێ هەتا نیوەشەوێ جووتی لێخورن و ئەگەر مانگەشەویش نەبێ، هەتا تاریك دادێ.

مانگەشەو بوو. رەزا لە پێش تاو هەڵاتەوە هەتا چێشتەنگاو و لە ئێوارێ را هەتا نیوەشەو جووتی لێ دەخوڕی. گەرماو ماندوویی بە خەیاڵیشی دا نەدەهات. وەختی واش هەبوو بە خۆی نەبوو هەتا بەیانی جووتی دەکرد. خاکی کێڵراو و خۆش کراو لە بەر تیشکی مانگەشەو جوانتر دیارە. شەو... بێدەنگی... خشە خشی ورد بوونی گڵ لەبەر نووکی گاسن دا باشتر دەبیسترێ.

ئیراز لەوەی کورێکی وەك توولە نەمامی پێگەیاند بوو، لەوەی کە زەوییەکەیان لەدەست ئەو مامە بێ ئینسافانە دەرهێنابووەوە، هەستی بە سەربەرزی دەکرد. ئیراز ئەم رۆژانە لە نێو دێ دا وەك گێژەڵووکە بە خۆشحاڵی دەگەڕا.

وەختێك یەکێك زاری دەکردەوە کە بڵێ رەزا...، ئیراز دەسبەجێ جوابی دەدایەوە:

"رەزا لە جووتێیە."

شەوی چاردەی مانگ، مانگەشەو هەموو دەشت و دەرو کەژو کێو و زیاتر لە هەمووانیش زەویی وەردوشێو بڕاوی رەزای نوور باران دەکرد. شنەبایەکی فێنکی دەهات. لاقی گاجووتەکانی رەزا لە عەرزی رۆ دەچوون. گاجووتەکان لە سەرەخۆ بە ئارامی ئامووریان رادەکێشا.

هەرچەند مانگەشەو بوو، هەرچەند زەوی دەتگوت سپی کراوەتەوە، بریسکەی دەدا، خەوێکی قورس لە هەر چوار لاوە رەزای گەمارۆ دابوو.

رەزا ماندوویە. گاجووت و نیرو ئاموورەکان هەروا بەجێ دێڵێ، سەر وە سندەگڵێك دەکاو خەوی لێ دەکەوێ. رەزا لەسەر ئەو پارچە زەوییە کە لەنێو ئەو دەشتە گەورەیەدا وەردی

برابوو و هەروەك پەڕە كاغەزێكی چەوری رەش لەنێو ئەو دەشتەدا دەدرەوشا، وەك نوختەیەك دیاری دەدا...

"دورمووش" كوڕی یازدە ساڵەی یەكێك لە خزمەكانی رەزا، وەك هەموو رۆژانی دیكە نان و پێخۆری بۆ هێناوە. چێشتەنگاو قایم بووە.

گەڵاو داری وشك لەبن پێی كوڕەكەدا خشە خش و قرچە قرچیان دێ و دەشكێن. كوڕەكە وەك رۆژەكانی دیكە لەبن دارەكان بە دوای رەزا دا دەگەڕێ. كوڕەكە چاوەڕێیە كە رەزا وەك هەموو رۆژێك چاوی پێی بكەوێو بێتەلای و پێش ئەوەی بوخچەی نان و پێخۆرەكەی لێ وەرگرێ، لە باوەشی گرێ، دووسێ جار هەڵی باوێ و بیگرێتەوە. كوڕەكە سەری سوڕ دەمێنێ. بن هەموو دارەكان یەك بە یەك دەگەڕێ. رەزا لە هیچ كوێ دیار نیە. پاشان چاوی بە رەزا دەكەوێ. رەزا لە نێوەڕاستی مەزراكە نوستوە. گاجووتەكانیش دیار نین. وەختێك دەگاتە ژوور سەری رەزا، دەترسێ و دەسڵەمێتەوە. بوخچەكەی لە دەستی بەردەبێتەوەو بە هاواركردن را دەكا.

وەختێك دەگاتە ئاوایی هەناسەی سوارە، خەریكە دەكەوێ. دەزیرێنێ. بەڵام زیرەكەی دەنگ نیە. نووزەیەكە. خۆی دەگەیەنێتەوە ماڵێ. لەبەر دەركی ماڵێ دەكەوێ. ژن لە دەوری كۆ دەبنەوە. بەو خەیاڵە كە منداڵەكە لە شتێك ترساوە، زمانی رادەكێشن. ئاوی ساردی بە زاریەوە دەكەن. ئاوی ساردی بە دەم و چاوان هەڵدەپرژێنن. كاتێك منداڵەكە وەهۆش خۆی دێتەوە، بە پەتە پەت دەڵێ:

"كاكە رەزام لە خوێنی خۆی دا خەوتبوو... دەوروبەری ببوو بە گۆمی خوێن... زاریشی خوێنی لێ هاتبوو... ئەمن هەڵاتم و هاتمەوە."

ژنەكان دەسبەجێ فكریان كرد كە مەسەلە چیە. سەریان داخست و بێدەنگ بوون. بە یەك دەقیقە هەموو ئاوایی پێی زانی. بە گوێی ئیرازیش گەیشتەوە. ئیراز رووی خۆی دەرنیەوەو بە گریان و لەخۆ دانەوە لە پێشەوەو خەڵكی ئاوەدانییش بەدوای دا گەیشتنە مەزرا. سەری رەزا لەسەر سندە گڵەكە خزیبوو و بەملیەوە هەڵواسرابوو.

ئیراز شیوەنی دەكرد:

"كوڕی خۆم... هەتیوی خۆم..."

خۆی بەسەر تەرمی كوڕەكەی دا دابوو. رەزا ئەژنۆی نوشتاندبوونەوەو هەروا تەواو ببوو. قوولكەكەی تەنیشتی خوێنی تێدا داوەستابوو. خوێن جەغەتەی بەستبوو. مێش و

مەگەز لەسەر جەغەتە خوێنەکە دەنیشتن و هەڵدەفڕینەوە... هەتاوێکیش بە بۆنی توندی خوێن، بە بۆنی خوێنی کەف کردووەوە بە هەموو جێیەك دا بڵاو ببووەوە و وەك هەڵمێك لە زەوی هەڵدەستا. دنیایەك مێش و مەگەز لەسەر تەرمەکە شڵخەیان دابوو، مێشە شینکە وەك هەورە تریشقەیەکی سەوزو چکۆڵە بەسەر تەرمەکەوە دەبریسکانەوەو دەخلیسکان... خوێنەکە کەفی نەکرد بوو، جەغەتەی بەستبوو، وەك خشت. بەڵام لەو گەرمایەدا کەفاوی دیار بوو.

"خۆشی نەدیوەکەم، کوڕەکەم... هەتیوەکەم..."

ژن و پیاو و گەورەو بچووك لە دەوری تەرمەکە هاڵابوون. زۆربەی ژنەکان دەگریان:

"جوانەمەرگ... جوانەمەرگ... کێ بوو دڵی هات بتکوژێ؟ چ کافرێك روحمی بە جوانیت نەکرد..."

نیراز لە هۆش چووبوو. وەك مریشکی سەر بڕاو هەڵدەبەزی و دەکەوتەوە سەر زەوی. دڵی بەردی بۆ دەبوو بە ئاو.

دووکەس لە ژنەکان هاتن کە نیرازێ لەسەر تەرمەکە هەڵپچڕن. بەڵام نەدەکرا لە تەرمەکە جیای بکەنەوە. پێیەوە نووسابوو. شیوەنی بۆ دەکرد:

"منیش بە زیندوویی لەگەڵ رەزای خۆم بنێژن..."

ئەو رۆژە تا ئێوارێ نیراز لەسەر تەرمی کوڕەکەی مایەوە.

خەبەر گەیشتە شاری. ژاندارمەو پزیشك و بازپورسی حکوومەت هاتن.

ژاندارمەکان نیرازیان کە دوو چاوی ببوونە دوو گۆمی خوێن و تەواوی لەشی رەش و شین هەڵگەڕابوو، بە راکێش راکێش لەسەر تەرمەکە لابرد. نیراز کەوتە سەر زەوی. جوڵەی نەدەهات. وەك مردووان... تا ماوەیەکی زۆر دەنگی لەبەر نەدەهاتەدەر.

پاشان نیرازیان بە زۆر لە عەرزی هەڵپچڕی و بردیانە لای بازپورس.

بازپورس:

"خاتوون... بە فکری تۆ کوڕەکەت کێ کوشتوویە؟... شکت لە کێیە؟."

نیراز بە چاوێکی لە هەموو شتێك بە تاڵەوە لە چاوی بازپورسەوە ڕاما.

بازپورس دووپاتی کردەوە:

"پێت وایە کێ کوڕەکەتی کوشتوە؟... شکت لە کێیە؟."

نیراز:

"ئەو کافرانە... ئەو کافرانە... لەو کافرانە بەدەر، کێ ئەو کارەی دەکرد... کوڕی مـن ئامۆزای خۆی کوشتوویە... بۆ زەوییەکە... ئەو کافرانە..."

بازپورس باش لە مەسەلەی مەزراکەی کۆڵیەوەو بە خەلکەکەی ئیمزا کرد.

خەڵك بلاوەیان کرد.

تەرمەکە بەو هەمـوو مێشە شینکەوە کە لە دەوروبەری دەسووڕان، بـەو ئـێرو ئامووڕەوەکـە بێ جووت و جـووتێر مابوونـەوە، بـە دایکێکـەوە کـە هێنـدە گریـابوو فرمێـسکێکی نـەمابوو بیڕێژێ، لەنێو خوێنێك دا کە بۆنەکەی سەرانسەری ئەو دەشـتەی داگرتبـوو، بـەجێ مـا. ئـەو خاکـە رەش و چـەورە، لـە نێـو ئـەو دەشـتە سـەرانـسەر زەردە دا وەك پـەڕە کاغـەزێکی رەش دەدرەوشایەوە.

عـەلی، ئـامۆزای رەزایـان بـە تۆمـەتی کوشـتنی رەزا بـردە ئیـدارەی ژانـدارمری. عـەلی بەچەندین شـایەتی زینـدوو سـبووتی کـرد کـە ئـەو رۆژە لـە دێـی خۆیـان نـەبووەو لـە گونـدی "ئۆکسووزلوو" بۆ سەر زەماوەند بانگهێشتن کراوەو چووەتە ئەوێ.

لە سـاکار کووی هەتا ئۆکسووزلوو چـوار سـەعاتە ڕێیـە. ئیراز و هـەموو خـەلکی ئـاوایی دەیانزانی کە قاتڵی رەزا عەلییە و دەشیان زانی لەسەر چیی کوشتوە.

دێهاتییەکان سەریان سوڕمابوو، ئیرازیش لەبەر سەرسوڕمان حەبەسابوو. چونکە دوو رۆژ دواتر عەلی هێدی هێدی و بە خاترجەمی هاتەوە ئاوایی. ئیراز پێی وابـوو حەتمـەن لـە داری دەدەن. ئەو فکرە سوکنایی بە دڵی ئەو دابوو. وەختێك بیستی قاتڵی کوڕەکـەی بـە خـەیاڵی ئاسوودەوە هاتۆتەوەو هەروا بزانە هیچ نەبووە، لە هۆش خۆی چوو و شێت بوو. تـەوڕێکیان لە ماڵێ دا هەبوو هەڵی گرت و راستـەڕێ چووە لای ماڵی عەلی و ئەوان. دەیویـست حەتمـەن قاتڵی کوڕەکەی بکوژێتەوە. وەختێك دیتیان ئیراز تەور لەسەر شان بـەرەو ئـەوان غـار دەدا، چوونە ژووریَ و دەرکەیان لەسەر خۆیان داخست. وەختێـك ئـیراز دیتـی دەرگـا داخـراوە، بـە بیوران وەرگەڕایە دەرگاکە... عەلی لە ماڵ نەبوو. ئەگەر عـەلی لە مـاڵ بووایـە، دەرگایـان دانەدەخست. تەنیا دایك و باب لـە گـەڵ دوو کـچ و منداڵـە چـکۆڵەکەیان لـە ماڵـێ بـوون. خەریك بوو دەرگاکە دەشکا. ئیراز بۆ ئەوەی دەرگاکە بشکێنێ و هەموو ئەوانـەی لـە ژووری دان بە بیوران لەت و پەت کا، بـە هـەموو هێـزی خـۆی تـەوری دەوەشـاند. خـەڵکی دێ بـە دەنگی تەقە تەقی دەرگا هاتن و لە دەوری خانووەکە خڕ بوونەوە. نە دەوێران لە ئیراز نزیـك بنەوە. راستییەکەی دڵیشیان نەدەهات لێی نزیك ببنەوە. دەیانویست تۆڵـەی کوڕەکـەی بـە دەستی خۆی وەرگرێتەوە...

جار جار دەنگی پیاوێك لەنێو دێهاتیەکان بەرز دەبووەوە:

"مەکە دایکم... مەکە خوشکم... عەلی لە ماڵێ نیە."

کەس نەیزانی سەرو کەللەی عەلی لە کوێ ڕا لـەنێو خەلکەکـە پەیدابوو. پـرِی دایـەو لـە پشتەوەڕا ئامێری لە ئیراز دا. بیورەکەی لە دەست دەرهێنا. ئەو ژنە بێحاڵەی بە هەموو تـێن و قوەتی خۆی بۆ گۆشەیەك توورِ هەڵدا. ئەو ژنە بەستـەزمانەی وەبـەر پێلەقـە دا. دێهاتیـەکان غاریان داو ئیرازیان لەبن پێی دەرهێنا.

بۆشەوێ ڕا ئیراز خانووی عەلی و ئەوانی سـووتاند. دێهاتیـەکان خـەریکی کووژاندنـەوەی ئاورەکە بوون کە عەلی سواری ئەسـپ بوو و غاری دا بۆ پۆستی ژاندارمری. خەبەری بە پۆستی ژاندارمری داو گوتی خانووەکە هێشتا هەر دەسووتێ.

کاتێك عەلی و ژاندارمەکان گەیشتنە دێ خەریك بوو دنیا ڕووناك دەبوو. دێهاتیەکان لـە دەوری عەلی کۆبوونەوە:

"ئەیکـەی عـەلی... لێـی ببـوورە... ئـەو کـورِە تـوولـە ئەمامـەی لـە خـۆڵ و خـوێن دا گەوزیوە... دڵی گڕی گرتوە... بەستەزمانە بۆخۆشـی نازانـێ چ دەکـا... ئـەتۆش خـوێی بـە برینان مەکە... چۆن دڵت دێ ئەو ژنە بێ کەسە لە زینـدان دا بـرزێ... مـاڵی وێـران بـووە و وەجاغی کوێر بووەتەوە... لێی گەرِێ لەو بەستەزمانە..."

عەلی گوێی لەم قسانە نەبوو. ژاندارمەکان ئیرازیان وەپێش خۆ داو بەرەو پۆستی ژاندارمری لێیان خورِی.

ئیراز لە ئیدارەی ژاندارمری پێی لـێ نا:

"دەرگای ماڵەکەیانم شـکاند، هـەرکارێك بلـێن کردوومـە. ئەگـەر توانیبـام بـچمە ژووری، هەموویانم بە بیوران ئەنجن ئەنجن دەکرد. بەڵام نەبوو. ئەگـەر لەسـەر کـورِە تاقانەکـەم، لەسـەر هەتیوەکەم، خۆشەویستـە نازدارەکەم هەموویانم کوشتبایە، دیسـان کەم بـوو. ماڵەکەشـیان مـن سووتاندم. دەمەویست هەموویان بە چزە چز لە نێو ئاگردا بسووتێن و بە زیندوویی ببرژێن. بەڵام چما ئەو دێهاتیە بێناموسانە هێـشتیان؟... خەبـەرداریان کـردن. ئاورەکـەیان کووژانـدەوە. ئەمانە شتێك نین...، ئەمانە بەقەد نووکە دەرزییەك خـوێنی ڕەزا قـەرەبوو ناکەنـەوە. ڕەزای من مەملەکەتێکی دێنا. ئاگاتان لـێیە چۆنم گەورە کردبوو؟... ئەمانە شتێك نەبوون..."

بازپورسیش قسەکانی ئەوی بەڕاست زانی و لە دەفتەردا نووسینی. ئیرازیان نـاردە زینـدان. ئەو یەك وشەشی لەوەی گوتبووی، وەرنەگرتەوە. لەپەستا دووپاتی دەکردەوە:

"کوڕی من شەش دانگی دێیەك، شەش دانگی مەملەکەتێکی دێنا.. ئەمانە شتێك نین... کوڕی من... ئەمانە شتێك نەبوون..."

ئیرازیان لە بەندی ژنانی زیندانی ژاندارمری دا، کە تەنیا یەك ژوور بوو، حەپس کرد.

ئیراز زۆری پێ‌سەیر بوو. لە جیاتی خوێنی کوڕەکەی، لە جیاتی دارچنارەکەی کە لە خۆڵ و خوێن وەردرابوو، تەنیا تاقە مالێکی خەراپ کردبوو. ئەم ناحەقی‌یە بۆ ئەو لە مەرگی کوڕەکەشی گرانتر بوو. نەیدەتوانی سەر هەڵبڕێ و تەماشای جێیەك بکا. بەرێی خۆشی نەدەدی. هەر هیچ شتێك و هیچ جێیەکی نەدەدی. وەك کوێران بە کۆمە کۆم دەچووە ئەم لاو ئەولا. نەیدەزانی لێرەدا تەنیایە، یان کەسێکی دیکەشی لێیە. لە قوژنەیەك دانیشت. وەك بەردێك دەچوو کە لە چالێك کەوتبێ. دەنگێکی لێوە نەدەهات.

هەمیشە چارشێوی سپیی بە خۆی دا دەدا. روخساری سەوزەو تاوەگاز بوو، چاوە بادامی‌یەکانی گەورە بوون. رووناك بوون. بریسکەدار بوون. برۆ کەوانی‌یەکانی جوانی‌یەکی دیکەیان دەدا بە روخساری. چەنەگەی باریك بوو. دەم و چاوی گەورە بوون. هەمیشە لسپێکی چکۆڵە لە کەزی‌یە رەشەکانی دەکەوتە سەر نێوچاوانی زەقی و بە ئەلقە دەنگووت. بەڵام ئێستا روخساری پەرێشان بوو. روخساری رێك هاتبوو. رەش داگیرسابوو. لە بەر خوێنی سپیێنەی چاوانی دیار نەبوو. ئەوەندە گریابوو، چاوەکانی ببوونە دوو پیاڵە خوێن. چەنەگەی دەتگوت وشك بووە. لێوەکانی ئیدی رەنگیان تێدا نەمابوو. قەڵشت قەڵشت ببوون، دەتگوت لە تینووان قەڵشیون. بەڵام هێشتا چارشێوەکەی سپی سپی بوو. بێ پەڵە.

بێدەنگ دادەنیشت. پاشان لەبەرخۆیەوە دەستی بە قسە دەکرد:

"کوڕی من نەمام بوو... کوڕی من شەش دانگی وڵاتێکی دێنا. ئەمانە شتێك نین... ئەمن کارێکم نەکردوە... ئەگەر دێیەکی تەواوم بە گڵ و بەردەوە وێران کردبایە و ئاگرم تێبەردابایە، دیسان کەم بوو."

خەجیج هیچی لەو میوانە تازەیە نەدەپرسی. پێی خۆش بوو کە لە تەنیایی رزگاری بووە. لە تەنیایی‌یان خەریك بوو دەڕزی... زۆر خۆشحاڵ ببوو، بەڵام لەپڕ زگی بەو ژنە سووتا... خوا دەزانێ ئەو ژنە چارەڕەشە چی بەسەر هاتبوو... خۆشحاڵی‌یەکەی زۆری نەکێشا. نەیدەویست هاودەم و هاونشینێکی هەبێ. ئێرە جێیەك نەبوو. جێی دەرد و بەڵا بوو. جێگای چارە رەشان... چۆن دەیتوانی بەوە رازی بێ کە لێرەدا هاودەمێکی هەبێ؟.

خەجیج دەیەویست ئەو ژنە وەقسە بێنێ، شتێکی لێ بپرسێ. بەڵام دڵی نەدەهات. نەیدەوێرا. پرسیار کردن لەو کەسانە کە ئاوا لە پەلەقاژەی سەرەمەرگ دان، ئاوا کەوتوونە گیانەڵا، کارێکی ئاسان نیە. پیاو بە هیچ جۆر نازانێ چۆن دەست بە قسە بکا و چیبان لێ بپرسێ. خەجیجیش زاری هەڵنەپچڕی. چاوەکانی تێوە بڕی و لە قوژبنێك دا هەڵکوشما.

ئێوارە داهات. خەجیج لە دەرێ جامێکی شۆرباو بڕوێش لەسەر مەقەڵیەك وەسەر ئاو لێنا. شۆرباوەکەی کە بۆنی توندی ڕۆن و پیوازی چۆقاوی لێدەهات، هێنایە ژوور. چێشتەکە نەرم نەرم هەڵاوی لێ هەڵدەستا. کاتێك شێوەکە نەختێك سارد بووەوە، بە ترس و لەرزەوە لەپێش ئیرازی ڕاگرت:

"پوورێ... حەتمەن برسیتە... کەوچکێکم شۆرباو بۆ لێناوی. بخۆ." چاوەکانی ئیراز هیچیان نەدەدی. وەك کوێران تەماشای ئەم لاو ئەولای دەکرد و سەری دەسوڕاند. وادیار بوو هیچی گوێ لێ نیە.

خەجیج بە ترس و لەرزەوە دووپاتی کردەوە:

"پووری... کەوچکێك لەم شۆرباوە بخۆ. خەریکی لە برسان بەلادا دێی... یەك دوو کەوچك شۆرباو بخۆ."

ئیراز بە هیچ جۆر گوێی لە دەنگی خەجیج نەبوو. چاوەکانیشی هیچیان نەدەدی. وەك بەردی ڕەقیان لێهاتبوو. ئەسڵەن چاوی نەدەگەڕان. لە کوێران خەراپتری بەسەر هاتبوو. تەنانەت لە چاوی کوێرانیش دا تەقەلایەك بۆ ڕوانین و ئاواتی دیتن دەبینرێ. لە کەڕان دا تەقەلایەك بۆ بیستن و کێشرانێك بەرەو گەیشتن بە دەنگ دەبینرێ. بەڵام لە ئیراز دا نیشانەیەك لەو تەقەلایەش بەدی نەدەکرا.

خەجیج بەسپایی نقورچێکی لە کەلەکەی ئیراز دا:

"پووری."

چاوی لە هەموو شتێك بەتاڵی ئیراز لە سەرەخۆ بەرەو خەجیج وەرسووڕان و لەسەر خەجیج ڕاوەستان و مۆلەق وەستان. خەجیج کەوتە هەوڵ و تەقەلا. دەیویست لەبەر ڕوانینەکەی ڕابکا. ویستی شتێك بلێ. بەڵام زمانی تێك هاڵا، ڕەق بوو و نەیتوانی. پیاڵە شۆرباوەکەی لەپێش ژنەکە بەجێ هێشت و بۆخۆی وەدەرکەوت. هەناسەی ڕاوەستابوو. هەتا بەندیەوان هات دەرگاکە دابخاتەوە، خەجیج نەهاتەوە ژوورێ. لە ئیرازو لە وەزع و حاڵی ئیراز دەترسا. واتە دڵی نەدەهات بەو وەزعەوە تەماشای ئیراز بکا. کاتێك بەندیەوان دەرگای لەسەر خەجیج پێوەدا،

خەجیج بۆ ئەوەی چاو لە ئیراز بکا، غاری داو خۆی لەنێو جێیەکەی ڕاکرد. ماوەیەك لەنێو جێیەکەی دا خۆی مات کرد و جوولەی نەهاتێ. دنیا تاریك بوو. هەڵنەستا چرایەکە هەڵ بکا. هەموو ڕۆژێ هەرکە دنیا تاریك دەبوو، چرایەکەی هەڵدەکرد. بەڵام ئەمڕۆ هەرچەند کردی و کراندی نەیتوانی هەستێ و چرایەکە هەڵ بکا. نەیدەوێرا دیسان چاوی بەو ڕوخسارە بکەوێتەوە کە لە نێوان مردن و ژیان دا پەلەقاژەیەتی. لە تاریکاییش دەترسا. بەڵام لە تاریکایی دا باشتر بوو. تاریکایی هیچ نەبێ وەك دیوارێك ئیرازی لەبەر چاوی ئەو دەشاردەوە.

ئەو شەوە تەنانەت یەك لەحزەش خەو لە چاوی خەجیج نەکەوت. هەر کە ڕووناکایی بەیانی لە درزی چوار چێوەی پەنجەرەکەوە هاتە ژوور، خەجیج ڕاست بووەوە. ئیراز هەر لەو قوژبنە کە لێی دانیشتبوو وەك سێبەرێکی سووك بە دیوارەوە نووسابوو. جوولەی نەدەکرد. تەنیا چارشێوە سپییەکەی دیار بوو. چارشێوە سپییەکەی وەك پەنجەرەیەکی سپی بە دیوارەوە دیار بوو.

نیوەڕۆ داهات. ئیراز هەروا لە جێی خۆی دانیشتبوو. ئێوارێش هەروا. ئەو شەوەش هەروەك شەوی ڕابردوو، خەجیج بە ترسەوە نیوە بە خەو و نیوە بەخەبەر، ڕۆژی کردەوە.

بەیانی، دیسان هەرکە ڕووناکایی لە درزی چوار چێوەی پەنجەرەوە هاتە ژوور، هەڵستا. چاوەکانی هەڵمسا بوون. چووە ژوور سەری ئیراز. خەجیج بڕیاری خۆی دابوو:

"پوورێ... بەسە ئیدی پوورێ... مەکە... پوورێ، پوورێ..."

دەستی ژنەکەی لەنێو دەستی خۆی گرت:

"پوورێ... بە قوربانت بم پوورێ... مەکە... پوورێ..."

ژنە چاوە گەورەکانی کە گەورەتریش ببوونەوە، بۆلای ئەو وەرگێڕا. چاوەکانی سیس ببوون. ئیدی شۆقیان تێدا نەمابوو. چاوەکان ئیدی سپێنەیان نەبوو. سەرانسەری چاوەکانی ڕەش و تاریك هەڵگەڕابوو.

خەجیج ڕووی تێکردەوە:

"پوورێ، پوورێ... دەردت چیە پوورێ... ڕەببی دەسەر سەرت گەڕێم پوورێ... ئەگەر بنیادەم دەرد و بەڵایەکی تووش نەبووبێ ڕێی ناکەوێتە ئێرە... وانیە پوورێ؟..."

ئیراز ناڵاندی:

"دەڵێی چی کچم."

خەجیج لەوە کە ئیراز زاری هەڵپچڕیبوو و قسەیەکی بەدەم دا هاتبوو، زۆر خۆشحاڵ بوو. وەك ئەوە دەچوو بارێکی قورسی لەسەر شانان هەڵگیرابێ.

خەجیج:

"چتە پووریّ... چت لێ قەوماوە؟... لەو کاتەوە پێت ناوەتە ئەم ژوورە نە قسەیەکت کردوەو نە پارووە نانێکت لە زارت ناوە."

نیراز:

"کوڕی من مەملەکەتێکی دێنا. کوڕی من چەپکە گوڵی دێیەکەمان بوو. ئەمانە شتێك نین..."

ئەوەندەی گوت و بێدەنگ بوو:

خەجیج:

"پووریّ...، لەوەتی چاوم بە تۆ کەوتوە، دەردی خۆمم لەبیر چووەتەوە. دەردت چییە پووریّ... پێم بڵێ... بیڵێ، بەڵکوو کەمێك سوکناییت بێ."

نیراز:

"ئەگەر ماڵی قاتڵەکانی کوڕی خۆم وێران کردبێ، ئەگەر دەرکیانم شکاندبێ، کارێکم نەکردوە؟... ئەگەر هەموویانم وەك قیمە ئەهنیبایە, کارێکم نەکردبوو؟... ئەمانە شتێك نین..."

خەجیج:

"ئاخ پووریّ گیان ئاخ... ڕەبی خوا کوێریان کا."

نیراز:

"کوڕی من چەپکەگوڵی ئاوەدانی بوو. ئەگەر هەموویان بکوژم کارێکم نەکردوە؟... ئەگەر تەواوی ئاوەدانییەکم بە بەردو گڵ و دارو درەخت و خانووەکانیەوە سووتاندبایە, دیسان کەم بوو."

خەجیج:

"وەی دایە گیان, وەی..."

نیراز:

"ئێستا منیان هێناوە دێرەیان کردووم و قاتڵی کوڕەکەشم بێخەیاڵ کڵاوی بە لایەکی سەریەوە دەنێ و لەنێو دێی دا دەگەڕێ... ئەدی مردن بۆ کێ باشە؟... ئاخر ئەمن بۆچی ماوم؟."

خەجیج:

"پووریێ گیان... پووری بەرێزم... ئەوەتا هاتوویە ئێرە زەوادت نەبڕیوە، ڕۆژووت نەشکاوە... ئێستا کەچکە چێشتێکت بۆ لێدەنێم."

خەجیج بڕیاری دا ئەمڕۆ ڕۆنێکی زۆر لە چێشتەکەی بکا. لە مانگێك پاش گیرانیەوە جل شۆریی دەکرد. جلی زیندانی‌یەکانی دەشوت. چەند قرۆشێکی کۆکردبووەوە. کچێکی منداڵکار لە دەرێ شتی بۆ زیندانی‌یەکان دەکڕی. کچەکەی بانگ کرد. پەنجا قرۆشی لە مستێ نا:

"بابی ئەم پەنجا قرۆشەم ڕۆن بۆ بێنە."

خەجیج لە خۆشی‌یان وەخت بوو باڵ بگرێ. چونکە ئیراز وەقسە هاتبوو. هەرکەس قسە بکا، بەو زووانە ئازار نایکوژێ، ئەگەر کەسێك لەم وەزعە دا قسە نەکاو هەر خۆی بخواتەوە، هاوار بە حاڵی. خەجیج هەربۆیە خۆشحاڵ بوو.

هەموو ئەو گۆرانی‌یە خۆشانەی خەجیج دەیزانین، یەك بە یەك بە دڵی دا رابردن. مەقەڵی‌یەکەی پڕ کرد لە ڕەژی. دەستی کرد بە فوو لێکردن، دەسبەجێ ڕەژی‌یەکە گرتی. خەجیج هەم باوەشێنی دەکردو هەم فووی لێدەکرد. ئاوی لە دەفرە سپی‌کراوەکەی کردو وەسەری نا. چێشتەکە دەسبەجێ ساز بوو. خەجیجیش پێی سەیر بوو کە چێشتەکەی وا زوو کوڵی.

هەروەختێك خەجیج باسی چێشتی دەکرد، ئیراز دڵی پێك دا دەهات. دەتگوت دڵ و ڕیخۆڵەی بەسەر یەك دا نووساون... لەو ڕۆژەوە کە کوڕەکەییان کوشتبوو هەتا ئەمڕۆ پارووە نانێك چیە، نەچووبووە سەر زارو زمانی. لە دەرێ بۆنی ڕۆن و پیوازی بۆ هات. دەنگی چزەچزی ئەو ڕۆنەی بیست کە بە چێشتەکەیان دا دەکرد.

خەجیج قاپە چێشتێکی لەپێش ئیراز دانا:

"بخۆ پووریێ... تو خوا بخۆ."

ئەمەی گوت و کەچکێکی داری دایە دەست. ئیراز هەروا بزانە لەبیری چووەتەوە کەچك چیە، کەوچکەکەی هەروا بە دەستەوە بوو، دەتگوت ئێستا نا ئێستا لە دەستی بەردەبێتەوە.

خەجیج دەترسا کە ئیراز دیسان دەم لە چێشتەکە نەدا. بۆیە تکای لێکرد:

"یاڵڵا پووریێ... دەبخۆ... دەبخۆ بە قوربانت بم..."

ئیراز لەسەرەخۆ شۆرباوەکەی خوارد.

خەجیج:

"پوورێ، ئاوم لە ئافتاوەی کردوە... هەستە مستێك ئاو بە دەم و چاوتەوە بدە با نەختێك بێیەوە سەرەخۆ."

ئیراز بە قسەی خەجیجێی کرد. هەستا دەم و چاوی شوتن:

"عومرت درێژ بێ کچی خۆم... بە مرادو خۆشی بی."

خەجیج:

"ئیشەڵلا پووری بەرێزم... ئیشەڵلا پوورێ گیان...، ئیشەڵلا..."

پاشان خەجیج دانیشت و بەسەرهاتی خۆی بۆ ئیراز گێڕایەوە:

"بەڵێ پووری بەرێزم، بەڵێ... ئاوا بوو. ئێستا ئەمن هیچم لە خوا ناوێ، جگە لەوە کە خەبەرێك لە حەمەد بزانم. راست نۆ مانگە لێرەدام. نە کەس دێتە لام، نە کەس لێم دەپرسێ... دایکم کە لە زگ و پشتانی گێڕاوم، جارێك زیاتر سەری نەداوم... بەڵێ پووری بەرێزم. رۆژەکانی پێشدا هیچ کەس نەبوو پاروە نانێکم بداتێ. پاشان دەستم کرد بە جل شوتن و جلی خەڵکی دیکەم... بەڵێ پووری بەرێزم... بریا توانیبام خەبەرێکی حەمەدی بزانم. خۆزگە زانیبام مردووە یان زیندووە. ئەگەر لە داریشم دەن بە خەیاڵم دانایە، تەنیا دەمەوێ خەبەرێکی حەمەدم بزانم..."

بەرەبەرە ئیراز لەو گێژی و بێحاڵیـیە هاتەدەر. دوایە لە زیندانیـیەکانی بیست کە نەدەبوو پێی لە تاوانی خۆی نابایە. نەدەبوو بڵێ:"دەرگاکە ئەمن بە بیور شکاندم...، ئەگەر ئەو بیژووە نەهاتبایەوە هەمووی ئەوانەی لە ژوورێ بوون دەمکوشتن... خانووەکەشم بۆیە ئاور تێبەردا کە هەموویان بسووتێنم..."

زیندانیـیەکان پێیان دەگوت:

"ئەگەر دە کوڕت هەبێ و هەر دەیان بکوژن، هەتا شایەتت نەبێ چت بۆ ناکرێ. دەبێ چەند کەس شایەتی بدەن بۆ ئەوەی قانوون بتوانێ قاتڵەکە بگرێ..."

ئیراز رۆژەکانی پێشدا هیچ لەم قسانە حاڵی نەدەبوو. تەنیا لەو زوڵم و ناحەقیـیە نارەحەت دەبوو. بەڵام وردە وردە فێر بوو. لە بازپرسیـیەکانی دواتر دا حاشای لە قسەکانی پێشووی دەکردو دەیگوت:

"ئەگەر لە زیندانێ دەچمە دەر، دەزانم چۆن بە حکوومەت دەسەلمێنم کە کوڕەکەم عەلی کوشتوویەتی."

خەجیج ئیرازی دڵخۆشی دەدایەوە:

"ئیشەڵڵا بەردەبی پووره ئیراز گیان، ئیشەڵڵا بەردەبی و قاتڵی کوڕەکەت تەحویلی حکومەت دەدەی... بەڵام پێم بڵێ ئەمن چ بکەم؟... ئەمن دەبێ لە قوژبنی زیندان دا بڕزم پووره نازدارەکەم. دەبێ عومری جوانیم لە بەندیخانە بەرمەسەر... چونکە هەموو شایەتی دەدەن کە وەلی ئەمن کوشتوومە."

ڕۆژگار تێپەڕی. خەجیج و ئیراز وەك دایك و کچ ئۆگری یەکتر بوون. لە دایك و کچیش زیاتر یەکتریان خۆش دەویست... بە بێ یەکتر نان و ئاویان پێ نەدەخورا. ئێستا دەردی هەردووکیان ببوو بە یەك. خەجیج زۆر باش ڕەزاو بەژن و باڵاکەی و چاو و بڕۆ ڕەشەکانی و قامکە شووش و باریکەکانی و سوار چاکی و تەقڵەبازی و سەماو هەڵپەڕینەکەی و سەردەمی منداڵییەکەی، دەزانی و باش تێگەیشتبوو کە ئیراز بە چ کوێرەوەرییەك ئەوی لە ئاووگڵ هێناوەتە دەرو هێناویەتە سەر بەرو سەرەنجامیش چۆن بۆ پارچە زەوییەك روحمیان بە جوانیی ئەو نەکردوەو کوشتوویانە. ئیرازیش هەروا. ئەویش حەمەدی لە نیزیکەوە دەناسی... لەو ڕۆژانەوە کە منداڵ بوو و لەگەڵ خەجیج ماڵۆچکەیان دروست دەکردن، هەتا ئەو ڕۆژە کە ئەو پێشهاتە قەوما...

ئیدی خەم و خەفەت و خۆشیی ئیراز و خەجیج بوون بە یەك... هەر دووکیان تەنیا یەك غەمیان هەبوو، ئەویش غەمی حەمەد.

ئیراز و خەجیج هەموو ڕۆژێ لە بەیانییەوە هەتا نیوەشەو گۆرەوییان دەچنی. ئەوەندەیان دەچنی کە چاویان نەیدەدی. گۆرەوییەکانیان لە شاردا ناوبانگیان کردبوو. خەڵك دەیانگوت:

"ئەم گۆرەوییانە ئەو کچە کە دەزگیرانی خۆی کوشتوەو ئەو ژنە کە کوڕەکەی کوژراوە، دەیان چنن..."

تاڵترین نەخش لەسەر گۆرەوییەکان هەڵدەفڕین. خەجیج و ئیراز لەبەر نموونە هەڵیان نەدەگرتەوە. نەخشەکان هەموو هی خۆیان بوون. جا چ ڕەنگێك و چ نەخشێك... تاڵ... وەك ژەهرەمار.

لەو ڕۆژەوە ئەم شارە ببووە شار، نەخشی وا بە ماناو ئەوەندە تاڵ و جوانی بە خۆیەوە نەدیبوو. ئەمە باوەڕی خەڵکی شار بوو. هەمووان وایان دەگوت.

زیندانی، یەکەم ڕۆژ گێژ و وێژە. دەڵێی لەسەر ئەم دنیایە نیە. دەڵێی چووەتە دنیایەکی دیکە. دەڵێی لە لێرەوارێکی بێ سەرو بن دا ون بووە. لەوەش خەراپتر، دەڵێی دەستی لە زەوی، ماڵ و حاڵ، دۆست و ئاشنا و خۆشەویست و هەموو شتێکی دیکە بڕاوە. دەڵێی لە

بۆشایییەکی بێ سەرو بن دا هەڵواسراوە و دەستی بە هیچ کوێ راناگا. زیندانی لە رۆژەکانی پێشدا حاڵێکی دیکەشی هەیە. دارو دیوار و گڵ و بەرد و ئەو ئاسمانە چکۆڵەش کە لە کلاورۆژنەرا دەیبینێ، بە دوژمنی خۆی دەزانێ. ئەگەر پووڵیشی نەبێ، خەراپتر. کوشم هەڵدێ و لە قوژبنێك دادەنیشێ.

بە خۆڕایی نەبوو ئیراز و خەجیج رۆژ تا شەو گۆرەوییان دەچنی، هەتا چاویان بیدیبایە رانەدەوەستان. دەستیان لە تاقە قرۆشێکی داهاتەکەشیان نەدەدا. چەند مانگ بوو جگە لە جیرەی زیندان دەمیان لە هیچ شتێکی دیکە نەدابوو.

پێیان وابوو کە درەنگ یان زوو حەمەدیش دێتە ئێرە. رەنگە سبەینێ، لەوانەشە مانگێکی دیکە... نابێ بێ پووڵ وەمێنێ... ئەو نابێ مل بەلاوە نێ و بە سەرشۆڕی لە قوژبنێك دانیشێ. هەربۆیە بوو کە ئیراز و خەجیج روحیان بە چاوی خۆشیان نەدەکرد و شەو و رۆژ دەیان چنی و دەیان چنی...

ئیراز دەیگوت:

"کچی نازەنینم... حەمەدمان وەك ئێمە کوێرەوەرییان نابینێ... چونکە ئێمە لێرەین."

خەجیج بە پێکەنینەوە جوابی دەدایەوە:

"ئەدی پووری گیان، ئێمە لێرەین... ئێمە لێرەین..."

ئیراز:

"حەمەدمان سوپاس بۆ خوا پووڵدارە، هەتا ئەو دێتە بەندیخانە زیاتریش پەیدا دەکەین. رۆژێك کە هات هەموو پووڵەکەی لە دەستی دەکەین. نایەڵین لە کن هەرکەس و ناکەسێك شەرمەزار بێ... نایەڵین چاو لەدەستی ئەم و ئەو بێ."

شەوانە بە چاوی ماندووەوە دەچوونە نێو جێی. ماوەیەکی زۆر پێکەوە قسەیان دەکرد. دەردی دڵیان هەڵدەڕشت. فکری سەیر سەیریان لەبارەی حەمەدەوە دەکردنەوە...، فکری وا کە بە نەقڵی هیچ کەس نەدەگەیشت... پاشان خەجیج لە دەستی دایکی دەهەری دەبوو و دەستی پێدەکرد:

"ئەو دایکەی من... بەو دایکەی منیش دەڵێن دایك؟... ئەمن خۆ شتێکم لێ داوا نەکرد بوو. گوتبووم دەسەر سەرت گەڕێم، هەر چۆنێك بێ خەبەرێکی حەمەدم بۆ بێنە... پێم گوتبوو ئەمن هیچم لێت ناوێ...، هیچ... تەنیا خەبەرێکی حەمەدم بۆ بێنە... بەلام رۆیشت و ئیدی ئاوڕیشی نەدایەوە."

ئیراز:

ئەتۆ چووزانی ئەو بەستەزمانە چی بەسەر هاتوە؟... ئەتۆ چووزانی؟."

ئیراز هەمیشە بەم جۆرە قسانە لەسەر دایکی خەجیجێی دەکردەوە.

ئەمشەویش وەك هەمـوو شەوێك لای نیوەشەو هەردووکیان چـوونە نێـو جێـی. نوێنـەکانیان لەبەر شەداریی ژوورەکە تەڕ بوون. دەنگی سیسرە بەرز ببووەوە.

خەجیج:

"پوورە ئیراز."

ئیراز:

"بلێ کچم."

قسەکانیان هەمـوو شەوێ بەم جۆرە دەست پێ دەکران:

ئیراز:

"چی؟."

خەجیج:

"تەڕایی."

ئیراز:

"باشە، چ بکەین کچم."

خەجیج:

"دایکی منیش دایکە؟."

ئیراز:

"ئەتۆ چووزانی بەستەزمانە چی بەسەر هاتوە؟."

خەجیج ئیدی زۆری باسی دایکی نەکرد. باسـەکەی گۆڕی:

"لە"پوورەگیر" لە چوکووراوا لە پێش دا خانوێـك سـاز دەکـەین. حەمـەد لـە پـێش دا بـە ڕەعیەتی دەست پێدەکا، دوایە زەوییـەکی چـکۆڵە دەکـڕێ... ئەمانـە حەمـەد بۆخـۆی پێـی گوتووم."

ئیراز:

"ئێستا ئێوە جوان و جوورن کچم... ئیشاڵلا..."

خەجیج:

"دەیەویست لە شاری بمباتە دوکانی کەباب فرۆش."

ئیراز:

ئیشەڵڵا دیسان هەر دەتبا."

هەموو شەوێ باسەکە بەم جۆرە ماوەیەك درێژەی دەکێشا. پاشان خەجیج چاوی قورس دەبوون و خەوی لێ دەکەوت. خۆی و زیندان و حەمەد و رەدووکەوتن و هەموو شتێکی لەبیر دەچووەوە. ئیرازیش هەروا. ئەمشەویش هەروەك شەوەکانی دیکە وردە وردە خەریك بوون خەویان لێ بکەوێ. خەجیج لە نێو خەو و بێداری دا ورێنەی دەکرد:

"خاکی یوورەگیر گەرمە، بەرۆژە... گەنمێك دێنێ ماری تێ ناچێ... زەوییەکەمان بنەتۆوی سی کیلە گەنمە..."

ئیراز:

"بەڵێ کچم، سی کیلە."

خەجیج:

"نیوەیمان کردوەتە گەنم و نیوەشی جۆ."

ئیراز:

"لەنێو گەنمەکەش یەك دوو کووز پیواز..."

خەجیج:

"نێو ماڵەکەمان بە گڵی سەوز سواخ کردوە."

ئیراز:

"گڵی سەوز... بۆ شیلە سواخ..."

خەجیج:

"جوانەگایەکمان هەیە هەر چاوێکی ئەوەندە... رەنگی جوانەگاکەمان خەنەییە. گوێرپارێکیش..."

خەجیج کە گەیشتە ئەم قسانە، ئیدی ئیراز وەڵامی نەدەدایەوە. ئەمشەویش هەروا بوو.

خەجیج لەسەری دەرۆیشت:

"ماڵی ئێمە ماڵی خۆتە پوورە ئیراز، حەمەد کوڕی خۆتە، ئەمنیش کچێ خۆتم."

ئیراز:

"کچێ خۆمی."

خەجیج:

"بویەکەی بەر دەرگامان شۆڕابەی گەیشتوەتەوە عەرزی."

ئیراز:

"دەورەکەی تانە دەکەین...، دەیکەینە باخچە... باخچەکەشی دەکەینە گوڵ و ریحانە."

خەجیج هەموو شەوێ کە دەگەیشتە ئەم جێیانە، لە پڕ وەك ئەوەی لە خەوێکی قورس راپەڕیبێ، وەهۆش خۆی دەهاتەوەو دەیپرسی:

"پوورە ئیراز... ئەتۆ دەڵێی کەنگێ حەمەدی دێنن؟."

ئەمشەویش هەروا بوو. لە نەکاو راپەڕی و پرسی:

"دەڵێی چی پووری؟... کەنگێ دەی هێنن؟."

ئیراز:

"ئەگەر سبەینێ نەی هێنن، هەتا مانگێکی دی حەتمەن دەی هێنن."

خەجیج:

"ئێمە لێرەین... وەنا پووری؟."

ئیراز بە لەخۆڕاییی بوونەوە جوابی دایەوە:

"ئێمە لێرەین... پووڵیشمان هەیە."

ئەوان هەموو شەوێ بەبەر ئەم قسانەوە خەویان لێ دەکەوت. ئەمشەویش هەروا.

رۆژی هەینی بوو، رۆژی بازاڕ، رۆژی جومعە بازاڕ... هەموو رۆژانی هەینی خەجیج چاوەڕێ بوو. ئەگەر دایکی هاتبایە، حەتمەن رۆژی جومعە دەهات. خەجیج ئەمرۆش بەیانی زوو، زۆر پێش تاو هەڵات لە خەو هەستابوو و گوتبووی:

"خوا بکا ئەمڕۆ بێ."

جومعەکانی دیکەش هەمیشە ئەم ئارەزووەی کرد بوو.

لای نیوەڕۆیە ژنێکی باڵا بەرز و کۆڵە پشت لە کۆڵ، بە ترس و دڵەخورپەوە لە زیندان نزیك کەوتەوە.

خەجیج هاواری کرد:

"پوورە ئیراز."

ئیراز لە ژووری جوابی دایەوە:

"چ بووە کچم."

خەجیج:

"دایکم."

نیراز هاتەدەرێ. لە پەنا خەجیجێ راوەستا. ژنێکی شەکەت و پێخواس کە چارشێوێکی رەشی بە سەری خۆی دا دابوو، بە شەلە شەل بەرەو زیندان دەهات. ژنە گەیشتە بەر دەرکی زیندان. راوەستا. سەری داخستبوو. بەندییەوانی لەڕو لاواز و تووڕەو تۆسن کە دیار نەبوو لەچی تووڕە بووە و دەلەرزێ، نەڕاندی:

"چت دەوێ کچێ؟."

ژنە:

"کچم لێرەیە... هاتووم بیبینم."

خەجیج هاواری کرد:

"دایە."

ژنە سەری هەڵبڕی و تەماشای چاوی بەندییەوانی کرد:

"ئەوەتا ئاغا... کچەکەم لەوێیە."

بەندییەوان:

"وەرە ژوور."

ژنە کۆڵەپشتەکەی دانایە زەوی. هەڵتروشکا و پشتی بە دیوارەوە دا:

"ئاخ... خەریکە موورەگەی پشتم بشکێ."

خەجیج هەروا راوەستا بوو و تەماشای دایکی دەکرد. ژنە لاق و لەتەری هەڵدڕ هەڵدڕ ببوون. نێو قەڵشتەکانی لاقیشی پڕ لە تۆز و خۆڵ بوو. مووی سەری لە تۆز و خۆڵ دا سپی ببوو. ئارەقی دەم و چاو و شان و ملی رەش رەش بوو. برژانگ و برۆی هێندەیان تۆز لێ نیشتبوو دیار نەبوون. داوێنی شڕ و چلکنی کراسەکەی لە لاق و لەتەری هاڵا بوو. وەختێک خەجیج دایکی لەم وەزعەدا دی، لە پڕ هەموو گلەیی و دڵ ئێشییەکانی لەبیر چوونەوە. زگی پێی سووتا. چاوی پڕ بوون لە فرمێسک. گەرووی برژایەوە. لاقی لە دوو نەدەهاتن کە بەپیر دایکییەوە بچێ.

دایک چاوی بە خەجیجێ کەوت کە هەروا لە جێی خۆی وشک بووەو بە چاوی بە فرمێسکەوە تەماشای دەکا. ئەویش گەرووی برژایەوە. دایک و کچ نەیاندەزانی چ بڵێن و بۆ ئەوەی لە بانگی گریانێ نەدەن، بەزەحمەت خۆیان بۆ راگیر دەکرا. دایک:

"وەرە کچە بێبەختەکەم... وەرە کچی بێ شانس و ئیقبالم... وەرە کن دایکی خۆت."
دایك ئیدی نەیتوانی پێشی خۆی بگرێ. فرمێسك بە ئارامی لە چاوی سەرەوژێر بوونەوە. خەجیج رای کردە کن دایکی. دەستی ماچ کردو لەسەر سەری خۆی دانـاو لـە پەنای دانیشت.
ئیرازیش هاتە لایان.
"بەخێراتی خوشکێ."
خەجیج ئیرازی لەگەڵ دایکی پێك ناساند:
"دایە، ئەمە پوورە ئیرازە... لێرە پێکەوەین."
دایك:
"ئەو خوشکەم چی بەسەر هاتوە کە کەوتوەتە ئەم چاڵە."
خەجیج:
"کوڕەکەییان کوشتوە."
دایك:
"ئاخ خوشکێ گیان، ئاخ... رەبی خوا چاکیان بۆ نەکا. رەبی کوێر بن."
ماوەیەك هەرسێکیان بێدەنگ بوون. لە پاشان دایك سەی هەڵبڕی و وەقسە هات:
"کچم... کچی کەزی ئاوریشم و چاوڕەشم... دەبێ لە دایکە بەستەزمانەکەت ببووری کچم... ئەتۆ چووزانی ئەو عەبدییە کافرە چی بەسەر دایکت هێناوە؟... لەو وەختەوە کە بیستوویە عەریزەم بۆ حکوومەت نووسیوە، هەر بۆخۆم دەزانم لە دەست ئەو خوانەناسە چیم کێشاوە کچم... لێی قەدەغە کردم کە پێم لە ئاوایی بەرمەدەر. بەڵێ کچی شیرنم... دەنا دایکت کچە شیرنەکەی لەم چواردیوارەدا، لەم شارەدا، لەنێو کەس و ناکەس دا بە تەنیا نەدەهێشتەوە... ئەگەر ئەو کافرە پێشی نەگرتایەم هەر رۆژێك نا رۆژێك دەهاتمە لای کچە شیرنەکەم."
دیار نەبوو بۆچی لە نەکاو قسەکانی پچڕی. لەو کاتەوە کە گەیشتبووە بەندیخانە یەکەم جار بوو کە روخساری نەختێك دەگەشایەوە. خەجیج و ئیراز پتری لێ‌نیزیك بوونەوە. ئەو بە سرتە دەستی کرد بە قسەکردن:
"کچی شیرنم... خەریك بوو لەبیرم بچێ... خەبەرم بۆ هێناوی...، دەڵێن حەمەد یاغی بووە... یاغی..."

وەختێك دایك ناوی حەمەدی هێنا، روخساری کچەکەی وا سوور داگیرسا دەتگوت گوڵی هەنارە. دڵی لەنێو قەوەزەی سنگی دا بە جۆرێك دەستی کرد بە لێدان دەتگوت خەریکە بێتە دەرێ. دایکی بۆی گێرایەوە:

"حەمەد پاش ئەوەی لە هەردووکیانی دا، رۆیشتە نێو دەستەی دۆردووە شێت... دەڵێن بەڵایەك بەسەر خەڵکی دێنن، ئەوسەری دیار نەبێ... دەڵێن کەس ناوێرێ بەو دەوروبەرانەدا تێپەڕێ. هەموو ئەوێیان پاوان کردوە... هەموو بەندەنەکانیان بەستوە...، هەرکەس بەوێ دا رابرێ، رووتی دەکەن، دەرپێیەکەشی لەپێ دادەکەنن و پاشان دەیکوژن."

خەجیج تووڕە بوو:

"حەمەد کاری وا ناکا... حەمەد خەڵکی ناکوژێ."

دایك:

"ئەمن چووزانم کچم، خوا دەزانێ... هەموو کەس وا دەڵێ... لە پێش دا ناوی دۆردووە شێت و پاشانیش ناوی حەمەد لەسەر زارو زمانانە. ناوبانگێکی دەرکردوە، مەپرسە... دەچیە هەر جێیەك باس باسی ئەوە. بچیە هەر جێیەك ناوی حەمەدۆکت گوێ لێدەبێ... ئەمن چووزانم کچم. ئەمن هەرچی لە خەڵکم بیستوە، ئەوت بۆ دەگێڕمەوە. وەختێك عەبدیخان ئەم قسانەی بیستەوە، هەتا مانگێك چوار پێنج ئێشك گری لە دەوریماڵەکەی خۆی دانان. دێهاتییەکان دەڵێن لەگەڵ ئەوەی چوار پێنج کەس ئێشکی ماڵەکەی دەگرن، دیسان دەترسێ و هەتا بەیانی خەوی لێناکەوێ. دەڵێن هەروا لە نێو ماڵێ دا دێت و دەچێ و بە دەوری خۆی دا دەسوورێ. پاشان وەکیل باشی عاصم هاتوەتە لای عەبدیخان و گوتوویە کە وەدوای حەمەد کەوتوە. بەڵام پێی گوتوە ئەوەتا ئەم کێوانە هەن یاغییەکی وەك حەمەدیان بەخۆوە نەدیوە. وەکیل باشی عاصم پێی گوتبوو ئەگەر حەمەدۆك نەبووایە ئەمن دۆردووە شێت و هەموو دەستەو بەستەکەیم لەنێو بردبوو. پاش ئەم قسانە عەبدیخان دێی بەجێ هێشتوەو ئیدی نەگەڕاوەتەوە. هێندێك دەڵێن لە شاری دەمێنێتەوە. هێندێك دەڵێن چووەتە یەکێك لە دێیەکانی چوکووراواو هێندێکیش دەڵێن چووەتە ئەنکەرەو لەبەر دەرکی حکوومەت دانیشتوە. دەڵێن عەبدیخان لە ترسی حەمەد خۆی شاردوەتەوە. ئەمنیش دیتم خان دیار نیە، غیرەتم وەبەر خۆم ناو گوتم با بچم سەرێکی کچە شیرنەکەم بدەم... بەڵێ کچە شیرنەکەم، ئاوا..."

وەختێك ئەم قسانەی دەکرد، وادیار بوو زەردەخەنەیەکیشی لەسەر لێوانە. روخساریشی زۆر روون بوو. کاتێك قسەکەی تەواو بوو، لە نەکاو رەنگی گۆڕا، رەش و شین هەڵگەڕا... دەتگوت خەریکە بخنکێ.

ئیراز و خەجیج لەوە کە حەمەد یاغی بووە خۆشحاڵ بوون. چاویان لە چاوی یەکتر کردو بە چاو لە نیازی دڵی یەکتر حاڵی بوون.

وەختێك چاویان بە رەنگی دایە کەوت, وەختێك دیتیان دەڵێی ئێستا نا ئێستا دەخنکێ, ترسان.

خەجیج کەوتە پەتە پەت:

"چ بووە دایە گیان."

دایك:

"مەپرسە کچم... خەبەرێکی ناخۆشم پێیە. بەڵام ئیشەڵڵا درۆیە. ئەمڕۆ بیستم رۆڵە... دڵم نایە بیڵێم... ئەمڕۆ بەیانی بیستم... ئەمڕۆ بەیانی... ئەمڕۆ بیستم کە... بەڵام دڵم نایە بیڵێم کچم... بیستم کە لە سەر یەکێك لە ئاغاکانی ساچی کاراڵی, حەمەدو دۆردووە شێت بەشەڕ هاتوون... دەڵێن دۆردووە شێت لەگەڵ یەکێك لە هاوکارەکانی تفەنگیان لە حەمەد داوە... ئەو جۆرە کە دەیانگوت کچە شیرنەکەم, حەمەد پێشی دۆردووە شێتی گرتوەو نەیهێشتوە ئاغای ساچی کاراڵییەکان بکوژێ. ئەویش تەقەی لە حەمەد کردوە. ئەمڕۆ سوارێك بە نێو ئاوایی دا رابردوە... ئەو خەبەرەی داوە... دەڵێن سوارەکە لە عەشیرەتی ساچی کاراڵی بووەو بە هاواری ئاغاکەیانەوە چووە... دەڵێن سوارەکە چەند ریز فیشەکدانی پێوە بوون... دەڵێن دوو تفەنگیشی پێ بوون. دەڵێن ئەسپەکەشی شەڵاڵی خوێن بووە... دێهاتییەکان خەبەریان بۆ هێنام... ئەو سوارە خەبەری داوە کە حەمەد بریندارە..."

خەجیج لە پێش دا وشك بوو. پاشان دەستی ئیرازی گرت, خۆی لە باوەشی ئەو هاویشت و دەستی کرد بە گریان و لەخۆدان:

"دیتت چیم بەسەر هات پووری؟."

دایك:

"ئەمن دەڕۆم کچم. سبەی دوو سبەی سۆراغێك دەکەم و دێمەوە لات. خەبەری حەمەدت بۆ دێنم. لەکۆڵە پشتەکەدا رۆن و نان و هێلکەم بۆ هێناوی. جاری دوایەش بۆت دێنم. دوعا بکە ئەو کافرە نەیەتەوە ئاوەدانی. وریای کۆڵە پشتەکە بە, ون نەبێ. خوا بتان پارێزێ. ئەمن رۆیشتم..."

وەختێك وەڕێ کەوت, لە دڵی خۆی دا دەیگوت:

"نەدەبوو پێی بڵێم... بریا زمانم لاڵ بووایە."

خەجیج بێدەنگ دەبوو و سەرلەنوێ بە هەنیسك دان دەگریا:

"دۆردووە شێتی کافر... کافری خوانەناس... چۆن بەزەییت بە جوانیی حەمەدم دا نەهات؟ ئاخر پیاو هاوکاری خۆی دەکوژێ؟... چۆنت دڵ هات دۆردووە شێت؟..."

ئیراز دڵخۆشیی دەدایەوە:

"ئەگەر یاغی بەڕاستی یاغی بێ، هەموو رۆژێ خەبەری کوژرانی بڵاو دەبێتەوە... خەڵك سازی دەکەن... باوەڕ مەکە... باوەڕ مەکە..."

بەڵام خەجیج گوێی لەم قسانە نەبوو:

"ئەمن ئیدی ناتوانم بژیم. پاش حەمەدم ئەمن ئیدی ناتوانم زیندوو بمێنم"

ئیراز تووڕە بوو:

"شێتە... لە کوێ دەزانی کوژراوە؟... بۆ زیندووی مەگری، فەڕی باش نیە... شتی خراپ بە دڵی خۆت دا مەهێنە... ئەمن وەختێك منداڵ بووم... نا، نا... بە جحێڵی لانی کەم بیست جار خەبەری مردنی ئەحمەدەزلەم بیست، بەڵام ئێستاش کە ئێستایە ئەحمەدەزلە ماوە."

خەجیج:

"پوورێ گیان... ئەم لەو یاغییانە نیە... حەمەد تازەکارە... کۆڵێیە... ئەمن ئیدی پاش حەمەد ناتوانم بمێنم."

ئیراز:

"کەرە... چما نازانی یاغییەکان جاروبار هەر بۆخۆیان خەبەری کوژرانی خۆیان لەزاری خەڵك داوێن؟... گوێت لێنەبوو دایکت دەیگوت چی؟... دەیگوت ریش بزن وەختێك خەبەری بیست کە حەمەد یاغی بووە، لە ترسان نەوێرا لە دێی دا وەمێنێ. لەوانەیە حەمەد ئەو خەبەرەی هاویشتبێتە سەر زارو زمانان بۆ ئەوەی ریش بزن بە خاترجەمی بگەڕێتەوە دێی. هەر دەشبوو ئەم کارە بکا. ئێستا دەی بینی... وەختێك ریش بزن بێتەوە دێ، ئەودەم حەمەد دەچێتە سەری و دەیکوژێ. ئەمە فێڵێکە حەمەد کردوویە. بە خۆڕایی مەگری."

خەجیج:

"حەمەد کاری وا ناکا پوورێ گیان... ئەمن ئیدی دوای حەمەد ژیانم بۆ چیە؟."

لە پاشان وەك تووشی نۆبەتی بووبێ، دەستی کرد بە لەرزین و هەڵچۆقان. ئیراز لە باوەشیی کردو هێنایەوە سەر جێیەکەی:

"سەبرت هەبێ... سەبرت هەبێ, کچە شێتەکەم... هەتا سبەینێ تاو هەڵدێ خوا دەزانێ چ روو دەدا... نەختێك سەبرت بێ... باوەڕ بە هەموو قسان مەکە..."

خەجیج دوو رۆژی تەواو وەك مردووان لە جێی دا کەوتبوو. لەچکێکی رەشی توند توند بە نێوچاوانێی ڕا بەستبوو. رەنگی وا زەرد هەڵگەڕابوو دەتگوت بەهێیە. زەردو بێ گیان.

پاش ئەم خەبەرە, ئیدی خەجیج رەنگی وەبەر نەهاتەوە. رۆژ لە رۆژ زەردترو لاوازتر دەبوو. ئیدی خەو نەدەچووە چاوانی. هەتا بەیانی لە جێی دا سەری وە ئەژنۆی دەکردو دەگریا.

ئیرازیش لەگەڵی بەخەبەر دەبوو. ئیدی شەوانە پێکەوە قسەیان نەدەکرد. بەڵام ئیراز جاروبار ئەوی دڵخۆشی دەدایەوە:

"ئێستا دەیبینی کچە شێتەکەم... دەیبینی... بەم زووانە خەبەری خۆشت لەلای حەمەدڕا بۆ دێ..."

بەڵام خەجیج هەر دەتگوت لەگەڵ ئەویشیان نیە.

## (١٤)

دوو رۆژ بــوو کــه بــه رۆژ لەجێیــەك خۆیــان دەشــاردەوەو بــه شــەو دەڕۆیــشتن. ئێــستا گەیشتبوونە بەرزاییەکانی کێوی "بەردەکاج" و گوێیان هەڵخستبوو. دەترسان دوژمن شوێنیان هەڵگرتبێت و داوێکی بۆ دانابن.

جەبار:

"مومکین نیه دوژمن لەبیری بچێتەوە. باش بزانە کە هەتا رقی خۆی بە ئێمە نەڕێژێ، شەوانە خەو لە چاوی ناکەوێ. چوار ساڵ لەگەڵی ژیاوم. دەیناسم. ئەمجار ئەجەلیشی هاتوە. هەربینا بیستت ئەم رۆژانە لێیان داو کوشتیان. بەڵام هەتا ئەو رۆژە نەگا مومکین نیه شوێنی ئێمە بەر بدا. ئەگەر ئێمەشی گیر نەکەوێ، باش بزانە کە لە داخان دەتەقێ و دەمرێ. ئێستا حەمەن بە دوامانەوەیە. بریا وای لێنەهاتایە، بریا..."

حەمەد:

"جەبار...، دەترسێی؟."

جەبار:

"نا...، بەڵام..."

حەمەد:

"بەڵام چی؟."

جەبار:

"دەمەوێ بڵێم لە کۆڵمان نابێتەوە."

حەمەد:

"قەیدی نیە, با بێ, جا دەیبینی."

جەبار:

"ئاخر ئەو وەك بنیادەمان نایە... لە جێیەك كە هەر فكریشی لێ ناكەیەوە بۆسەت بۆ دادەنێ و تەڵەت بۆ دەنێتەوە. ترسی ئەوەم هەیە بكەوینە تەڵەیەوە... دەنا ئەگەر پیاوانە بۆمان بێ شتێك نیە. یان بە ئێمە دەبڕێ یان بەو, هەر جۆر خوا حەز بكا..."

نایب رەجەب هەموو فكری چووبووە سەر خۆرەتاو كە خەریك بوو ئاوابێ، لەگەڵ كاجێك كە تیشكی دەمەو خۆرئاوا لە تلۆفكەكەی دابوو و سوور دەچوو. هەتاو خەریك بوو ئاوا دەبوو. نایب رەجەب وردە وردە سەری بەردایەوە. هەتاوی سەر كەلەپۆ دەم و چاوی و ئەو كۆنە پەڕۆیانەی كە برینی ملی ئەویان پێ بەسترابوو، نوور باران دەكرد.

نایب رەجەب قسەی جەباری دووپات دەكردەوە:

"یان بە ئێمە دەبڕێ یان بەو... هەر جۆر خوا حەز بكا."

دووبارە چاوی بڕییەوە تلۆفكی كاجەكە.

جەبار:

"كاك حەمەد، نەكا دڵت لێم ئێشابێ؟."

حەمەد:

"نا كاكە... دڵم بۆ دێشێ. لەوانەشە حەقی تۆ بێ... ئەمنیش پێم وایە دۆردوو دەستمان لێ هەڵناگرێ و هەر بەدوامانەوەیە..."

جەبار:

"دەمەویست بڵێم كە دەبێ وشیار بین. خوا دەزانێ چ روو دەدا. نابێ لە نەخافڵ تێكەوین..."

حەمەد:

"قسەی تۆیە. خوا دەزانێ چ روودەدا."

نایب رەجەب:

"كوڕینە... گوێتان لێ بێ دەڵێم چی. دەزانن ئەمن لەم كێوانە چ شتێكم زۆر خۆش دەوێ؟..."

حەمەد زەردەیەكی هاتێ:

"ئێمە چووزانین؟."

نایب ڕەجەب:

"وەختێک هەتاو ئاوا دەبێ، ئیشکەکەی شیخاڵ شیخاڵ دەبێ و دەکەوێتە سەرداره کاجەکان. ئەمن ئەوەم زۆر پێخۆشە."

هەتاو ئاوابوو. تاریك داهات. مانگ حەوت و هەشت شەوە بوو. زۆر نەدەمایەوەو زوو ئاوا دەبوو"سێبەرەکان تێکەڵ دەبوون. دەوروبەر بە باشی نەدەبینرا.

جەبار:

"با وەرێ کەوین؟."

حەمەد هەستایە سەر پێ:

"ئەدی، بابڕۆین."

نایب ڕەجەب:

"ڕاوەستن کوڕینە. دەقیقەیەك چاوەڕوانی من بن."

نایب ڕەجەب پاش ئەم قسەیە هەستاو چووە بن دارێك. پاش چەند دەقیقە گەڕایەوە:

"وەختێك دنیا تاریك بوو، دیتم شتێکی سەوز لەبن بەردەکەدا دەترووسکێ. چووم بزانم چیە... تۆمەز خەنەتیلکە بووە."

جەبار پێکەنی. حەمەدیش مەسەلەکە تێگەیشت و پێکەنی:

"نایب ڕەجەب... لە تاریکایی دا خەنەتیلکە تروسکەی دەدا؟... ئەویش تروسکەیەکی سەوز... ئەرێ؟..."

نایب ڕەجەب زۆر بەجیددی وەڵامی دایەوە:

"ئەمنیش پێم سەیرە. ئێوەش ئەگەر حەز دەکەن، بچن بیبینن."

حەمەد:

"باشە، ئەگەر بۆخۆت لە تەماشای وەڕەز بووی، بابڕۆین."

نایب ڕەجەب:

"پێم خۆش بوو پترم تەماشا کردبایە، بەڵام کارمان هەیە..."

حەمەد:

"ئەدی، کارمان هەیە."

لەسەرەوژێری ئەو کێوە بەردەڵانە دەهاتنە خوار. دوو ڕۆژ بوو سەرتاسەر بە نێو بەردان دا ڕۆیشتبوون. ڕۆیشتنی چی؟ خۆیان ڕاکێش کردبوو. لەمڕۆ بەیانییەوە نان و پێخۆرەکەشیان تەواو ببوو. برسییان بوو. کەوشەکانیشیان دڕابوون. بەردەکان وەك بەردە سماتە کەوشەکانیانیان خوارد بوو. تەنیا سەرە کەوشەکانیان بە حاڵ وبال بە لاقانەوە مابوو. چەرمی بەری دەستیشیان داماڵرابوو. دەستیان خوێناوی بوون.

نایب ڕەجەب:

"دیسان دەبێ بڕۆین... دیسان دەبێ سەرگەردان بین... ئاخ بۆچی لەو شێتە بێنامووسە دەترسێن؟... ئەگەر گەیشتینە خوارێ با چاوەڕوانی بین بزانین چ ناماقوولێك دەتوانێ بکا، چ تەڵەیەکمان دەتوانێ بۆ بنێتەوە..."

حەمەد:

"قەڵس مەبە نایب، ئەوە دەچینە خوارێ."

نایب ڕەجەب:

"هەموو چەرمی بەری دەستانم ڕۆیشتوە... وا دەبرژێتەوە کە برینی گوللەی سەر ملمم لەبیر چووەتەوە... ئاخر ئەمن بەم دەستانە چۆن دەتوانم تفەنگ باوێم... جا دەڵێی توورە مەبە... ئاخر پیاو چۆن توورە نابێ؟..."

حەمەد:

"چاك دەبی نایب ڕەجەب... با بگەینە ئاوەدانی. دەڵێم بەری دەستانت بۆ دەرمان کەن و بۆت ببەستن."

جەبار:

"نایب چتە؟... ماشەڵلا... دەڵێی پیرێژنەی دۆ لێ ڕژاوی..."

نایب ڕەجەب توورە بوو:

"قەستەم بەخوا ئاگات لە زاری خۆت نەبێ، هەر لەوێ لەگەڵ عەرزی لێکت دەدرووم... تێگەیشتی؟..."

حەمەد:

"جەبار وازی لێ بێنە.؟

جەبار قاقا پێکەنی.

نایب ڕەجەب بە پێکەنینی جەبار بە جارێك دەهری بوو:

"دایك حیزه بنیادەم نیه خۆ..."
حەمەد دەیەویست هەرا ساز نەبێ:
"ئێستا دەگەینە خوارێ نایب رەجەب..."
نایب رەجەب:
"بەو دایك جندەیە بڵێ چەقە چەقێ نەكا. دەنا خوا ئاگاداره دەیكەمە كولەكەی كەوباران."
پاش ئەم قسەیە جەبار غاری دایە لای نایب رەجەب، دەستی ماچ كردو لەسەر سەری داناو بە پێكەنینەوە گوتی:
"ئیدی ئاشت بووینەوە..."
نایب رەجەب نەختێك ئارام بووەوە:
"ئەمن لەگەڵ كەسێك كە ناوی حەڵاڵی وێنەكەوتوە، ئاشت نابمەوە."
حەمەد بۆ ئەوەی باسەكە بگۆڕێ، پرسی:
"نایب... تفەنگەكەت فیشەكی لەبەردایە؟."
نایب بە قەڵسی جوابی دایەوە:
"لە بەری دایە."
حەمەد:
"زۆر باشە."
نایب رەجەب:
"دەمەوێ هەر پێنج فیشەكەكە لە مێشكی عەبدی خانی بێ شەرەف بەتاڵ بكەم... دەمەوێ لە مێشكی ئەو بێناموسەیان بدەم كە ئەو هەموو زوڵمە لە فەقیر و هەژاران دەكا..."
حەمەد:
"ئیشەڵلا پێكەوە... ئەمن ئەگەر بەدەستی خۆم نەیكوژم دڵم ئۆقرە ناگرێ."
حەمەد داخ لە دڵانەی بیر دەكردەوە. كوشتن... لەنێو بردنی كەسێك... ئەمانە لەو كارانە بوون كە ئێستا لە دەستی دەهاتن... ئەو فیشەكانەی هاتەوە بیر كە لە لێڕەوار پێیەوە نابوون. گیان دەرچوونی وەلیی وەبیر هاتەوە. وەبیری هاتەوە كە چۆن لەنێو قوڕ و قاڵ دا چەنگەكرەی دەكرد... بەڵام ئەمانە بە پیاوكوژی دانانرێن. كاتێك ئەو لە

دارستان دا تەقەی لێ‌کرد بوون هەر بەفکریشی دانەهاتبوو کە خەریکە کەسێك دەکوژێ. کاریگەرترین رێگا بۆ ئەوەی گیانی خۆی رزگار بکا، هەر ئەمە بوو... بەڵام ئێستا بۆخۆی دەیویست کەسێك بکوژێ، بەدەستی خۆی دەیەویست ژیانێك لەنێو بەرێ... دەیەویست یەکێك کە زیندووپە، رقی هەیە، بزووتنەوەی هەیەو ئەوینی هەیە، لە ژیان بێ بەش بکا. کاتێك ئاوای بیر دەکردەوە، هەستی دەکرد زۆریشی حەق نیە. ئەو دەیزانی بیر بکاتەوە... بیر کردنەوە بە درێژی و پانی و قووڵی... نایب حەسەن لە شاری هێندێك شتی فێر کرد بوو، لەوانەیە بیر کردنەوە لە ئەوینیش ئەو فێری کرد بێ... ئەگەر عەبدی نەکوژێ چ دەبێ؟..." تاوێك ئەم خەیاڵە سەرسەرەکی بە دڵی دا تێپەڕی. پاشان، لەو شتە سەرسەرەکیە زۆر ترسا. هەوڵی دا ئەو خەیاڵە سەر سەرەکیە لە دڵی خۆی بەرێتەدەر. بەڵام هەرچەند تێدەکۆشا، فکر بەری نەدەدا. لە دڵی خۆی دا گوتی:"ئێستا با بگەینە دێ..."

لە پڕ هاواری نایب رەجەب بەرز بوو:

"فریام کەون."

نایب رەجەب ویستبووی لە گابەردێکەوە باز داتە گابەردێکی دیکە. نەیتوانیبوو و ئێستا دەستی بە رەگە دارێك گرتبوو و هەڵواسرابوو. گەیشتنە فریای و نایب رەجەبیان گرتەوە.

نایب رەجەب بێزارو شەکەت بوو:

"ئاخر کەنگێ دەگەینە خوارێ؟."

حەمەد:

"شتێکی وامان نەماوە... ئێستا دەگەینێ."

وەختێك مانگ لە کێوەکەی رووبەروویان ئاوا دەبوو، گەیشتنە دەشتێ.

نایب رەجەب:

"باشە... ئاسوودە بووین. هێندەی نەمابوو لەسەر گابەردەکە هەڵدێرێین و بە هیلاك بچین... ئێستا ئەگەر دۆردووە شێت لە گیانی خۆی وەڕەز بووە، بابێ... هەر تەڵەیەك پێی دەکرێ با بۆمان دانێتەوە... ئەگەر پیاوە بابێ گەووادی شێت و شوور... ئێستا دەبێ لێرە ئەختێك بحەسێینەوە... بەری دەستانم وا دەبرژێتەوە مەپرسە..."

بەرە دەست و لاق و ئەژنۆی ئەوانی دیکەش دەبرژانەوە. حەمەد لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"عەبدی حەقی خۆیەتی بکوژرێ..." ئەو رۆژەی وەبیر دەهاتەوە کە جوانەگایەکەی

لێنەستاندبوون... ئەو ڕۆژانەی وەبیر دەهاتەوە کە لە گەرمای سەختی ئاسیاب چەشمەدا ڕۆژ تا ئێواری لەنێو چەقڵەشینکە دا جووتی لێدەخوری... جێگای برینی چەقڵەشینکە لە سارد و سەرمادا دەتگوت ئاورە لە لاق و لەتەرانی بەربووە. هەموو ئەوانەی وەبیر دەهاتەوە. برژانەوەی ئەم برینانە لە سارد و سەرمادا بنیادەمی بێهۆش دەکا. تەواوی سەردەمی منداڵیی خۆی کە وەك ژەهرە مار تاڵ بوو، وەبیر دەهاتەوەو لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"عەبدی حەقی خۆیەتی بمرێ... ئێستا بابگەینە ئاوەدانی."

جەبار نقورچێکی لە حەمەد کوتا:

"چتە حەمەد... دیسان لەگۆ فکرو خەیاڵان ڕا چووی؟..."

حەمەد بە شەرمەزارییەوە جوابی دایەوە:

"شتێك نیە."

جەبار:

"هەستێ بڕۆین... ڕۆژمان لێبێتەوە کارێکمان بۆ ناکرێ."

حەمەد:

"ئەرێ، ڕاست دەکەی."

هەستان و وەڕێ کەوتن. پاش چارەکە سەعاتێك گەیشتنە دڕووەڵانی چەقڵەشینکە.

نایب ڕەجەب:

"وەی دایە گیان، وەی... سەد شوکور بە بەردەکان... ئەم چەقڵانە وەك سەگی هار لە لاق و لەتەری پیاوی بەردەبن."

حەمەد:

"ئەمە ئەو دڕووەڵانەیە کە باسم دەکرد... ئەو جێیەیە کە ئەمن جووتم لێدەکرد."

نایب ڕەجەب:

"وەی دایە گیان، وەی."

جەبار:

"ئەوە دەڵێی چی حەمەد؟... گاسن چۆن لەو چەقڵانە دەچێ؟... ئێرە دڕووەڵان نیە، لێڕەوارە..."

"وەی دایەگیان، وەی."

حەمەد:

"ئەرێ، لێرەوارە."

جەبار:

"پاش ئەو بەردەڵانە، هەر دەبوو بگەینە دڕووەڵانێکی وا. بڕوانە ئەو شانسە..."

نایب رەجەب:

"وەی دایەگیان، وەی... چ شانسێکی هەیە حەمەدۆك... وەی دایەگیان... وەی."

رادەوەستان و پشوویەکیان دەدا. لاق و لەتەریان خوێنی لێدەچۆڕا. حەمەد جنێوی دەدا. ڕاست ئەو جنێوانە کە بە منداڵی بەو چەقڵانەی دەدان، ئێستا دووپاتی دەکردنەوەو کەیفی بەو دووپات کردنەوەیە دەهات. ئەو زۆربەی ئەو جنێوانە لە دورسوون فێر ببوو. داخوا ئێستا دورسوون لە کوێ بوو؟...

"وەی دایەگیان، وەی."

چەقڵە شینکە لەبن پێیان خشەی دەهات، خشە خشێکی قورس و بە ژان... لە بێدەنگی شەوێدا، ئەم دەنگە لە مەودای زۆر دووریش ڕا دەبیسرا.

"وەی دایەگیان، وەی."

جەبار:

"سەد خۆزگە بە چەقڵەکان... ئەم خیزە وردە لە چەقڵەکانیش پیسترە."

حەمەد:

"ئێرە ڕاست ئەو جێگایەیە کە ئەمن جووتم لێدەکرد... ڕاست ئێرەبوو..."

"وەی دایەگیان، وەی."

دەنگی کەڵەشێر لە دوورەوە هات. لەلای جنوب ڕا... دەنگی کەڵەباب نەدەپسایەوە، هەروا دەیان خوێند و چەند بڵێندیشیان دەخوێند... پاشان لە ڕووبارێك پەڕینەوە. بەردەکان لەبەر پێیان دا دەخزین. چەقڵەشینکە لەم بەر تیژترو زۆرتر بوو.

"وەی دایەگیان، وەی."

وەختێك لە چۆمی پەڕینەوە، چناری پیر کە وەك تارماییەکی ڕەشتر لە شەوەزەنگ بە تاریکایی شەوەوە نووسابوو، لە ڕووبەڕوویان دەرکەوت. بەرەو چنار چوونە پێش. کاتێك گەیشتنە پشت چنارەکە، لە نەکاو دەنگی ئاوەکە وەك دەنگی تۆپ تەقی.

"وەی دایەگیان، وەی."

حەمەد:

"گەیشتینە ئاوایی. با بچین لەسەر ئەو کانییە دەست و چاومان بشۆین... سبەینێ، یەکێ جووتێك کاڵەتان بۆ پەیدا دەکەم کە کەیفی پێبکەن..."

چوونە قەراغ ئاوەکە. کەوشەکانیان داکەند. لنگیان لە ئاوێ ڕاکردن.

نایب ڕەجەب:

"وەی دایەگیان، وەی."

جەبار:

"بەسە ئیدی نایب ڕەجەب، هێندە مەنەقێنە... لەنێو چەقڵەکانیش هاتینەدەر."

نایب ڕەجەب:

"ئەمن بە عومری خۆم دڕووەڵانی وام نەدیوە. وەی دایەگیان، وەی."

حەمەد:

"ئێرە پێی دەڵێن سەرچاوە..."

ئەو ڕۆژانەی بیر کەوتەوە کە لە ئاسیاب چەشمە هەڵاتبوو و چووبووە لای سلەمان. دایکی وەبیر هاتەوە کە چەند حەوتوو لەسەر ئەم کانییە دانیشتبوو و چاوی لەسەرچاوەکەیەوە بڕیبوو، بەو هیوایە کە تەرمەکەی لەژێر شاخەکە بێتەدەر و بکەوێتە سەر ئاو... دایکی وەبیر هاتەوە. بۆ هەزارو یەکەمین جار لە دڵی خۆیدا گوتی:

"خوا دەزانێ چ بەڵایەکیان بەسەر دایکم هێناوە."

لە جەباری پرسی:

"جەبار... ئەتۆ دەڵێی چ بەڵایەکیان بەسەر دایکم هێناوە؟."

جەبار:

"هیچیان لێنەکردوە."

نایب ڕەجەب:

"وەی دایەگیان، وەی... ئێرە کوێیە خوایە گیان..."

حەمەد:

"ئێرە پێی دەڵێن سەرچاوە... ئاشەکە بەرەژێرترە... ئاشەوانەکەشی سمایل گوێ براوە..."

جەبار:

"بڕوانـە حەمـەد... پـێش ئـەوەی بـچینە نێـو دێ، بـاش وایـە بـچینە ئـەوێ و خەبـەرێك بزانین... دڵم خەبەر دەدا کە وا باشترە..."

نایب ڕەجەب:

"وەی دایەگیان، وەی."

جەبار:

"توخوا لـێوەبڕە نایب..."

حەمەد:

"ڕاست دەکەی... باشتر وایە بچینە لای سمایل گوێ بڕاو و خەبەرێکی لـێوەرگرین."

جەبار:

"ئەرێ، وا باشترە... پیاو نابێ بێخەبەر و بەچاو بەستراوی بچێتە هیچ دێیەك و هیچ جێیەك."

نایب ڕەجەب:

"ڕاست دەکا... دیارە ئەو سـەگبابە ناقۆڵایـە ئەقڵیـشی هەیـە... وەختێـك یـاغی بـووی، دەبێ بەردو دار و گورگ و ڕێوی و مارو مێروو بە دوژمنی خۆت بزانـی. دەبـێ هۆشـت بەسـەر هەموو شتێکەوە بێ. دەبێ پێت وابێ لەبن هەموو تەختە بەردێك یەکێك بۆت لە بۆسەدایە... ئەتۆ هێشتا تازەکاری حەمەد, بـەڵام ماشـەڵڵا لـەزۆر کـەس لێـزانتری. ئـەتۆ تاقیکردنـەوەت کەمە, بەڵام لە جیاتیان بەهۆشی. دەبێ فکری هەموو شتێکت هەبێ."

ڕاست بوونەوە. ڕووناکایی‌یەك بە ئەندازەی پڕنچکێك لە دووری هەڵدەبوو و دەکووژایەوە.

حەمەد:

"ئەو شۆقەی دەبینن؟... ئەوێ ئاشی سمایل گوێ بڕاوە."

کاتێك لە ئاشی نیزیك دەبوونەوە, دەنگی سەوەڕیشیان هاتە بەرگوێ.

جەبار:

"پێم وایە ئەمانە سەگی گوندین..."

حەمەد:

"بەڵێ, دەنگیان دەگاتە ئێرە..."

هاتن لە پشت دەرکی ئاشی ڕاوەستان. سمایل گوێ بڕاو کە گوێی لە هەستی پێیان ببوو, لە ژووری ڕا بانگی کرد:

"کێیە؟."

حەمەد:

"منم، حەمەدۆکم... کوڕی برایم."

ماوەیەکی زۆر لە ژووریَ جوابێك نەبوو. پاشان دەنگی سمایل گویَ بڕاو هات:

" حەمەدۆك لێرە چ دەکا؟ درۆیە... حەمەدۆك دۆردووە شێت کوشتوویە... هەر دوێنیَ بوو کە خەبەری هات."

بۆنی ئارد لەو شەوەدا بلاّو دەبووەوە. پێیان وابوو ئێستا لە عەمباری ئاردی دەکەون.

دەنگی ئەو ئاوە کە ئاشەکەی پیَ دەگەڕا، دەتەقیەوەو بەسەر شەودا پان دەبووەوە.

حەمەد:

"مام سمایل، ئەمن نەمردووم... چما دەنگم ناناسی؟."

سمایل:

"دەنگتم ناسی...، ناسیم... ئێستا دێم دەرگاکە دەکەمەوە."

سمایل خێراو بە دەنگ و هەراوە دەرگای کردەوە. وەختێك دەرگا کرایەوە، شۆقی لەرزۆك و نارنجیی ئاگرەکە لە سەروچاویانی دا. سمایل ماوەیەك لە سەروچاوی حەمەد ورد بووەوە:

"حەمەدۆك... ئاخرەکەی ئەو کافرەت نەکوشت کە عالەمێك لە دەستی رزگار بکەی."

حەمەدۆك زەردەیەکی هاتیَ. چوونەژوور.

لەنێو ئاگردان دا بلێسەکان لێك دەهالاّن و جار جار هەتا سەر زەوی لار دەبوونەوە. بۆنی ئارد ئێستا توندتر دەهات. ملی درێژو بە چرچ و لۆچ، دەم و چاوی درێژو ریش و برۆو کلاّوە کۆنەکەی سمایل گویَ بڕاو لە ئاردی دا ون ببوون. کاتێك چاوی بە دەست و قاچی میوانەکان کەوت، ترسا. پرسی:

"چیتان بەسەر هاتوە؟"

حەمەد زەردەخەنەیەکی کرد:

"لەگەلّ دۆردووە شێت شەڕمان بوو. ناچار بووین دوو رۆژان بەنێو بەردەلاّن و شاخ و داخ دا بەریَ دا برۆین."

سمایل هەلّتروشکاو پالّی وەدیواری دا:

"دوێنیَ سوارێك بەنێو دێی دا رابردبوو. دەلّێن چووەتە شەڕی دۆردووە شێت. ئەو خەبەری دابوو کە دۆردوو تۆی کوشتوە... هەموو خەلّکی دیَ تازیەیان داگرتبوو، حەمەد... دەزانی دێهاتی‌یەکان چەندیان خۆش دەویَی؟."

پاشان دەستی بەسەری حەمەد دا هێنا:

"حەمەد... باوەڕ بە چاوی خۆم ناکەم... ئاخر چۆن ئەم هەموو فیشەك و فیشەکدانەت لە خۆ شەتەك داوە؟... چۆن قەوەتت پێ دەشکێ ئەوەندە فیشەك و چەك و چۆڵە لەگەڵ خۆت بگێڕی... بەم وەزعەوە هەر باوەڕ ناکەم ئەتۆ حەمەدۆکی خۆمان بی... ئەمن هەر ئەو حەمەدۆکەم لەپێش چاوە کە بە دوای گاجووتەکانەوە هەر دەکەوت و هەڵدەستایەوە... دەڵێی دوێنێ بووە. باوەڕ ناکەم."

حەمەد:

"دەبێ باوەڕ بکەی... بەرخ هەر لەبن سەوەتەی دا نابێ."

سمایل:

"حەمەمن ئێستا زۆرتان برسییە... با هەستم پارووە نانێکتان بۆ دانێم."

سمایل هەڵستا. چاوی لە ئاگرەکەوە بڕی و چەند لەحزەیەك راوەستا. زەردەیەکی هاتێ:

"ئاورەکەش چەند چاکی گرتوە..."

سمایل پشتی چەمابووەوە. حەمەد پێی سەیر بوو. حەمەد پێی وابوو سمایل هەر ئەو سمایلەیە کە بە منداڵی دیویەتی، هەروا جحێڵ و بەتاقەتە... حەمەد بە ترس و نیگەرانییەوە پرسی:

"خەبەری دایکم و خەجیج چیە؟... عەبدی لە کوێیە؟... لە ماڵێیە؟."

سمایل لە جێی خۆی رەق بوو. نە قسەیەکی کردو نە رۆیشت و نە دانیشت. ئەو چاوەڕوانی ئەم پرسیارە بوو. هەر دڵی لە دڵ دەدا کە ئێستا نا ئێستا دەپرسێ. تازە کار لە کار ترازابوو. سمایل گێژو واق وڕماو تەماشای دەوروبەری خۆی دەکرد کە حەمەد پرسیارەکەی دووپات کردەوە:

"لە دایکم و ..."

سمایل کەوتە پەتەپەت:

"باشن، باشن... ئێستا دێم پێت دەڵێم ئەو کافرەش لە کوێیەو چ دەکا... سەبر کەن جارێ کەمێك خوێراوکتان بۆ بێنم دەست و لاقتانی تێخەن."

حەمەد کە هەر لە پێشداش نیگەران بوو، لە "باشن، باشن..."ی سمایل زیاتر وەشك کەوت. سمایل بە لەگەنێک خوێراوکی شیلەو گەرمەوە گەڕایەوە:

"دەست و لاقتان لە خوێراوك خەن... دەست و قاچتان بەرد هەڵدر هەڵدڕی کردوون. برینەکانیان زۆر خراپ دەبرژێنەوە... خوێراوکیان زۆر بۆ باشە."

حەمەد:

"بەم زووانە دایکمت دیوە؟..."

سمایل:

"پێم گوتی کە باشن... لێم گەڕێ با باسی عەبدیخانی کافرت بۆ بکەم... وەختێک ئەو کافرە بیستی کە چوویە گەڵ یاغییەکان، لە ترسان دەرپێیەکەی زەرد کرد. هەموو شەوێ خوا داینـاوە پێنج کەس، شەش کەس، دە کەس ئێشکیان لـە ماڵەکـەی دەگـرت، بـەو حاڵـەش لـە ترسان خەوی نەبوو، هەتا لە نەکاو ون بوو. ڕەنگ و ڕوویەکی هەڵێنابوو چاوتان پێی کەوتبایـە لێی دەترسان. ترس بنیادەمی چۆن دەگۆڕێ!... ئێستا حەتمەن خەبەری کوژرانی تۆی بیستوەو هاتوەتـەوە دێـی... دەڵـێن دەستو پێوەنـدەکانی وەختێـک خەبـەری کـوژرانی تۆیـان بیستوە، کردوویانەتە جێژن... حەقی خۆشیان بووە بیکەنە جێژن، چونکە دەتناسن."

دڵی حەمەد کەوتبووە پەلەپەل. لە جێی خۆی دا بەند نەدەبوو. دەیەویست هەرچی زووتـرە خۆی بگەیەنێتە نێو دێ:

"یاڵڵا هەستن کوڕینە... هەستن بڕۆین تا پێش پارشێوان بگەینە ئاوایی."

جەبارو نایب ڕەجەب دەیانزانی حەمەد دەڵێ چی. هەردووکیان بێ ئـەوەی قسەیەک بکـەن، کاڵەکانیان دەپێ کردو بەن کاڵەیان توند کردو هەستان.

سمایل:

"چێشتەکەتان لەسـەر ئـاگرە، نـەختێک ڕاوەسـتن ئێـستا گـەرم دەبێتـەوە. خوێـراوک بـۆ برینەکانتان باشە، لە دێش بلێن بۆتان وەگرن."

حەمەد لە پێشەوەو ئەوانی دیکـە بـە دوای دا لـە ئاشـی وەدەر کـەوتن. پێـنج شـەش هەنگاو ڕۆیشتن، دیسان کەوتنەوە نێو چەقڵەشینکە. نایب ڕەجەب دیسان دەسـتی کـردەوە بە وەی، وەی...

ئەسـتێرە لـە ئاسمـان دا بریـسکەی ئاوییـان دەدا. نایـب ڕەجـەب ڕووی بـەرەو خۆرهـەڵات وەرگێڕاو میزی کرد:

"ئەستێرەی من هێشتا هەڵنەهاتوە... ئێستاش زۆرمان ماوە بۆ پارشێوان."

ئەوانی دیکە جوابێکیان نەدایەوە. ئێستا بزرانەوەی لاق و دەستانیان کەمتر بوو.

ڕێوییەکیان لەبەر پێیان دەرپەڕی. ئەگەر لە نیزیک ئاوەدانی نەبوونایە، نایـب ڕەجـەب بـە خزمەت مام ڕێوی دەگەیشت، بەڵام چارە چ بوو؟ خـەریک بـوون لـە ئـاوایی نیزیـک دەبوونـەوە.

ڕێـوی کلکـە زل و تووکنەکـەی بەسـەر چـەقڵان دا ڕادەکێـشاو هـەڵدەهات. دەتگـوت شـۆقی ئەستێران مووەکانی سیخوار باران دەکا.

جەبار:

"کاکە حەمەد؟."

حەمەد:

"ئێستا دەگەینێ. دێ ئا لەو خوارەیە."

کاتێك لە یەکەم ماڵی ئاوەدانی نیزیك بوونەوە، چەند سەگی زەلامیـان بـۆ هـاتن. حەمـەد سەگەکانی لاواندەوە. سەگەکان حەمـەدیان ناسـیەوە لـەبن پێـی دا دەسـتیان کـرد بـە کلکـە سووتە.

بەنێو دێی دا تێپەڕین. چوونە لای ماڵی حەمـەد. دێ چـۆڵ و بێـدەنگ بـوو. حەمـەد لـەم وەختانەدا هەرگیز دێیەکەیانی ئاوا چۆڵ و بێ سروە نەدیبوو. نامۆیی کرد. چاوەکانی بـە دوای دێهاتییەکان، مریشکەکان، ئەوانەی دەچوونە سـەر کـارو کاسـبی...، و بـە کـورتی بـە دوای زیندەوەرێك دا دەگەڕان.

بەسپایی لە دەرکەی دا. گوێی هەڵخست. دەنگێك نەهات. چەند جاری دیکـە لـە دەرگـای دا. دیسان دەنگێك نەهات. نەیتوانی پێشی خۆی بگرێ. خۆی گەیاندە پەنجەرە چـکۆڵەکە. بـە دەنگێکی نزم بانگی دایکی کرد:

"دایە...، دایە..."

دیسان دەنگێك نەهات. گوێی بـە دەلاقەکـەوە نووسـاند. هـەموو ئەنـدامی لەشـی ببوونـە گوێ، بەڵام لە ژووری، جگە لە دەنگی جڕو جانەوەر کە دارەکانیان دەجوی، دەنگێك نەدەهات. کرم دارەکانیان دەجوی. نیگەرانییەکەی زیاتر بوو. بەڵام دوا تیشکی هیوا هێـشتا لـە دڵـی دا نەکووژابووەوە.

ڕووی لە جەبارو نایب کردو بە دەنگێکی قیناوی گوتی:

"دایکم لە ماڵ نیە..."

فکری کردەوە. وەبیری هاتەوە کە دایکی لە ئاوەدانی دا "عـەلی دورمـووش"و ئـەوانی لـە هەموو کەس خۆشتر دەویست. عەلی دورمووش دەبێ حـەفتاوپێنج سـاڵێك تەمـەنی بـێ. ئـەم دواییانە پشتی کۆم ببووەوە، بەڵام وەك پیاوێکی پەنجا ساڵە توندو تۆڵ و لە سەرخۆ بوو:

"گەیشتینێ، ماڵی مام عەلیم ئێرەیە."

له پێش ماڵی عەلی دورمووش رەشایی سەگێکی زەلام دیار بوو. سەگەکە لەبەر دەرگا کەوتبوو. بە دەنگی پێیان سەرە زەلامەکەی هەڵبڕی. پاشان لەسەرەخۆ سەری لەسەر دەستانی دانایەوە.

حەمەد بە شەکەتی شانی بە دەرگاکەوە ناو بانگی کرد:

"مام عەلی دورمووش... هۆی... مام عەلی..."

لە ژووریّ دەنگە دەنگێك بەرز بووەوە.

دەنگی پیرانەو گەورەی عەلی دورمووش لە نێو دەنگەکانی دیکەدا بە چاکی دیار بوو. جار جار بێدەنگ دەبوو و سەرلەنوێ دەبیسترایەوە:

"بەخوا حەمەدە... راست دەنگی حەمەدە... وەڵلا دەنگی خۆیەتی."

نایب رەجەب داهاتەوەو بە سرتە بە حەمەدی گوت:

"دەنگتیان ناسی حەمەد... وەی دایە گیان، وەی."

لەو کاتەدا دەرگا کرایەوە. عەلی دورمووش بە توتی کراس و دەرپێیان فانۆس بەدەست وەدەرکەوت. ریشە سپییەکەی دەگەیشتە سەر ورگی. ئەوەندە گەورە دەهاتە بەر چاو دەتگوت ماڵەکە نایبا. کاتێك چاوی بە حەمەد کەوت، پێکەنی:

"لە کوێی حەمەد؟... ئێمە دوێنێ خەبەری کوژرانی تۆمان لە سوارێکی یووررووك بیست... سوپاس بۆ خوا کە ساغ و سلامەتی:

"کچینە... هەستن ئاوری بکەنەوە، دۆشەکێ راخەن، حەمەد هاتوەتەوە."

لە ژووریّ دەنگی تەپە تەپی دۆشەك راخستن هات. عەلی دورمووش وەپێش کەوت :

"فەرموون بۆ ژووریّ."

چوونە ژووریّ. جەبار نیگەران دیار بوو. لەوانە بوو دەستی لێدەی بگری. عەلی دورمووش ئەو فانۆسەی بەدەستیەوەبوو لە تەنیشت ئاورگەکەی داناو دانیشت:

"دەی، حەمەدۆك، بڵێ بزانم چۆنی، ئەحواڵت باشە؟... هەموو ئاوەدانی تازیەی بۆ داگرتبووی. وەختێك دێهاتییەکان بیستیان کوژراوی، هەموو ئاسیاب چەشمە تازیەی داگرت. خوا بکا خەبەری کوژرانت بە گوێی خەجیج نەگەیشتبێ. دەنا لە تاوان وەزگ دەدا. خەبەری خەجیجت بۆ دێ یان نا؟... بەستەزمان دایکت... بەڵام خەفەتێ مەخۆ. هەروا بزانە بۆخۆت لێرە بووی . بۆخۆم تەرمەکەیم هەڵگرت... بۆخۆم بەدەستی خۆم بە خاکم ئەسپارد..."

سەری هەڵبڕی. تەماشای روخساری حەمەدی کرد. رەنگی حەمەدی وردە وردە رەش هەڵدەگەڕا. عەلی دورمووش کەوتە پەلەقاژە. تێگەیشت حەمەد خەبەری نەبووە:

"چ بوو حەمەد؟... ناکا نەت بیستبێ؟...

جەبار چاوی پڕ بوون لە فرمێسك. نایب رەجەب تفەنگەکەی بەتاڵ کردو سەر لەنوێ پڕی کردەوە. حەمەد هەوڵی دا خۆی نەدۆڕێنێ. پرسی:

"خەجیج چی بووە؟."

عەلی دورمووش بەسەرو کەللەی خۆی دادەدا:

"قوڕ بەسەر منی بێعەقڵ... بریا زمانم لاڵ بایە...، ئاخر ئەمن نەمدەزانی کە نەت بیستوە... ئاخر چەند مانگە... وەرن قوڕ وەسەری من کەن..."

ژنی عەلی دورمووش لەو وەختەوە کە حەمەد و ئەوان هاتبوونە ماڵێ، هەتا ئێستا، هەروا بێدەنگ لەبەر ئاگردانەکە دانیشتبوو و چاوی بڕیبووە ئاورەکەو قسەیەکی نەکرد بوو. تەنانەت بەخێراتنی حەمەدیشی نەکردبوو. ئێستا تووڕە ببوو و بەگژ مێردەکەی دا دەهاتەوە:

"نەت توانی پێشی خۆت بگری؟... هەمیشە هەروای. راوەستابای هەتا کوڕەکە پاروە نانێکی دەخوارد. پاشان پێت گوتبایە. چما درەنگ دەبوو؟."

عەلی دورمووش:

"ئاخر ئەمن چووزانم... چەند مانگ رابردووە کە... چووزانم لەو چەند مانگەدا بە گوێی نەگەیشتوە."

دەنگی جۆرێك بوو دەتگوت دەگری:

"ببوورە حەمەد... پیرییە ئیدی..."

کوڕەکان و بووکەکان و نەوەکانی عەلی دورمووش و هەرکەس لەو ماڵەدا بوو، لەدەوری حەمەدو ئەوان کە لە دەوری ئاگردانەکە دانیشتبوون، کۆ ببوونەوە و تەماشای حەمەدیان دەکرد کە راست و چەپ فیشەکدانی لەخۆی دابوون، خەنجەری لەبەردابوو، دەمانچەو نارنجۆکی بە قەدیەوە بوون و دووربینێ لە مل دابوو. لە چاوی ئەمانەدا باوەڕ نەکردن و سەر سووڕمان و نەختێکیش گاڵتە پێکردن دەخوێندرایەوە.

لەنێو ئەو هەموو بنیادەمە زەلام زەلامەدا وایان دەهاتە بەرچاو کە حەمەد لاسای یاغییان دەکاتەوە.

حەمەد سەر لەنوێ پرسی:

"خەجیج چی بووە؟."
عــەلی دورمــووش نەیــدەتوانی جــواب بداتــەوە. ملــی بــەلاوە نــابوو و چــاوی لــە شــۆقی ئاگردانەکەوە بریبوو و هیچی نەدەگوت.
حەمەد وەرگەڕایەوە سەر خێزانی عەلی دورمووش، کە لەبەر لاوازی روومەتی تێقوپیبوون و لەژێر چارشێودا بسکی سپی و خەنە تێدراوی دەبینران:
"پووری... تۆ پێم بڵێ... خەجیج لەکوێیە؟."
ژنە بە دڵسۆزییەوە تەماشای چاوی حەمەدی کرد:
"ئاخر ئەمن چ بڵێم حەمەدی خۆم؟... ئەمن چووزانم؟..."
پیرێژن رەنگی بە روانەوە نەمابوو.
حەمەد:
"پووری... هەر چۆنێك بێ ئاخرەکەی یەکێك هەر پێم دەڵێ چی بووە."
پیرێژن مۆڕەیەکی وەهای لە عەلی دورمووش کرد کە دەتگوت دەیەوێ بیکوژێ:
"ئەمان لە دەستی تۆ... خوا دەزانێ ئەو کوڕە چەند رۆژە دەمی لە نانی نـەداوە... لێـت گەڕابایە پارووە نانێك لە گەرووی بچێتە خوارێ، ئەو وەخت پێت گوتبایە... چما دڵت دەتۆقی راوەستابای؟..."
پاشان هەستاو هات لە پەنای حەمەد دانیشت. دەستی لەسەر ئەژنۆی حەمەد دانا.
"بروانە حەمەدی من... هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم. عەبدی بریندار بوو، بریا گوللەی گەرم لەسەر دڵی راوەستابا و کوشتبای. وەختێك وەهۆش خـۆی هاتـەوە، شـاهیدە درۆزنـەکانی لەدەوری خۆی کۆ کردەوە. تەنیا ئەو عەلیـیە شـەلە بێدینـە، ئـەو بێدینـە کـە شـوێنی تـۆی هەڵگرتبوو، گوتبووی ئەمن شایەتی نادەم. وەختێك شەلە حـازر نـەبوو شـایەتی بـدا، عەبـدی خانیش دەستووری دا ئەویان لە دێـی دەرکـرد. ئـەویش پیلـی ژن و منداڵەکـەی گـرت و سـەر و سیپاڵی کۆ کردەوە، رۆیشت و رۆیشت. ئێستاش کەس نەیزانی بۆکوێ چووە..."
پاشان یەك یەك ناوی هـەموو ئـەو کەسـانەی بـرد کـە بـە درۆ شـایەتیان دابـوو و گـوتی خەجیجیش لە شاری لە زیندانی ژاندارمرییە. ئەمەشی لێ زیاد کرد کە بیستوویە بەم زووانە خەجیج لەدار دەدرێ.
هەر ئەو بریسکە وەك نووکە دەرزییە، دووبارە هاتەوە نێو چاوەکانی حەمەد. جەبار ئێستا ئیدی ئەو بریسکەیەی باش دەناسی. هەر وەخت ئەو بریسکەیە دەهاتـە چـاوەکانی حەمـەدەوە،

روخساری حەمەد جۆرێکی دیکەی بەسەر دەهات...، دەبوو بە پڵینگێک کە ئامادەیە ئامبازی نێچیرەکەی بێ.

حەمەد لەسەرەخۆ هەستایە سەرپێ:

"هەستن هاوکاران... دەبێ بچین مشووری ئەو عەبدییە بێناموسە بخۆین."

پاشان دەستی خێزانی عەلیی لەنێو دەستانی گرت و پرسی:

"پووری... دایکیشم ئەوان کوشتیان... وانیە؟..."

ژنی بەستەزمان چاوی پڕ بوون. نەیتوانی زار هەڵپچڕێ.

حەمەد:

"وانیە پووری؟..."

ژنە دیسان هیچی نەگوت.

حەمەد دەستی ئەوی بەرەڵا کرد:

"با بڕۆین."

حەمەد لە پێشەوەو جەبار و نایب بەدوای دا، لە تاریکاییدا ون بوون. حەمەد تفەنگەکەی بەتاقی کردەوە، پڕیوو:

"ئێوەش ئەگەر تفەنگەکانتان فیشەکیان لەبەردانیە، وەبەریان دەن. نارنجۆکەکانیشتان ئامادە بکەن."

نایب رەجەب لەو کاتەوە کە بەسەرهاتەکەی لە زمانی خێزانی عەلی دورموش بیستبوو، هەروا ددانی لە چیڕەوە دەبردن. سەری بە راست و چەپ دا دەسووڕاند و ددانی بە جەرگی خۆی دادەگرت. نایب رەجەب قۆڵی حەمەدی ـ کە بە نیوە غاردان دەڕۆیشت ـ گرت:

"گوێت لێبێ. نابێ روحم بە هیچ کەس بکەین. دەبێ ژن و منداڵەکەشی قیمە قیمە بکەین."

حەمەد:

"چۆنی تۆ بڵێی با وابێ، نایب."

قۆڵی لەدەستی نایب راپسکاند و وەڕێکەوت.

بۆخۆشیان نەیانزانی چەندی پێوەخراو چۆن گەیشتنە بەر دەرکی ماڵی عەبدی.

حەمەد:

"نایب ڕەجەب تۆ بانگیان کە، بلێ میوانتان هاتوە، بلێ پەیامێکمان بۆ هێناون."
نایب سێ جار توند لە دەرگای دا. دەنگی ژنێك لە ژووری را جوابی دایەوە:
"کێ بوو؟."
نایب:
"بیکەوە خوشکێ میوانم، پەیامێکم هێناوە. دەبێ زوو بیلێم و بگەڕێمەوە."
ژنە بە پرتەو بۆڵە هات و دەرگای کردەوە:
"لێرە ڕاوەستە کاکە، با چرایەکە هەڵکەم."
ژنە پاش ئەم قسەیە سەر لەنوێ چووە ژووری هۆدەکە. نایبیش لە دەرگاچوویووە ژوور. ژنە شەمچەیەکی لێدا.هۆدەکە ڕووناك بوو. لەو کاتەدا هەرسێکیان بۆلای ڕووناکاییەکە ڕۆیشتن. کاتێك ژنەکە لەبەر ڕووناکی چاوی بە سێ کەس کەوت تێك ڕابوو. تاوێك بە سەرسوڕمانەوە تەماشای حەمەدی کرد. پاشان زیڕەیەکی کرد. نایب ڕەجەب دەسبەجێ ژنەکەی گرت و زاری بەست. حەمەد بە ڕقەوە پرسی:
"عەبدی خان لەماڵێیە؟."
ژنە:
"نا... ئەو ئیدی نایەتەوە ماڵێ... ڕەبی بە قوربانت بم حەمەد... بریا عەبدی هەر قەت نەهاتبایە سەر ئەم دنیایە..."
لەو نێوەدا هەموو خەڵکی ماڵێ وەخەبەر هاتبوون و بە ترس و لەرزەوە تەماشای یاغییەکانیان دەکرد.
دووژنی عەبدی خان و دووکوڕی و چەند ژن کە لە دێیەکانی دراوسێیانەوە بە میوانی هاتبوون، لە ماڵی عەبدی بوون.
حەمەد دەستووری بە نایب ڕەجەب دا:
"با وەپێشت کەون ، ماڵەکە بگەڕێ، لەهەر جێیەك عەبدیت دۆزیەوە مێشکی بپرژێنە."
نایب ڕەجەب:
"هەر پێنج گوللەکەی لە مێشکی دەدەم، مێشکی لەت و پەت دەکەم..."
قۆنداغە تفەنگێکی دەکەلەکەی ژنەکە سرەواند:
"فانۆسێك هەڵکەو وەپێشم کەوە."
ژنە بێ ئەوەی قسەیەك بکا، چرایەکی دیکەی هەڵکرد و وەپێش نایب کەوت.

حەمـەد لـە نێوەراسـتی ژوورەکـەدا وەك پەیکـەری رق و تـووورەیی، راسـت راوەسـتابوو. ئەندامی وردو ریوەڵەی گەورە دیاربوو، ببووە غولێك، بە سام بـوو، ژنـەکان شـیوەنیان دەکـرد. منداڵەکان وەك دوو لکە داری ناسك کە با لێیان بدا دەلەرزین.

زۆری پێچوو یان کەم، نایب گەڕایەوە. ناهومێدی لە دەنگی دەباری.

گوتی:

"هەموو جێیەکم سەروبن کرد. نەبوو."

ژنە:

"مانگێکە چووەتە چوکوورراوا... دەیزانی رۆژێك دێـیە سـەری. لەترسـان خـەو لـە چـاوی نەدەکەوت... بۆیە لێیداو رۆیشت."

حەمەد:

"نایب."

نایب:

"فەرموو."

حەمەد کورەکانی نیشان دا:

"هەردووکیان بەرە دەرێ، چیان لـێ دەکەی بکە."

هەردوو ژنەکە لە پڕ خۆیان هاویشتە بەر پێی حەمەد:

"رەبی خوا بکا بە قوربانت حەمەد گیان... ئاخر منداڵەکانم چ گوناحێکیان هەیـە؟ رەبـی دەسـەر سەرت گەڕێم حەمەدم... ئەو کافرەی وەبینەو بیکوژە، بەڵام منداڵی من چ گوناحێکیان هەیە؟."

نایب منداڵـەکانی گرتبـو و رایدەکێـشان. منداڵـەکان لـە دووی نەدەکـشان و پەلـەقاژەیان دەکرد... جەبار جمکەی دەستی یەکێکیانی گرت و توند فرێی دایـە قورنەیـەك. منداڵەکـە بـە هەموو تینی خۆی دەستی کرد بە گریان و هاوار.

یەکێك لە ژنەکان متەقی نەدەکرد. وەك تەرمێکی بێگیان لەبەر پێی حەمەد دا کەوتبوو و جووڵەی نەدەکرد. بەڵام ئەوی دیکەیان هەروا دەپاڕایەوە:

"حەمەدم... حەمەدی خۆم... ئاخر منداڵەکانی من چ کارێکیان لەگـەڵ تـۆ کـردوە؟... چما منداڵەکانی من گوناحێکیان هەیە؟..."

نایب یەکێك لە منداڵەکانی ـ کە بە دەستیەوە بـوو ـ بـە هـەموو هێـزی خـۆی دە عـەرزی کوتاو لاقی لەسەر دانا. لوولەی تفەنگەکەی لەسەر سەری منداڵەکە داناو لە حەمەدی پرسی:

"بۆ هەر دەبێ لە دەرێ بێ... باشە، لە ژوورێ عەیبی چیە؟... دەستی لێبکێشم؟."

هەر ئەو ژنە کە وەك مردوو لەبەر پێی حەمەد دا کەوتبوو، لە پڕ وەك هەڵۆیەك پەلاماری جەباری دا کە خەریك بوو کوڕەکەی دەبردە دەرێ.

جەبار بە دەستێکی خەنجەرەکەی بەر پشتێنی هەڵکێشاو لە ژنەکەی دا. ژنە هاواری کرد: "ئای مردم" و کەوت.

ئەو ژنەی دیکە کە لوولە تفەنگی نایبی لەسەر سەری کوڕەکەی دەدی، بە گریانەوە پاڕایەوە:

"حەمەدم، حەمەدی من، روحمم پێ بکە... حەقتە حەمەدم، بەڵام کوڕی من چ گوناحێکی هەیە؟."

روخساری حەمەد تاو لەگەڵ تاو دەگۆڕا. ئەو بریسکەی وەك نووکەدەرزی لە چاوانی دا کووژایەوە. چاوی بە نایب کەوت کە قامکی لەسەر پەلەپیتکە بوو. هەربینا چرکاندنی. وەخت تەنگ بوو. حەمەد شەپێکی لە لوولەی تفەنگەکە دا کە لەسەر سەری کوڕەکە بوو. نایبیش لەو لەحزەیەدا دەستی لێکێشابوو. گوللەکە وەدیواری کەوت.

حەمەد دەستووری بە جەبار دا:

"ئەو منداڵەی بەرەڵا کە."

ژنە ئەم دەستەی حەمەدی ماچ دەکرد، پاشان ئەمەیانی بەردەداو دەستەکەی دیکەی ماچ دەکرد، دیسان ئەمیان و دووبارە ئەویان..."

"بڕۆ حەمەدم... بڕۆ ئەو کافرە وەبینە و بیکوژە... حەقتە حەمەدی خۆم، بە قەد عەرزو عاسمان حەقتە... بەخوا ئەگەر فرمێسکێکی بۆ بڕێژم. ئەگەر دڵۆپێك فرمێسکم لەسەر تەرمەکەی رشت، ئیدی خەڵك بە "زێنەب"م بانگ نەکا... وەی بینەو بیکوژە، حەقتە حەمەدم، لە عەرز هەتا عاسمان."

حەمەد هەر زاری هەڵنەپچڕا. بێ ئەوەی یەك قسە بکا، لە سەرەخۆ لە هۆدەکە وەدەرکەوت. هەموو لەشی ژانی دەکرد. دەتگوت هەموو لەشی لە دەسك ئاونگ دا کوتراوە.

نایب رەجەب تووڕە ببوو. جنێوی دایك و بابیی دەست پێ کردبوو. قۆڵی حەمەدی گرتبوو. وەهای دەگوشی، دەتگوت دەیەوێ باسکی بشکێنێ:

"ئەتۆ بەو دڵ ناسکی‌یەتەوە ناتوانی یاغی بی. ناتوانی تۆڵە بستێنیەوە. پیاوەکانی عەبدی لە کەلێنێك، قوژبنێك بە گیرت دێنن و مشوورت دەخۆن... لە ئێستاوەش جگە لە عەبدی، دووژمنێکی دیکەت هەیە کە پێی دەڵێن دۆردووە شێت."

جەبار:

"زۆر دەڵێی نایب رەجەب... ئەگەر دوژمنێکمان هەیە کە پێی دەڵێن دۆردووە شێت، لەبەرامبەر دا دۆستێکی زۆریشمان هەن کە پێیان دەڵێن عەشیرەتی ساچی کارالی... قەول وا نەبوو لە جیاتی عەبدی‌خان دوو منداڵی بێ‌گوناح بکوژین."

نایب رەجەب بێدەنگ بوو.

دەرو دراوسێ بە دەنگی شیوەن و گریان، بە توێی کراس و دەرپێیانەوە لە ماڵان هاتنەدەرو لە دەوری ماڵی عەبدی خڕ بوونەوە. لە یەك لەحزەدا ئەم قسانە دەم بە دەم گەڕان و بە گوێی هەموو کەس گەیشتنەوە:

"حەمەد نەمردوە، حەمەد نەمردوە."

"حەمەد نەمردوە."

حەمەد هەتا ئەو عەبدی‌یە کافرە نەکوژێ نامرێ... حەمەد نامرێ."

"دڵی حەمەد بە قەد دەلیایەك بەزەیی تێدایە."

دڕیان بە ئاپۆڕایەکە دا کە لەبەر دەرگای ماڵەکە کۆببوونەوەو بە نێویان دا تێپەڕین. وەختێك دێهاتی‌یەکان چاویان بە حەمەد و هاوڕێکانی کەوت، لەپڕ بێدەنگ بوون. بوو بە بێدەنگی‌یەك کە دەنگی هەناسەش نەدەبیسترا.

حەمەد زاری کردەوەو پاش ماوەیەك بۆ یەکەم جار قسەی کرد:

"دێهاتی‌یەکان وەخەبەر هاتوون. تازە ناکرێ لەنێو دێی بمێنینەوە. با بڕۆین."

جەبار:

"با بڕۆین."

نایب رەجەب:

"برینەکەم وەژان هاتوەتەوە، لە دێی بچینەدەر بچینە کوێ؟... خەریکە لە برسانیش دەمرین."

حەمەد:

"دیسان دێینەوە."

بەرمو دەرەوەی ئاوایی وەڕێ کەوتن و دەنگە دەنگ و هەراو هۆریایەکیان لە پاش بەجێ ما. سەگوەڕ تەواوی دێیەکەی داگرتبوو. دیار بوو سەگەل کەوتوەتە پەلەقاژەو تەنگانە. هێندێکیان لە جیاتی وەڕین دەیان قروسکاند.

نایب رەجەب هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشا:

"با دانیشین. ئەمن ماندوو بووم. خەریکم دەمرم. برینەکەم زۆر پیس وەژان کەوتوە."

جەبار:

"چتە نایب... ئەتۆ کە هێندە بێتاقەتی بۆچی سنگ بە گوللەوە دەنێی؟."

نایب تووڕە بوو, هەستاو نەڕاندی:

"جارێکی دیکە زارت هەڵپچڕی و قسەم لەگەڵ بکەی, مێشکت دەپرژێنم... زۆڵی سەگباب... ئەتۆ کارت بە کاری من چیە؟"

جەبار لە قاقای پێکەنینی دا.

حەمەد:

"وازی لێبێنە جەبار... ئاخرەکەی تووشی بەڵایەکمان دەکەی."

نایب:

"ئەم دایك حیزە ئاخرەکەی ناچارم دەکا کە کارێکی نابێ بکرێ, بیکەم... بەخوا هەربینا دیت کەلاکیم خستە عەرزی."

حەمەد:

"وازی لێبێنە نایب رەجەب... گاڵتەت لەگەڵ دەکا, حەقت نیە تووڕە بی."

نایب رەجەب:

"ئەمن گاڵتەم لەگەڵی نیە... با لێم گەڕێ بەدەردو مەرگی خۆم ڕابگەم."

حەمەد:

"جەبار... ئیدی گاڵتەی لەگەڵ مەکە."

جەبار دەسبەجێ غاری داو دەستی نایبی ماچ کردو لەسەر سەری دانا:

"دڵت نەیەشێ... تازە گاڵتەت لەگەڵ ناکەم."

نایب رەجەب زەردەیەکی هاتێ:

"کەرِوادە... دەڵێی شەیتانە, پەنا بەخوا."

جەبار:

"ئیدی تۆبە... ئیدی تۆبە... ئیدی گاڵتە ناکەم."

لەسەر عەرزی دانیشتن. چاوەڕێ بوون دەنگە دەنگەکە دامرکێتەوەو خەڵکەکە بچنەوە ماڵەکانیان. هیچ کامێکیان قسەیان نەدەکرد. هەریەکە فکری لە شتێك دەکردەوە.

هەراو هۆریایەکە وردە وردە دادەمرکایەوە، سەوەرەکەش بەرە بەرە کەمتر دەبوو. جەبار کە لەو بێدەنگییە وەڕەز ببوو، خۆی پێ نەگیراو دەستی پێ کرد:

"نایب رەجەب."

"دیسان چ سندانێکتە."

جەبار:

"ئەگەر حەمەد پێشی نەگرتایەی، ئەو منداڵە بێگوناحەت دەکوشت؟."

نایب رەجەب:

"ئەی چی؟... ئەرێ وەڵڵا حەوت رووحی پێ بان، یەکێکم پێ نەدەهێشت... بۆچی دەپرسی؟."

جەبار:

"هیچ... هەروا پرسیم."

نایب رەجەب ددانی لە چیڕەوە بردن:

"جەبار... گومانم نیە کە قەحبەی دێیەکەی ئێوە دایکە جندەکەی تۆ بووە، گەووادی دێیەکەشتان بابە گەووادەکەت بووە."

حەمەد:

"جەبار... ئەتۆ جوابی مەدەوە."

جەبار:

"ئەمن جوابی نادەمەوە."

هەراو هۆریای نێو دێ بەتەواوی بێدەنگ بوو. دیسان دێ لەو تاریکی و بێدەنگییەی پێشوودا نوقم بووەوە.

حەمەد:

"هەستن... هەتا رۆژ نەبووەتەوە بچینەوە لای مام عەلی دورمووش."

نایب رەجەب:

"دەبەر زارت مرم... زووبن... زووتر، زووتر..."

هەستان.

دێ وەك جاری پێشوو بێدەنگ و چۆڵ بوو. عەلی دورمـووش لـە دەرەوە گـوێی لـە دەنگی پێیان ببوو و دەرگای کردبووەوەو لەبەر دەرگا چاوەڕێیان بوو:

"خەوم لـێنەکەوت. زۆر لەمێژە چاوەڕوانتانم."

نایب رەجەب:

"باشە, ئێمە هاتین."

عەلی دورمووش:

"گوتم مریشکتان بۆ سەر برن... حەتمەن زۆرتان برسیـیە..."

نایب رەجەب:

"چۆنم, براله..."

فیشەکدان و قایش پشتێن و قایشی تفەنگی نایب رەجەب زیوکاری کرابوون. دیار بوو ئـەم زیوکارییانە کاری وەستاکارێکی کارامە بوون. سمێڵە داچۆڕاوەکانی نایب رەجەب سوور بـوون. نایب خەنەی دە سمێڵانی دەدا.

هەر کە دانیشتن, کچێکی شەرمێون کە جاروبارە بە دزییەوە بە دەم حەمەدەوە پێدەکەنی, سفرەکەی راخست. قبوولێیان هێنا. هەڵمێکی بۆنخۆش لە قبوولییەکە هەڵدەستا. لە دەفرێکی دیکەدا مریشکی سوورەوەکراویان هێنا.

نایب رەجەب:

"ئەم پلاوە حەتمەن بۆ برینەکەی من باشە... ئەمن ئەو جۆرە پلاوەم زۆر پێ خۆشە کە ئاوا هەڵمی لـێهەڵدەستێ و بۆنی رۆنەکەی بنیادەمی مەست دەکا..."

جەبار:

"نایب رەجەب... ئەتۆ بەو سەلیقەو ئیشتیایەوە بۆچی هـاتووی بوویـە یـاغی؟... ئـەتۆ دەبوو دەفتەرخانەت کردبایەوە."

نایب گوڕاندی:

"وست بە."

حەمەد:

"جەبار, گاڵتە لەگەڵ نایب مەکە."

جەبار:

"ئەمن چم گوتوە؟."

دیار بوو زۆر لەمێژ بوو عەلی دورمووش دەیەوێ شتێك بە حەمەد بڵێ، بەڵام بۆی نەدەکرا. یان قسە دەهاتە نێو قسەوە، یان بۆخۆی نەیدەگوت. حەمەد تێگەیشتبوو:

"مام عەلی... وادیارە قسەیەکت لە دڵ دایە... هەروا تفی خۆت قووت دەدەیەوە. قسەکەت بکە."

عەلی دورمووش:

"بڵێم چی حەمەد؟... ئەتۆ هەر لە منداڵییەوە لێت دیار بوو کە ئەگەر گەورە بووی پیاوێکی باش دەبی. دەمەوێ بڵێم چاکت کرد کە ئەم منداڵە بێگوناحانەت نەکوشت."

نایب رەجەب بەم قسەیەی عەلی دورمووش زۆر نارەحەت بوو:

"پیرەپیاو... مامە پیرە... ئەتۆ چ دەزانی؟... ئەتۆ چووزانی تۆڵە یانی چی؟... بۆخۆت بەسەرت نەهاتوە تا بزانی... ئەتۆ چووزانی مانای ئەم قسانە چیە..."

عەلی دورمووش ملی بە لاوە نا و هیچی نەگوت.

نایب رەجەب لەسەر قسەکانی رۆیشت:

"ئەگەر ئەمن لە جیاتی حەمەد بووایەم، گیان لەبەرم لەو ماڵەدا نەدەهێشت، هەموویانم سەر دەبڕی، ماڵەکەشم بەسەر کەلاکەکانیان دا دەڕووخاند. تێگەیشتی؟."

عەلی دورمووش:

"تێگەیشتم."

لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە نانیان دەخوارد حەمەد سەری داخستبوو و فکری دەکردەوە.

حەمەد:

"مام عەلی... خوا بەزیادی کا."

جەبار:

"خوا بەزیادی کا."

نایب رەجەب:

"خوا بەزیادی کا... هاتمەوە سەرەخۆ."

جەبار دەیەویست زاری بکاتەوە کە حەمەد پێشی پێ گرت:

"مام عەلی دورمووش، دەمەویست شتێکت لێ بپرسم."

عەلی دورمووش:

"بپرسە حەمەدم."

حەمەد:

"عەلیەیەشەل چووەتە کام دێ؟... خەبەرت لێی هەیە؟."

عەلی دورمووش:

"دەڵێن چووەتە گوندی "جاغشاک"... لێرەرا بۆ جاغشاکیش دوو ڕۆژە ڕێیە."

حەمەد:

"بەچی بزانین کە شەلە حەتمەن لەوێیە, یان نا؟."

عەلی دورمووش:

"خوشکەزای عەلیەیەکوێر, لە جاغشاک مێردی کردوە. پێرێ هاتوەتەوە ئاسیاب چەشمە. دەچم لێی دەپرسم."

حەمەد ڕووی کردە جەبارو نایب:

"حەتمەن دەبێ عەلیەیەشەلی وەبینین. ئەگەر چوویێتە جاغشاک, دەبێ بچین لەوێ بیبینین."

جەبار:

"دەچین."

نایب:

"ئەمن بەو برینەوە چ بکەم؟... ڕۆژ لە ڕۆژ خەراپتر دەبێ."

حەمەد:

"ئەتۆ حەز دەکەی مەیە نایب ڕەجەب... تۆ مەیەو هەر لێرە لە لای مام عەلی دورمووش بمێنەوە. ئاگای لێت دەبێ."

عەلی دورمووش:

"ئەرێ وەڵڵا, ئاگام لێت دەبێ, هەتا چاك دەبیەوە, دەشت شارمەوە."

نایب وەك ئەوەی لە ئەکاو بریسکە لێی دابێ:

"ئەمن؟... ئەمن؟... ئەمن لێرە وەمێنم؟... ئەگەر بشکوژرێم لێرە نامێنمەوە. ئەمن لە ئێوە جیا نابمەوە... تێگەیشتن یان نا؟... بەڵام قسەیەکم هەیە, چۆنە کەسێك بە دوای عەلیەیەشەل دا بنێرین؟."

ژنە پیرەکەی عەلی دورمووش کە دوور لەوان دانیشتبوو, هاتە نێو قسەکانیان:

"ئەو یەزیدە کە شوێنی حەمەدی هەڵگرت و ئەو بەڵایەی بەسەر هێنا, ئەگەر بزانێ حەمەد پیاوی بە دوادا ناردوە, هەڵدێ... ئەو یەزیدە چما لە گرتن دێ؟... بەخوا لە ترسان رادەکاو ئیدی بە کەس نابینرێتەوە. سەری خۆی هەڵدەگرێ و روو لە کێو و بیابان دەکا."

عەلی دورمووش تەماشای چاوی حەمەدی کرد:

"ئەتۆ عەلیبەشەلت دەوێ حەمەدم؟."

حەمەد:

"بەڵێ مامە, عەلیبەشەلم دەوێ..."

عەلی دورمووش:

"ئێوە دەتوانن دوو رۆژ لە کادێنی ئێمەدا بێننەوە؟."

حەمەد بێ ئەوەی فکر بکاتەوە, جوابی دایەوە:

"حەوتوویەکیش دەمێنینەوە."

عەلی دورمووش:

"ئێستا ئەمن عەلیبەکوێری بە سواری بەرێ دەکەم... دەڵێم بە عەلیبەشەل بڵێ ئەمن کارم پێیەتی, دەمەوێ شوێنم بۆ هەڵگرێ. دەڵێن عەلیبەشەل پاش مەسەلەی تۆ تۆبەی کردوە کە تازە شوێن گێڕی بکا. بەڵام ئەگەر ئەمن کارم پێی بێ حەتمەن دێ. ئەگەر بیهەوێ شوێنیش نەگێڕێ, سەرێکم هەر لێدەدا. بەڵام نەکا, لە پڕ بەڵایەکی بەسەر بێنی؟..."

ژنی عەلی دورمووش دیسان هاتە نێو قسانەوە:

"لێی گەرێ هەر بەڵایەك دەیەوێ, بەسەری بێنێ... لێی گەرێ ئەمجن ئەمجنی کا, چما ئەم بەڵایە ئەو یەزیدە بەسەر حەمەدی خۆمی نەهێنا؟... ئەگەر ئەو خوانەناسە شوێنی حەمەدی خۆمی هەڵنەگرتبایە, کێ دەیتوانی حەمەدی من وەبینێ؟... ئەتۆ عەلیبەکوێری بە دوادا بنێرە, با بڵێ عەلی دورمووش کاری پێتە. هەر کە هات, حەمەد دەبێ لەو بەردەرگایە بیداتە بەر مەودای خەنجەران و ورد وردی بکا. ئەمنیش خەڵکی ئاوایی بانگ دەکەم بێنە سەیرێ..."

عەلی دورمووش:

"ئافرەت, زۆر دەڵێی... بەسیە ئیدی. عەلیبەشەل نیازێکی خەراپی نەبوو. ئەسڵەن ئەو کاتەی شوێن هەڵدەگرێ, فکری هیچ شتێکی دیکە ناکاتەوە, هەر چاوی لەم دنیایە نیە, هەر نازانێ چاکەی دەکا یان خەراپەی. عەلیبەشەل وەختێك باسی شوێن گێڕانی بۆ

دەکرێ, ئەقڵ لە سەری دا نامێنێ. چما ئەگەر لە جەنگەڵ گەڕابووەوە, ئەتدی چ حاڵێکی هەبوو؟ ئەسڵەن ڕەنگی بە ڕووانەوە نەمابوو. وەك مردووانی لێ‌هاتبوو. هەمووان شایەتیان دا, ئەو نەبێ. ئاوارە بوو, لەدێی خۆی دەریان کرد, ماڵ و حاڵی لێ تێك چوون, بەڵام شایەتیی بەدرۆی لەسەر خەجیج نەدا... حەمەدم, ماڵ و حاڵی عەلی‌یەشەل وێران بوو, بەڵام شایەتیی نەدا. نابێ هیچی لێ‌بکەی حەمەدی خۆم. عەلی‌یەشەل پیاوێکی خەراپ نیە."

ژنە:

"کارم بەوە نیە پیاوی چاکە یان خەراپ. ئەم بەڵایە کێ بەسەر حەمەدی هێنا؟... چما عەلی‌یەشەل نەبوو؟... حەمەدی خۆم, ئەگەر مام عەلیشت پیاوی بە دوادا نەنارد, دەبێ بۆخۆت بچی و بەگیری بێنی... ئەگەر لە کونی هەتیتەش دا خۆی حەشار دابێ, دەبێ بەگیری بێنی و ئەو خەنجەرە لەبەر پشتێنت هەڵکێشی و لە زگی ڕاکەی."

عەلی دورمووش توورە بوو:

"بڕوانە ئافرەت, بزانە چ دەڵێم, تۆ ئەو خوایەی بە حەقی دەناسی, تۆ ئەو دین و مەزەبەی دەپەرستی, مەیە نێو قسەکانمانەوە. ئاخر ئەتۆ کارت بەو کارانە چیە؟."

ژنە:

"پێویست نیە ببیە وەکیلی کوڕەکە. لێی گەڕێ چۆنی پێ خۆش بوو, وا بکا."

عەلی دورمووش:

"باشە با بیکوژێ... با بیکوژێ ئەو بەستەزمانە... ئاخر خۆ عەلی‌یەشەل نیازێکی خەراپی نەبوو. ئەو مردووی شوێن هەڵگرتنە. ئەسڵەن فکریشی لە سەرەنجامی کارەکە نەکردبووەوە. خۆ ئەگەر زانیباشی سەرەنجامی کارەکەی بە کوێ دەگا, دیسان شوێنەکەی هەر هەڵدەگرت, چونکە عەلی‌یەشەل مردووی شوێن گێڕانە, شێتی شوێن گێڕانە. وەختێك شوێنێك هەڵدەگرێ ئیدی هۆشی بەسەر ئەم دنیایەوە نیە... ئێستا با حەمەد بچێ ئەو بەستەزمانەی بکوژێ با دڵی تۆ ئۆقرە بگرێ."

ژنە:

"بەڵێ. دڵم ئۆقرە دەگرێ. وەختێك کەلاکی عەلی‌یەشەل ببینم دڵم وا فێنك دەبێتەوە, وا بزانە سەهۆڵە."

عەلی دورمووش:

"حەمەدم، گوێت لەم قسانە نەبێ... هیچی لێناکەی، نا؟."
حەمەد بە دەنگی نەرم و کزەوە جوابی دایەوە:
"ئەمنیش دەمەوێ شوێنی یەکێکم بۆ هەلگرێ و بۆم وەبینێ."
ژنە:
"لە پێش دا با شوێنەکەت بۆ هەلگرێ. پاشان کە کارەکەی تەواو بوو، بیکوژە. هەموو ئەم بەلایانە ئەو کافرە بەسەر تۆی هێناون. خەجیجیش ئەو ناردیە زیندان. ئەو بووەتە باعیس کە خەجیج لە زیندان دا برزێ."
عەلی دورمووش داهاتەوەو بە سرتە بە حەمەدی گوت:
"دەتەوێ شوێنی ئەوت بۆ هەلگرێ؟."
حەمەد سەری بە نیشانەی "بەلێ" بۆ لەقاند.
عەلی دورمووش:
"زۆرم پێ خۆش بوو حەمەدم، زۆر... ئێستا دەچم عەلییەکوێرت بۆ لە جێی دەردەکێشم و دەرێیەی دەکەم. کاتێك عەلییەشەل بزانێ ئەمن کارم پێیەتی، کاری زێڕیشی هەبێ، بەجێی دێلێ و وەڕێ دەکەوێ. ئێستا دەلێم جێتان بۆ بەرنە کادێنێ. دوو ڕۆژان دەبێ لەوێ بنوون."
عەلی دورمووش دوایە بانگی ژنەکەی کرد:
"کچێ... لە جیاتی ئەو هەموو دانیشتن و چەنە لێدانە، هەستە جێی میوانەکان بەرە لە کادێنێ رایخە. ئەمن دەچمە لای عەلییەکوێر."
ژنە:
"بڕۆ، هەر جەهەننەمێك دەچی، بچوو."
ژنی دورمووش پیرەژنێکی سەرسپی بوو کە هەموو ددانەکانی هەلوەریبوون. زاری دەتگوت زاری هەمبانەیە. گەنم ڕەنگ و چاومەڕ بوو. لە حەمەدی نیزیك بووەوە. وەك ئەوەی بیهەوێ نهێنییەکی گرنگ بدرکێنێ، بە سەروودەست حالیی کرد، بردیە قوڕنەیەك و بە گوێی دا چپاند:
"فریوی ئەمانە مەخۆ... بە هیچیان باوەڕ مەکە. بە مام عەلیشت باوەڕ مەکە. ئەمانە هەموویان پیاوی ئەو عەبدییە خوانەناسەن. لەوانەشە ئێستا لە کادێنێت پەستێون و بچن خەبەر بە ژاندارمە بدەن کە بێن بتگرن. بە هیچیان باوەڕ مەکە. بە مام عەلیشت باوەڕ

مەکە. هەربینا دیت فریویان دای و دایانیە دەستی ژاندارمە... ئێستا ئەمن دەچمە ئاشی. دوو ڕۆژان لەوێ دەمێنمەوە, بۆ ئەوەی ئەگەر ژاندارمە هاتن, بێم و ئاگادارتان بکەم. ئەگەر خەبەرم بۆ هێنان کە ژاندارمە هاتن, دەبێ دەسبەجێ رابکەن. ئەدی حەمەدی خۆم... لەم دێیەدا تەنیا ئەمنم کە چاکەی تۆم دەوێ. ئەتۆ یادگاری دوونەی خۆمی. بابت خوا لێی خۆش بێ, نازانی چەند پیاوی چاك بوو. ئەتۆ یادگاری برایی. ئێستا جێتان لەکادێنێ بۆ رادەخەم. خەوتان نایە؟."

حەمەد:

"دایە حۆری, ئەوەندە بێخەوم, سەری خۆم پێ ڕاناگیرێ. سێ ڕۆژە خەو لە چاوم نەکەوتوە, لەبەر بێخەوییان وەختە بمرم."

دایە حۆری:

"عەمرم نەمێنێ... یاخوا کوێر بم نەمزانی حەمەدم کوشتە خەوە."

هەموو ژنەکانی بانگ کرد:

"تۆهۆی... خوانەناسینە, خوانەناسینە... ئەو کوڕانە وەختە لە تاوی خەوێ بمرن و ئێمەش ئاگامان لێیان نیە. هەستن جێیەکانیان بۆ لە کادێنە کۆنەکە راخەن... لەسەر کایە بۆیان راخەن."

نایب رەجەب:

"وەی دایەگیان, وەی."

حەمەد:

"چ بوو نایب."

نایب:

"بڕوانە ملم چۆن ئەستوور بووە... خەریکە لە دەفەی نێو شانم تێدەپەڕێ."

حەمەد:

"ئێستا مەلحەمت بۆ دروست دەکەین."

دایە حۆری:

"ئێستا دایەحۆریت مەلحەمێکت بۆ دروست دەکا, بە دوو ڕۆژ چاك چاکت بکاتەوە."

نوێنەکانیان بە پەلە بردە کادێن. میوانەکانیش چوونە کادێنێ. فتیلەیەك بە تیرەگی نێوەڕاستی کادێنەکەوە هەڵواسرابوو, فرتێنەی دەکرد. کادێنەکە نیوەی پڕ لە کا بوو. بۆنی کاو

گـزره گـەرووی پیـاوی دەبرژانـدەوە. بـۆنی کـا, بـۆنێکی خـۆش و مەیلەوسـوێرە. لـە لایـەکی کادێنەکەش تەپاڵەیان لەسەریەك دانابوون. پووشکە کا بەماڵی جاڵجاڵووکەوە گیرسابوونەوە... هـەزاران پووشـکە کـا... ژنـەکان چـوونە دەرێ و دەرگایـان پێـوەدا. تـازە یەکـەمین تیـشکی بەرەبەیان لە دەلاقەوە دەهاتە ژوورێ. زۆری نەمابوو دنیا روون بێتەوە.

لەسەر تەبارە کایەکە جێگایان بۆ راخستبوون. جەبار لەسەر جێیەکەی راوەستابوو, چاوی لێك نابوون و هەروا باوێشکی دەدان.

نایب رەجەب خۆی فڕێ دایە نێو جێیەکەی:

"کوڕینە ئەمن خەریکم ئاورم تێبەر دەبێ... هەموومان نابێ بنـووین. دەبێ یـەکێکمان ئێشك بگرێ."

حەمەد:

"ئێوە بخەون, ئەمن رادەوەستم."

حەمەد لە خەفەتان وەخت بوو دیق بکا. جەبار هەر چووە سـەر جێـی و خـەوی لـێکەوت. نایب رەجەب دەیناڵاند.

حەمەد تفەنگەکەی هەڵگرتبوو, لەسەر تەبارەکایەکە دانیشتبوو و سەری وەسەر ئەژنۆی کردبوو.

لای نیوەڕۆیە دایە حۆری نانی بۆ میوانەکان هێنا. نایـب دەیناڵانـد. دایـە حـۆری کـە ئـەم وەزعەی دی, لە خۆی تووڕە بوو:

"ئەی خەجاڵەت خۆم... لەبیرم چوو..."

حەمەد:

"چت لەبیر چوو, دایە حۆری؟."

دایە حۆری نایب رەجەبی نیشان دا:

"دەبێ دەرمانی بۆ ساز کەم."

تازە لە نان خواردن ببوونەوە کـە دایـەحۆری گەڕایـەوە. پیاڵەیـەکی بـە دەسـتەوە بـوو کـە هەڵمی لێهەڵدەستا:

"ئەم دەرمانە بابم دروستی دەکرد. هەروەخت یەکێك بریندار دەبوو, بـە رەحمـەت بـێ هـەر بەم دەرمانە زوو چاکی دەکردەوە. وەرە برای خۆم."

خێرا برینەکەی کردەوە. تەڕدەسـت و کارامـە بـوو. پەڕۆیـەکان بـە برینـەکەوە نووسـابوون. لـێکردنەوەیان کارێکی ئاسان نەبوو.

دایە حۆری:

"جەرگەکەم خەرابێ برالە... بڕوانە برینەکەی چۆنی کێم کردوە... وەی برای خۆم گیان، وەی."

نایب رەجەب ددانی لە چیرەوە دەبردو دەینالآند. دایە حۆری برینەکەی کردەوە، خاوێنی کردەوە، مەڵحەمی لەسەر داناو بەستی.

نایب رەجەب:

"دەستت نەرزێ خوشکم... دەستت خۆش بێ... ئارام بووم."

نایب رەجەب دووبارە چووەوە نێو جێیەکەی.

جەبار:

"کاك حەمەد، ئەتۆش بخەوە، ئەمن بەخەبەرم."

دایە حۆری:

"ئەمنیش دەچمە ئاشی. دەترسم ئەو خوانەناسانە بە گرتتان بدەن. هەر لە دوورەوە ژاندارمەی ببینم، دێم و خەبەرتان دەدەمێ. لەم ماڵەدا کەس ناتوانێ دەست لە حەمەدم بدا. کەس ناتوانێ دەست لە یادگاری دوونەگیانم بدا. ئەمن چوومە ئاشی، دەچم لەوێ دادەنیشم و چاو لە رێیە دەکەم. ئەگەر ژاندارمە دەرکەوت دەسبەجێ خۆم دەگەیەنمەوە حەمەدی خۆم."

حەمەد چووە نێو جێی. بەڵام هەرچی دەیکرد، خەوی لێنەدەکەوت. چەند رۆژ بوو شەکەت و بێ خەو بوو، کەچی خەوی لێنەدەکەوت. مردنی دایکی و گیرانی خەجیج، بە جارێك پشتییان شکاندبوو. وەك ئەوە دەچوو کە حەمەد لە بن ئەو هەموو دەردو بەڵایەدا پلیشابێتەوە. جاری وابوو دەتگوت ئێستا دەخنکێ. دڵی گری گرتبوو و دەسووتا. لەگۆ فکرو خەیاڵی دوورو درێژڕا دەچوو و بەو هاسانییە نەدەهاتەوە سەرخۆ. دیار نەبوو بۆچی، جار جار لە هەموو کەس، لە هاورێکانی، لە خەڵك و لە خۆی دەسڵەمیەوە. بەڵام هیچی بە هیچ کەس نەدەگوت.

نیوەشەو بوو کە جەبار بانگی حەمەدی کرد:

"ئەمن خەوم دێ. هەستە ئەتۆ راوەستە."

حەمەد کە هەر خەوی لێنەکەوتبوو، هەڵستا. تفەنگەکەی تاودایە. لەسەر تەبارە کایەك دانیشت. ئەژنۆی بە سنگیەوە نان و سەری وەسەر ئەژنۆیانی کرد. دیسان لە فکرەوە چوو.

لای بەیانی خەریك بوو چاوی گەرم دەبوون کە دەرگای کادێنێ کرایەوە. حەمەد دەسبەجێ تفەنگەکەی بۆ لای کادێنێ راداشت.

عەلی دورمووش:

"چیە حەمەدۆك؟... دەتەوێ من بکوژی؟."

حەمەد هیچی نەگوت.

عەلی دورمووش:

"وەرە حەمەد... عەلیەکوێر, عەلیەشەلی هێناوە. لە مالێن. هاورێکانت هەستێنەو وەرن. مەسەلەکەم بە عەلیەشەل گوتوە. زۆر دەترسێ. لە ترسان وەختە دلی بتۆقێ. ئەو ئافرەتەی منیش خەراپی پێ کرد. خۆی پێدا داو تفی لەو بەستەزمانە کرد. پێی گوت:"ئەگەر حەمەدۆك نەتکوژێ, بۆخۆم دەتکوژم." ئێستا شەلە زراوی چووە. لە ترسان وەك مێژۆك دەلەرزێ. عەلیەشەل پێی وایە ئەمن فریوم داوەو هێناومە بیکوژی. هەر لێم دەپرسێ هێناوتم بکوژێ؟ نازانی چۆن دەلەرزێ. وەختە لە ترسان دیق بکاو بمرێ."

حەمەد وەختێك بیستی عەلیەشەل هاتوە, وادیار بوو نەختێك خۆشحال بوو. جەباریش وەخەبەر هاتبوو. فکریان کردەوە کە نایبی هەلنەستێنن. بەلام ترسان توورە بێ. بۆیە ئەویشیان هەلستاند.

جەبار:

"هەستە نایب رەجەب, هەستە... شوێن گێری بەناوبانگی زەمانە پەیدا بووە. عەلیەشەل هاتوە. دەبێ بچین دوو قسەی لەگەل بکەین."

نایب رەجەب کە ئەستۆی خۆی پێ رانەدەگیرا, بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

"ئا!... عەلیەشەل هاتوە؟... عەلیەشەل هاتوە؟."

جەبار:

"بەلێ... خۆیەتی... عەلی شوێن هەلگر... عەلی شوێن گێر... بەناوبانگترین شوێن گێری رۆژگارە."

نایب رەجەب:

"هات؟... زۆلی حەرامزادە هات؟... وەی دایە گیان وەی... وەی ملم, وەی..."

جەبار:

"چیە نایب؟... ئاخر خەراپە..."

حەمەد:

"هەستن... هەستن بچینە لای عەلی‌یەشەل."

نایب رەجەب:

"راوەستن."

پاش ئەم قسەیە دەستی کرد بە تەکاندن و خاوێن کردنەوەی جلەکانی. تفەنگ و خەنجەرو فیشەکدانەکانی کە قایشەکەیان زیوکاری کرابوو، بە وردەکاری‌یەکی تەواوەوە لە خۆی دان. سمێڵەکانیی بە جوانی بادان. شانە زیوینەکەی دەرهێناو مووی سەری جوان داهێنا. بەلام هەرچی دەیکرد دڵی نەدەهات تەماشای لاقەکانی بکا. پاژنەی کەوشەکەی پێوە نەمابوو. تۆزی تەقیلەکەشی بە لکی سۆرانی‌یەکەی پاك کردەوە.

جەبار نەیتوانی خۆی رابگرێ:

"یاڵڵا نایب... کەوشەکانمان رووی مەجلیسیان نیە، بەلام چارە چیە؟."

نایب:

"ئەرێ وەڵڵا، چارە چیە؟."

وەختێك چوونە ژوورەکە، عەلی‌یەشەل کە لە پەنا شاگردان دانیشتبوو ویستی هەڵستێ. بەلام نەیتوانی. تەکانێکی دایە خۆی. بەلام دووبارە کەوتەوە. رەنگی خۆڵەمێشی گرتبوو.

عەلی‌یەکوێر:

"کاك عەلیم هێنا."

حەمەد:

"هەر بژی."

نایب رەجەب ددانی لە چیرەوە بردن و تەماشای چاوی عەلی‌یەشەلی کرد:

"ئەو قورمساغە کە پێی دەڵێن عەلی شوێن گێڕ ئەتۆی؟... ئەتۆ لە خوا نەترسای؟... ئەتۆ شەرمت لە مەخلووقاتی خوا نەکرد؟..."

عەلی‌یەشەل سەری داخستبوو و چاوی لە خۆڵەمێشی ئاگرەکەوە بڕیبوو، جووڵەی نەدەکردو دەنگی دەرنەدەهات.

حەمەد:

"نایب رەجەب، رێگا بدە من لەگەڵ عەلی ئاغا قسە بکەم."

نایب رەجەب:

"باشە, ئەتۆ قسە لەگەڵ ئەم گەوادە بێویژدانە بکە, بزانم چی پێ دەڵێی..."

حەمەد هاتە پەنای عەلییەشەل و چۆکی بە چۆکیەوە دا:

"عەلی ئاغا... گرێ کوێرەیەکم هەیە بە دەستی تۆ دەکرێتەوە... با دەقیقەیەك بچینە دەرێ."

عەلییەشەل لەو جێی لێی دانیشتبوو, رەق ببوو و جووڵەی نەدەکرد. کەوتە پەتە پەت:

"حەمەدم... حەمەدئاغا... ئەمن چووزانم سەرەنجامەکەی وای لێدێ... بەزەییت پێم دا بێ... ژن و منداڵم هەیە, روحم پێ بکە."

حەمەد:

"مەترسە... با بچینە دەرێ قسەیەکم پێتە دەبێ بە سرتە پێت بڵێم."

عەلییەشەل:

"روحم بە ژن و منداڵم بکە. ئەمن کردم, ئەتۆ نەیکەی حەمەدئاغا. ژن و منداڵم هەیە."

حەمەد:

"هەستە بچینە دەرێ... دەمەوێ بە سرتە شتێکت پێ بڵێم."

عەلییەشەل هیچ رەنگی بە رووەوە نەمابوو. وەك مردووانی لێهاتبوو. دەلەرزی:

"وەرە کەوشەکانت ماچ کەم حەمەد ئاغا, منداڵەکانم هەتیو مەکە. ئەمن کردم, ئەتۆ نەیکەی حەمەد ئاغا..."

نایب رەجەب تووڕە بوو:

"ببزوو دەویت بابی شەل... راست وەبە, خۆ هەر کارێك و دوو کارت نەکردوون... ببزوو, یاڵلا..."

نایب رەجەب خەنجەرەکەی هەڵکێشا.

حەمەد:

"نایب... کارت پێی نەبێ."

نایب رەجەب:

"زۆر باشە. کارم پێی نیە, دەستیشی لێنادەم. ئەتۆ لەسەر سەرتی دانێ و لەبەر دەستی راوەستە..."

لە نارەحەتی خەنجەرەکەی لە کالانی راکردەوە.

حەمەد:

"مەترسە عەلی ئاغا... کاریکم پێت نیە. ئەگەر ویستبام بتکوژم، لیرەش دەمتوانی... دەمەوێ بە سرتە شتێکت پێ بلێم."

عەلیبەشەل:

"پەنا بەخوا... ئەوە هەستام... روحم بە منداڵەکانم بکە حەمەد ئاغا... پەنا بە خوا."

عەلیبەشەل هەستا. لاقە شەلەکەی بە دوای خۆی دا راکێشا، لە هۆدەکە وەدەر کەوت و لە قوژبنێکی تاریك دا راوەستا. حەمەدیش چووە پەنای.

حەمەد:

"باش گوێت بکەوە عەلیبەشەل. هەموو ئەو بەڵایانە ئەتۆ بەسەر منت هێناون. بەڵام تازە دەرچوو... پیاوەتییەکیشت کرد، خەبەری ئەویشم هەیە. هەمووی ئەمانە رۆیشتوون. ئێستا دەبێ لە فکری دوارۆژ دا بین. ئێستا لە تۆم دەوێ شوێنی یەکێکم بۆ هەڵگری و بۆم بدۆزیەوە."

عەلی کەوتە پەتە پەت:

"بەخوا پاش مەسەلەی تۆ ئیدی سوێندم خواردوە کە شوێن گێری نەکەم. ئەگەر دەتەوێ، بمکوژە. ئەمن سوێندم خواردوە کە ئیدی شوێن هەڵنەگرم. سوێندم خواردوە کە ئیدی نەبمە باعیسی هیچ کەس."

حەمەد:

"باشە. ئەگەر ئەو شوێنەم بۆ نەگێڕی، ئەودەم دەتکوژم."

عەلیبەشەل ملی بە لاوە نا:

"روحم بە منداڵەکانم بکە."

حەمەد:

"ئەم قسانە هیچ ناکەن. دەبێ هەروەك شوێنی منت هەڵگرتبوو، ئێستاش شوێنی ئەو کەسەی دەمەوێ بۆ من هەڵگری. بەخۆڕایی مەپاڕێوە."

عەلیبەشەل بە زمانێکی فەقیرانە پرسی:

"شوێنی کێت بۆ هەڵگرم."

حەمەد:

"شوێنی عەبدیخان... دەبێ لە هەر کوێیەك بێ، وەیبینی. ئەگەر لە کونە مشکانیش دا خۆی شاردبێتەوە، دەبێ شوێنی هەڵگری. ئەگەر بووبێتە تەیرو چووبێتە ئاسمان دەبێ بیدۆزیەوە. ئەگەر دیتەوە زۆر باشەو ئەگەر نا..."

عەلیپەشەل:

"بۆچی زووتر نەتگوت براله... ئەگەر دەمزانی کە دەتەوێ شوێنی عەبدیخانت بۆ هەلگرم, هەر کە زارت دەکردەوە, دەمگوت بەسەرچاو. شوێنی ئەوت بۆ هەلدەگرم. لە هەر کونێك دا خۆی حەشار دابێ بۆت دەبینمەوە. ئەگەر لە جەهەننەم دا خۆی شاردبێتەوە دەیبینمەوە. حەتمەن یان لە شارە, یان لە گوندی "زەردەباخچە"یە, یان لە "هەوشارەدێ". حەتمەن لە یەکێك لەو جێیانەیە. دەبێ پێکەوە بچینە لای چوکووراوا. وای دەبینمەوە هەروا بزانە بە دەستی خۆم شاردوومەتەوە. یەخەی دەگرم و دەیدەمە دەستت... ئەو کافرە ماڵ و گوزەرانی منی تێك داوە. چونکە شایەتیی بەدرۆم نەدا لە دێی وەدەرنام. روحمی بە ژن و منداڵم نەکردو ئاوارەو سەرگەردانی کردین. ناچار بووم پیلی ژن و منداڵم بگرم و بچمە غەریبایەتی. لەخوام دەوێ ئەو خوانەناسەی وغجرِ وغجرِ بکەی. بۆخۆم لە خوام دەوێ بیبینمەوە. لە گەڵتان دێم. یاغی دەبم و روو لە شاخی دەکەم..."

حەمەد:

"باشە... ئێستا با بچینە ژووری. پاشان قسەی لێدەکەین. نامەوێ کەس بزانێ. نابێ بە کەس بڵێی. عەلی دورمووش بۆنی کردوە, بەڵام قەیدی نیە. نابێ کەسی دیکە بزانێ."

عەلیپەشەل:

"ئەمن بە خەیاڵم دا نایە. هەموو دنیاش پێ بزانێ کاری خۆم دەکەم. هەموو کەس دەزانێ ئەو بێشەرەفە چی بەسەر تۆو خەجیج و دێهاتیەکان و پاشانیش بەسەر خۆم هێناوە. دەردی لە دڵم دا هێندەی کێوێکە. چما لەبیرم دەچێتەوە؟ هەموو دنیاش پێ بزانێ, شوێنی هەلدەگرم. ئەوپەڕەکەی ئەوەیە ئەمنیش تفەنگێك هەڵدەگرم و وەدوات دەکەوم. بچیە هەر کوێیەك لەگەڵت دێم, بەخوا دێم..."

حەمەد هات و لەبەر ئاگر دانیشت. عەلیش هات. عەلیپەشەل بە چاوان پێدەکەنی.

عەلی دورمووش:

"چاوت پێدەکەنێ شەلە... ناکا کارێکی تازەت بۆ پەیدا بووبێ؟ پێم بڵێ دەتەوێ شوێنی کێ هەلگری؟."

عەلیپەشەل:

"نا... شتی وا نیە. کاك حەمەد لەگەڵم ئاشت بووەتەوە. بۆیە خۆشحاڵم."

پاشان، حەمەدو جەبارو نایب و عەلیەیەشەل، چوار بە چوار چوونەوە کادێنێ.
وەختێك لە کادێنێ وەدەر کەوتن و وەڕێ کەوتن، هێشتا بەری ڕۆژێ روون نەببوو.
حەمەد:
"خواحافیز دایە حۆری، خوا حافیز مام عەلی دورمووش. هەمووتان بە خوا دەسپێرم."
دایە حۆری:
"حەمەد، حەمەدی خۆم... ئەگەر وەختێك کاری عەلیەیەشەل تەواو بوو، قیمە قیمەت نەکرد... ئەگەر ئەو یەزیدەت وغڕ وغڕ نەکرد، بزانە کە هەرگیز گەردنت ئازا ناکەم. ئێسك و پروسکی دوونەش لە گلکۆدا ئاگر دەگرێ. حاڵی بووی چیم گوت؟ گوێت لێبوو؟."
عەلی دورمووش:
"بەخێرچی حەمەدم... گوێت لە قسەی دایە حۆریت نەبێ، بۆخۆت دەزانی ئەختێك شێتۆکەیە."
پاشان رووی کردە عەلیەیەشەل:
"ئەتۆش وەدڵی خۆتی مەگرە عەلی. ژن ئەگەر پیر بوو، خەرفانەکەی بەلایە..."
لە دێی وەدەرکەوتن.
عەلیەیەشەل:
"کەوابێ خۆم بە چاوی خۆم کەلاکی ئەو کافرە دەبینم، ها؟..."
عەلیەیەشەل دوای ئەم قسەیە لێوی خۆی لستەوە. ئەمە عادەتی بوو، هەروەخت کاری راست بهاتایەو کەیفی ساز بایە لێوی خۆی دەلستەوە.
عەلیەیەشەل:
"دەزانم برالە زۆرت خەراپە لە دەستی من دیوە. ئێستێ دەمەوێ چاکەشم لە دەست ببینی. هەرکارێکی لە دەستم بێ بۆتی دەکەم. پاش ئەوەش کە کاری ئەو کافرەت یەك لا کرد، دیسان هەر کارێکم لە دەست بێ بۆت ئەنجام دەدەم. ئەتۆ زۆر بە رەحمی، زۆر پیاوی. یەکی دیکە لە جێی تۆ با، هەتا ئێستا لەمێژ بوو منی کوشتبوو. بەلام ئەتۆ تێگەیشتی کە ئەمن گوناحێکم نیە. ئەگەر ئەمن بنیادەمێکی خەراپ بووایەم، شایەتیی بەدرۆم دەداو تووشی ئەم ڕۆژە نەدەبووم. بەلام ئەتۆ تێگەیشتی کە شایەتیی بەدرۆ لە من ناوەشێتەوە. ئەگەر ئەو کارەم کردبایە خوێنم حەلاڵی تۆ بوو."
نایب ڕەجەب کە لەمێژ بوو قسەی نەکردبوو، وەقسە هات:

"دەڵێن ئەتۆ لە شوێن گێڕان دا لینگەت نیە؟."

عەلی‌یەشەل:

"شوێنم خەراپ نەدەگێڕا... بەڵام ئیدی سوێندم خواردوە کە شوێنی بنیادەم هەڵنەگرم."

نایب رەجەب:

"باشە, کارت بە حەیوانان چیە؟."

عەلی‌یەشەل:

"ئەگەر بە جارێک دەست لە شوێن گێڕان هەلگرم, نەخۆش دەکەوم. شوێنی شوورو کەڵەکێوی و ئەو جۆرە حەیوانانە هەڵدەگرم... وەدوای راوچی‌یان دەکەوم و شوێنی حەیوانان هەڵدەگرم, چ بکەم, بە دەست خۆم نیە. ئەگەر هیچ شوێنێك هەڵنەگرم بەخوا دەمرم."

جەبار:

"بە قوربانی خوای بم..."

نایب رەجەب:

"وەی دایە گیان, وەی."

پاشان هەتا گەیشتنە بەستێنی "ئاویژەگابەرد", هیچیان قسەیان نەکرد. لێرە, ئاونگ لەسەر زەوی نیشتبوو. خاکی ئێرە سوور بوو. گڵەکەی بۆنێکی لێ‌هەڵدەستا, وەك بۆنی گڵی چوکووراوا.

نایب رەجەب:

"وەی دایە گیان, وەی... وەی ئەژنۆم... خەریکە ئەژنۆم دەشکێن... سەری خۆم بۆ راناگیرێ."

جەبار:

"چ بووە نایب رەجەب... دیسان دەناڵێنی..."

نایب رەجەب:

"وەی دایەگیان, وەی."

عەلی‌یەشەل:

"برینەکەی زۆر ئەستوور بووە. بەم وەزعەوە دەرناچین. چونکە زیاتر ئەستوور دەبێ. دەبێ لە جێیەك وەمێنین. ماڵی "ئومەتەزەرد" لەو نیزیکانەیە, پیاوێکی باشە."

نایب رەجەب:

"نا، نابێ... بۆ برینێك ناكرێ بنووین. شوێنی ئەو كافرەمان هەڵگرتووەو دەبێ وەدوای كەوین. نابێ بێڵین شوێنەكە كوێر وەبێ."

نایب رەجەب دوایە تووڕە بوو و بانگی جەبارو حەمەدی كرد:

"حەمەد، جەبار... وەرنەپێش كارم پێتانە. دەمەوێ هەتا ئەو كارە تەواو دەبێ ئەمن سەردەستە بم... دەبێ هەردووكتان بە قسەم بكەن، باشە؟..."

حەمەد:

"باشە."

جەبار:

"باشە... بزانم دەتەوێ چ بكەی."

نایب رەجەب:

"هەركەس قسەم لە قسە بكا، دەسبەجێ دەیكوژم... ئەگەر بابیشم بێ، دەیكوژم."

جەبار:

"باشە، كەس قسەت لە قسەی ناكا... ئێستا بڵێ بزانم دەتەوێ چ بكەی؟."

نایب رەجەب:

"راوەستە با وەختی بێ."

پاشان بانگی عەلیەشەلی كرد:

"عەلیەشەل دەڵێن ئەتۆ لە شوێن گێڕان دا زۆر وەستای... بەڵێنیشت داوە ئەو نامەردەی بدۆزیەوە. وایە یان نا؟."

عەلیەشەل:

"بەڵێ. بەڵێنم داوە. بەڵام ئەگەر قەولیشم نەدابێ، بۆخۆم دەمەوێ وەیبینم. بۆخۆم بە خوێنی سەری تینووم."

نایب رەجەب:

"باشە... بڵێ بزانم، بە فكری تۆ ئێستا عەبدی لە كوێیە؟."

عەلیەشەل:

"ئێستا ناتوانم بڵێم لە كوێیە. یان دەبێ لە شاری بێ، یان چووەتە هەوشارەدێ... لەوانەشە خەبەریان پێ دابێ كە ئێمە لە دوای عەوداڵین... ئەگەر دڵی خەبەری پێ دابێ، حەتمەن دەچێتە دێهاتی "دەشتی بۆرگیر"، چونكە دەزانێ یاغیەكان ناچنە جێگای دەشت و ئەگەریش بچن لێی نامێننەوە."

نایب ڕەجەب:

"باشە، ئەگەر چوویتە لای یۆرگیر دەبێ چ بکەین؟."

عەلیپەشەل:

"ئەمن خەبەری دەزانم. هەر لاق لە یۆرگیر بەربێتە دەرێ خەبەرتان پێ دەدەم."

نایب ڕەجەب:

"ئێستا تەگبیری ئێمە چیە؟."

عەلیپەشەل:

"ئێستا ئێوە بچنە مالّی ئومەتەزەرد. ئەمن دەچمە لای چوکوورداوا، نەختێك گوێ هەلّدەخەم و دوایە دێمەوە لاتان. ئێستا دەبێ بچینە مالّی ئومەتەزەرد. ئومەتەزەرد خزمی خۆمەو ئەو کافرەشی خۆش ناوێ."

لای ئێواری بوو کە گەیشتنە مالّی ئومەتەزەرد. مالّی ئومەتەزەرد تاقە مالّە بوو، و لەسەر تەپۆلکەیەکی بە دارو بار هەلّکەوتبوو.

عەلیپەشەل:

"سلاّو کاك ئومەت. ئەمە حەمەدۆکی خۆمانە."

ئومەت:

"براله بیستبووم کە چوویە شاخی. زۆرم پێ خۆش بوو. زۆرم حەز دەکرد بت بینم."

عەلیپەشەل ئەوانی لە حەساری مالّی ئومەتەزەرد داناو بۆخۆی لێیدا ڕۆیشت.

ئومەتەزەرد لە دواوە بانگی کرد:

"کاك عەلی، چایەك بخۆوە، دوایە برۆ."

عەلیپەشەل، هەروا بە دەم ڕێگا ڕۆیشتنەوە جوابی دایەوە:

"کاك ئومەت کارم هەیە. بە پەلەم."

عەلیپەشەل هەروا کە لاقە شەلەکەی بە دوای خۆی دا ڕادەکێشا، وەك ئەوەی بە غاردان بڕوا، دوور کەوتەوە.

شەوێ شنەبایەکی نەرمی هەلّکرد. مانگ بە ئاسمانەوە دەتگوت سەهۆلّ بەستوویە. شۆقی مانگ بە نێو لك و پۆپی دارەکان دا شیخالّ شیخالّ دەبوو و دەکەوتە سەر زەوی.

عەلیپەشەل لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

"ئەگەر ببیە تەیرو بچیە ئاسمان بەگیرت دێنم."

ماڵەکەی وەبیر هاتەوە کە بە چەند ساڵ زەحمەت دروستی کردبوو و رای‌خستبوو. وەبیری هاتەوە کە پیاوەکانی عەبدی‌خان ئەو ماڵەیان چۆن وێران کردبوو. ددانی لە چیرەوە بردن. خێراتر پێی هەڵێنایەوە.

کاتێك گەیشتە شاری, تازە دنیا رووناك دەبوو. چووە لای بازارەکە. "مراد"ی گەسك دەری بازارەکە, خەریك بوو بەردەرکی دوکانەکانی دەماڵی و تۆزو خۆڵی گەیاندبووە عاسمان. وادیار بوو مراد سەرمایەتی. سلاوێکی لە مراد کردو راستەرێ چووە چاخانەکەی "تۆفیق ئاغا". تۆفیق ئاغا تازە چاخانەکەی کردبووەوە. عەلی داوای چای کرد. چایەکیان لەپێش دانا. چایەکە هەڵمی لێ‌هەڵدەستا. عەلی‌یەشەل کە دڵەکوتەی بوو, هەتا هەموو دوکانەکان کرانەوە, هەر لە چاخانە دانیشت.

کاتێك یەکەم تیشکی هەتاو لە بەردەرێژی پیادەرێیەکانی دا, عەلی‌یەشەل چووە دوکانی "مام مستەفا".

مام مستەفا خەڵکی ماراش و پیرەپیاوێکی ریش سپی و سەروروخۆش بوو. هێشتا دوکان نەکرابووەوە. عەلی لەبەر دوکانەکە هەڵتروشکاو پشتی بە دەرگای دوکانەکەوەدا. چاوەرێ دانیشت. سەگە گروێیەك کە لمبۆزی رەعەرزی دەخشا بە تەنیشت عەلی دا تێپەری. ئێرە رووبەرووی دوکانی نالبەندیی "حاجی کوورە" بوو. تاوێك دواتر حاجی کوورە هات. دەزگایەکەی رێك و پێك کردو دەستی کرد بە نارە نارو ناڵ کوتانەوە. ئەو پەین و پاڵەی لە قوژبنێك کۆ کرابووەوە, هەڵمی لێ‌هەڵدەستا. وەختێك هەتاو بڵیند بوو هەڵمەکە نیشتەوە. پاشان مام مستەفا پەیدا بوو. وەختێك مستەفاغا بەو بەیانی‌یە چاوی بە عەلی‌یەشەل کەوت پێکەنی:

"چ باسە عەلی؟... شوێنی دزەکەت لە دوکانی ئێمە دیوەتەوە؟."

عەلی‌یەشەل بە باوێشك دانەوە هەستا:

"ئەدی, هەروایە."

مستەفاغا دەرگای دوکانەکەی کردەوەو چووە ژوور:

"باشە, وەرە ژوورێ عەلی ئاغا بزانم, باس و خەبەر چیە؟..."

عەلی:

"بڵێم چی کاك مستەفا قۆرت لەسەر قۆرتێ بە ملمان دا دێ."

مستەفا:

"بەڵێ، بیستوومانە."

عەلیپەشەل:

"بەڵێ، حەتەمن بیستووتە."

مستەفاغا:

"عەبدی کارێکی باشی نەکردوە... ڕۆژێ پێنج فەرزە نوێژان دەکا، بەڵام حەق نەبوو ئەو ڕەفتارە لەگەڵ تۆ بکا."

عەلیپەشەل:

"دەڵێن عەبدیخان لەم دەوروبەرانەیە... ئەگەر ڕاستە، باشترە ئەمن لەو نیزیکانە خۆم ئاشکرا نەکەم. ئەگەر وەدەستی کەوم حەتەمن بەڵایەکی دیکەم بەسەر دێنێ."

مستەفاغا:

"مەترسە کاك عەلی. ئەو ئێستا لە فکری گیانی خۆی دایە. لەو بستە منداڵە، لەوەی کە دەڵێن یاغی بووە، ئەوەندە دەترسێ کە نازانم لە چ کونێك دا خۆی حەشار داوە. ناوێرێ لە شار وەمێنێ. دوێنێ هاتە لای من، هێندێك سیغارو شەمچەی کڕی، لە خورجێنەکەی هاویشت و بە چوارناڵ لێیداو ڕۆیشت. چووە گوندی "ئاك تووزلوو". بەنیازە هەرلەوێ زەوی و خانوو بکڕێ و بمێنێتەوە. عەبدی و حەمەد بە یەکتر دەوێرن. ئەتۆ وریای خۆت بە. خەراپەی لەگەڵ تۆ کرد. بەڵام بۆخۆشی چاکەی نایەتەڕێ. ئەوە دەشی بینی، لە ترسی منداڵێکی بستێك منداڵ چۆن کون بە کون خۆی دەشارێتەوە..."

عەلیپەشەل بێ ئەوەی مستەفاغای وەشك بخا لەسەرەخۆ پرسی:

"خوا دەزانێ لە ئاك تووزلوو میوانی کێیە."

مستەفاغا:

"دەتەوێ لە ماڵی کێ بێ؟ لە ماڵی کوێخا حوسێنی خزمی خۆیەتی."

عەلیپەشەل بۆ ئەوەی بە تەواوی دڵنیا بێ، زۆر بە ئارامی گوتی:

"نا... باوەڕ ناکەم لە ئاك تووزلوو بێ، چونکە ئەو ئێوە ئێوەی هیچ پێ خۆش نیە. حەتەمن دەچێتە چوکووراوا، دەچێتە گوندی زەردەباخچە، ماڵی کوڕە خاڵەکەی."

مستەفاغا تووڕە بوو:

"قسەی قۆڕ بۆ دەکەی؟ کابرا لە ترسان خوێن لە لەشی دا نەماوە. بیبینی زگت پێی دەسووتێ. وا زەرد بووە دەڵێی بەهێی زەردە... ئاخر ترسەنۆکی وا کە لە ترسان نازانێ لە چ

کونێك دا خۆی بشارێتەوە, دەچێتە ماڵی کوڕەخاڵەکەی, کە دەڵێی مەڕی خوایە... عەبدیت چۆن ناسیوە... لەوانە نیە کە بەو ئاسانیەیە کلکی بە تەڵەوە بێ... بیستم ئەو کوڕە یاغیەیە کە پێی دەڵێن حەمەدۆك چەند شەو لەمەوبەر چووەتە سەر ژن و منداڵی عەبدی. دەڵێن ویستوویە ژن و منداڵەکەی بکوژێ, دوایە بەزەیی پێیان دا هاتوەو بەرەڵای کردوون. بیستورتە یان نا؟... دەستەیەکیشیان ژاندارمە وەدوای ئەو کوڕە یاغیەیە خستوە. خۆ عەبدی لەم وەزعەدا منداڵ نیە لە ئاك توورلوو وەدەرکەوێ. کوێخا حوسێن زۆر پیاوە. هەتا کەلاکی کوێخا حوسێن نەکەوێ, کەس ناتوانێ پڕی چاوان تەماشای میوانەکەی بکا... عەبدی ئەمانە باش دەزانێ. چما منداڵە کە ماڵی کوێخا حوسێن بەجێ بێڵێ و هەستێ بچێتە زەردەباخچە؟ قەولت پێ دەدەم ئێستا بچیە ماڵی کوێخا حوسێن, دەبینی لە پەنای ئاگردانەکە دانیشتوە... ئەمن دڵنیام."

عەلیەیەشەل:

"خوا بە حەقە, ناحەقیان لە کەس قبووڵ ناکا. ئەو زوڵمی لە من کردوە. خواش بە دەستی کەسێکی دیکە حەقی منی لێدەستێنێ. با خۆی بشارێتەوە... با لە ترسان شەو و ڕۆژ ئارەق هەڵڕێژێ... ئەمن کارێکم پێی نیە, هەر حەواڵەی خوای دەکەم."

مستەفاغا:

"ئەرێ, ئەتۆ حەواڵەی خوای بکە."

عەلی هەرچەند جێگای عەبدی دۆزیبووەوە, بەڵام دیسان دڵی ئاوی نەدەخواردەوەو ڕازی نەبوو هەتا باشتر دڵنیا نەبێ, حەمەدۆکی بەرێتە چوکووراواو خوا نەخواستە بەڵایەکی بەسەر بێ.

لە مستەفاغا هێندێك هەڵواو لەنانەواخانەش هێندێك نانی کڕیو بەرەو ئاك توورلوو کەوتە ڕێگا.

لە شاری ڕا هەتا باتلاغەکانی "ئاغاچسیز" نیزیکەی سەعاتە ڕێیەکە. لێرە داری بیشەی بە قەدەر دارەکانی لێرەوار بڵیندن. چۆم بە نێوەڕاستی ئەم دارانەدا دەڕوا. گوندی ئاك توورلوو کەوتووەتە پشتی باتلاغەکانی ئاغاچسیز. لەو دێیەدا کەس نیە تاولەرزی خۆڵاتیی تووش نەبووبێ.

لە نیزیك قامیشەلان وەك ئەوە دەچوو ڕێگای لێ ون بووبێ. دەستی کرد بە شوێن گێڕان. شوێنی چەقەڵێکی هەڵگرت. شوێنەکە بۆ لای باتلاغەکان چووبوو. لەوە کە ئەو شوێنەی

دۆزیبـووەوە، هـەم خۆشـحاڵ بـوو هـەم تـووڕە. لـە دڵـی خـۆی دا دەیگـوت:"باشـە، شـوێنی چـەقەڵە!..." هـەروا کـە جنێـوی بـە چـەقەڵ دەدا شـوێنەکەی هـەڵگرت. سـەرەنجام بـە دوای شوێنەکەدا لە عەرزێکی وشك سەری وەدەرنا. لەدڵی خۆی دا گوتی:"ئەو چەقەڵە سەگبابە زۆر شتی لەبن سەریەوە هەن... هەر لە جێ دا چەقەڵ حەیوانێکی بەهۆشە."

ڕۆژی دواتر هەتاو بڵێند ببوو کە گەیشتە ئاك توززلوو.

ئاك توززلوو کوێرە دێیەکی بیـست ـ سـی ماڵیـیە. هـەموو ماڵـەکانی ئـەو دێیـە کەپرن، کەپری قامیش. لەسـەر بانـە قامیـشەکانیش گیـا شـین ببـوو. بـانی کـەپرەکانی دەوروبەری قامیشەڵان هەمیشە نوێیە، چونکە قامیشەڵان لەبەر دەستیانە. قامیشەکە دەبڕنەوەو جار بە جار پێ دادەپۆشن. بەڵام بانی ئەو کەپرانە کە لە قامیـشەڵان دوورن، زۆرتر بە قامیشی وشك داپۆشراون. گیاشینیشیان نیە. ڕەنگی ئەو بانانـە کـەمێك وەك ڕەنگی زیو دەچێ.

عەلیـیەشـەل گەیشتە پەنای ئاوەدانی. مێشوولە باڵی لێك نەدەدا. تـەنیا ژنێـك لەبـەردەرگای یەکێك لە ماڵەکانەوە کە چیغی چواردەورەکەی داهاتبوو، سەرێکی هێنایەدەرو ڕۆیشتەوە ژووری.

عەلیـیەشەل:

"خوشکێ... خوشکی بەرێز... ماڵی حوسێن ئاغا کامەیە؟."

ژنەکە هاتە بەر دەرگا. ماڵێکی نیوە کەپرو نیوە تەنەکەی لە نێوەڕاستی ئـاوەدانی دا پـێ نیشان دا. عەلی کە هەناسەی سوار ببوو، بۆ لای ئەو ماڵە وەڕێ کەوت.

دەرگای ماڵەکە کرابووەوە. تاوێك لە پـێش دەرگـا ڕاوەسـتا. پیـاوێکی گەڵەگـەت لـە ماڵێ هاتەدەر:

"چت دەوێ براگیان؟."

عەلیـیەشەل:

"ئەمن ڕەعیەتی عەبدیخانم... پەیامێکم بۆی هێناوە."

پیاوەکە:

"وەرە ژوور براگیان."

لـە حەسـاری گـەورەی ماڵەکـە تێپـەڕی. چـووە ژووری هۆدەیـەك کـە سەرانـسەر بـەرەی لـێ ڕاخرابوون و ئاورەکەشـی خـۆش خـۆش دایـسا. عەبـدیخان لەبـەر ئاگرەکـە دانیـشتبوو، دەسحێبی دەگێڕان و بۆ لای ئاورەکە چەمابووەوە، وادیار بوو وێژینگی دەدان.

عەلی تاوێك لە پەنا دەرکەی راوەستا. عەبدیخان هەروا وێژینگی دەدان. هۆشی بەسەر دەرگاکەوە نەبوو و هەروا دەسحێبی دەگێڕان. پیاوە کەڵەگەتەکە بە دوای عەلی دا هاتە ژوور:

"خان... لە دێی خۆتان ڕا هاتوون."

عەبدیخان, هەروا بە دەم فکرەکانیەوە بە ئەسپایی سەری وەرسووڕاندو چاوی دە عەلیەوە بڕی. عەلی جۆرێك راوەستابوو دەتگوت خەریکە بەسەر لاقە شەلەکەی دا بکەوێ. خان لە پێش دا عەلیی نەناسیەوە. یەك دوو جار چاوی لێك نان. کاتێك عەلیی ناسیەوە ڕەنگی پەڕی. زاری کردەوە هێندێك شت بڵێ, بەڵام نەیتوانی. کەس لە قسەکانی حاڵی نەدەبوو. عەلی چووە لای. عەبدیخان چاوی پێ دەرپەڕین و دەسحێبەکەی لە دەست بەربوونەوە:

"وەرە کوڕم... وەرە بزانم باس و خەبەر چیە؟... لە دێی ڕا خەبەرت هێناوە؟."

عەلی لەبەر ئاگردان, لە لای خان دانیشت.

عەبدیخان:

"باشە... باس و خەبەر؟."

عەلی یەك دوو جار بە دزیی پیاوە کەڵەگەتەکە چاوی لە عەبدیخان داگرت. عەبدیخان تێگەیشت کە عەلی قسەیەکی نهێنیی پێیە.

عەبدیخان:

"وەسمان... تاوێك بچۆ دەرێ, ئێمە دووسێ قسەی تایبەتیمان هەن."

پیاوە باڵابەرزەکە چووەدەرێ و دەرگای پێوەدا. عەبدیخان لە عەلی نیزیك بووەوە:

"کوڕم باس و خەبەر چیە؟."

روخساری عەبدیخان لەبەر ترس و نیگەرانی شکلێکی سامناکی بە خۆیەوە گرت. پرسی:

"عەلی... نەکا ئێستا شوێنی منت هەڵگرتبێ؟."

عەلییەشەل رای خۆ فەقیر دەنواند دەتگوت ئێستا نا ئێستا لە بانگی گریانێ دەدا.

عەلی:

"خان... نازانی ئەو شوێن گێڕانە چ بەڵایەکی بەسەر من هێناوە... دێ و ماڵ و ژیان و دارونەدارم لەدەست چووەو کەوتوومەتە غەریبایەتی. ئێستا ئەوەش بەس نیە, دەبێ روحیشم بدەم. حەمەدۆك هات. منی لە چاغشاك بەگیر هێناو بەدەست بەستراوی هێنامیە ئاسیاب چەشمە. دەیگوت دەبێ عەبدیخانیش وەبینم و هەردووکتان پێکەوە بکوژم. شەوێ گەیشتینە ئاسیاب چەشمە. حەمەدۆك دەرگای ماڵەکەی تۆی شکاندو چووە ژوورێ. شیوەنی

ژن و منداڵەکەت دەگەیشتە ئاسمان. ئەمن لەو شلووق و پلووقی‌یەدا بۆی دەرچووم. چوومە ماڵی حەسۆ شێلم. حەسۆ دەستەکانی کردمەوە. حەسۆم نارد بچێ بزانێ لە ماڵی ئێوە چ باسە. حەسۆ چوو و خەبەری هێنا. دەیگوت خان لە ماڵ نیە, حەمەدیش چووەتە ژووریٚ و لە پشتەوە دەرگای داخستوە, کەس ناتوانێ بچێتە ژووریٚ و ژن و منداڵی عەبدی‌خان لە ترسان ئەوە زریاویان دەچێ... دوو یاغیی دیکەش کە لەگەڵ حەمەد بوون, وەختێك پێیان زانیبوو کە ئەمن هەڵاتووم, کەوتبوونە نێو دێ و ماڵ بە ماڵ بە دوام دا دەگەڕان... بەڵێ خان... ئەمنیش لە نێو دێی رام کرد... نازانی لە نێو دێی چ قیامەتێك بوو. بە هەر نارەحەتی‌یەك بوو لە ئاوایی وەدەر کەوتم, هەتا گەیشتمە سەر چۆمیش, گوێم لە دەنگی ئەوانە بوو کە بەدوامەوە بوون. ئێستا پێم بڵێ تەگبیری من چیە خان... ئەمن هەوەڵ خواو دووهەم تۆ شك دەبەم."

عەبدی‌خان رەنگی پەڕی. لەو نێوەدا عەلی‌یەشەلیش دەستی بە گریان و هەنیسك دان کردبوو:

"خان... دەستم بە داوێنت... فکرێك بۆ ژن و منداڵی من بکەوە. ژن و منداڵەکەم لە چاغشاك بەجێ ماون. ئاخر گوناحی من چیە. ئەمن تازە ناوێرم بچمەوە وێ. ئەتۆ رێیەکم بۆ دانێ خان. بۆ خۆشت دەبێ فکرێك بۆخۆت بکەی. لەم چوکووراوایە چ دەکەی؟... ئێستا ئێمە بە جەهەننەم، ئەتۆ دەبێ چارەیەك بۆخۆت بدۆزیەوە. ئاخر ئەتۆ خاوەنی پێنج پارچە ملکی خان. هەموو خەڵك گەورەو چووك دەڵێن عەبدی خان چووەتە چوکووراوا. ئێستا ئێمە بە جەهەننەم خان. ئەمن لە خۆم زیاتر لە فکری تۆ دام خان..."

روخسار و ئەستۆی عەبدی خان سوور هەڵگەڕان. چاوی پڕ بوون:

"کوڕم، عەلی ئاغا... دەزانم خەراپەم لەگەڵ کردووی. ئێستا بچۆ ژن و منداڵەکەت بێنەوە دێی خۆمان. نامەیەکیشت دەدەمێ بۆ ماڵی ئێمەی بەرە. دەنووسم تۆو و جووتت بدەنێ. هەرچی بووە رۆیشتوە. ئێستا بچۆ پیلی ژن و منداڵەکەت بگرەو بیان هێنەوە ئاسیاب چەشمە."

عەلی:

"ئەمن تازە ناوێرم پێ لەو نێوە بنێم خان گیان. ئەگەر ئەو بێشەرەفی بێ‌ناموسە بەگیرم بێنێ، بەخوا وجڕ وجڕم دەکا."

عەبدی خان:

"لێی مەترسە، نایەڵم چی دیکە لەو کێوانەدا بە کەیفی خۆی بێت وبچێ. بیستوومە لەگەڵ دوردووە شێتیش تێک چوون. وەڵامم بۆ دۆردووە شێت ناردوە. هەر ئەم ڕۆژانە دەستەی چیچکلیشی بەگژدا دەکەم. هیچ ترست لێی نەبێ. هەر ئەم ڕۆژانە وەك کەوبارە بۆت دەگرم. ئەتۆ ترست نەبێ.

عەبدی خان دەستی بە گیرفانیدا کردو بەستەیەك ئەسکیناسی دەرهێنا. لەنێو ئەسکیناسەکان نیزیك بە دە ئەسکیناسی سەوزی دەرهێنا:

"وەرە کوڕم، وەرە عەلی ئاغا. ئەمەش پوولی خەرجیت. ئێستا گوێ بگرە بزانە چت پێدەڵێم. ئەتۆ ئێستا دەبێ ڕاستەڕێ بچیە ئاسیاب چەشمەو سەرێکی ماڵی ئێمە بدەی. بڵێ سێ مێگەل لە مەڕو ماڵاتەکە لێ خوڕن بۆ چوکوورلوا. بەڵام وریا بە ئەو زۆڵی حەرامزادەیە نەت بینێ. بە شەو بچووە نێو ئاوایی با کەس نەت بینێ. بە یەکێك لە نۆکەرەکانی من بڵێ هەستێ بچێتە چاغشاك و ژن ومنداڵەکەت بۆ بێنێ. ئەتۆش خەبەرێکی منداڵەکانی من بزانەو وەرەوە. نازانم ئەو ئەحلەتیە چی بەسەر منداڵەکان هێناوە. هەستە عەلی ئاغا... هەستە پارووە نانێك بخۆ و وەرێکەوە."

عەلیە شەل دیسان گریا:

"خان مەمنێرە بۆ ئەولا. بەخوا وەدەستی کەوم، کەلاکم دەخاتە سەر زەوی."

عەبدی خان تووڕە بوو:

"زووبە، وەرێکەوە. قسەکانیشت لەبیر نەچن. بەخۆڕاییش مەترسە. لەوانەیە هەتا ئێستا ژاندارمە گرتبێتیان. ئەو جارێ زۆری ماوە بۆ ئەوەی ببێتە یاغی."

عەلی:

"باشە خان. بەسەر چاو. ڕاست دەکەی. ئەو ئێستا زۆری ماوە بۆئەوەی ببێتە یاغی."

نانیان بۆ عەلی هێنا. عەلی بە پەلە نانەکەی خوارد و وەرێکەوت:

"بە پشتیوانیی خوا. دەچمەوە دێ... ئیشەڵڵا خەبەرێکی ژن و منداڵەکەتت بۆ دێنمەوە."

عەلی باڵی گرتن. لاقە شەلەکەشی لەبیر چووبووەوە. ڕۆژ و نیوێك یەك تەکان بەڕێوە بوو، تا گەیشتەوە ماڵی ئومەتەزەرد. کاتێك گەیشتەوە نیوەشەو بوو. لەبەر دەرگا فیتوویەکی لێدا. ئومەت فیتووەکەی ناسیەوەو دەرگای کردەوە:

"بەسپایی، بەسپایی... ماڵەکەمان پڕ لە ژاندارمەیە. بەدوای حەمەددا دەگەڕێن. هاتوونە ماڵی ئێمە ماندوویان بجەسێتەوە، ئێستا نووستوون. وەکیل باشی عاصم خەریکە شێت دەبێ. کوڕەکانی تۆش ئەوە لە کادێنێ کەیفێ دەکەن. بەرخێکم بۆ سەربڕیون. بەڵام ئەم حەمەدۆکە ماشەڵڵا یەك پارچە ئاورە بۆخۆی. ئەقسە دەکاو نە هیچ دەڵێ. بەڵام دیارە زۆری پێیە. لە چاوانی ڕا دیارە. چاوەکانی وەك ئاگر هەڵدەبن و دەکووژێنەوە. ئێستا راوەستە. لەنێو باغییەکان ناوبانگێك دەردەکا کەس نەبینێ... وەرە بتبەمە لای وان."

چوون بۆ لای کادێنێ. ئومەت دوو خڕکە بەردی هەڵگرتنەوە. سێ جاری لێك دان. دەرگای کادێنێ بە ئەسپایی لێکرایەوە.

عەلییەشەل:

"ئەمنم... هاتمەوە."

حەمەد:

"بەخێراتیەوە، وەرە ژوور."

عەلی چووە ژوورێ و دەرگایان پێوەدا.

حەمەد:

"ئەو رەفیقەی تۆ زۆر پیاوە عەلی ئاغا. زۆر پیاوی چاکە. ئەگەر کەسێکی دیکە بایە، تا ئێستا ئێمەی بەگرت دابوو. ژاندارمەکان ماڵ بەماڵ بەدوامان دا دەگەڕێن. چاك بوو کە هاتیەوە."

عەلییەشەل:

"دیتمەوە برالە. لە ئاك توزلوو، لە ماڵی کوێخا حوسێن، لەبەر ئاگردان لێی دانیشتوە."

حەمەد لە خۆشییان دەست و لاقی خۆی لێ ون ببوون. شەمچەی لە گیرفانی دەرهێنا. شەمچەیەکی لێداو چرا فتیلەکەی هەڵکرد. ئەمە کەمتەرخەمییەکی گەورەبوو.

جەبار و نایب رەجەب، هەردووکیان لەقوژبنێك لەسەر دۆشەکێك خەوتبوون. حەمەد بەئەسپایی نقورچێکی لە جەبار کوتا. جەبار بەترسەوە لەجێی دەرپەڕی و پڕی دایە تفەنگەکەی.

حەمەد:

"شتێك نیە جەبار، ئەمنم."

جەبار:

"چیە، خەبەرێك هەیە؟."

حەمەد:

"عەلی هاتوەتەوە."

جەبار:

"عەلی هاتەوە؟."

حەمەد:

"ئەدی، هاتوەتەوە."

جەبار:

"دیویەتەوە؟."

حەمەد:

"ئەدی، دیویەتەوە."

جەبار:

"کەوابێ، کارەکەمان جوور بووە."

حەمەد:

"ئەدی، جوورە."

جەبار:

"کەوابێ، دەسبەجێ دەبێ وەرێ کەوین. وا نیە؟."

حەمەد:

"ئەدی، دەسبەجێ."

جەبار:

"دەسبەجێ... بەڵام نایب رەجەب وەزعی باش نیە. ملی بۆ ناجوولێ... دەترسێ بمرێ."

حەمەد:

"ئەدی تەگبیرمان چیە؟."

جەبار:

"نایب دەبێ هەر لێرە وەمێنێ."

حەمەد:

"نامێنێتەوە... دەترسم تووشی شتێکمان بکا."

جەبار:

"چارە نیە، دەبێ هەڵی ستێنین."

حەمەد:

"ئەرێ، دەبێ هەڵیستێنین."

جەبار نقورچێکی لە نایب کوتا. نایب لە خەوێ دا تەنیشتاو تەنیشتی کرد.

جەبار:

"نایب، هەستە."

نایب رەجەب:

"ئەمن خەریکم دەمرم... ئەوە دەمرم."

جەبار:

"هەستە نایب... دەبێ برۆین، هەستە."

جەبار دەستی نایبی گرت و راستی کردەوە.

نایب ناڵاندی:

"لێم گەڕێن... ئەمن خەریکم دەمرم... ئەمن ئیدی دەمرم."

جەبار:

"هەستە رەجەبەشێر... هەستە نایبەشێر... ئاخر ئەتۆ نەتگوت بۆخۆت سەردەستەی؟... هەستە..."

وەختێك دەستی نایبی بەردا، نایب سەرلەنوێ کەوتەوە نێو جێیەکەی و لێی کەوتەوە.

حەمەد:

"بەستەزمانە... چەند رۆژە خەو نەچووەتە چاوی. ئەمڕۆ یەکەم رۆژە کە خەوی لێدەکەوێ... چەند رۆژە هەر هاواری بووە."

جەبار:

"ئەدی چ بکەین؟... لێرە بەجێی بێڵین و برۆین؟."

حەمەد:

"نا."

حەمەد جمگەی دەستی نایبی گرت و راستی کردەوە.

چەند جار بە سرتە بۆی دووپات کردەوە:

"نایب, نایب... عەبدیخان لە گوندی ئاك توزلوویە, لە ئاك توزلوو... لە ئاك توزلوو... عەلی خەبەری هێناوە... عەلیشەل هاتەوە نایب, هەستە..."

نایب رەجەب چاوی هەلێنان:

"چی؟..."

حەمەد:

"جێگای عەبدیخانمان دیتەوە, لە ئاك توزلوویە."

نایب رەجەب:

"عەلیشەل جێیەکەی دیتەوە؟."

حەمەد:

"بەلێ, عەلیشەل دیتیەوە."

نایب رەجەب:

"ئەگەر نەیدیبایەوە, هەر لە جێ دەمکوشت... روحی خۆی کریەوە."

نایب هەلستا. دەتگوت ژەهری خواردوە. نێوچاوانی تێك نابوو. نەیدەویست بزانن ئەستۆی چەند دێشێ:

"کورینە هەتا وەرێ نەکەوتووین, با برینەکەم دەرمان بکەین. نایب رەجەبتان دەیەوێ کارێك بکا, خوا لە هەموو گوناحەکانی خۆش ببێ, دەیەوێ عەبدیخان بکوژێ. نایب رەجەبتان دەیەوێ هەموو گوناهەکانی بە خوێنی عەبدیخان بشواتەوە."

عەلیشەل:

"با ئەمن بۆی دەرمان کەم."

عەلی لە پەنای ئەژنۆی نایب دانیشت.

نایب رەجەب:

"کوری چاك, گیانی خۆت کریەوە. ئەگەر نەتدۆزیبایەوە, بە خوایەتی خوا هەر لە جێ دەمکوشتی."

عەلی:

"دیمەوە. دوژمنی فەقیرو هەژارانم دیتەوە. حەقی خۆی لە مستێ نێن."

نایب رەجەب:

"وای حەقی خۆی لە مستێ دەنێم کەیفت پێی بێ."

عەلی لە نێو قوتووە بۆیاخێك مەڵحەمی دەرهێنا. مەڵحەمی لەسەر برینەکە داناو بەستی.

نایب رەجەب:

"یاڵڵا با برۆین, ئەگەر بە دەقیقەش زووتر بکوژرێ, باشترە."

بە پەلە لە دەرگا چوونە دەر. لەبیریان چوو خواحافیزی لە ئومەت بکەن. وەرێ کەوتن.

جەبار:

"سوپاس بۆ خوا کە ئەو رۆژەشمان دیت."

حەمەد:

"سوپاس بۆ خوا."

حەمەد لە خۆشییان نەیدەزانی چ دەکا. لە پێش ئەوانی دیکەوە, وەك باڵی لێ ڕوابن دەفڕی, عەلیپەشەل بە دوای حەمەدەوە بوو.

عەلیپەشەل:

"دە لیرەشی دا بە من."

عەلیپەشەل ئەو درۆیانەی کردبوونی و ئەو گریانەی پێی گریابوو, بۆ ئەوانی دەگێڕایەوەو ئەوانیش پێدەکەنین.

کاتێك گەیشتنە نیزیك شاوایی "تاقەتوو", لە برسان خەریك بوو بکەون. بە رۆژ حەسابوونەوەو بە شەویش بە نێو دارو دەوەن دا رۆیشتبوون."

عەلیپەشەل:

"ئێستا غەمی نانتان بۆ دەخۆم. هەر لە نێو ئەم قوولکەیە چاوەڕوانم بن."

عەلی رۆیشتە گوندی تاقەتوو. لەوێوە بۆ ئاك توزلوو نیو سەعات رێ بوو. ئاك توزلوو لە پشت ئاناوارزا, لە پشت قەڵاتی ئاناوارزا بوو. عەلی, نیو سەعات دواتر بە هەمبانەیەکی گەورە نان و دۆدانەیەك ماستەوە گەڕایەوە.

"ماستەکەم دزی. دۆدانە ماستەکەیان بە دارێکەوە هەڵواسیبوو. وام هەڵگرت, دەتگوت ئی خۆمانە."

نان و ماستەکەیان خوارد. پاشان یەکی سیغارێکیشیان پێچایەوە.

لە روخساری نایب رەجەب ڕا دیار بوو کە برینەکەی خراپ وەژان هاتوە. هەروا ددانی لە چیرەوە دەبردن و نێوچاوانی گرژ دەبوو. کەمێکیش بۆڵەی دەهات:

"بۆخۆم سەردەستەم. هەرکەس قسەم لە قسەی بکا, بۆخۆم دەزانم چی لێدەکەم. لە ژیانی خۆم دا گوناحم زۆر کردوون. ئێستاش دەمەوێ خێرێك بکەم. هەرچی گوتم بە قسەم بکەم."

نایب رووی بۆ لای جەبار وەرگێڕا:

"حاڵی بووی چیم گوت؟."

پاشان لە حەمەدیشی پرسی:

"ئەتۆش تێگەیشتی؟."

جەبار:

"حاڵی بووم."

حەمەد:

"تێگەیشتم."

نایب رەجەب:

"هەتا شەوێ دەبێ لێرە بین. شەوێش دەبێ بچینە قەراخ دێ و لە نێو داران دا خۆمان بشارینەوە. ئێوە دەبێ بە قسەی من بکەن. ئەمن ئەو وڵاتەی بست بە بست شارەزام. تێگەیشتی؟... بست بە بست... هۆ وێ دەبینن؟... ئەوێ پێی دەڵێن مەیدانگای جەیهان. پشتەوەی وێ ئاناوارزایە، پشتی ئاناوارزاش گوندی حاجیانە. وەختێك عەبدیان کوشت دەبێ بچینە گوندی حاجییان و روو لە کێوی حاجییان بکەین... وەختێك کابرامان کوشت گوردانێك ژاندارمەمان وەدوا دەخەن. زەحمەتە لە چنگیان دەرچین، بەڵام هیچ کەس ئەم ئێوە ئێوەی وەك من شارەزا نیە. هەموو کون و کەلێنەکانی شارەزام... نابێ هیچ کامتان قسە لە قسەی من بکەن. ئێوە ناوی کاکە شەلەتان بیستوە یان نا؟... ئەو بە قسەی منی نەکردو هەموو دەستەکەی بە کوشتن دا، ئەویش چ دەستەیەکی گەورە!... بۆخۆشی کوژرا. هیچ کەس دەوروبەری چوکووراوا وەك نایب رەجەبی خۆتان شارەزا نیە... هەمووتان دەبێ بە قسەی من بکەن."

ئەو جێیەی خۆیان لێ شاردبووەوە لافاوگە بوو. لافاو خڕە بەردی سپی و سوورەکاج و قامیش و دەوەن و رەگەدارێکی زۆری تێ کردبوو و بەسەر یەك دا کەڵەکەی کردبوون.

لافاوەکانی دواتریش هێندێك لکەداری دیکەیان هێنابوو، بەڵام نەیانتوانیبوو دوورتریان بەرن و هەر لە بن کەڵەکە دارەکەی پێشوو، خڕیان کردبوونەوەو بۆخۆیان بەسەر ئەو داروبارەدا تێیەڕیبوون و لە پەنای کێلگەکەوە قوولکەیەکیان دروست کردبوو.

حەمەد و ئەوان لەو قوولکەیەدا خۆیان حەشار دابوو.

ئێوارە داهات. هەتاو خەریك بوو ئاوا بێ. دەشت بە تیشکی هەتاو نوورباران دەکرا. لێوارەی هەورەکان ڕووناك بوو. هەورەکان بە سوورچی ئەوپەڕی دەشتەکەوە چەسپابوون.

نایب ڕەجەب:

"زۆر لەمێژ بوو خۆرئاوابوونی چوکووراوام نەدیبوو. لێرە وەختێك هەتاو دێ ئاوا بێ، ماوەیەك بە زەوییەوە دەچەسپێ و دەمێنێتەوە... هەر سوور دەبێ و سوورتر دەبێ... وەك خوێن سوور دەبێ... لە پاشان لەپڕ ون دەبێ... ئێستا تەماشای کەن... ئەمن ئیدی دەبێ بمرم... وەرن تەماشا کەن."

جەبار پێکەنی.

نایب ڕەجەب تووڕە بوو:

"بە چی پێدەکەنی سەگباب؟."

جەبار:

"بە عەلیپەشەل پێدەکەنم."

نایب بێدەنگ بوو.

هەتاو ئاوا بوو. دنیا تاریك بوو. نایب دەستی لەبەر پشتێنێ نابوو، و وەك پەیکەرێکی بێگیان ڕوو بە تاریکایی کاتی خۆرئاوا ڕاوەستابوو:

"ئەمن ئیدی ئەجەلم هاتوە. چاك بوو، هەر ئەبێ پێش مردنم جارێکی دیکە خۆرئاوابوونی چوکووراوام دی."

لە دەشتی ئاقەتوو تێپەڕین. گەیشتنە باتلاغەکان. وەختێك لە باتلاغەکان هاتنەدەر، ماڵە قامیشەکانی ئاك توزلوو وەدەر کەوتن. لە کولاوکەی یەك دوو ماڵەوە ڕووناکایی دەهاتە دەر. ماڵەکانی دیکە لەتاریکایی دا ون ببوون. زۆر ماندوو بوون. لە بن دەوەنێك دانیشتن. عەلیپەشەل خەریك بوو سیغارێك داگیرسێنێ. نایب کە لە سەرەخۆ دەیناڵاند، گوڕاندی:

"شەلەی قوڕمساغ... دەتەوێ کەلاکت بخەمە سەر زەوی؟... لەگیرفانتی نێ."

عەلیپەشەل بێ ئەوەی هیچ بڵێ، شەمچەکەی لە گیرفانی نایەوە.

نایب ڕەجەب جارێکی دیکە بە توندی دەستووری دا:

"دووبارە پێتان دەڵێم... هەرکەس گوێم بۆ ڕانەگرێ، هەر لە جێ دەیکوژم... ئەگەر بابیشم بێ دەیکوژم... بڵێن بزانم منتان بە سەردەستە قبووڵە یان نا؟."

گوتیان:

"سەردەستە ئەتۆی نایب."

پاش ئەم قسەیە نایب سەری داخست و نیو سەعاتێك بێدەنگ ماو لەفکرەوە چوو. پاشان سەری هەڵبڕی, بڕۆی تێك نان و لە حەمەدی پرسی:

"ئەم شەلە دوایەش بە کەلکی تۆ دێ؟."

حەمەد:

"ئەدی..."

نایب رەجەب:

"یەکی وەك عەلیبەشەل بەکەلکی هەموو یاغییەك دێ."

نایب دووبارە بێدەنگ بوو. وەخت درەنگ دەبوو. جەبار خۆی پێ ڕانەگیرا:

"چتە نایب؟... خەوت لێکەوتوە؟."

نایب زۆر لەم قسەیە تووڕە بوو. ددانی لە چیڕەوە بردن و جوابی دایەوە:

"سەگباب... پێت وایە لەم دەشتە وا بە ئاسانی دەکرێ بچینە نێو دێ, کابرایەکی لەماڵی خۆی دا بکوژی و بچیەوە شاخی؟... خەریکم نەخشەی دەکێشم."

نایب دووبارە بێدەنگ بوو و لە گژ فکران ڕاچوو. پاش ماوەیەك وەك لە خەو ڕاپەڕیبێ, سەری هەڵبڕی. لەو تاریکایییەدا تەماشای یەك بە یەکیانی کرد. لەبەر شۆقی ئەستێرە دەم و چاوی هیچیانی بۆ نەبینرا.

دەنگی وەك دەنگی دایکێك گەرم و بە سۆز بوو" گوتی:

"کوڕینە... ئیدی ئەمن وەختم هاتوە. ئەم برینە کاری خۆی کردوە. زۆر باش دەزانم تازە بۆی دەرچووم. ئەمن لە فکری ئێوەدام لە فکری حەمەدۆك دام. دڵی حەمەدۆك, دڵی پیاوانە. لەنێو ئەم پێنج دێیەدا, دوای چەندین ساڵ لەنێو هەموو پیاوەکان دا ئەو تاقە پیاوە هەڵکەوتوەو لە رووی زاڵم هەڵگەڕاوەتەوە. حەمەد زۆر پیاوە. ئەگەر بێنم هەمیشە وەك گلێنەی چاوی خۆم پارێزگاریی لێدەکەم. بەڵام ئەمن تازە ڕۆیشتووم..."

پاشان, رووی کردە عەلیبەشەل:

"ئەتۆ... شەلە, ئەتۆ... ئەتۆ ئەگەر پیاوێکی باش بی, چونکە یاغییش نی, دەتوانی زۆرت کەلك بۆ حەمەد هەبێ."

عەلیبەشەل:

"هەر کارێك لە دەستم بێ، بۆ حەمەد تەنەخی ناکەم. ماڵم وێران بوو. لە ئاوەدانی دەریان کردم. ژن و منداڵم ئاوارە بوون. هەموو ئەو دەردانە هەروا بزانە بوونە بەرداشێك و لەسەر دڵم دەگەڕێن."

نایب:

"ئێستا بێینەوە سەر کارەکەی خۆمان. نیوەشەوێ دەبێ بچینە نێو دێی. ڕاستەڕێ دەچینە ماڵی حوسێن. لە ژووری دا دەیکوژین و دێینە دەرێ. بەڵام عەلییەشەل نابێ لەگەڵمان بێ."

حەمەد:

"ئێستا نیوەشەوە نایب. هەر ئێستا دەبێ وەڕێ کەوین. نا؟..."

نایب هەستا. فیشەکدانەکانی ڕێك و پێك کرد، دەمانچەکەی پڕ کرد، نارنجۆکەکانی تاقی کردنەوەو گیرفانەکانیی پشکنین:

"شەلە، شەمچەکەت بدە بە من و لەم دەوروبەرانەش رامەوەستە... بۆ هەر کوێیەك دەچی، بچۆ."

عەلییەشەل شەمچەکەی دەرهێناو دای بە نایب.

"ئیشەڵلا بە خێرو خۆشی."

پاش ئەم قسەیە پشتی تێکردن و ڕۆیشت.

حەمەد:

"دووبارە ئیشەڵلا یەکتر دەبینینەوە... سوپاست دەکەین."

عەلی:

"بە هیوای خوا."

وەختێك عەلییەشەل لە تاریکایی دا ون بوو، ئەوانیش بۆ لای ئاوەدانی وەڕێ کەوتن. شەماڵێکی فێنکی دەهات. بایەکە بەنێو بانە قامیشەکانی ئاك توزلوو دا تێدەپەڕی و فیتووی لێدەدا.

کە گەیشتنە پەنای ماڵە نیوە قامیش و نیوە تەنەکەکە، ڕاوەستان.

نایب:

"حەمەد... لە دەرگا بدە... جەبار ئەتۆش ئامادە بەو سەنگەر بگرە. لە پشت ئەو سەکۆیە درێژ بە. هەرکەس هات ویستی لەم ماڵە نیزیك بێتەوە، هەر لە جێ بیکوژە. بەزەییت بە فرمێسکی چاوی هیچ کەس دا نەیەتەوە. هەر ڕەشاییەکت دی نیزیك بووەتەوە لێی دەو لە عەرزی بدە."

حەمەد خڕکە بەردێکی هەڵگرتەوەو دەستی کرد بە دەرگا کوتان. تەنەکەکانی ماڵێ لەبەر تیشکی ئەستێران دا وەك سەهۆڵ دەبریسکانەوە. تەقە تەقی حەمەدیش بێدەنگیی نێو دێیەکەی تێك دەدا. پاش ماوەیەك دەنگی پیاوێك لە ژووریّ ڕا هاتە بەر گوێ:

"کێ بوو؟... کێیە بەو نیوەشەوە..."

نایب ڕەجەب:

"ئەمنم براله... ڕەعیەتی عەبدی خانم. پەیامم بۆ هێناوە."

هەر ئەو دەنگ جوابی دایەوە:

"بڕۆ بەیانی وەرەوە."

لەو کاتەدا دەنگی وەڕینی سەگێك لەوسەری ئاوایی بەرز بووەوە.

نایب ڕەجەب:

"پەیامەکەم بە پەلەیە. دەبێ هەر ئێستا بیدەمێ براله... بیکەوە."

دەرگا کرایەوەو دەسبەجێ پێوەدرایەوەو لە ژووریّ ڕا داخرا.

نایب ڕەجەب:

"ئاخ لە دەست ئەم برینە... ئەگەر ئەم برینە نەبووایە, چووبوومە ژووریّ. ئاخ لە دەست ئەم برینە... بەڵام ئێستا نیشانیان دەدەم. ئێستا ناچاریان دەکەم دەرگا بکەنەوە."

نایب ڕەجەب بە هەموو قەوەتی خۆی نەڕاندی:

"ئەمن نایب ڕەجەبم, سەرکردەی یاغییان... ئەگەر تا ئێستا منتان نەناسیوە, ئێستا دەمناسن. ئەو ناپیاوەی دەبێ بدەنە دەستی من, دەنا بۆخۆتان زانی... ئەمن حوسێن ئاغاو ئەو جۆرە قسانە نازانم... ئەو کافرەم تەحویل بدەن."

حەمەدیش وەقسە هات و نرکاندی:

"منیش حەمەدۆکم. هاتووم تۆڵەی دایکم و دەزگیرانەکەم بکەمەوە. هاتووم تۆڵەی دێهاتییەکانیش بستێنمەوە... هاتووم تۆڵەی فەقیرو هەژاران بکەمەوە. عەبدیی تەحویلی ئێمە بدەن... ئەگینا خۆتان زانی."

هەر ئەو دەنگ لە ژووریّ ڕا جوابی دایەوە:

"عەبدیخان لێرە نیە. بڕۆن وەدوای کاری خۆتان کەون. لێرە نیە."

نایب:

"بەمن دەڵێن نایب ڕەجەب, مامۆستای یاغییان... هەتا عەبدیی وەرنەگرم, هەنگاوێك لێرە دوور ناکەومەوە."

دوایەش دەستووری بە حەمەد دا:

"نارنجۆکێك لە ژێر دەرگاکەدا بتەقێنەوە. دەرگاکە لەبەر یەك هەڵتەکێنە."

هەر ئەو دەنگی پێشوو بەرز بووەوە:

"ماڵەکە ژن و منداڵی تێدایە... عەبدی لە ماڵ نیە."

نایب رەجەب:

"کەوابوو دەرگاکە بکەوە."

هەر ئەو پیاوە:

"نایکەمەوە."

نایب رەجەب نەڕاندی:

"حەمەد, زامنی نارنجۆکەکە راکێشەو دەرگاکە لەبەر یەك هەڵتەکێنە."

حەمەد:

"حازرم نایب... چاوەڕێی دەستووری تۆم."

نایب:

"کەوایە, لەسەر چی راوەستاوی."

لەوکاتەدا لە ژووریَ را تەقەیان لێ‌کرا.

نایب:

"حەمەد, درێژ بە. ئەو بێ‌ناموسەیە تەقەمان لێ‌دەکا."

لە ژووریَ ڕا وەك بارێزان گوللە دەهات.

نایب:

"حەمەد نارنجۆکەکەت باوێ."

دەنگێك لە ژووریَ ڕا هات:

"دەست راگرن. ژن و منداڵ گوناحیان چیە؟ ئێمە دێینەدەر. ئێوە بچنە ژوور و حیسابی خۆتان بکەن. عەبدی‌خان تۆش تەقە مەکە, راوەستە ئێمە بچینە دەریَ, پاشان هەرچی دەیکەن بیکەن."

دەنگی تەقە لە ژووریَ کپ بوو. دەرگا کرایەوە. منداڵی خەواڵوو و ژنەکان بە جل و بەرگی خەویانەوە لە ژووریَ دەهاتنەدەر. هەموویان لە ترسان وەك مێرۆك دەلەرزین و لە ماڵیَ دوور دەکەوتنەوە. ئاخر جاریش پیرەپیاوێك و دوو کوڕە جحێڵە لە ماڵیَ هاتنەدەر.

پیرەپیاو:

"عەبدی لە ژووریێیە. ئەگەر حیسابێکتان لەگەڵی هەیە، خۆتان زانی بە کاری خۆتان."

پاش ئەوە دیسان لە ژووریێ دەنگی تەقە بەرز بووەوە. عەبدی لە پەستا تەقەی دەکرد.

دێهاتییەکان بە دەنگی تەقە لە ماڵەکانیان دەهاتنەدەرو دەهاتنە دەوروبەری ماڵی حوسێن ئاغا. لەنێو دێهاتییەکان دا یەکێك هاواری کرد:

"یاغی هاتوون."

پاش ئەم قسەیە هەموو دێهاتییەکان رایان کردەوە لای ماڵەکانی خۆیان و خۆیان دەژووریێ هاویشتەوە. لە ماوەی دەقیقەیەك دا دیسان نێو ئاوەدانی چۆڵ بووەوە.

نایب:

"حەمەد، لە پشت دەرگا دامەزرێ و تەقە بکە."

حەمەد:

"قازانجی چیە نایب؟... کابرا لە ژووریێیە. دەتوانێ هەرسێکمان بنگێوێ."

نایب بە گاڵتە پێ هاتنەوە جوابی دایەوە:

"هەرسێکمان دەنگێوێ... ئێستا ئەمن نیشانی دەدەم. ئەتۆ دەرگاکە وەبەر گوللە بدەو کارت نەبێ. بەڵام هەرچی گوتم دەبێ بەقسەم بکەی. دەرگاکە وەبەر گوللە بدە."

پاشان بە هەموو قەوەتی خۆی نەڕاندی:

"ئاوا ئاغا عەبدی. لە جیاتی ئەوەی بێیەدەرێ و خۆم لەبەر پێیان هاوێی، تەقەمان لێدەکەی. بەڵێ؟... کەوابوو ئێستا پێت نیشان دەدەم."

نایب چووە پشتەبانێ، ئەو لایە کە بای لێوە دەهات.

حەمەد دەرگاکەی وەبەر دەسرێژ دابوو و نەیدەزانی نایب چ دەکا. عەبدی لە ژووریێ ڕا دەرەوەی گوللەباران دەکرد. جەبار روو بە دێ لەسەر عەرزی راکشابوو و سەنگەری گرتبوو. عەبدیخان تفەنگچییەکی خەراپ نەبوو. ئەگەر حەمەد لە پشت سەنگەری بەردەرگا نەبووایە لەمێژ بوو پێکرابوو.

لەدەرێ شوێنەوارێك لە ژن و پیاو و گەورەو چووك دیار نەبوو. دێ هەروەك ئەو وەختە کە تازە هاتبوون، چۆڵ و بێدەنگ بوو.

ماوەیەك رابرد. حەمەد گوللەبارانەکەی نەدەپساندەوە. ئاخری ئەم کارە چ دەبوو؟... نایبیش دیار نەبوو. لەحزەیەك دەستی لەو تەقە خۆڕاییە راگرت، نایب هاواری لێ بڵیند بوو:

"دایك حیز، ئاخر نەمگوت دەرگاکە وەبەر گوللە بدە؟."

حەمەد بە بێ وازیی‌یەوە سەرلەنوێ دەستی بە تەقە کردەوە.

لەو کاتەدا لە پشتەوەی دارتووەکانەوە دەنگێك بیسترا:

"ئەگەر هەتا بەیانییش تەقە بکەن، ناتوانن عەبدیی بێننەدەر."

حەمەد:

"ئەتۆ کێی؟."

هەر ئەو دەنگ جوابی دایەوە:

"ئەمن حوسێن ئاغام. ئەمە بزانن کە تا ئەمڕۆ جگە لە رەشیدە کوردە هیچ یاغیی‌یەك لاقی وەچوکووراوا نەکەوتوە. رەشیدە کوردەش چوکووراوا سەری خوارد. رۆژ بێتەوە لەم دەشتە وەك کەوبارە بەدەست دەتانگرن. وەرن رێی خۆتان بگرن و برۆن."

نەعرەتەی نایب رەجەب لە پشتەوەی ماڵەکە بەرز بووەوە:

"جەبار، جەبار... ئەو یەزیدەی بێدەنگ کە."

جەبار بن دارتووەکەی وەبەر گوللە دا. لەو کاتەدا ئەوەی دەبوو بکرێ، کرا. بڵێسەی ئاور لە چواردەوری خانووەکە بەرز بووەوەو لە ماوەی یەك سانیەدا سەرتاسەری خانووە قامیشەکە ئاگری گرت.

نایب رەجەب:

"حوسێن ئاغا، حوسێن ئاغا... هۆی گەووادباشی. رەشیدە کوردە دەگیرێ، بەلام ئەمن نا. ئەمن نایب رەجەبم. ئەمن گورگی چوکووراوام حوسێن ئاغا. یان ئەمشەو عەبدیی دەکوژم، یان تەواوی ئاك توزلوو دەسووتێنم."

ئەو پیاوەی لە بن دارتووەکە بوو هاوارێکی لێ‌هەستاو پاشان ژن و منداڵ و هەموو دێیەکە دەستیان کرد بە گریان.

نایب رەجەب:

"حەمەد، ئیدی تەقە مەکە. ئێستا ئەو ناپیاوە قڕ دەبێ و بە ناچار دێتەدەر."

حەمەد دەستی لە تەقە کێشایەوە.

شەوبا، بڵێسە ئاورەکانی، کە هێندەی سپیدارەکان بەرز بوون، بە راست و چەپ دا دەبرد. کەپری دراوسێشیان تاوێك دواتر ئاگری گرت. پاشان ئاگر گەیشتە کەپری پشتەوەش. لە ماوەی پازدە بیست دەقیقەدا زیاتر لە دە کەپر ئاوریان گرت.

حەمەدو جەبار دامەزرابوون و جوولەیان نەدەکرد. نایب رەجەب وەك فرفرە بە دەوری کەپرەکەدا دەسووڕاو دەینەڕاند:

"وەرە دەرێ عەبدی، وەرە دەرێ... وەرە دەرێ و خۆت لەبەر دەست و پێی حەمەد باوێ، بەلکوو لێت خۆش بێ."

لە ژووریٚ دەنگێك نەدەهات. جار جار گوللەیەك بە بنانگوێی نایب دا رادەبرد. بلێسەکان بە پریشك هاویشتن بەرەو ئاسمان هەلدەفڕین. بلێسەکان خوارو راست دەبوونەوەو لە تاریکایی شەودا بە لەت و پەتی بلاو دەبوونەوە. دنیا وەك رۆژی رووناکی لێهاتبوو. لە بەردەلانی شینی ئاناوارزاوە هەتا درووەلانی قەراخی چۆمی جەیهان تیریژوویکی رووناکایی دڕی بە تاریکایی شەو دابوو. دێهاتییەکان کە بە توێی کراس و دەرپێی سپییەوە لە مالەکانیان هاتبوونەدەر، بەم لاو ئەو لادا رایان دەکردو شڕەو بڕەی مالەکانیان لەنێو خانووە سووتاوەکان دەردەکێشا. قیامەتێك بوو...

نایب دیسان نەڕاندی:

"عەبدی، هەتا نەبرژیوی وەرە دەرێ."

پاشان بانگی حەمەدی کرد:

"حەمەدی خۆم... خانووەکە دەرگای دیکەی نییە. ئێستا ناچارە هەر بەو دەرگایەدا بێتەدەر. هەر لەوێ تفەنگێکی لە مێشکی سەری بدە."

حەمەد:

"باشە، نایب."

پیرێژنێکی بالابەرز لەبن دارتووەکەوە بە غاردان هاتە لای مالێ. چووە ژووریٚ. نایب رەجەب هیچی نەگوت. ژنە دۆشەکێکی بە کۆلێ داداو هاتەوە دەرێ و بە غاردان بەرەو دارتووەکە گەڕایەوە. دۆشەکەکەی لەوێ داناو سەرلەنوێ هاتەوە. دیسان چووە ژووریٚ. ئەمجارەیان سندووقێکی لەگەل خۆی هێنا. پاشان مەنجەل و جەوال و لێفەو بەرەکانی هێنایەدەر. ئاخر جاریش لێفەیەکی زۆر گەورەی وەبن هەنگلی داو هێنایەدەرێ. لێفەکە هێندێ شتی تێوە پێچرابوو. پاشان ئاگرەکە گەیشتە دەرگا. حەمەدو جەبار هەر لە سەنگەرەکانیان دا بوون. نایب رەجەبیش بە دەوری کەپرە نیوە قامیش و نیوە تەنەکەکەدا دەسووڕا.

بەلام خەبەرێك نەبوو. نە عەبدی هاتە دەرێ و نە هیچ. بانی مالەکە بە تەواوی سووتاو تێك تەپی. دیسان عەبدی دیار نەبوو. چاوەڕێ بوون. دیوارەکانیش سووتان و هەلوەرین. بەلام کەس لە مالەکە نەهاتەدەر.

بایەکە توندی کردبوو. بڵێسەکان لەم کەپرەوە دەچوونە ئەو کەپر. زۆربەی نیزیك بە تەواوی کەپرەکانی دێ گڕیان گرتبوو. دنیا وا رووناك ببوو، دەتگوت رۆژە. دەتگوت خۆرەتاوی چوکووراوا کە وەك خەڵوزی تواوەوە دەچوو، لە دەشتێی داوە. سێبەری درێژ درێژی دارەتوو و دارە بێیەکان کەوتبووە سەر زەوییە غاوییەکان. سێبەری دێهاتییەکان لەسەر زەوی تێك دەئاڵقا.

ئەوەی دەهات وەك با نەدەچوو، یەك پارچە گڕ بوو. دەتگوت لەدوور... لە جێگایەکی زۆر دوورەوە بڵێسەو ئاگر دەپرژێنن.

حەمەد:

"لە دەستمان دەرچوو... ئەی داخی بە جەرگم..."

جەبار:

"ئەرێ، لە دەستمان دەرچوو."

نایب رەجەب:

"خانووەکە هیچ دەرگای دیکەی نەبوون. جگە لەوەش ئەمن هەمیشە بە دەوری خانووەکەدا دەسووڕام. لێی وریا بووم کە نەکا یەکێك لە دیوارەکان کون بکاو بێتە دەرێ. خەبەری نەبوو. پێم وایە هەر لەوێ سوتاوە. تەماشای کردوە بسوتێ باشترە لەوەی وەدەستی ئێمە بکەوێ."

جەبار:

"رەنگە."

حەمەد:

"رەنگە... بەڵام هەتا بە چاوی خۆم کەلاکەکەی نەبینم، باوەڕ ناکەم."

پاشان حەمەد خەفەتی بۆ پەیدا بوو:

"حەیف، حەیف... دێیەکی زەلام بە گوناحی ئەو یەزیدەوە سووتا."

جەبار:

"ئەدی. هەموو دێیەکە سووتا."

نایب رەجەب:

"با بسووتێ... با هەموو چوکووراوا بە دارو بەردەوە بسووتێ."

حەمەد خەفەتی دەخوارد:

"فەقیرو هەژارەکان گوناحیان چیە؟."

نایب رەجەب:

"ئەمانە لە جێ دا هیچیان نیە. با خانووشیان نەبێ. بۆ وان فەرق ناکا... ئەوان هەر ئەوەن کە هەمیشە بوون."

حەمەد:

"باشە نایب... ئێستا چ بکەین؟ هەروا راوەستین؟."

نایب:

"ئێستا چ بکەین؟."

جەبار:

"دەبێ هەروا راوەستین و لە ئاورەکەوە رامێنین؟."

حەمەد:

"حەتمەن ئێستا لەمێژە خەبەرچی گەیشتوەتە شار. سبەینێ قیامەتێك بەرپا دەبێ، هەر مەپرسە."

نایب رەجەب بە نەعرەتە کێشانەوە پێکەنی:

"سبەینێ تەلگراف دەکەن بۆ تەنکەرە کە دێیەکی گەورەیان سووتاندوە. ئێستا دەبێ خۆمان بگەیەنینە گابەردەکانی ئاناوارزا. ئەگەر لە دەشتێ پێوەبین، حیسابمان تەواوە..."

هەرسێکیان تەماشای خانوویەکیان دەکرد کە هەروا دەسووتا. هەرسێکیان هەناسەیان هەڵکێشا. پشتیان لە دێیەکی سووتاو کردو وەڕێ کەوتن.

وەختێك لە دێی چوونەدەر، دووپارە بەرەو دێ گەڕانەوە. هەموو دێیەکە یەکپارچە ئاگر بوو...

حەمەد:

"ئەی خوایەگیان... ماڵێکی ساغی تێدا نەماوە. ئەگەر ئەو بایەی نەهاتبایە، وای لێنەدەهات. پێم خۆش بوو بمرم، بەڵام وا نەبایە."

جەبار:

"ماڵێکی لێ دەرنەچوو. هەموو دێیەکە سووتا."

حەمەد:

"وەختێك لە دێی وەدەر دەكەوتین ژن و پیاو و گەورەو چووك راوەستابوون و تەماشایان دەكردین. دەتگوت هەموویان وشك بوون. هیچكامیان زاریان هەڵنەپچڕاو قسەیەكیان نەكرد. یەكیان متەقی لێوە نەهات. نە تووكیان لێ‌كردین، نە بەرد بارانیان كردین و نە جنێویان پێ داین. هەروا بزانە هەموویان مردوون. بریا مردبام و ئەو دیمەنەم نەدیبایە."

نایب وەڵامێكی سەربەرەژووری دایەوە:

"باشە... بوو ئیدی... وەی ئەستۆم، وەی... كوڕینە ئەمن ئیدی دەمرم. دەڵێی خەریكن سەرم دەبڕن... وەی ملم، وەی..."

نایب دانیشت. سەری لەنێو ئەژنۆیانی گرت و ماوەیەك هەروا مایەوە. حەمەدو جەبار لەسەر سەری راوەستابوون. پاشان نایب لەپڕ كەوت و دەستی كرد بە تل دان. جەبار ویستی لە باوەشی گری. بەڵام نایبی كەڵەگەت و چوار شانە بەو ئاسانییە لە باوەش نەدەكرا. نایب وەك مار جینگڵی دەدان.

شیوەن و گریانێك لە لای ئاوەدانی بەرز بووەوە. شیوەن و گریانێكی بەكۆمەڵ. ئەستێرەی رۆژێ هەڵاتبوو. ئەو ئەستێرە گەورەیە پریشكی داویشتن. دەتگوت ئەستێرەیەكی وا گەورە لە ئاسمان هەڵدەسووڕێنن و ئەویش بە دەوری خۆی دا پریشكان داوێ... دەنگێك بیسترا:

"لێرەوە رۆیشتن. هەر ئێستا بێرەدا تێپەڕین."

دەنگێكی دیكە پرسیاری كرد:

"بە كام لادا رۆیشتن؟."

حەمەد بۆ لای جەبار خوار بووەوە:

"راست دەنگی وەكیل باشی عاصمە."

جەبار خەجلا:

"خۆیەتی، خۆیەتی... نایب گەمارۆ دراوین، نایب هەستە."

لە كاتێك دا نایب لەبەر ئازاری برینەكەی وەك مار جینگڵی دەدان، جەبار بە كۆڵێی‌دا داو وەرێ كەوتن. غاریان دەدا. بەڵام نەیاندەزانی بۆ كوێ دەچن. ئاوری دێیەكەش وردە وردە دادەمركا.

وەكیل باشی عاصم نەڕاندی:

"دەبێ بۆ لای مێشە برۆین، بۆ لای ئاناوارزا..."

جەبار:

"ئیدی کوژراین..."

حەمەد:

"ئەگەر بزانم ئەو کافرە کوژراوە غەمێکم نیە, هەر ئێستا حازرم بمرم... بریا توانیبام باوەڕ بکەم کە مردوە, باوەڕ بکەم کە لەنێو ئاگرەکەدا برژیوە."

جەبار:

"نایب ئیدی جوولەی لێبڕاوە."

حەمەد:

"داینێ عەرزی, لەوانەیە شتێکی بووبێ."

نایب رەجەب بە کۆڵی جەبارەوە نالاندی و جوابی دایەوە:

"نا, هیچ نەبووە. وەزعم باشە. دامنێ عەرزی."

جەبار کە سەری سوڕمابوو, نایبی بەخۆوەو بالآبەرزی دانایە زەوی. نایب:

"دەچنە کوێ؟."

جەبار:

"وەکیل باشی عاصم بە دوامانەوەیە."

نایب رەجەب:

"جەبار راستم کەوە."

جەبار چووە بن پیلی و راستی کردەوە. نایب رەجەب کە خۆی بـە پێـوە رانـەدەگرت, چـەند جار تەماشای راست و چەپی کرد:

"ئێمە ئێستا لە نیزیك مێشەین. ئەگەر توانیبامان خۆمان بگەیەنینـە تەختـە بـەردەکانی ئاناوارزا حەتمەن رزگاریمان دەهات. بەڵام تازە ناگەینە ئەوێ. حەتمەن دەگیر دەکەوین."

نایب گوێی هەڵخست:

"گوێتان لێیە؟... لەم نیزیکانەن... گوێتان لە دەنگیان هەیە؟..."

حەمەد:

"بەڵێ."

جەبار:

"بەڵێ."

نایب:

"ناتوانین زۆر لە نێو مێشە گیر بین. سبەینێ خەڵکی هەموو ئەو دێیانەی دەوروبەرمان وەدوا دەکەوێ... لە پێشەوەش دێنە ئەم مێشەیە. بەڵام ڕێگایەکی دیکەشمان نیە."

حەمەد:

"چارەی دیکەمان نیە."

نایب:

"چۆمی جەیهان لەولای مێشەکەیە. دەبێ خۆمان بە ئاوێ دا بێڵین. ئەگەر ئاوەکە بمانبا، دەردەچین، و ئەگەر نا، دەکوژرێین."

حەمەد:

"ئێستا تەگبیرمان چیە؟."

نایب:

"خۆ ئێمە ئەو کافرەمان لەنێو ئاگردا برژاند."

حەمەد:

"ئەدی، برژا."

جەبار:

"ئەمن گومانم هەیە، لەوانەشە دەرچووبێ."

نایب لەم قسەیە ئاگری گرت و نەڕاندی:

"ئەتۆش یەزیدی سەگباب... ئەگەر دەرچووبێ زۆرت پێ خۆش دەبێ، ها؟... ئاخر چۆن دەرچووە؟ حەمەد بەردەرگای گرتبوو. ئەمنیش بە دەوریماڵەکەدا دەسووڕام... ئاخر بە کوێ دا دەرچووە؟... ماڵەکە کونێکی دیکەی نەبوو. پێم بڵێ چۆن دەرچووە؟."

حەمەد:

"برژی... تازە ئەگەر بشمرم پێم ناخۆش نیە."

نایب:

"ئافەریم حەمەد..."

جەبار هیچی نەگوت.

لەو ڕەشە شەوەدا جگە لە خشپەخشپی پێیان دەنگێك نەدەهات. هەستی لاقیان بەسەر خاك و دەوەن و چیلکەو چاڵ دا رادەکشا. دەنگی لاقی دێهاتیەکان وەك شەپۆلێك سواری تاریکایی شەو ببوو.

جەبار:

"حەتمەن لەم دەوروبەرانەن... بە ئەنقەست قسە ناکەن."

حەمەد:

"حەتمەن."

نایب:

"دەبێ خۆمان بگەیەنینە مێشە... دەستم بگرن."

دەستی نایبیان گرت و بەرەو مێشە دەخۆ نووسان. دەنگی ئەو پێیانەی لە دوایانەوە بوون، خێراتر بوو، کاریگەرتر بوو، و زۆرتر بوو. خشپەخشپێك بۆ لای ئەوان دەهات. ئەویش لەگەڵ ئەو خشپەخشپە بەدوایان دا دەهات. کێو و بەردو دارو دەوەن وەدوای ئەوان کەوتبوو. وایان دەهاتە بەرچاو.

ئەم دەشتە... ئەم دەشتە بە قوڕ گیراوە... چەندیش هەموارە... وەی دایە گیان وەی... وەختێك هەتاو بکەوێ، ئەم دەشتە وەك سینییەك کە هەتاو لێی دابێ دەبریسکێتەوە... تەپۆلکەکان کورت و چکۆلەن... دەڵێی هەموویان تووڕەکەڕێژن... گابەردەکانی ئاناوارزا... ئەگەر بتوانن بگەنە ئەو گابەردانە، پەناو پەسیوێکیان هەیە... چۆمی جەیهان لە پشتەوەیە... چۆمی جەیهان ئاوێکە تاریك کە خێرا غاردەداو تێدەپەڕێ... هێندێ جاریش لە نەکاو کەم دەکاو دەنیشێتەوە... هەردوو بەرەکەی خاکی رەشە. لێوارەکانی ناوێری پێیان لەسەر دانێی. نەرمن و هەڵدەوەرنە نێو رووبارەکە. قەراخەکانی چۆمی جەیهان قامیشەڵانن. پەناگەی تەیری لاق درێژی گۆلاونشینن... لەو جۆرە جێگایانە عەرز بۆنێکی تفت و ترشاوی لێدێ... تەنیا دارەتوویەك لەو دەشتە دا هەیە... گەڵاکانی لە تۆزو خۆڵ دا نوقم بوون...

ئەگەر دارەکانی ئەو مێشەیە نەبن، لەنێوەڕاستی ئەم دەشتەدا دەستیان لە هیچ جێیەك گیر نابێ.

لەنێو مێشەکەدا بۆنی باتلاغ بە چواردەوردا بڵاو دەبێتەوە... رۆیشتن بەنێو ئەو دارانەدا سامناکە... لەوەتا ئەو مێشەیە بووەتە مێشە، هەتا ئەمڕۆ زۆر جێگای لاقی بنیادەمیان وێ نەکەوتوە. چونکە هەموو جێیەکی پێدارۆیشتنی ناکرێ.

خشپە خشپەکە زیاد دەکا. خشپەخشپ وەك بایەك هەموو دەشتەکە پڕ دەکا. خشپە خشپ وەك ئاگرێك پێوە دەچێ.

نایب ڕەجەب بە زەحمەت هەناسەی دێ:

"بەم لایەدایە کورینە... ئیدی ڕێگا تەواو بوو."

لەنەکاو لە ڕووبەڕوویان چەند گوللە تەقین.

نایب ڕەجەب:

"ڕاکشێن."

بۆخۆشی ڕاکشا.

نایب ڕەجەب:

"مێشەکەیان گەمارۆ داوە. دەنگتان لەبەر دەرنەیە. بە زگە خشکە برۆنە نێو دارەکان... وست، وست... فیشەکەکان لەبەر تفەنگەکانتان بێننەدەر... یەك فیشەك بتەقێنن کارمان تەواوە... هەر کوتەمان لە جێیەك دەکەوێ... ئەگەر لادێیی‌یەکان بمانگرن، بە زیندوویی دەمانخۆن."

لە دەوروبەر گوللەبارانێك دەست پێ کرابوو مەپرسە. دەتگوت شەو پریشکان داوی... پاشان لە نەکاو تەقەکە بێدەنگ بوو.

دەنگێك هات. یەکێك زۆر بە پارێزەوە قسەی دەکرد:

"لێرە نین... ئەگەر لێرە بان، جوابیان دەدایەوە."

دەنگێکی دیکە:

"ئەوە دێهاتی‌یەکان دێن... ئەوان دەیان دۆزنەوە."

لادێیی‌یەکان نیزیك دەبوونەوە.

"ڕەنگە چووبنە لای ئاناوارزا."

"حەتمەن... یاغی ئەگەر ئەقڵی هەبێ، نایە لە نێو مێشەی چوکووراوا دا خۆی حەشار بدا."

لادێیی‌یەکان بە ژن و پیاو و گەورەو چووکەوە هاتن و گەیشتنەوە ژاندارمەکان. هەراو هۆریایەك ساز ببوو... لە هەر لایەك هەنگامەیەك بوو. شەو پڕ ببوو لە دەنگە دەنگ. خەڵکی ڕق هەستاو و داخ لە دڵ خۆیان بەسەر پێوە ڕانەدەگرت. هەروا تێکیانەوە داویشت. لە دەوروبەری مێشەکەو لەنێو زەوی‌یەکان دا بڵاو دەبوونەوە. خەڵك وەك شەپۆل لەم سەرەوە دەچوونە ئەو سەر.

کەمێك دواتر لە لای ئاناوارزاوە دەنگی تەقە هاتە بەر گوێ.

"لای ئاناوارزا... بۆ لای ئاناوارزا..."

خشپەخشپێك کە لە دەوروبەری مێشە ئەم سەرو ئەوسەری دەکرد، بەرەو ئاناوارزا وەڕێ کەوت.

نایب رەجەب:

"دەنگتان لەبەر نەیەتەدەر، ئەم شلووقییە بە فریامان گەیشت. دێهاتییەکان خەریکن ژاندارمەکان هەتلە دەکەن... لە جێی خۆتان مەبزوون."

هەناسەی نایب رەجەب وەك گڕی ئاگر لە ملی حەمەد دەدرا.

لە دەوروبەریان و لە نیزیکیان ژاندارمەکان بە پەلەقاژە بەم لاو ئەولادا رایان دەکرد. سێ دڵ کە لە نێو دەوەنێکی گەورەدا خۆیان حەشار دابوو، توند توند لێیان دەدا. ئەگەر ژاندارمەکان راوەستابان و ئارام ببان، گوێیان لە تەپە تەپی ئەو دڵانە دەبوو.

هەراو هۆریایەکەی داوێنی ئاناوارزا ساتێك بێدەنگ نەدەبوو و ئەمەش زۆر بە قازانج بوو.

ژاندارمەکان گەڕان و بە دەوری خۆیان دا سووڕان، قسەیان کردو راوێژیان کرد. سەرەنجام وەڕێ کەوتن و دوور کەوتنەوە.

نایب رەجەب هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشا:

"سوپاس بۆ خوا... خوایە زۆر شوکور... وەدەست لادێیییەکان کەوتباین سیرمە سیرمەیان دەکردین. ئێستا دەبێ بچینە پێشتر، دەبێ بچینە نێوەڕاست."

هەستان، نایب رەجەب یەك دوو هەنگاو رۆیشت و راوەستا.

حەمەد:

"چ بوو نایب؟."

نایب:

"وەی دایە گیان، وەی... وەی خوایەگیان، وەی."

حەمەد:

"دەبێ چ بکەین نایب."

نایب:

"دەبێ خۆمان بگەیەنینە نێوەڕاستی مێشەکە، بچینە جێیەکی پڕ دارو درەخت تر... وەی دایە گیان وەی."

حەمەدو جەبار هەر یەکەی قۆڵێکی نایبیان گرتبوو. نایب لاقی لەدوو نەدەهاتن. قاچی وەك قاچی مردووان دەچوون. هەتا بەری بەیانی هەروا چوونەپێش. پاشان هەوا بووڵێڵ بوو. ڕووناکی‌یەکی ڕەنگ نارنجی هەموو مێشەکەی داگرت. سەوزایی توندی مێشەکە لەنێو ئەو ڕەنگە نارنجی‌یەدا دەتوایەوەو وەك هەڵمێکی ڕەنگ ئاسمانی ون دەبوو. لە دەشت و مێشە دووکەڵێکی قورس بەرەو ئاسمان بەرز دەبووەوە.

لاقیان بە قەڵەمە تووترك هەڵدر هەڵدڕ ببوون. حەمەد درووەلانی ئاسیاب چەشمەی وەبیر هاتەوە. دیار نەبوو بۆچی سەرلەنوێ بریسکەی ڕەنگ زەردی برنجە وەك هەورە تریشقە لەسەری دا پڕیشکی هاویشت.

نایبیان لەسەر هێندێك گەڵ و گیا درێژ کرد. هەموو لەشی ئەستوور ببوو. ئەستۆی ئەوەندە ئەستوور ببوو, نێو شانانی پڕ کردبوو. نایب چەند جار دەمی کردەوە, وادیار بوو دەیەوێ شتێك بڵێ, بەڵام دەنگی دەرنەهات. بەدەست ئاناوارزای نیشان داو پاشانیش گڵی پێ نیشان دان. بە هەموو توانایەوە چاوی لە گڵەکەوە بڕیبوو.

دڵۆپ دڵۆپ فرمێسك لە چاوی نایب دەڕژانە خوار. پاشان چاوەکانی لێك نان. ئەمجار لەپڕ کەمێك ڕاست بووەوە, بەڵام دووبارە کەوتەوە.

حەمەد:

"وەی نایب ڕەجەب, وەی."

جەبار:

"وەیش..."

حەمەد:

"هیچ پێم وانەبوو دەمرێ."

جەبار:

"بۆخۆی دڵی خەبەری دابوو... هەرباسی مردنی خۆی دەکرد..."

حەمەد:

"خوا دەزانێ بە مرادی دڵی گەیشتوە یان نا..."

جەبار:

"هیچ کەس نەیدەزانی نایب لە کوێ ڕا هاتوەو بۆچی یاغی بووە, کەسیش نەیدەزانی خەڵکی کوێیە... ئەمنیش نازانم بە مراد گەیشتوە یان نا."

حەمەد:

"زۆری پێ خۆش بوو عەبدی بکوژرێ. لە منیشی زیاتر پێ خۆش بوو. بەلاّم عەبدی کارێکی لەگەڵ ئەو نەکردبوو. عەبدی دوژمنی من بوو. وەختێك ئەتۆ گوتت عەبدی نەکوژراوەو رای کردوە، دیت چۆن توورە بوو، هێندەی نەمابوو لەت و پەتت بکا؟..."

جەبار:

"خەنجەرەکەت دەرێنە با گلکۆی گۆڕ غەریبەکەمان هەڵکەنین."

حەمەد خەنجەرەکەی هەڵکێشا و لە عەرزێی رۆکرد. دەستیان کرد بە گۆڕ هەڵکەندن:

"وەی نایب، وەی... نایب رەجەبی گۆڕ غەریب..."

خاکی ئەم نێوە نێوە نەرم و شەدارە. بە سەعاتێك قەبرێکی قووڵ و فرەوانیان هەڵکەند. نایبیان لە قەبرەکە نا. دەستیان کرد بە گەڵ برین و بە ئەندازەی بستێك دارو گەلاّیان لەسەر تەرمەکەی هەڵچنی. پاشان گڵ و گیای وردیان تێ کردو ئەمجار گلّیان بەسەر دا کردو دایانپۆشی.

حەمەد:

"جەبار، دەبێ لەسەر گۆڕی نایب رەجەبی گۆڕ غەریبمان نەمامێکیش بنێژین."

جەبار:

"با بینێژین."

گەڕان، گەڕان. لەنێو دارەکان دا نەمامە توویەکی هێندەی کلکە پێمەرە ئەستووریان دۆزیەوە. نەمامەکەیان لە رەگ و ریشەوە هەڵکەند و هێنایان لەسەر گلکۆی نایب چەقاندیان.

حەمەد:

"لەوانەیە ئەم مێشەیە جگە لە قەبری نایب هیچ گلکۆیەکی دیکەی لێ نەبێ."

جەبار:

"جگە لە قەبری نایب هیچ گلکۆیەکی دیکەی لێ نیە. کێ مردووی خۆی دێنێ لەو جێگا تاریکە بینێژێ؟..."

پاشان تاو هەلاّت و قەبری نایب هەڵمی لێهەستاو رووناك بوو.

هەرکە تاو هەلاّت، هەراو هەنگامەیەك لەلای ئاوەدانییەوە بەرەو مێشەی ئاناوارزا وەڕێ کەوت.

جەبار:

"نایب چی گوت؟."

حەمەد:

"گابەردەکانی ئاناوارزای نیشان داین."

جەبار:

"دەبێ لەم مێشەیە تێپەڕین و خۆمان بگەیەنینە چۆمی جەیهان."

حەمەد:

"هەرچی نایب گوتوویە, دەبێ وا بکەین. نایب ئەم مەڵبەندە باش شارەزا بوو... چەند خۆشحاڵ بوو کە هەموو دێیەکەی سووتاندبوو. وانەبوو جەبار؟... پێی خۆش بوو هەموو چوکووراوا بسووتێنێ و بیکاتە خۆڵەمێش... چ مرۆڤێك بوو نایب... لەوانەیە ئەم چوکووراوایە زۆری ناحەقی لێکردبێ... خوا دەزانێ."

جەبار:

"لەو رۆژەوە ناسیومە, هەر جنێوی بە چوکووراوا دەدان. هیچ کەس نەیدەوێرا لە لای نایب ناوی چوکووراوا بێنێ... جار جار کە لە فکرەوە دەچوو, لەبەر خۆیەوە گۆرانییەکی دەگوت. گۆرانییەکەی تووك بوو, ئازار بوو و بێزاری بوو. وەختێکیش گۆرانییەکەی تەواو دەبوو, ماوەیەك هەروا بێدەنگ و مات دادەنیشت. چەند رۆژ هەر بەو جۆرە بێ ئەوەی قسە لەگەڵ کەس بکا, لەگۆ فکران رادەچوو. پاشان دەهاتەوە سەرەخۆ. خوا دەزانێ دەردی چ بوو. کەس سەری لێ دەرنەدەکرد. ئاخرەکەشی ئەوەی بە نسیب بوو کە لە نێو مێشەی ئاناوارزادا بنێژرێ... بەڵام لەمێژ بوو کە نە جنێوی بە چوکووراوا دەداو نە گۆرانییەکەشی دەگوت... لە یاغییەکانم بیستبوو کە هەر وەختێك ویستبێتیان بێنە چوکووراوا نایبیان لەگەڵ نەهاتوە... دەیانگوت لەسەر رێگا لە جێیەك چاوەڕێ دەبوو هەتا ئەوان دەهاتنەوە... بەڵام سەرەنجام ئەو ئاو و گڵەی بە نسیب بوو."

حەمەد:

"لەوانەشە ئەمە دڵخوازی خۆی بووبێ."

جەبار:

"با بڕۆین حەمەد... ئێستا مێشە پڕ دەبێ لە بنیادەم و سەگ."

حەمەد گەڕایەوە سەر قەبری نایب:

"خواحافیز نایب..."

چاوی پڕ بوون لە فرمێسك.

جەبار:

"خواحافیز..."

بەنێو ئەو دارو دەوەنە چڕو چوغرەدا کە مـاری تـێ نەدەچـوو, بەزەحـمـەت دەچـوونە پـێش. جەبار تفەنگ و فیشەکدانە زیوکاری کراوەکانی ئابیبیشی هەڵگرتبوون.

ئەو دەوەن و دڕووانە کە وەك دیوارێکی کەلێن بڕ, ڕێگای ئەوانیان گرتبوو جەباریان ماندوو کردبوو. بەڵام حەمەد لە هەموو کاتێك چوست و چالاکتر بوو... ئەو دڕك و داڵـەی بـە دەسـت بۆی لانەدەدران, بە خەنجەر دەیبڕین. جەباریش دادەهاتەوەو بەو ڕێگایەدا دەڕۆیشت کە حەمەد دەیکردەوە. حەمەد لە هەوڵ و تەقەلایەکی تونددا بوو.

گەرمای نیوەڕۆ دەستی پێ کردبوو. لەو بێدەنگیەدا تـەنیا دەنگـی شـکانەوەی لکـە دارو دەوەنەکان دەهاتە بەرگوێ. ئەگەر ئاوڕ وەپشتەوە بدەینەوە دەبینین حەمـەد بـە نێـو دارو دەوەن دا جۆگەتێکی دوورو درێژی کێشاوە.

دوو سەعاتە ڕێیان مابوو بگەنە ئاناوارزا. ئەوان تـەنیا ئاسمانیـان دەدی, لەگـەڵ لووتکـەی بەردەڵانەکانی ئاناوارزا.

وەختێك گەیشتنە نێوەڕاستی مێشە, ڕۆژ لە نیوەڕۆ لای دابوو.

حەمەد:

"با هەر لێرە وەمێنین. شەوێ دووبارە وەڕێ دەکەوینەوە."

جەبار:

"ئەمنیش ئەوەندە ماندووم خەریکم دەکەوم."

جـەبار ڕاکـشا, حەمـەدیش لـە پـەنای ئـەو... زۆریـان نـەمابوو بگەنـە بـەردەڵان. لـەنێو گابەردەکانەوە دەنگی سەدان و هەزاران لاقیان دەهاتە بەرگوێ.

حەمەد هەستاو ڕوانی:

"ناتوانین چاك بیان بینین... دێهاتیەکان بە دوای ئێمەدا دەگەڕێن, بەڵام تازە ناتوانن بمان بیننەوە... ڕزگاربمان هات."

جەبار نەختێك ڕاست بووەوە:

"وەختێـك نـە لـە کێـو و نـە لـە نێـو مێـشە نـەمان بیننـەوە, بـەرەو ڕێگـای "ئـازابلی و سۆمباس" وەڕێ دەکەون و دەچن بۆ لای شار... دەیانەوێ لەوێ لە داومان بخەن."

حەمەد:

"ئەگەر وابێ ناچارین چەند رۆژ لێرە بین."

جەبار:

"ئێمە دەبێ بە رێگای "کووزان" دا خۆمان بگەیەنینە چیا."

حەمەد:

"ئەتۆ رێگای کووزان شارەزای؟."

جەبار:

"نا، رێگای کووزان شارەزا نیم، بەڵام کێوەکان دەناسمەوە، وەختێك بگەینە کێوەکانی ئاناوارزا هەموو جێیەکمان لێ دیار دەبێ."

حەمەد:

"کەوایە هەتا دنیا تاریك نەبووە با برۆین."

جەبار:

"ئیدی هەستی پێیان نایە."

حەمەد:

"لەوانەشە لە دەوروبەری مێشە بۆسەیان نابێتەوە."

جەبار:

"نا بابە... لە کوێ فکری وا دەکەن؟."

حەمەد:

"کەوایە با برۆین."

دنیا تاریك ببوو، کە گەیشتنە بەرزاییەکانی ئاناوارزا. لە گۆشەو کەناری زۆر دوور هێندێ رووناکی زریوەیان دەهات. چۆمی جەیهان وەك گوریسێکی رەش بەنێو خاکەکەدا قەف قەف ببوو. ئاك توزلوو دەتگوت لە دووکەڵێکی رەش دا نوقم بووە.

حەمەد لای خۆرهەڵاتی نیشان دا:

"هۆوێ کوێیە؟."

جەبار:

"پێم وایە دێهاتی "بوزکۆیوو" بن."

حەمەد:

"با بەولادا برۆین... پێم وایە نیزیکترە."

جەبار:

"دەترسم ئەولاشیان گرتبێ."

حەمەد:

"برۆ با برۆین. ئەگەر تووشیان بین, دەزانین چییان پێ دەکەین."

پاشان گەڕایەوە سەر جەبار. لەو تاریکایی‌یەدا بە زەحمەت روخساری جەباری دی:

"ئەتۆ دەڵێی چی جەبار؟... بەفکری تۆ ئەو کافرە کوژراوە؟."

جەبار:

"پێم وا نیە. ئەگەر رای نەکردایە, حەتمەن ئاگری دەگرت و دەهاتە لای دەرگا... لانی کەم هاواری دەکرد, دەی نەڕاند..."

حەمەد:

"لەوانەشە لەنێو دووکەڵ دا خنکابێ؟."

جەبار:

"زۆری تەقە دەکرد... ئەگەر دووکەڵ خنکاندبایەی نەیدەتوانی تەقە بکا."

حەمەد:

"لەوانەیە بان و دیوارەکەی بەسەر دا رووخابێ و لەپڕ کوژرابێ."

جەبار:

"خوا بکا وابێ... ئەگەر وابێ زەحمەتەکەمان بە خەسار نەچووە."

لە کێوی سەرەوخوار بوونەوە. چەندیش پێ هەڵگەڕابوون...

## (١٥)

قەدیمییەکان داستان و بەسەرهاتێکی زۆر لەچوکووراوای کۆن دەگێڕنەوە. لەسەردەمی یاغیگەریی حەمەدۆك دا پیرەپیاوێك هەبوو بە ناوی سمایلەزلە, کە زیاتر لە نەوەد ساڵ تەمەنی بوو. سمایلەزلە زۆری چیرۆك و داستانی چوکووراوای کۆن لەلابوون. سمایلەزلە چاوێکی شینی هەبوون. هەروەك چیمەن. چەنەگەی وەك چەنەگەی هەموو تورکمەنەکان باریك و کەم موو بوو. نێو شانی پان و هەروەك سەردەمی لاوێتی بەتاقەت بوو. چاوی وەك چاوی هەڵۆ تیژو بەکار بوون و هەرچەند پشتی کۆم ببووەوە, بەڵام هەمیشە بە سواری ئەسپ و تفەنگ لەشان دەچووە راو. سمایلەزلە گۆرانییە تورکمەنییەکانی بە نارە نار دەگوت. لەبارەی شەڕی عەشیرەتەکانەوە زۆری داستان و بەسەرهات دەگێڕانەوەو سەرەنجامیش بە خۆڕانانەوە ئەو برینانەی نیشانی خەڵك دەدان کە لەو شەڕانەدا لە لەشی ببوون.

جار جار ماڵ و نێو دێ لەبەر چاوی تەنگەبەر دەبوون و رووی دەکردە دەشت و چیا. ئەو حەزی دەکرد هەموو سروشتێکی تورکمەن بوون بپارێزێ و هەمیشە وەك تورکمەنێك بژی.

هێندێك وەختیش هەر بە جارێك دەهاتە کوڵ و سەرخۆش دەبوو. سواری ئەسپێکی کوێت دەبوو کە هەر بە جوانوویی بۆخۆی بەخێوی کردبوو. ئیدی وەك بایەك کە لە وڵاتی تورکمەنەکانی رابردووەوە بێ, بە کۆسارە پڕ لە کاجەکان و بە نێو پنگ و جاترەو گیاخاو دا لینگی دەدا. لە کۆچ و کۆچبارو شەڕ لەگەڵ عوسمانییەکان, لە تفەنگی ئاوێنەدار, لە دەسك و قووڵە بەردەکان کە چۆن لەنێو هۆزەی عێلاتییەکان دا دەنگیان دەهات و لە گەرمێن و کوێستانی عێل و عەشیرەتەکان کە چۆن دەشت و دەرو کێو و بەندەن لە رەنگی جلەکانیان سەوزو سوور هەڵدەگەرا, زۆر چیرۆك و داستانی دەگێڕانەوە.

دەیگوت:

"هەتا پەنجا ـ شەست ساڵ لەمەوبەر..."

وەختێکیش وەقسە دەهات لـێبڕینەوەی نەبوو. دەتگوت ئەوینـە وەزمـان هـاتوە، یـان گۆرانی‌یە قسە دەکا.

دەیگوت:

"هەتا پەنجا ـ شێست ساڵ لەمەوبەر چوکووراوا تەنیا باتلاغ و مێشە بوو... لە بنارەکانی نەبێ، بۆ نموونە پارچە زەویی بە قەد لـەپی دەستیـشت نـەدەدی... ئـەودەم لـە چـوکووراوا نـە بنیادەم هەبوو، نە جندۆکەو نە پەری، هـەتا کـۆچ دەسـتی پـێ کـردو وەك لافـاو بـە سـەری دا هات... وەختێك چوکووراوا بەرگی جێژنی لەبـەر دەکـرد، واتـە داری رووت و خـاکی رووت و دنیای رووت سەرلەنوێ دەستیان بە بووژانەوە دەکرد، کۆچی تورکمەنەکانیش دەست پێ دەکرا، دەتگـوت لافـاوە... بـە کێـو و بەنـدەن و دەشـت و دەردا سـەوزو سـوور تێکـەڵ دەبـوو و هەنگامەیەك بەرپا دەبوو هەر مەپرسە... عێل و عەشیرەتمان بـار دەکـرد، کێـو و کۆسـارمان بەجێ دەهێشت، تا دەگەیشتینە کوێستانی "هـەزارەگا" و تاوڵـمـان هـەڵ دەدا. کـە زسـتانیش دادەهات، بەرەو چوکووراوا وەرێ دەکەوتین... چ قامیشەڵان و مێشەو دارودەوەنێـك...، کـە ماریان تێ‌نەدەچوو، چ باتلاغێك و چ مێرگ و مێرغوزارێك... سـاڵ دوازدە مـانگ لـەوەڕ لـە ئـەژنۆیان... بـە سـواریی ئـەسـپ دەکەوتینـە سـەر رەوە ئاسـکان... جـا چ جـۆرە ئاسـکێك، هەمووی چاو رەش و رەوەك... ئەسپ ئەگەر ئەسپ بێ لە راوە ئاسك دا خۆی دەردەخا... لـە قامیشەڵانەکانی چوکووراوا هەر قامیشێك دەتدی هێندەی سـپیدارێك... هـەر قامیـشەڵانێك هێندی پەڵە سپیدارێك. لە تەنیشت گۆلاوەکان زیرووی گوڵەقامیش دەتگوت تیـشکە دەڕژێتـە سەر ئاو... تەواوی چوکووراوا دەبوو بە یەك پارچە نێرگس.

شەوو رۆژ لە هەر لایەکەوە شنەبایەك هەڵی دەکرد، بۆنێرگسی لـێ‌دەهات. پیـاوی مەسـت دەکرد. چوکووراوا داستانێك بوو. دەریای سپی شەپۆلێکی دەدا سپی و کەفاوی...

چادری عێلاتی‌یەکان بە تەنیشت یـەکترەوە... دووکـەڵێك لەبـەر چـادران هەڵدەسـتا پەڵـە پەڵـە... لای "عوسمانیـە" و "تـووپراك قـەڵا"، واتـە ئەوبـەری چـۆمی جـەیهان کـە رووی لـە کێوەکانە، جێ‌هەواری عێلـی "تجیرلی" بـوو... لـەلای بـەرەوە عێلاتـی "جـەیهان بـەکرلی" و "مسـتەفا بیگلی" تاوڵیان هەڵدەدا... عێلی "جریت" لای ولاتـی جـەیهانی پـاوان دەکـرد... عێلی "بوزدوغان" لەنێوان ئاناوارزاو "حەمید قەڵا" هەڵی دەدا... کوردەکانی "لەك" لـەلای

ئاناوارزاو "کووزان"، عێلی "سۆمباسلی" لەلای ئاوی سۆمباس و تووڕووس هەڵیان دەدا...
لای "ئێکشیلی"و دێهاتی "قرێڵی"ش کوێستانی عێلی "تارتیلی" بوو...

هێندێ وەختیش عێلات جێی خۆیان دەگۆڕیەوە. بۆ وێنە ساڵێ وا هەبوو عێلی بووزدوغان دەچووە کوێستانی جریتەکان و جریتەکانیش لە کوێستانی عێلی بوزدووغان چادریان لێدەدا... زۆردارترین عێلیش عێلی "هەوشار" بوو. ئەوان لە هەر جێیەکی چوکووراوا پێیان خۆش با، گەرمێن و کوێستانیان دەکرد. کەسیش نەیدەوێرا پڕی چاوان تەماشایان بکا. هیچ کەس باشاری عێلی هەوشاری نەدەکرد...

ئەمن وەك خەونێم بەبیر دێ. لەگەڵ عوسمانیەکان شەڕێك هەڵگیرسابوو. خانێك هەبوو بەناوی کووزان ئۆغلی. ماڵی لەو دێیە بوو کە پێی دەڵێن کووزان. هەموو عێل و عەشیرەتەکان لەگەڵ عوسمانی شەڕیان دەکردو لە پێشەوەی هەمووانیش ئەو کووزان ئۆغلیە سنگی کردبووە مەتاڵ. بەڵام عوسمانیەکان بەهێزتر بوون، کووزان ئۆغلیان گرت و بردیان. عێلی هەوشاریشیان راونا بۆ "بووزاك"و سەرکوتیان کرد. گۆرانی "دادن ئۆغلی" باسی ئەم شەڕانەیە. دێهاتیەکان بۆ مردنی کووزان ئۆغلییش تازیەنامەیەکیان داناوە کە ئاگر لە دڵی بنیادەم بەردەدا...

سمایلەزلە کە دەگەیشتە ئێرە بێدەنگ دەبوو. چاوی پڕ دەبوون لە فرمێسك. لێوەکانی دەلەرزین و بە دەنگە گڕو ئەستوورەکەی تازیەنامەی کووزان ئۆغلیی دەگوت، کە چۆنیان ئەستوندەکی بڵێندی تاوڵی کووزان ئۆغلی لە عەرزی داوەو پێنسەد سواری خەلیفەی عوسمانی چۆنیان هێرش کردوەتە سەرو چۆن باب لە هاواری کوڕی نەهاتوەو کووزان ئۆغلی شێرەپیاوی کێوو شاخان چۆن هەتا ئەژنۆیان بەفری کووزانی دڕیوەو لە کێوی وەسەر کەوتوەو لەسەر چیا چۆن لە چاوەڕوانیی حەکیم دا هەر برینێکی بووەتە سەرچاوەیەکی خوێن...
دەیگوت:

"دوای ئەمە بوو کە عوسمانیەکان بە زۆرو زۆرداری عێل و عەشیرەتەکانیان لە چوکووراوا نیشتەجێ کرد. زەویان دانێ و قەباڵەیان دانێ... بۆ ئەوەی گەرمێن و کوێستان نەکەن، لە کێو و بەندەنەکان سەربازیان دانا. کەس نەیتوانی بچێتە کوێستان. عێل و عەشیرەتەکان لە چوکووراوا وەك گەڵاڕێزانی پاییز کەوتنە سەر یەك... مردنیان تێ کەوت... زۆر کەسیان بە تاولەرزو زۆر کەسیان بە گەرما لەنێو چوون. بەهیچ جۆر نەیاندەویست لە چوکووراوا نیشتەجێ بن... عوسمانیەکان قەڵەمەو ئەمامیان دەدانێ کە بیان نێژن و باغ بنێننەوە، بەڵام

عێلاتی‌یەکان ڕەگەی ئەمام و قەڵەمەکانیان دەسووتاند، ئەمجار دەیان چەقاندن... هەربۆیەش دێهاتی ئەم نێوە نێوە باغ و باغاتی نیە. پاشان وەختێك عوسمانی‌یەکان دیتیان عێلاتەکە خەریکن لەنێو دەچن، ڕێگایان دان هاوینان کۆچ بکەن و بچنە کوێستان... بەرە بەرە عێلەکان لە چوکووراوادا جێ و جێ‌یان کردو دەستیان کرد بە خانوو دروست کردن و کشت و کاڵ... پاشانیش وردە وردە عێل و عەشیرەتەکان لەنێو چوون... زەمانە گۆڕا... پیاوەتی کەم بوو و سەرەنجام لەنێو چوو... وای لێ‌هات کە دەوڵەتی عوسمانی دەیەویست...، دنیا بە کەیفی دەوڵەتی عوسمانی سووڕا..."

کاتێك سمایلەزلە دەستی بە تاریفی عێل و عەشیرەت دەکرد، قسەی لێ‌نەدەبڕا. دەیتوانی چەند ڕۆژ لەسەر یەك قسە بکا. ماندووش نەدەبوو. ئەو هەمیشە خەفەتی بۆ ئەو دنیا بێ دەردو ئازارو مەینەتە دەخوارد کە لە دەست چووبوو. زۆر جار کەدەستی بە قسە دەکرد، دەیگوت:"ئەتۆ دەڵێی چی؟... ئەمن داداڵ ئۆغلیم دیوە..."و لەو بارەشەوە زۆری بە خۆی دەنازی.

ساڵەکانی هەزارو نۆسەدو حەڤدەو هەژدەو نۆزدەو بیست... سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهانی... شەڕی شکانی عوسمانی‌یەکان بوون... لەو ساڵانەدا چوکووراوا پڕ ببوو لە یاغی و سەربازی ڕاکردوو... ناوچەی توورووس ببووە پاوانی یاغی‌یەکان و لە ترسی یاغی‌یان کەس نەیدەوێرا پێی دا بڕوا.

لەشکری فەڕانسە چوکووراوای داگیر کردبوو. یاغی و سەربازی ڕاکردوو، چەتەو غەیری چەتە، دزو غەیری دز، حەڵاڵ زادەو حەرام زادە، چاك و خەراپ و جوان و پیرو هەموو خەڵکی چوکووراوا دەستیان دایە دەستی یەك و دوژمنیان لە چوکووراوا وەدەرنا. لە سەرتاسەری وڵاتیش دوژمنیان دەردەکرد. دەورە خەریك بوو دەگۆڕا...

لەدوا ساڵەکانی سەدەی نۆزدەدا، چەندین ساڵ دوای نیشتەجێ بوون، هەل و مەرج کەم کەم خەڵکی ناچار کرد بەزەوی‌یەوە ببەسترێنەوە. خاك وردە وردە نرخی پەیدا دەکرد. تورکمەنەکانیش کە لەگەڵ نیشتەجێ بوون نێوانیان خۆش نەبوو، بەرە بەرە گەرمێن و کوێستانیان وەلا دەنا و بە زەوی‌یەوە دەچەسپین.

لەو سەردەمەدا، خاکی چوکووراوا یەك و چل تا یەك و پەنجا بەرهەمی دەدا. ئەمە شتێکی تەواو تازە بوو. ئەگەر لە ساڵەکانی پاش هەزارو نۆسەدو نۆزدەدا تەماشای خاکی چوکووراوامان دەکرد، دەمان دیت کە باتلاغەکانیان تا ڕادەیەك وشك کردوە، مێشەکانیان

سووتاندوەو کردوویاننە زەویی کشتوکاڵ. لەو ساڵانەدا ئەگەر نیوەی خاکی چوکووراوا نەبێ، نیزیك بە نیوەی دادەچێندرا.

سیستمی تازە لەم ساڵانەدا لەگەڵ حکوومەتەکانی تایفەگەری و خان خان بازی و خان و بەگ و بەگلەرو پاشاوەکانیان دەستەویەخە بوو. لەو سەردەمەدا، لەمێژ ساڵ بوو بناخەی حکوومەتی تایفەگەری لەخۆوە سست دەبوو، و لە جیاتی خانەکان، هێندێ ئاغای پووڵدار پەیدا دەبوون. ئەم ئاغایانە بۆ وەدەست هێنانی زەوی و بۆ ئەوەی چەندی بکرێ زیاتریان زەوی هەبێ، هەمیشە لە شەڕو کێشەدا بوون. لەو شەڕو کێشەیەدا سەریش دەکەوتن. بە هەزار فرت و فیڵ زەوییان لە دەستی دێهاتییەکان و خەڵکە فەقیرو هەژارەکە دەردێناو، جا هێندێك لە رێگای قانوونییەوە، هێندێك لە رێگای بەرتیل دانەوەو هێندێکیش بەزۆرو زۆرداری...

شەڕو کێشەی نێوان ئەو ئاغا پووڵدارانەو خەڵکی دەست کورت هەروا پەرەی دەستاند. خاکی ئاغایەکان رۆژ بە رۆژ زیاتر و زیاتر دەبوو، لە بەرامبەر دا دێهاتییەکان هەژارو هەژارتر دەبوون.

لەو رۆژگارەدا ئاغاکان بۆ سەرکوت کردنی ئەو خەڵکە دەست کورتە کە بە قیمەتی گیانیشیان حازر نەبوون زەوییەکانیان لە دەست بچێ، هێندێك دەستەی یاغییان پەروەردەو پەرەوازە دەکردو ئەوانیان هەم بۆ لێدان و کوشتن و ترساندنی دێهاتییەکان و هەم بۆ بەرەنگار بوونەوەی حکوومەتی مەرکەزی بەکار دێنا. دەکرێ بڵێین هیچ ئاغایەك نیە کە لەم رێگایە کەڵکی وەرنەگرتبێ.

ئەو ئاغایانەی نەیاندەتوانی لەنێو یاغییەکانی کێوی دا پشتیوانێك بۆ خۆیان پەیدا بکەن، بۆخۆیان هێندێك یاغیی تازەیان دەناردنە شاخی، و هەر بۆیە ناوچەی تووڕووس ببووە مەیدانگاو پاوانی یاغییەکان، و قازانجی ئەو ئاغایانە کە بۆخۆیان لە دەشت و لە نێو دێیەکان دا نیشتەجێ بوون، لەکێوەکان دا بەگژ یەکتر دا دەهاتن. یاغییەکانی کێوی، یان پێك وەردەبوون، یان خەڵکی بێتاوانیان دەکوشت و لەو نێوەدا خاکی ئاغایەکان بەرین ترو گەورەتر دەبوو.

عەلی سەفابەگ کوڕی یەکێك لە ئاغا لێکەوتووەکان بوو. (بە کوردیی پەتی، کۆنە بەگ و بارگێن تۆپیو بوو ـ وەرگێڕ). ئاغا هەرچەند پووڵ و سامانێکی نەمابوو، بەڵام توانیبووی عەلی سەفابەگی کوڕی بۆ خوێندن بنێرێتە مەدرەسەی سوڵتانیەی شاری ئەدەنەو پاشانیش بیـنێرێتە مەدرەسەی بەرزی حقوقی ئەستەمبووڵ. بەڵام هەرچۆنێك بوو،

عـەلی سـەفابەگ نـەیتوانیبوو مەدرەسـەی بـەرزی حقـوقی تەسـتەمبووڵ تـەواو بکـا، خوێندنەکەی بە نیوەچڵی بەجێ هێشتبوو، گەڕابووەوە دێ و دەستی کردبوو بە وەکالـەت. پاش ئەوەی ڕێوشوێنی کارەکە فێر ببوو، هێندێ تاقیکردنەوەی دەست کـەوتبوو و ڕێگـاو لاڕێی کارەکانی لێك جیا کردبووەوە، لەپڕ هۆشی هاتبووەوە سەرەخۆو کەوتبووە بیری ئـەو زەوییانە کە ڕەحمەتیی بابی لە دەستی دابوون. ئەمە بوو کە دەستی کرد بە نەخشەکێشان بۆ وەرگرتنەوەی ئەو خاکانە کە بابی لە دەستی چووبوون و توانیشی زەوییەکانی بابی لـە دەستی دێهاتییەکان دەربێنێتەوە. هەر ئەو کێشەو بەرەیە بەباشی ڕێگای زەمین داربوونی فێر کردو ئیدی لە کاری خۆی دا وەستایەك بوو.

بەڵام دێهاتییەکان، ئیدی دێهاتییەکانی سەرەتای سـەردەمی نیشتەجێ بـوون و تەنانـەت دێهاتییەکانی پاش ئەو سەردەمەش نەبوون. ئەم دێهاتییانـە ئێـستا تێگەیـشتبوون کـە خـاك یانی گەوهەر... و بە چنگ و نینۆك بە زەوییەکانیانەوە چەسپابوون. بەربەرەکانێیەك لەنێوان عەلی سەفابەگ و دێهاتییەکان دا دەستی پێ کرد کـە چـەندین سـاڵ درێـژەی هـەبوو. هۆشـی عەلی سەفابەگی سەگبابیش لەو جۆرە کێشەو بەرەیـەدا خـۆی نیـشان دەدا. فـێڵ و تەڵەکـەی تازەی دەدۆزینەوەو ڕێگا چارەی نوێی دادەهێنان.

لە سەرەتادا فرت و فێڵەکانی سەریان دەگرت و دەیتوانی بە هەر جۆرێـك بـێ خـەڵکی ئـەم دێ و ئەو دێ لێك بکاتە دوژمن و تێکیان بەردا، پاشان بۆخۆی لایـەنی یـەکێکیانی دەگـرت و بە یارمەتیی ئەم لایە، زەوی و زاری لایەکەی دیکەی داگیر دەکرد. ئـەم شـێوەیە زۆر ئاسـان و کاریگەر بوو. بەڵام زوو ئاشـکرا بـوو. دێهاتییـەکان کـە ببوونـە دوژمنـی سـەروماڵی یـەکتر، تێدەگەیشتن دوژمنی ڕاستەقینەی ئەوان کێیە، بەڵام فایدەی چی؟ تازە کار لە کار ترازابوو، و لانی کەم نیوەی زەوییەکانیان لەدەست چووبوو، و لە بەرامبـەردا پانـایی زەوییـەکانی عـەلی سەفابەگ سەری لە چەند دێی شەشدانگ دابوو.

عەلی سـەفابەگ چەندین ساڵە ڕێگاو چارەی نوێ دەدۆزێتەوە، بـەڵام یـەك دوو سـاڵ زیـاتری پێ ناچێ کە دەسـتی ئـاوەڵا دەبـێ، بـەو حاڵـەش زەوی و زاری عـەلی سـەفابەگ هەمیـشە لـە پەرەگرتن دان و لە هەر حاڵ دا هەر ئەو دەیباتەوە.

سـەرەنجام کار دەگاتە جێگایەك کە فرت و فێڵەکان تەواو دەبن و هیچ دێهاتییەك بە تەڵەی عەلی سەفابەگەوە نابێ. هەرچەند فـێڵ و تەڵەکـەی لـێبڕاون، بـەڵام عـەلی سـەفابەگ بێکـار دانانیشێ و ئاخرەکەی ڕێگایەك دەدۆزێتەوە.

لەم رۆژانە دا کێوەکان پەناگەو پاوانی یاغییەکان، سەربازە راکردووەکان، چەتەکان و پیاوکوژەکانن... و ئێستا وەختی ئەوە هاتوە کە عەلی سەفابەگ لەمانە کەڵك وەرگرێ.
لەگەڵ یەك دوو دەستە لە یاغییەکان رێك دەکەوێ، چەند پیاوی خۆی دەنێرێتە چیاو بە گژ دێهاتییەکانیان دا دەکا. ئیدی عەلی سەفابەگ کاری لەپێشە، تازە کام لادێیی دەتوانێ لەبەری بکۆخێ؟... ئەگەر دێهاتییەکی وا بە غیرەت پەیدا ببێ، شەوێك ماڵەکەی وێران دەکەن. ژنەکەی دەرفێنن و دوای ئەوەی هەزار سووکایەتیی بەسەر دێنن، دەیکوژن و شرت و گومی دەکەن. هەموو کەسیش دەزانێ ئەم کارانە گازی عەلی سەفابەگن. بەڵام کەس ناوێرێ بڵێ پشتی چاوی برۆیە. ژاندارمەکان دەکەونە سەر یاغییەکان و دەکوژرێن.
دیارە ئاغاکانی دیکەش ئەم شێوە کارەیان رەچاو کردوە. هەربۆیەش خاکی چوکووراو بە خوێن رەنگین دەبێ و کوشت و کوشتار دەست پێ دەکا. یاغییەکانی شاخی دەستە دەستە پێك وەردەبن و یەکتری قەلاچۆ دەکەن. شەو نابێ کە چەند دەستە یاغیی تازە لە چیاکان دا سەر هەڵنەدەن.
لەو نێوەدا هێندێك دەستە یاغی وەك دەستەی "گیزیك دووران"، "رەشیدەکوردە"و "گووت دەلەك"یش هەن کە گوێ بۆ دووزمانیی ئاغاکان راناگرن، بۆخۆیان ئاغای خۆیانن و بە پێچەوانەی ئەوانی دیکە، بە دژی ئاغاکان پشتیوانی لە دێهاتییەکان و خەڵکی فەقیرو هەژار دەکەن.
کێوەکانی تووروووس زۆر پیاوکوژی خوێنخۆرو بەناوبانگیان بەخۆوە دیوە. بەڵام ئێستا ناوو نیشانێکیان لەپاش بەجێ نەماوە، کەچی بە پێچەوانە ناوی زۆر لە یاغییەکان وەك ئەو دەستە یاغییانە کە بەدژی ئاغاکان پارێزگارییان لە دێهاتییەکان دەکرد، هێشتا لەبیر نەچوونەتەوەو زۆر شیعرو گۆرانی و تازیەنامەیان بۆ دانراوە... ئەم شیعرو تازیەنامەو گۆرانییانە ئێستا زار بە زار دەگەڕێن...
لەو سەردەمەدا بوو کە حەمەدۆك وەکێوان کەوتبوو. واتە لە سەردەمێك دابوو کە دەستە یاغییەکان بۆ قازانجی ئاغاکان لەکێوان دا خوێنی یەکتریان دەڕشت و دێهاتییە فەقیرو هەژارەکانیش هاواریان لە دەستیان دەگەیشتە ئاسمان.
زەوییەکی عەلی سەفابەگ لە ساڵی هەوەڵ دا دەبووە دوو هێندە، پاشان چەند هێندەو چەندین هێندەو ئەمجار دەبوو بە چەند هێکتار، دەیان هێکتارو لەوەش زیاتر. زەوییەکانی

بەرینایی دێهاتەکەیان دەگرتەوەو ئەو دێهاتییانەی زەوییەکانیان لێ ئەستێندرابوو هەر لەسەر زەوییەکانی خۆیان دەبوونە رەعیەتی عەلی سەفابەگ.

عەلی سەفابەگ پیاوێك بوو کەڵەگەت و برۆ گەورە، کە هەمیشە چەکمەیەکی تروسکەداری دەپێ دەکرد. دەم و چاوی ئەسمەر بوون، بەڵام سەوزەیەکی تاریك، هەمیشە بە قەمچییە زیونیشانەکەی لە چەکمە تروسکەدارەکانی رادەکێشا.

ئەمڕۆ سێشەممەیە. خەبەر هاتوە کە:

"فیشەك و جبەخانەی دەستەی کالایجی تەواو بووەو حەوتوویەکیشی پێ دەچێ، هەتا لە سووریەوە بۆیان دێ..."

عەلی سەفابەگ وە پەلەقاژە کەوتوەو نیگەرانە. لە میوانخانە گەورەکەی دا هەر هاتوچۆ دەکا. تووڕەیە لە فکرەوە دەچێ. فکرەکانی وەك زنجیر بەدوای یەکتر دا دێن. فکر دەکاتەوە کە دەبێ چەند ساڵی دیکەش راوەستێ هەتا ببێتە خاوەنی زەوییەکانی گوندی "وایـوای". لێکدا لێکدا تەلگراف بۆ ئەنکەرە لێ دەدا کە:

"خەڵك راپەڕیون... یاغییەکان کێوەکانیان پاوان کردوە... چما ئێمە حکوومەتمان نیە؟..."

و لەو قیژەو هاوارانە...

"دەبێ یەك دوو ساڵی دیکە ددان بە جەرگی خۆت داگری... ئەدی لە کوێی دەستەی کالایجی؟... بۆچی خۆت نیشان نادەی؟..."

ژنەکەی لەسەر نیوتەختەکە پاڵی دابووەوەو بەسەرسوڕماوی تەماشای مێردەکەی دەکرد کە چۆن پیاسە دەکاو بە قەمچییە زیونیشانەکەی لە چەکمە تروسکەدارەکەی رادەکێشێ. وەختێك سەبرو سیکەدانەی عەلی سەفابەگ تەواو دەبوو، ئیدی خۆی پێ رانەدەگیراو لەگەڵ ژنەکەی دەستی دەکرد بە سکاڵاو نهێنی و نەخشەکانی خۆی بۆ ئاشکرا دەکرد. ئەم دەردی دڵ کردنە ئەوی سووکبار دەکرد. ئەمڕۆش یەکێك لەم رۆژانە بوو. عەلی سەفابەگ دەستی پێ کرد:

"خاتوون... دەزانی نەخشەم چیە؟..."

خاتوون:

"بلێ بزانم."

هەمیشە بە دوای ئەم پرسیارو وەڵامە کورتەدا عەلی سەفابەگ لە سەری دەڕۆیشت. ئەمڕۆش درێژەی پێ دا:

"دەزانی نەخشەم چیە خاتوون؟... بەخوا ئیدی حەوسەلەم نەماوە... ئیدی لە گیانی خۆم وەڕەز بووم. لە دەستی ئەمانە وەجان هاتووم... هەموو ڕۆژێ پۆستی ژاندارمری...، هەموو ڕۆژێ ژاندارمەو ژاندارمە هێنان...، ئیدی جاڕز بووم... دێهاتی‌یەکان دوێنێ کۆبببوونەوەو بە کۆمەگ چووبوونە بەر دەرکی ماڵی ئوستانداری دادو هاواریان وەڕێ خستبوو کە لە دەستی یاغی‌یەکان نە لە ناموسمان ئەمینین و نە لە ماڵ و گیانمان... دەیانویست تەلگراف بۆ ئەنکەرە بکەن, چاك بوو گەیشتمێ و نەمهێشت. گوتم:"کاری وا مەکەن کە ئابڕووی شارەکەمان لەلای حکوومەت بەرن..."، بەڵام هەر جۆرێك بێ, دەبێ دوو ساڵ ددان بە جەرگی خۆمان دا گرین. ڕاوەستە با گوندی وایوای بکەمە ئی خۆم, ئەو وەخت دەزانم چ دەکەم... دەزانی چ نیازێکم هەیە کچێ؟..."

ژنە بە نیشانەی بەڵێ, سەری بۆ ڕاوەشاند. عەلی‌سەفابەگ لەسەری ڕۆیشت:

"نیازم هەیە دێهاتی‌یەکان لە دەوروبەری خۆم خڕکەمەوەو ئەنکەرەی لە تەلگرافان بگرم کە : خەریکن ڕادەپەڕن... یاغی‌یەکان کێویان پاوان کردوە... دەیانەوێ حکوومەت دامەزرێنن. ئەودەم دەوڵەت لەشکرێك سەرباز دەنێرێ و مشووری هەموو کێوی‌یەکان دەخوا... هەموویان دەگیرێن. حکوومەتت پێ چیە خاتوون؟ ڕاپەڕینی کوردەکانی سەرکوت کرد, پێت وایە بە چەند یاغی کاڵە لەپێ ناوێرێ؟... بە تەلگراف چی‌یەکەم گوتوە کە جارێ لەبارەی یاغی‌یەکانەوە هیچ خەبەرێك نەدا بە ئەنکەرە... پێم گوتوە کارێك مەکە لەلای حکوومەت ئابڕووی شارەکەمان بچێ... بەڵام با دوو ساڵی دیکەش ڕابرێ و زەوی‌یەکانی وایوای ببن بە ئی خۆم, ئەودەم دەزانم چ لەو یاغی‌یانە دەکەم..."

عەلی‌سەفابەگ بێدەنگ بوو. لەفکرەوە چوو. پاشان سەری هەڵبڕی و تەماشای دارو دیواری کردو دەستی کرد بە پیاسە کردن...

زۆر پاش دوو ساڵ نەخشەکانی عەلی سەفابەگ هاتنە سەر بەر. ئەنکەرەی تەلگراف باران کرد... ئەو یاغی‌یانەی بە نەخشەی خۆی هاتبوونە نێو دێ, خستە داوی ئەو سەربازانە کە لە ئەنکەرەوە نێردرابوون و بەم جۆرە هەموویانی خاشەبڕ کرد...

دەرگا کرایەوە. عەلی‌سەفابەگ کە لە فکردا بوو, هاتەوە سەرهۆش. کارەکەرێك کە دەرگای لێ‌کردبووەوە بە غاردان لە پلیکانەکان وەسەر کەوت:

"ئەفەرێك کە سەروگوێلاکی خۆی پێچاوە, دەیەوێ بت بینێ... ریشیشی درێژە."

عەلی سەفا:

"بلێ بێته سەرێ."

ئەو پیاوەی سەروسەکوتی خۆی پێچابوو، بە هەناسەبڕکە هاتە سەرێ و خۆی بە سەر نیوتەختەکەدا دا:

"سلام علیکم براله..."

عەلی سەفا:

"علیکم السلام."

تازە هاتووەکە:

"جەنابی عەلی سەفابەگ، رەحمەتیی بابت باشترین دۆستی من بوو. خۆم لەماڵێ هاویشتووی. عەبدی پەنای بۆ هێناوی. دەبێ عەبدیی لەو بەڵایەی تووشی بووە رزگار بکەی. دێیەکی تەواوی لەپێش چاوی خۆم ئاگر تێبەردا. باشترین دۆستی رەحمەتیی باوکت پەنای بۆ هێناوی. گوتم حەتمەن دەبێ بچمە خزمەت عەلی سەفابەگ... تا لەو بەڵایە نەجاتم بدا. گیانی من بە دەستی تۆیە عەلی سەفابەگ... هاتووم دەستەو داوێنت بم کە فکرێکم بۆ بکەیەوە. لەگەڵ باوکت زۆرمان نان و نمەك کردوە، لە دوو براش زیاتر لێك نیزیك بووین... هاتووم پەنام بۆت هێناوە کە لەو بەڵایەی تووشی هاتووم رزگارم بکەی..."

عەلی سەفابەگ پێکەنی:

"دانیشە با نەختێك بێیەوە سەرەخۆ... دوایە قسان دەکەین."

عەبدیخان:

"چ بێمەوە سەرەخۆم بە قوربانت بم؟... ئەمن تازە حاڵێکم نیەو ژیانم لێتاڵە... کابرا وەك شمشێری ئیزرائیل شەو و رۆژ بەسەر سەرمەوەیە بە قوربانت بم. دێیەکی سووتاند هەر بۆ ئەوەی منی دەست کەوێ... هەموو گوندی ئاك توزلووی سووتاند جەنابی عەلی سەفابەگ... بەخوا تەیری ئاسمانیش دەبێ بۆ من بگرین بە قوربانت بم... گیانی من لە دەستی تۆ دایە جەنابی عەلی سەفابەگ... هاتووم پێڵاوەکانت ماچ کەم، دەبێ فکرێك بۆ گیانی من بکەیەوە... یاخوا مامە عەبدیت بە قوربانی منداڵەکانت بێ، مامت ئیدی نە خەوی هەیەو نە خۆراك. ئەو هەتیوە لێی بووەتە شمشێری ئیزرائیل، شەو و رۆژ بە دوای دا دەگەرێ. تازە مامت لە خەو و خۆراك و لە هەموو شتێك کەوتوە..."

عەلی سەفابەگ نیوە بە گاڵتەو نیوە بەراستی لێی پرسی:

"عەبدی خان, دەڵێن ئەو حەمەدۆکەی بە دوات دا دەگەڕێ, بستە منداڵێك زیاتر نیە؟..."

عەبدیخان بە هاوارو دادەوە هەستایە سەرپێ:

درۆ دەکەن... لەخۆوە وا دەڵێن... ئەوەندە گەورە بووە, دەڵێی منارەیە... وەختێك خانووەکەی دەسووتاند بۆخۆم بە چاوی خۆم دیتم. درۆ دەکەن... من و تۆ تێك کەنەوە ئەگەر بگەینە سەرشانی... لەخۆڕا وا دەڵێن... خەڵك شتێك دەڵێن و ئەتۆش شتێك دەبیسی بە قوربانت بم, بەڵام ئەمن بە چاوی خۆم دیومە... ئەمن دەزانم چ غوولێکە, بەخوا من و تۆ تێك کەنەوە ناگەینە سەرشانی... خەڵك قسەی چۆن دەکەن پەنا بە خوا... ئاخر چما بستە منداڵێك ئەو کارانەی لە دەست دێن؟... بووەتە دێو بەخوا هەر دەڵێی دێوە بە قوربانت بم..."

عەلیسەفابەگ:

"خان, ئەتۆ جارێ قاوەیەك بخۆوە... فکرێکی بۆ دەکەینەوە کە ئیشەڵڵا فکرت ئاسوودە بێ."

عەبدی خان بە دەستی لەرزۆکەوە پیاڵە قاوەکەی لەسەر ئەو سینییە هەڵگرت کە کارەکەرەکە لە پێشی راگرتبوو. بۆنی قاوە میوانخانەکەی پڕ کرد. عەبدیخان بە هەڵقووڕاندن قاوەکەی خواردەوە.

ژنی عەلیسەفابەگ هات و لەسەر نیوتەختێکی دیکە دانیشت:

"یاخوا بەخێر بێی عەبدیخان. بیستمان و دڵمان بۆت نارەحەت بوو بەخوا. عەلیسەفابەگ مشوری ئەو حەرامزادەیەت بۆ دەخوا. ئەتۆ زۆر فکری خۆتی پێوە نارەحەت مەکە."

لەو وەختەوە کە گوندی ئاك توزلوو سووتابوو, عەبدیخان سەیری زۆر خۆش ببوو, زۆریشی دەگوت. هەمیشە داستانی ئاگر تێبەربوونی دێیەکەی دەگێڕایەوە. هەرکەس هەبایە گوێی بۆ بگرێ, بۆ ئەو فەرقی نەبوو. کابرا گوێی لێبایە یان نا, ئەو یەك بێن قسەی دەکرد. ئەوانەی گوێیان بۆ دەگرت, زگیان بە عەبدیخان دەسووتاو تووکیان لە حەمەدۆك دەکرد. فەرماندار, ئوستاندار, فەرماندەری ژاندارمری, دێهاتی و شارنشینەکان هاودەردییان لەگەڵ دەکرد. عەبدیخان بەسەرهاتەکەی ئەوەندە بە گریان و دەردی دڵەوە دەگێڕایەوە کە گوێگر بە خۆی نەبوو, زگی پێی دەسووتا.

وەختێك دیتی ژنی عەلیسەفابەگ هاتوە گوێ بۆ قسەکانی راگرێ, لەپڕ وەك شتێك دڵی کرایەوە. هەستی کرد سوکنایییەکی بە دڵ دا هاتوە. پێش ئەوەی عەبدیخان دەست بە گێرانەوەی داستانی ئەو شەوە بکا, بە جۆرێك رەنگی دەگۆڕاو تێك دەچوو کە پێویست نەبوو داستانەکە بگێڕێتەوە. چونکە تەواوی بەسەرهاتەکە لە سیمای دا دەخوێندرایەوە.

ژنە:

"دڵی هەموومان بوو بە ئاو عەبدیخان. دوێنێ ژنی جەنابی فەرماندار تەشریفی هێنابووە ماڵی ئێمە... دەیگوت فەرماندار خۆشی ئەوەندە لەو مەسەلەیە تووڕەیە هەر خوا بزانێ... دەیگوت جەنابی فەرماندار دەیەوێ بە هەر جۆرێك بووە ئەو بێشەرەفە بگرێ... ئاخر دەکرێ دێیەکی تەواو بسووتێنێ؟... ژنی جەنابی فەرماندار زۆری حەز دەکرد جەنابت ببینێ خان... دەیگوت پێم خۆشە بیبینم و لە زمانی خۆی بیبیسم... بەکورتی هەموویان بۆت بە پەرۆشن ئاغا عەبدی. راوەستە عەلیسەفابەگ لەباری گوندی وایوایەوە خاترجەم بێ, ئەوەدەم بە خزمەتیان دەگا... بەخوا ئەگەر بێڵێ تاقە یەك یاغی بەو کێوانەوە بێنێ... عەبدیخان, دڵی هەموومان بۆ ئێوە بووەتە کەباب."

عەلی سەفابەگ قەمچییە زیونیشانەکەی لە چەکمە تروسکەدارەکەی رادەکێشاو لەم سەری دیوەخانەوە دەچووە ئەو سەرو دەگەڕایەوە.

دیسان عەبدیخان رەنگی گۆڕاو لێوەکانی دەستیان کرد بە لەرزین:

"ئاخ, ئاخ, ئاخ... ئاخر بڵێم چی, خوشکێ گیان؟... ئەو بەڵایەی بەسەر من هاتوە, خوا بە نسیبی دوژمنیشی نەکا... هەتا ئەمڕۆ بەڵای ئاوا بەسەر هیچ کەس نەهاتوە خوشکی گیان... بەخوا لە هیچ کتێبێکیش دا نەنووسراوە... وەلیخان خوشکەزای من بوو خوشکێ گیان... چ نۆجوانێك, چ نۆجوانێك... دەتگوت خەڵقی شمشاڵە خوشکێ گیان... چ بەژنێك, چ باڵایەك بریا بتدیبایە...

بەخوا ئەگەر دەتدی لە بەژن و باڵای سەرت سوڕ دەما خوشکێ گیان... خەجیج دەزگیرانی وەلی خان بوو. کەچی ئەو بیژووە حەرامزادەیە کچەکەی هەڵگرت و وەکێوان کەوت... پێت وانەبێ کچ بۆ وەلی گیان قات بوون. بەخوا هەر قامکی هەڵێنابایە پەنجا پەنجا کچی بۆ دەهاتن خوشکێ گیان... ئەمن ئاغای پێنج دێیانم خوشکێ. بابیشم هەرواو باپیریشم هەروا بوو... کەچی ئەو بێشەرمە دەزگیرانی خوشکەزامی هەڵگرت و وەکێوان کەوت... ئاخر قەت شتی وا دەبێ؟... بەو حاڵەش, بە خوشکی خۆم بڵێم, خەبەرم بۆ نارد کە لە گوناهی خۆش بووم, با

کچەکە بێنێتەوەو بێتەوە سەر جێ و ڕێی خۆی. دڵم بڕوای نەدا لەکێو و بەندەنان سەرگەردان و لێقەوماو بسووڕێتەوە... باشە ئەگەر یەکتریان دەوێ, با بیانەوێ... ئەسڵەن هەموو ڕەعیەتەکانی من وەك کوڕی خۆم وان. بەڵام بەخۆڕایی نیە کە گوتوویانە جووچکە قەل گەورە بکەی, چاوت دەکۆڵێ... ئەدی خوشکێ گیان, ئاوا... قەدیمیان دەیانگوت چاکەی زۆر خەراپەی لە دوایە, بەڵام ئەو پەندە بەو گوێ سەگباب خێوەی مـن دا نەچوو, و نەچوو, هەتا ئاخرەکەی بەسەر خۆم هات... کەس نەبوو پێم بڵێ ئاخر بێکاری ئەوەندە چاکە دەکەی؟... بۆچی هێندە لە فکری ئەمانە دای؟... باشە کچەکەی هەڵگرتوەو چووەتە شاخی, ئیدی بە تۆ چی... با هێندە لە کێو و بەندەنان بمێننەوە هەتا چاویان دەردێ... ئاخر بە تۆ چی پیاوی باش؟... بەڵام ئەمن گورگم لە کۆزی خۆم کرد, خوشکێ, گورگ... لە گوناهی ئەو هەتیوە حەرامزادەیە خۆش بووم و گوتم بێتەوە ئاوەدانی سەر کاروکاسبیی خۆی... بەڵام بریا زمانم لاڵ بایەو ئەو قسەیەم نەکردبایە. چونکە حەرامزادە هاتەوەو لە جیاتی ئەوەی چاکەم بداتەوە, لە وەلیخانی داو لە خۆڵ و خوێنی گەوزاندو منیشی بریندار کرد. هێندەی نەمابوو منیش بمرم خوشکێ گیان. تۆخوا جا تەماشا کە خوشکێ... دەبێ بە داستان بیگێڕنەوە بەخوا... دەبینی چاکەی منیان چۆن دایەوە؟..."

ژنە:

"باسی مەکە عەبدیخان, برینم مەکولێنەوە... بەکێی دەڵێی... بەمن؟... قەت نابێ چاکە لەگەڵ خەڵکی بکەی, چما عەلیسەفابەگ کەمی چاکە کردوەو خەراپەی هاتوەتەڕێ؟... بەڵام عەدەب گرتوو نابێ..."

عەبدیخان:

"بەقوربانی زارت بم خوشکێ... پیاو دەبێ عەدەب گرتوو بێ... بەڵام ئێمە کارمان لە کار ترازاوە. هەر ئەو بێ نمەك و نان خۆرو ناندێن درێنە پاش ئەوەی وەلیخانی کوشت و منی بریندار کرد, وەکێوان کەوت و یاغی بوو... خۆ دەبینی خوشکێ؟... ئێستا لە دوای چووان نەچین... گوتم باشە, بە جەهەننەم کە ڕۆیشت... حەز دەکا یاغی بێ و سەر بەندەنان بگرێ, پێی خۆشە ببێتە چەتەو هەرچی پێی خۆشە بیکا... کەچی ڕۆژ نیە خەبەر نەیە کە سوێندی خواردوە منیش بکوژێ... ئەدی خوشکێ گیان. دەستەشی دروست کردوەو لەگەڵ دەستەکەی دێتە سەرم... ئەدی خوشکێ گیان, دەستەی ساز کردوە... دەڵێن گوتوویە هەتا خوێنی عەبدیی وەك شەربەت نەخۆمەوە دڵم ئۆقرە ناگرێ... دیوتە

خوشکێ... دەیەوێ خوێنی من وەك شەربەت بخواتەوە. وەرە بڕوانە ئەگەر چاکە بکەی چۆنت جواب دەدەنەوە؟... کەس نازانێ چی لە گیانی پیرەپیاوێکی وەك من دەوێ. ئەمن ئێستا پێم لەسەر لێوی قەبرییە... خۆ ئەمن ئێستا تەنیا لە فکری نوێژو ڕۆژووی خۆم دام. ئاخر چی لە گیانی من دەوێ؟... خۆ من تازە کارم بە کاری دنیا نەماوەو هەر لە فکری ئەو دنیا دام، ئاخر بۆچی دەبێ هێندە کوێرەوەریان ببینم؟... بە کورتی بە خوشکی خۆم بڵێم خەبەریان هێنا کە هەتیو سوێندی خواردوە بمکوژێ... لە دەستیشی دێ، چونکە حەرامزادەیە. ئەوەبوو کە ماڵ و حاڵەکەمم بەجێ هێشت و لەدێی خۆمان هەڵاتم و چوومە ماڵی حوسێن ئاغا کوێخای گوندی تاك توزلوو... حوسێن ئاغا خزمی خۆمانە... بەڵام بریا لاقم شکابایەو نەچووبام، چونکە بوومە باعیسی ئەو ئاوەدانییە گەورەیە. هەموو دێیەکەی سووتاند خوشکێ گیان، پێت وابوو چییە، سووتاندی..."

ژنە:

"ئەدی برالە... بریا نەچووبایە ئەو بەقوڕێ گیراوە... بریا ڕاستەڕێ هاتبایەیتە ماڵی ئێمە."

عەبدیخان:

"ڕاست دەکەی خوشکێ... بەڵام خۆ ئەمن کەرامەتم نەبوو. چووزانم ئەو حەرامزادەیە چ نیازێکی هەیە؟... هەر بە ئەقڵم دا نەدەهات ئەو خوانەناسە بتوانێ نەخشەی وا بکێشێ... خۆزگە خوشکێ... خۆزگە هەر لە پێش دا زانیبام... بە کورتی، بە خوشکێ خۆم بڵێم دێیەکی ئاوا گەورەی سووتاندو کردیە خۆڵەمێش. ئەو فەقیرو هەژارانە بە رووت و قووتی مانەوە... بەخواجەرگم بۆ ئەو منداڵە بێگوناحانە برژیوە... نە پاروە نانێکیان هەیە بیخۆن و نە جلکە شڕەیەکیان بۆ دەرچووە لەبەری کەن... زۆریان مانگاو گوێرەکەشیان سووتاون خوشکێ گیان... بەڵام ئاگات لە دڵی من نیە... دڵی من لە هەمووان زیاتر بۆ ئەو منداڵە بێگوناحانە دەبرژێ... بە دەست خۆم نیە خوشکێ، دڵم دەبرژێ... بۆ ئەو منداڵە بەستەزمانانە... بەخوا لەبەر غەمی ئەو دێهاتییانە غەمی خۆمم لەبیر چووەتەوە... عەلییەشەم نارد خوشکێ... ناردم ئاردو ئازووخە بۆ ئەو فەقیرو هەژارانە بێنێ... چونکە دڵم هەڵی نەگرت خوشکێ. دڵی بنیادەمی بەرد نیە، ئاسن نیە... ئێستا دەترسم ئەو حەرامزادەیە بچێ دێیەکەی ئێمەش بسووتێنێ. تازە ترسی نەماوە خوشکێ گیان... کەسێك کە سامی شکا دەبێ پیاو لێی بترسێ خوشکێ... بەخوا ئاسیاب چەشمەش دەسووتێنێ... دەیسووتێنێ و دەیکاتە خۆڵەمێش... ئەتۆ دەڵێی چی

خوشکێ... بە خوشکی خۆم بڵێم ئەو گورگی بیابانە, وەدوا شوێنی من دەکەوێ, جێیەکەم پێ دەزانێ و بە نیوەشەوێ وەڕێ دەکەوێ دێتە ئاك تورلوو... نیوەشەو بوو گوێم لە دەنگێك بوو خوشکێ... ئەدی, راست نیوەشەو بوو... دیتم بانگی من دەکەن... دەسبەجێ فکرم کرد کە خۆیەتی... شەوی پێشتر خەوم پێوە دیبوو... ئەدی خوشکێ... هاتە خەوم... ئیدی دەدڵم گەڕابوو کە ئەم رۆژانە پەیدا دەبێ. هەرکە بانگیان کردم, زانیم خۆیەتی. منی دەویست, بەڵام بە خوشکی خۆم بڵێم حوسێن ئاغا منی نەدا... ئەدی, منی نەدا خوشکێ... چما دەیدام؟... بەخوا ئەگەر بیدابام... هەتیو بەسەر حوسێن ئاغای دا نەڕاند کە پیلی ژن و منداڵت بگرەو وەرە دەرێ. فەقیرە حوسێن ئاغا چی کردبایە خوشکێ؟... لەپێش دا بە منی گوت کە تەسلیم بم. گوتم نابێ و دەستم کرد بە تەقە, بەڵام فایدەی چی خوشکێ؟...ماڵەکەی ئاور تێبەردا... خوشکێ بریا دیبات کە ماڵێکی بەو گەورەیییە چۆنی گڕ گرتبوو و دەسووتا... سێ کەسیش دەرگای ماڵەکەیان گوللەباران دەکرد... چما دەکرا بە دەرکەی دا بچمە دەرێ خوشکێ؟... بەڵام کونێکی دیکەش نەبوو کە پێیدا بێمە دەرێ... لەنێو ئاگرەکەدا هەروا ئەم لاو ئەولام دەکرد. چەند جاریش بڕیارم دا هەرچۆنێك بێ بە دەرکەی دا وەدەر کەوم... بەڵام بیرم کردەوە سووتان و لە ئاگردا برژان, لەوە باشترە کە بکەومە چنگی ئەو. بڵێسەکان بۆ لام دەهاتن... چ بڵێسەیەك خوشکێ. دووکەڵەکەی دەیخنکاندم. ئەسڵەن دەرگاشم نەدەدییەوە. لەنێو ئاوری سوورو دووکەڵی رەش دا مابوومەوە. خەریك بوو بخنکێم خوشکێ, خەریك بوو ببرژێ. خۆم بە دارو دیواردا دەدا, بەڵام ئیدی تەمام لە خۆم نابوو. بەسەر سەرم, بەسەر دەم و چاوم و بەسەر هەموو جێیەکم دا ئاور هەڵدەڕژا. شادەو ئیمانم هێنا خوشکێ گیان. کەوتمە فکری ژن و منداڵەکەم و دێهاتییەکان. گوتم خوا لە هاوارتان بێ دێهاتییەکان... ئەگەر ئەمن نەبم, هەمووتان لە برسان دەمرن. گوتم خوایە بۆخۆت روحمێك بەو رەعیەتە بەستەزمانانەم بکە. ئەدی خوشکێ... گوتم خوایە بۆخۆت روحمێك بە رەعیەتە بەستەزمانەکانم بکە, لەپڕ دیتم جێیەکم ئاوری گرتوە. ئەدی خوشکێ, دیتم سەرم ئاگری گرتوە... لە ترسی روحی خۆم, خۆم بە عەرزی دادا... بە خوشکی خۆم بڵێم, هەروا بە دەوری خۆم دا دەسووڕام کە لەپڕ دەنگی ژنێکم هاتە بەر گوێ. یەکێك بانگی دەکردم خوشکێ. دەیگوت:"عەبدیخان, عەبدیخان." یەکێك لەنێو ئاگرەکەدا بەدوام دا دەگەڕا... گوتم لێرەم خوشکێ گیان. ئەدی خوشکێ... گوتی:"وەرە ئەم بەر, بەری تەنەکەکان, دەمەوێ لە لێفەتەوە پێچم.". بە کورتی سەرت نەیەشێنم خوشکێ. منی لە لێفەوە پێچا, چ

لێفەیەك، پێم وایە لێفەی کورسی بوو خوشکێ گیان... ئەمنیش کە هێندە بەخۆوە نیم خوشکێ گیان... بە کورتی ئەمنی لە لێفەوە پێچا، وەبن هەنگڵی دام و بردمیە دەر...
ئێستا ئەو حەرامزادەیە پێی وایە ئەمن لە نێو ئاگردا سووتاوم و بوومە خۆڵەمێش. خوشکێ گیان، بەخوا ئەگەر ژنە گەورەکەی حوسێن ئاغا نەبووایە سووتابووم. پێت وایە چیە؟... ئەگەر زانیبایان کە ئەمن لەنێو لێفەکەدام، دەسبەجێ دەیان کوشتم. بەڵام بە ئەقڵیان دا نەهات کە ئەمن لەنێو لێفەکەدام."

ژنە چاوی پڕ ببوون لە فرمێسك:

"چاك بوو کە بە فکریان داهات تۆ لەنێو لێفەوە پێچن و بتبەنەدەر. ئەگینا ئەو کافرانە روحمیان پێ نەدەکردی."

عەبدیخانیش چاوی پڕ ببوون لە فرمێسك و هێندەی نەمابوو لە بانگی گریانێ بدا.

عەبدیخان لەسەری رۆیشت:

"عەرزی بە خزمەتی خوشکێ خۆم بکەم، پاش ئەوەی ماڵی حوسێن ئاغایان ئاور تێبەردا، هەرلەوێ راوەستان هەتا خانووەکە دامردو بووبە خۆڵەمێش، ئەوجار چوون یەك یەك هەموو ماڵەکانی ئاك توزلوویان سووتاند... ئەدی خوشکێ گیان، دانە بە دانە، یەك بە یەك هەموو ماڵەکانیان ئاور تێبەردا... ئێستا دەڵێم ماڵی حوسێن ئاغا بە جەهەننەم، ئەویان لەبەر من سووتاندو حوسێن ئاغاش دەوڵەمەندە، چەند رۆژی دیکە خانوویێکی لەوە باشتر ساز دەکاتەوە. بەڵام بێناموس، خەڵکەکەی دیکە گوناحیان چیە؟ بەڵام فەقیرو هەژارەکان چ گوناحێکیان کردوە خوانەناسینە؟... خوشکێ بەخوا هەر غەمی ئەو فەقیرو هەژارانەمە کە بەو بەرە زستانە ماڵ و هێلانەیان لێتێك داون، ئیدی غەمی خۆم لەبیر چووەتەوە... باشە خوانەناسینە، ئەگەر ئێوە دوژمنایەتیتان لەگەڵ عەبدی هەیە، ماڵەکەتان ئاور تێبەرداوە، ئیدی لە رێی خۆتان بڕۆن، ئیدی چ کارێکتان بەسەر مستێك بەدبەخت و بەستەزمانی ئاوەدانییەوەیە؟..."

ژنە:

"دوو رۆژی دیکە زستانە، ئاخر ئەوان چۆن دڵیان هات ماڵ و گوزەرانی ئەو فەقیرو هەژارانە بەو بەرە زستانە ئاور تێبەردەن و بیکەنە خۆڵەمێش، ئاخر ئەو بەستەزمانانە گوناحیان چیە کە لە ساردی زستانێ دا لە سەرمان هەڵلەرزن؟... ئەتۆ نەختێك راوەستە خان، با عەلیسەفابەگ مەسەلەی گوندی وایوای بگەیەنێتە جێگایەك، ئەودەم تاقە یەك یاغییش

بەو کێوانەوە ناهێڵێ... نیازی هەیە هەر کە مەسەلەی وایوای بگاتە جێگایەك ئەنکەرەی تەلگراف باران بکا... دەیەوێ تەلگراف لەسەر تەلگراف بۆ عیسمەت پاشاش بنێرێ... لە مەرکەز را قشوون دەنێرن، پیادەنیزام دەنێرن، تێدەگەی خان؟... قشوونی پیادەنیزام... نەك چوار ژاندارمە... هەموویان دەگرن و یەك بە یەك لە داریان دەدەن... ئاخر چما دەکرێ دێیەك هەروا بە خوت و خۆڕایی بسووتێنن؟... وەزعی ئێمەش باش نیە، چونکە هەرچی هەمانە بۆ ئەوانەی خەرج دەکەین... فیشەك و تەقەمەنیەکەیان ئێمە دەیکڕین، خواردن و خۆراکیان بۆ دەنێرین، ئاخر خۆ ئەمە حاڵ نیە، هەموو داهاتی عەلیسەفابەگ بۆ چەك و جبەخانەی ئەوانە خەرج دەکرێ... با مەسەلەی ئەم وایوایە بە قوڕێ گیراوە لایەکی لێ وەلایەکی بکەوێ، ئەودەم دەبینی کە عەلی سەفابەگ چۆن بە خزمەت هەموانیان دەگا."

عەلی سەفابەگ هەروا لە ژوورێ دا دەهات و دەچوو و فکری دەکردەوە. وەختێك ناوی وایوای هاتە بەرگوێی لەپڕ هاتەوە سەرخۆی. هات قۆڵی ژنەکەی گرت:

"باسی چی بۆ خان دەکەی؟... باسی چی؟..."

عەبدیخان:

"قەیدی چیە عەلیسەفابەگ، خۆ ئەمن بێگانە نیم، ڕەحمەتیی بابت لە برای خۆم لەمن نیزیکتر بوو."

ژنە، کە تێگەیشتبوو شەکری شکاندوە، بە دەنگێکی گوناحبارانەوە جوابی دایەوە:

"عەبدیخان ئی خۆمانە. ئەگەر بێگانە بووایە، سکاڵام لەکن نەدەکرد."

عەلیسەفابەگ مۆڕەیەکی لە ژنەکەی کرد کە ماناکەی ئەمە بوو:

"شەکرێکی خەراپت شکاند خاتوون." و پاشان لە ژنەکەی توورە بوو:

"ئەتۆ هەستە وەدووای کاری خۆت کەوە کچێ، ئەمن و عەبدیخان دەمانەوێ دوو بەدوو پێکەوە قسان بکەین."

ژنە هەڵستاو لەسەرەخۆ چووە ژوورێکی دیکە.

عەلی سەفابەگ بە پێکەنینەوە هات لە پەنای عەبدیخان دانیشت و دەستی لەسەر ئەژنۆی خان دانا:

"زۆرم بیر کردەوە خان، زۆر... بەڕاستی حەقتە. ئەو حەمەدۆکە لەوانە نیە پیاو بە ئاسانی باشاری بکا. کەسێك کە لە ژاندارمەو دێهاتیو حکوومەت نەترسێ و دێیەکی تەواو بسووتێنێ، بۆ ئەوە دەبێ پیاو لێی بترسێ. حەوتوویەکە ژاندارمەو دێهاتییەکان تەواوی کێو و

بەندەنەکانیان پشکنیوە, بەڵام نایدۆزنەوە. هەر لەگوندی ئاك تورزلوو پەنجا کەسی وەدوا کەوتوە, لە دێیەکی دیکەش پازدە تفەنگچیی کارامە خەریکن بە دوای دا دەگەڕێن, بەڵام سەرو سۆراغی دیار نیە... بنیادەمی وا بۆ لێترسان دەبێ. لەنێو بردنی یەکی ئاوا کاری "یەشی"و "سەننار" نیە, خان."

عەبدیخان بە جارێك ڕەنگی پەڕیبوو, خۆی بەسەر دەستی عەلیسەفابەگ دا داو گوتی:

"روحی من لە دەستی تۆ دایە, هەر جۆر بووە دەبێ کارێکم بۆ بکەی... سبەینێش دێ و هەموو دێهاتی چوکووراوا دەسووتێنێ... دەبێ فکرێك بکەیەوە."

عەلی سەفابەگ:

"زۆر زەحمەتە خان, زۆر... بەڵام دەبێ فکرێکیش بکەینەوە."

عەبدیخان:

"هەر جۆر بووە, دەبێ فکرێکی بۆ بکەیەوە بۆ قوربانت بم..."

عەلی سەفابەگ:

"ئەمن فکرێك بۆ حەمەدۆك دەکەمەوە... ئەمە قسەی تێدا نیە, بەڵام ئەمنیش دەمەویست تکایەکت لێبکەم."

عەبدیخان لەپڕ لە خۆشییان دەرپەڕی:

"بەچاوان... ئەگەر داوای روحیشم لێبکەی تەنەخیم نیە عەلیسەفابەگ... فەرموو چ ئەمرێکت هەیە, ئاخر ئەتۆ برازای منی, ئاخر ئەمن و بابت لە دوو براش لێك نیزیکتر بووین... ئەگەر گیانیشمت بوێ دەسبەجێ حازرم بە قوربانتی بکەم."

عەلی سەفابەگ سەرلەنوێ دەستی عەبدیخانی گرت و لە پەنا خۆی داینا:

"خوا لە گەورەییت کەم نەکا... دەزانم چەندت لوتف لەگەڵ من هەیە... پێت وانەبێ بۆ ئەم کارە شتێکم لێت دەوێ و چاوم لە شتێکە... نەکا فکری وا بکەیەوە... ئەگەر بزانم هێندەی نووکی دەرزی بە مێشکت دادێ کە شتێکم لێت دەوێ, حازر نیم یەك قسەش بکەم... ئەمن مشووری حەمەدۆك دەخۆم تا ئەتۆ فکرت ئاسوودە بێ, بەڵام فکر نەکەیەوە لەبەرامبەر ئەو کارەدا شتێکم لەتۆ دەوێ."

عەبدیخان دیسان هەر بەو خۆشحاڵیی پێشوویەوە راست بووەوە:

"زۆر دەبووری... چما دەگونجێ ئەمن لەبارەی تۆوە شتی وام بە دڵ دا بێ, جەنابی عەلی سەفابەگ... عەرزم کردی ئەتۆ برازای منی."

عەلی سەفابەگ ماوەیەك بێدەنگ بوو و لە فكرەوە چوو. پاشان سەری هەڵبڕی و تەماشای چاوی عەبدیخانی كرد:

"نازانم دەزانی یان نا، ئەمنیش هێندێ گیروگرفتم هەن. دیارە لەم ساڵانەی دوایی دا لە سایەی خواو سەری تۆوە گیروگرفتەكانم كەمتر بوون، بەڵام كێشەی خاكەكانی وایوای ئاسوودەیی پێ نەهێشتووم."

عەبدیخان هەر بەو شاگەشكە بوونەوە هاتە نێو قسەكانی عەلی سەفابەگ:

"چۆن نازانم... زۆر باشیش دەزانم كە هەموو زەوییەكانی وایوای ئی رەحمەتیی باوكت بوون. باوكت لەوێ خەریكی كشت و كاڵ بوو. لەو سەردەمەدا ئەتۆ دەچوویە قوتابخانە. وەختێك بابت عومری درێژی بۆتۆ بەجێ هێشت، ئەو لادێییانە هاتن و گوندی وایوایان كردە ئی خۆیان. خۆ ئەو قەباڵەیەی لە دەست تۆ دایە خۆڕایی نیە... قەباڵەی خاوەن ملكیەتیی شەشدانگی وایوایە. ئەمنیش شاهیدم. جگە لەمن دێهاتییەكانی پێنج گوندی خاردەشتیش شایەتن. هەموو خەڵكی ئاك توزلووش دەزانن كە تەواوی خاكەكانی وایوای هی بابی رەحمەتیت بوون... هەر هیچ غەمی ئەو شتانەت نەبێ. ئەم مەسەلەیە حەواڵەی مامە عەبدیت بێ. مامە عەبدیت لەو جۆرە كارانەدا وەستایە. هەموو كێشەیەكی ملكایەتیت بە مامی خۆت بسپێرە. بەخوا هەتا شەش مانگی دیكە قەباڵەی هەموو خاكی وایوای بەناوی تۆوە وەردەگرم."

عەلی سەفابەگ:

"پێت وا نەبێ چاوەڕوانییەكم لێت هەیە خان."

عەبدیخان:

"چۆن فكری وا دەكەمەوە برازا گیان؟."

عەلی سەفابەگ:

"هەموویانم لە دێی دەركردوە. وام كردوە هیچیان لە ترسان ناوێرن پێ دەخاكی وایوای بنێن. هەموویان هەڵاتوون و چوونە "یۆرگیر"، بەڵام دەست هەڵگر نین."

عەبدیخان:

"ئەتۆ ئەم كارانە بۆ مامە عەبدیت دانێ. ئەو كارانە كاری منن. بزانە چۆنیان جێبەجێ دەكەم."

عەلی سەفابەگ:

"هەتا حەوتوویەکی دیکە ئەو جبەخانەیەی داوام کردوە, لە سووریەڕا دەگاتەجێ."

عەبدیخان:

"باشە..."

عەلی سەفابەگ:

"خەبەرم داوە هەموو ئەو جبەخانەیە دەستەی کالاجی وەری بگرێ."

عەبدیخان:

"ئۆ خوایە, مامت بە قوربانی ئەو چاوانەت بێ."

عەبدیخان هەڵستا. عەلی سەفابەگ پێی چەقاند کە عەبدیخان لە ماڵی ئەوان بمێنێتەوە. بەڵام عەبدیخان پێی سەلاّح نەبوو لەم ڕۆژانەدا میوانی هیچ کەس بێ. تەنانەت وەختی ساڵ ئاواییش کەمتەرخەمیی نەکردو گوتی:

"باشتر وایە ئەم ڕۆژانە لە پێش چاوی ئەم و ئەو پێکەوە نەبینرێین... ئەو جۆرە تێبینییانە پێویستن."

## (١٦)

ئەو شەوە تا رۆژ یەك تەكان بە رێ دا رۆیشتن، لای بەیانی رێگای بەردەلانەكانی سپیەكاجیان گرت. لەو هەموو رێیەدا هیچ قسەیەكیان نەكردبوو. تەنانەت یەك قسەش. وەختێك لە چیای شاخاوی و بەردەلانی سپیەكاج وەسەر دەكەوتن، لەسەر گابەردێك دانیشتن و روانییانە دەشتی چوكورراوا كە لەگەڵ خۆرهەڵات دەتگوت چووەتە بن دووكەڵ. بەرە بەرە ئەو تەم و مژە لاچوو و دێیەكان و جادەكان و تەپۆلكەكان و چۆمێك كە بە قۆرت و پێچ دەرۆیشت و بریسكەی دەدا، وەدیار كەوتن.

وەختێك هەتاو گەرم بوو، ئەو تەم و مژە شوێنەواری نەما. دەشتێكی رووناك بە هەموو دارو بەردەكانیەوە لەپێش چاویان راخرا. مەزرای داچێندراو و بەیار، بە رەنگی رەش و سوورو رەنگەكانی دیكەوە دەتگوت لەبەر دەمیانن.

جەبار بێدەنگییەكەی شكاند:

"بڕوانە حەمەد، دوێ شەوێ لە هۆوێ بووین."

حەمەد سەری هەڵنەبڕی:

"ئەدی، لەوێ بووین."

جەبار نەیدەزانی چ لەو بێوازییەی حەمەد بكا، بێدەنگ بوو، بەڵام حەزی دەكرد قسە بكا. شتێك پاڵی پێوەدەنا قسە بكا:

"بڕوانە بنارەكانی ئاناوارزا. هۆوە گوندی "ئاهچیك"و ئەو جێیەش كە رەش دەچێ مێشەیە... ئەو جێیەش كە دەڵێی هێندێ شتی بەسەردا دەفڕێ، باتلاغی بێ دارو درەختە... ئاك تۆزلوو هێشتا دووكەڵی لێ هەڵدەستێ... بڕوانە، هێشتا ئاك تۆزلوو دووكەڵی لێ هەڵدەستێ... دیتت حەمەد؟."

حەمەد ملی بە لاوە ناو بە بێ وازی جوابی دایەوە:

"دەیبینم."

جەبار بە نیگەرانی‌یەوە پرسیاری کرد:

"بیر لە چ دەکەیەوە حەمەد؟... بۆچی لە گژ فکران راچووی؟."

حەمەد:

"تۆ بڵێی ئەو خوانەناسە سووتابێ؟... لە فکری ئەودام. پاشانیش بیر لە فەقیرو هەژارەکەی ئاك تورزلوو دەکەمەوە. ئەوان زۆریان زوڵم لێ‌کرا. فکر دەکەمەوە کە چ بکەین."

جەبار:

"تازە چووە، بەخۆڕایی بیری لێ‌مەکەوە."

حەمەد:

"تازە چووە، ئەوەی نەدەبوو بکرێ کرا."

جەبار:

"بچینە لای تومەتەزەرد، ئەمشەو لەلای ئەو بحەسێینەوە... سبەینێ دەچینەوە شاخی..."

چاوەکانی حەمەد بریسکەیەکیان دا:

"دەزانی بیر لە چ دەکەمەوە؟."

جەبار:

"نا."

حەمەد:

"دەمەوێ بچمە خاردەشت. دەمەوێ خەڵکی هەر پێنج دێیەکە کۆبکەمەوەو پێیان بڵێم کە ئیدی عەبدی‌خان نەماوە، خەیاڵتان تەخت بێ. پێیان بڵێم زەوی‌یەکان ئی خۆتانن، گاجووتەکان ئی خۆتانن، ئیدی ملکانەیەك لە گۆڕێ دا نیە، هەرچەندی پێتان خۆشە بیکێڵن... هەتا ئەمن لەو کێوانە ماوم دەبێ وابێ... رۆژێکیش کە ئەمن کوژرام بۆخۆتان بیر لە حاڵی خۆتان بکەنەوە. پاشان دەمەوێ دێهاتی‌یەکان کۆبکەمەوەو درووەڵانەکە بسووتێنم. دەبێ لە پێش دا درووەڵانەکە پاك بکرێتەوە. هەتا هەموو چەقڵەشینکەکە نەسووتاوەو پاك نەبووەتەوە، نابێ هیچ کەس وەرد ببرێ."

جەبار چاوی پڕ بوون لە فرمێسك:

"زۆر باش دەبێ حەمەد. دێی بێ ئاغا. دێیەك كە لەوێ هەركەس هەر شتێك داچێنێ، ئی خۆیەتی."

حەمەد زەردەیەكی هاتێ:

"هەركەس هەرچی پەیدای دەكا..."

جەبار:

"ئێمەش تفەنگ لەشان پارێزگارییان لێدەكەین."

حەمەد:

"ئێمە كارێكی دیكەشمان هەیە."

جەبار بە ئاسەوە پرسی:

"چ كارێك؟."

حەمەد:

"بۆخۆشم باش نازانم... بەلاّم كارێكی دیكەش هەیە."

جەبار:

"ئاخر چ كارێك؟."

حەمەد:

"فەقیرو هەژارەكەی گوندی ئاك توزلوو زۆریان زوڵم لێكرا جەبار... حەتمەن دەبێ كارێكیان بۆ بكەین. بووینە هۆی ئەوە كە هەموو ماڵەكانیان بسووتێن و ببنە خۆڵەمێش... لە فكری ئەوان دام."

جەبار:

"راست دەكەی، زۆریان زوڵم لێكرا، بەلاّم چیمان لە دەست دێ؟."

حەمەد:

"دەتوانین چ كارێكیان بۆ بكەین؟."

جەبار بە باوێشك دان هەستایە سەرپێ. لاقە درێژەكانی و شانە پانەكانی وەك فەنەر لەبەر یەك كشانەوە. حەمەدیش بە باوێشك دان هەڵستا. دەم و چاوی بە چاكی تاوەگاز ببوون. لەبەر لاوازی ئێسك و پێستی بەسەر یەك دا وشك ببوون. لە روخساری دا نیشانەیەك لە ماندوویی نەدەبینرا. لە قسەكردن و رێ رۆیشتن و هەموو ئاكارو كردەوەیەكی دا تواناو چوستی و چالاكی دەبینرا. لەو كاتەوە كە یاغی ببوو، بەتەواوی گۆڕابوو.

وەختێك ڕاست بووەوە ئەو تیشكە زەردەی جاران لە مێشكی دا درەوشایەوەو زیاتر و گەورەتر بوو:

"جەبار، هەركەس هەرچی چاندی و هەرچی پەیدای كرد ئی خۆیەتی. پارێزگاریشیان لەسەر مە. دەبێ هەموویان زەویی خۆیان هەبێ."

جەبار:

"ئێمەش پارێزگارییان لێدەكەین. هەركامێكیان دەبێ خاوەنی زەویی خۆی بێ."

بۆ لای خۆرهەڵاتی گابەردەكە بایان دایەوە. حەمەد لە پێشەوەو جەبار بە دوای دا بە ڕێچكە بزنێك دا وەڕێ كەوتن.

جەبار:

"لەوانەیە ئێستا ژاندارمەكان بە دوامانەوە بن."

حەمەد:

"حەتمەن بە دوامانەوەن... دەبێ بچینە نێو لێڕەوار."

جەبار:

"ئەرێ، باشترە."

حەمەد:

"لەو كاتەوە كە كەوتوومە بیری دێهاتییەكان و زەوییەكانیانەوە، هیچ پێم خۆش نیە بمرم."

جەبار بە دەنگێكی كەمێك لەرزۆكەوە وەڵامی دایەوە:

"مردن؟..."

حەمەد نایب ڕەجەبی وەبیر هاتەوە:

"ئاخرەكەی تێنەگەیشتم ئەو نایب ڕەجەبە چ جۆر بنیادەمێكە. لە بەرەبەری سەرەمەرگیش دا هەر دەیەویست یارمەتیمان بدا. چەند خۆشحاڵ بوو كە گوندی ئاك توزلوو ئاوری گرتبوو. هیچ سەرم لێی دەرنەدەچوو. هەموو كەسی خۆش دەویست، بەڵام وەك ئەوە دەچوو دوژمنی هەموو كەسیش بێ. ئەگەر چاكەشمان لەگەڵ ئاك توزلوو كردبایە دیسان خۆشحاڵ دەبوو."

جەبار بۆنی كاجەكانی كە لە هەوادا بڵاو ببوونەوە هەڵدەمژی. چیلكە كاجێكیشی لە بن ددانی نابوو، دەیجوی:

"ڕاست دەكەی حەمەد، ئەمنیش پێم وایە."

حەمەد:

"دەڵێی دڵم دەیەوێ لە قەوەزی سینگم بێتەدەرو هەڵفڕێ. خۆشحاڵم. سەرم گێژە. ئەسڵەن نازانم دەبێ پێبکەنم یان دەبێ بگریم. جارێك خۆشحاڵم و جارێك گریانم دێ. هەر لە بیری زەوییە کشتوکاڵییەکان دام. نازانم لادێیییەکان وەختێك نیازی ئێمە تێ بگەن دەڵێن چی..."

جەبار:

"خوا دەزانێ."

ئەو شنەبایەی جار جار دەهات، بۆنی پنگ و سەرچاوەی لێدەهات. بە شەو لێرەوارو بەردەڵان و کێو و بەندەنیان بڕیبوو. هێشتا زۆریان مابوو بگەنە ماڵی ئومەتەزەرد. خەریك بوو هەتاو بڵیند دەبوو.

حەمەد:

"با هەتاو ئاوا بێ دوایە وەڕێ دەکەوین."

جەبار:

"باشە."

دانیشتن. شەلاڵی ئارەق بوون. هەتاو ئاوا بوو. دنیا تاریك بوو. پەردەیەکی رەش کەوتە سەر ئەو چوکووراوایە کە بەیانی کەوتبووە ژێر تەم و مژ. ئاسمان پڕ بوو لە ئەستێرە. ئەستێرە بە تەنیشت ئەستێرەوە. پۆلە ئەستێرەیەك لەلای خۆرهەڵات دەتگوت پریشکان داوێ. جار جار ئەستێرەیەك رادەخزی. زۆربەی ئەو ئەستێرانە دەکەوتنە پشتی کێوەکەی بەرامبەریان...

هەستان. گەیشتنە ماڵی ئومەتەزەرد:

"حەمەد بە دەنگێکی نزم ئومەتی بانگ کرد:

"کاك ئومەت... هووووت، هووووت، کاك ئومەت..."

ماوەیەکی زۆر لە ژوورێ ڕا جوابێك نەبوو. لە پاشان دەرگا کرایەوەو ئومەت هاتەدەرێ. کاتێك زانی ئەوانەی لە تاریکی راوەستاون حەمەدو جەبارن، پێی سەیر بوو و ترسا. نەیتوانی هیچ بڵێ. ئەوەی گوتیشی کەس لێی حاڵی نەدەبوو.

حەمەد:

"سلاو کاکە... باس و خەبەر چیە؟."

ئومەت:

"سسس، سسس..."

حەمەد تێگەیشت خەبەرێك هەیە.

ئومەت داهاتەوە، بە سرتە بە حەمەدی گوت:

بڕۆن... بە دوای من دا وەرن بچینە شاخی. ئەم دەوروبەرە پڕە."

جەبار:

"لەبرسان ئەوە بەلادادێین."

ئومەت:

"کەوایە راوەستن."

ئومەت چووە ژووری و دە دەقیقەیەکی پێ چوو تا هاتەوە:

"یاڵلا، بڕۆن با بڕۆین."

بەدوای ئومەت دا وەرێ کەوتن. بەنێو گابەردو شاخەکان دا رێگای بەرزاییەکانیان گرتەپێش. چنگیان لە رەگ و لك و پۆپی دارەکان گیر کردو وەسەر کەوتن. سەعات و نیوێك بەم شێوەیە پێ هەڵلاچوون. لە سووچێکی پڕ دارو دەوەن ئومەت بە هەناسەسواری راوەستا:

"ماڵ خەراپینە ئەوە چ کارێك بوو کردتان؟... ئاخر کاری وا لە چ کتێب و دەفتەرێك دا نووسراوە؟... شتی وا دەبێ پیاو دێیەکی چوکووراوا بە تەواوی بسووتێنێ؟... بەخوا "گیزیك دووران" کە کێو لەبەر ناوەکەی دەلەرزی و ئەو کێوانە یاغیی وەك ئەو بەغیرەتیان بەخۆوە نەدیوە، ئەویش غیرەتی کاری وای نەبوو."

جەبار:

"خەبەری دیکەت چ هەیە براڵە... ئەوانمان پێ بڵێ."

ئومەت:

"دەتەوێ چ خەبەرێکم هەبێ؟... تفەنگچییەکانی دوازدە دێ، کە رەنگە هەزار کەس زیاتر بن، لەگەڵ گوردانێك ژاندارمە بە دواتانەوەن. ئێستا دوو رۆژە کێو و بەندەن و دەشت و دەر پڕن لە دێهاتی و ژاندارمە کە بە دوای ئێوەدا دەگەڕێن. کونە مشکیشیان دەست کەوێ دەیپشکنن. بەخوا بەگیرتان بێنن، ئەنجن ئەنجنتان دەکەن. ئاخر ئەوە کارە دێیەکی تەواو ئاور تێ بەربدەی؟... بەخوا تا ئێستا شتی وا نە کەس دیویەو نە کەس بیستوویە. ئێستا باشە دێیەکەتان سووتاند..."

ئومەت کە گەیشتە ئێرە بێدەنگ بوو:

"حەمەد بە دەنگێکی کزو گیراوەوە پرسی:
"باشە, ئێستا دێیەکەمان سووتاند... دوایە؟..."
ئومەت دیسان بێدەنگ بوو.
حەمەد دیسان دووپاتی کردەوە:
"سووتاندمان... باشە, دوایە؟..."
ئومەت:
"هیچ... باشە ئێستا دێیەکەتان سووتاند..."
حەمەد:
"باشە ئێستا بڵێین دێیەکەمان سووتاند... باشە, دوایە؟..."
ئومەت کە خەبەرێکی تەواوی لە مەسەلەکانی دیکە نەبوو, دیتی وا چاکە باسەکە بگۆڕێ. گوتی:
"ئێستا بڵێین دێیەکەتان سووتاند..."
نەیدەزانی چۆنی تەواو بکا. لەپڕ درۆیەك وەك بریسکە لەسەری دا درەوشاو لەسەری ڕۆیشت:
"لانی کەم توانیتان ئەو خوانەناسە بکوژن؟."
جەبار:
"لەگەڵ ماڵی حوسێن ئاغا سووتاو بوو بە خەڵووز."
ئومەت:
"لەو پشتەوەی ئەشکەوتێك هەیە. کەس نایەتە ئێرە. هەتا دێهاتی و ژاندارمەکان ڕێگایان دەگۆڕن و دەڕۆن, دەبێ هەر لێرە وەمێنن. نەکەن پێتان لێرە بترازێ. عەلیەشەلیش لە ئاسیاب چەشمەیە. سبەینێ نان و پێخۆرتان بۆ دێنم. هەر لێرە بن."
پاشان حەمەدو جەباری هێنایە پەنا ئەشکەوتەکە:
"ئێرەیە بچنە ژوورێ. ئەگەر لەم دەوروبەرە پەیدا بوون, نەخەڵەتابن بۆ لای خوارێ, بۆ لای چوکووراوا رابکەن. چونکە دەگیر دەکەون و کوژرانتان مسۆگەرە. ئەگەر لەم دەوروبەرانە پەیدا بوون, دەبێ ئێوە هەلکشێن بۆ سەرێ. ئەگەر بەو دیودا شۆڕ بنەوەو بگەنە داوێنێ, دەچنە سەر چۆمی "کەشیش". ئەمن رۆیشتم. بەخوام سپاردن."
وەختێك ئومەت رۆیشت, ئەوانیش لە پەنا ئەشکەوتەکە دانیشتن و بە پەلەپەل زگی خۆیان تێر کرد.
جەبار:

"ئەمن دەچمە ژووری ئەشکەوتێ دەنووم. ئەگەر خەوت هات، ئەمن هەستێنە."
حەمەد وەڵامێکی نەدایەوە:
تیشکە زەردەکە هەروا لە مێشکی حەمەد دا دەسووڕاو دەسووڕا... تیشکە زەردەکە وەك چۆمێکی خوڕێن، بریسکەدارو بە قوڕت و پێچ، بە شەپۆل دان بە مێشکی حەمەد دا رادەبردو رادەبردەوە.
خاردەشت بە دڕووەڵانە شینەکەیەوە لە مێشکی حەمەد دا گڕی گرتبوو و دەسووتا:
"خاکی هەرکەس‌ئەتپەتوێیەتی. عەبدی‌خان مابێ، یان نەمابێ."
بڵێسەکان بەخێرایی‌یەکی سەرسوڕهێنەر کەوتبوونە دوای یەکتر. بڵێسەو زمانە ئاورەکان وەك تاڤگەیەك کە لە بەرزایی هەڵبڕژێ، هەڵدەڕژانە سەر خاردەشت و دەڕژێشتن. گێژەڵووکەیەك باوەشێك ئاگری لە خاردەشت دا هەڵگرتبوو و لەم دڕووەڵانەوە بۆ ئەو دڕووەڵان و بۆ هەر لایەك غاری پێ دەکرد:
"دەپازدە رۆژێك دەبێ ئەو باوەشە ئاگرە هەروا لە خاردەشت دا هەڵبێ و بە هەموو لایەك دا بڕوا. لەپاشان رۆژێك دەبینی کە ئاورەکە کووژاوەتەوەو تەواوی خاردەشت کەوتوەتە بن خۆڵەمێش، بن خۆڵەمێشێکی رەش وەك وردە خەڵووز...
دەنگی گۆرانی لە خاردەشت بەرز دەبێتەوە. لە هەر سووچێك گۆرانی‌یەك... شادو زیندوو... دێهاتی‌یەکان گاجووتەکانیان دەبەن نێری کێشاوە، دێهاتی‌یەکان بە دوای گاجووتەکانەوەن... زەوی‌یەکان وەردو شێو دەبڕن، بێ‌ئەوەی چەقڵەشینکە یان شتێکی دیکە لاق و لەتەریان هەڵدڕێ... چەند خۆشە...
حەمەن لە ئاسیاب چەشمە جێژنێك دەگیرێ. جێژنێکی گەورە... حەمەن لەو جێژنەدا مام عەلی دورمووش بەو قەڵافەتە زلەیەوە هەڵدەپەڕێ، جا چ هەڵپەڕینێك... یەکێك لەو لاقە زەلامانەی هەتا ئاستی سەری هەڵدێنێ و لەسەر یەك لاق سەمایەکی سەیر دەکا... هەموو لەبەر پێکەنین کەفەزگ دەبن. ئەگەر نایب رەجەب دەیدی کە چ باسە، حەمەن کەیفی دەکرد، خۆشحاڵ دەبوو، بەڵام داخی گرانم ئێستا نایب رەجەب لە مێشەی ئاناوارزادا خەوتوە."
لەنەکاو ترس دڵی حەمەدی لەرزاند:
"هەزار کەس دێهاتی... بگرە زیاتر لە هەزار چەکداری دێهاتییش... ئاخر ئەو هەموو لادێیی‌یە لەو کێو و کۆسارە چی‌یان دەوێ؟... ئەمە جێی باوەڕ نیە... ئەگەر دێیەك سووتێندراوە، بەوانی دیکە چی؟... گووردانێکیش ژاندارمە... دەی جا چ بوو... لە چی دەترسێی حەمەد... بەڵا نەیە، ئەگەر هات بەخێر بێ."

ئەو ترسەی دڵی حەمەدی داگرتبوو، لە نەکاو رەویـیـەوە... بـا هـەزار کـەس بـن... بـا هەزارو پێنسەد کەس و دوو هەزار کەس بن... هەرچەندی دەبن با بن... تازە تـرس لـە دڵـی حەمەد دا نەمابوو. زیاتر لە سێ‌سەد فیشەکیشی پێ بوو. ئەوەندەی لە ژیانی خۆی دڵنیا بـوو، ئەوەندەش خاترجەم بوو کە تاقە گوللەیەکیش بە خەسار نادا.

هەتا بەیانی لەو فکرانە دابوو. هەمیشە خەجیجیشی لەبیر بوو. فکری لـە بەندیخانـە دەکـردەوە. ئەو زیندانەی خەجیجی تێدا بوو. دڵی تەزی. باوەڕی نەدەکرد ئەوەندە بەڵایـە تووشـی کەسـێك بـێ. سەری لەو هەموو بەڵایە سوڕما. حەمەد کەمتر جنێوی دەدا. بە قینەوە چەند جنێوێکی دان.

کاتێك جەبار وەخەبەر هات، هەتاو بڵێند ببوو. جەبار چاوەکانی هەڵگلۆفین و هەستا:

"حەمەد، بۆچی هەڵت نەستاندم؟."

حەمەد:

"خەوم نەدەهات."

جەبار:

"با پاروەوە نانێك بخۆین، پاشان ئەتۆ بخەوە."

حەمەد:

"باشە."

حەمەد پێپێچەکەی کردەوە. پیوازو پەنیری تـازە. پیـوازو پـەنیریان لـەنێو نـانی کـردو بـە کاوەخۆ خواردیان. پاشان هەسـتان و چوونە سـەر کانیـیـەك کـە نـەختێك لـەولای ئەشـکەوتەکە بوو. دەمیان پێوەناو تێرزگی خۆیان ئاویان خواردەوە.

حەمەد:

"ئەمن لێرە لەبەر تاوێ رادەکشێم."

جەبار:

"بنوو."

حەمەد هەر سەری وە بەردەکە کردو خەوی لـێ‌کەوت. روخساری وەك روخساری منداڵێکی ساوا ئارام بوو. لای نیوەڕۆیە وەخەبەر هات. ئارەقی کردبوو. خۆی خاوکێش کرد. هەر بە ئاوی ئەو کانیـیەی لەبن بەردەکە هەڵدەقوڵی دەم و چاوی شوتن. هاتەوە سەرخۆ.

جەبار:

"ئەم ئومەتە زەردە بەڵایەکمان بەسەر نەیەنێ؟."

حەمەد:

"ئەری، نەکا بەڵایەکمان بەسەر بێنن؟."

جەبار:

"خوا دەزانێ."

حەمەد:

"پێم وا نیە. بەڵام وا باشترە لێرە نەمێنین. بچین بۆ لای ئاسیاب چەشمە."

جەبار:

"لەداو نەکەوین؟."

حەمەد:

"یاغی لە داو ناکەوێ. یاغی بەداوەوە دەکا."

جەبار:

"جارێ با راوەستین هەتا نوعمەت پەیدا دەبێ."

حەمەد:

"بەڵێ. جوان نیە بێخەبەر برۆین."

سەعاتێك دواتر گوێیان لە خشپەخشپێك بوو. خۆیان لە پشتی گابەردەکە حەشار دا. خشپە خشپەکە زیاترو نیزیکتر بوو. لە پشت کاجێکەوە سەروسەکوتی نوعمەت وەدەر کەوت. وەختێك دیتی ئەوان لە پشت گابەردەکە دامەزراون زەردەیەکی کرد. حەمەدیش زەردەیەکی هاتێ.

نوعمەت:

"خەریکن رێگاکەیان دەگۆرن. لەوە تەمابراو بوون کە ئێوە لەم دەورو بەرە بدۆزنەوە. منیش پێم گوتن یاغییەك کە دوێنێ لە ئاناوارزا دێیەکی تەواوی سووتاندوە، ئەمڕۆ نایە لە کێوی "ئاکارجا" خۆی بشارێتەوە."

جەبار:

"چاکت گوتوە کاك نوعمەت."

نوعمەت دەستی حەمەدۆکی گرت:

"زۆرم تۆ خۆش دەوێ. براڵە، بە ئەندازەی روحی خۆم. هەرچی کردووتە چاکت کردوە. حازرم ژن و منداڵەکەشت بە قوربان بکەم."

جەبار بە لە خۆیایی بوونەوە:

"ئاورمان تێبەردا. سووتاندمان، ئەو سەگبابە."
حەمەد پرسی:
"کاک نومەت. ئەگەر زەوی ئی ئەو کەسە بێ کە دەیکێڵێ و کاری لەسەر دەکا، چۆن دەبێ؟."
نومەت:
"زۆر باش دەبێ کاکە."
حەمەد:
"ئەگەر گاجووتەکان ئی ئەو کەسانە بن کە کاریان پێ دەکەن و عەرزیان پێ هەڵدەدرن چۆن دەبێ؟."
نومەت:
"جا لەوە چاکتر لە دنیادا هەیە؟."
حەمەد:
"ئەگەر خاردەشت ئاگری تێبەردرێ و پاش ئەوەی خاکەکە لە چەقڵەشینکە پاک بووەوە بکێڵرێ، چۆن دەبێ؟."
نومەت:
"چاک دەبێ."
جەبار ئەو پێرپێچە نانەی نومەت هێنابووی لێی وەرگرت و لە پشتێی بەست.
گوتیان:
"خوات لەگەڵ کاک نومەت."
نومەت:
"ئەگەر تووشی گیروگرفتێك بوون، وەرنەوە لای من. حەمەدم زۆر خۆش دەوێ."
حەمەد:
"خوا بت پارێزێ برا گیان."
حەمەد کە لە پێشەوە دەڕۆیشت، راوەستا. جەباریش کە گەیشتەوە ئەو راوەستا. حەمەد بە دەستی چەپی، دەستی راستی جەباری کە بە تفەنگەکەیەوە بوو، گرت. چاویان لە چاوی یەکترەوە بری و تەماشای یەکتریان کرد.
حەمەد:
"کاکە، نازانی چەند خۆشحاڵم."
جەبار:
"ئەمنیش هەروا، براله."

## (١٧)

گوندی "ڕەشەتوو" لەسەر چۆمی جەیهانە. چۆمی جەیهان لە پێش ماڵەکانی گوندی ڕەشەتوو دەڕژێتە بەستێن و وەك دەلیایەك پان دەبێتەوە. لێرە دە پازدە ساڵی پێ دەچێ هەتا چۆمی جەیهان جارێك جێگۆڕکە بکا. بە چەپ و ڕاست دا دەڕوا, قۆرت و پێچان دەکاو لەسەر ڕێگای خۆی چەو و لیوەو گڵە نەرمە بەجێ دێڵێ. هەربۆیە خاکی چوکووراوا لێرە لە جێیەکانی دیکە بەپێژەوترە. خاکی ئەم دەوروبەرانە گەوهەرە.

ئەو زەوییانەی عەلیسەفابەگ لەم دواییانەدا وەدەستی هێنابوون, لەگەڵ گوندی ڕەشەتوو هاوتخووبن. نیوەی زیاتری ئەو خاکانە لە پاش هەرمەنییەکان بەجێ ماوە, نیوەکەی دیکەشی بەزۆر فێڵ و کەڵەك لە چنگی دێهاتییەکان دەرهێناوە. ناکۆکیی نێوان خەڵکی ڕەشەتوو و عەلی سەفابەگ لەمێژ ساڵە دەستی پێ کردوەو درێژەی هەیە. عەلی سەفابەگ و دێهاتییەکان سێبەری یەکتری بە تیر دەنگێون.

ژێرچەپۆك کردنی خەڵکی ڕەشەتوو و دەست بەسەر داگرتنی ئەو هەموو زەوی و زارە بە هەزار فێڵ و تەڵەکە لە لایەن عەلی سەفابەگەوە داستانێکی دوورودرێژە.

ئەم دەست بەسەرداگرتنە, بەرزترین نموونەی تەماحکاری و فێڵبازی و ساختەچییەتیی عەلیسەفابەگە. خەراپ نیە بزانین عەلی سەفابەگ بۆ وەدەست هێنانی مستە گڵێك چ زوڵم و زۆرێکی لە خەڵك کردوە.

"کاك ساڵە" منداڵی گوندی ڕەشەتوو بوو. تەنیا خوێندەواری ئاوەدانی بوو و هەر لەو کاتەوە کە لە قوتابخانەی ئاوایی خەریکی خوێندن بوو, بە هۆش و زرینگی و تێگەیشتن ناوبانگی دەرکردبوو. بەغیرەت و قسە لە ڕوو و ڕاست و بێ باك بوو.

دنیا خەرابا درۆی بە زاری دا نەدەهات. کەڵەگەت و باریك و بەهێز، دەم بە پێکەنین و وەك منداڵان ساکارو دڵپاك بوو. کاك ساڵە کۆسپی سەر ڕێگای عەلی سەفابەگ بوو. ئەگەر ئەو نەبووایە عەلی سەفابەگ دەیتوانی بە ئاسانی هەموو زەوییەکانی ڕەشەتووش هەڵلووشێ. بەڵام کاك ساڵە وەك کێوێك لە نێوان عەلی‌سەفابەگ و زەوییەکانی خۆی و دێهاتییەکانی ئاوەماڵی دا ڕاوەستابوو و سنگی کردبووە قەڵغان. کاك ساڵە وەك دێهاتییەکانی دیکە نەدەچوو. دێهاتییەکانیش زۆریان خۆش دەویست و بە قسەیان دەکرد. لەمێژ ساڵ بوو عەلی‌سەفابەگ دەیەویست کارێکی لەگەڵ بکا، پێی نەکرابوو. کێشەی عەلی سەفابەگ و خەڵکی ڕەشەتوو هەتا ئەمڕۆی کێشابوو. دێهاتییەکان نەدەچوونە ژێر بارو لە پێشی ڕادەوەستان، تا ئەوەی...
بەڵێ تا ئەوەی:

"وەسمان کالایی" سەرکردەی دەستەی کالایی کە ئامۆزای کاك ساڵەو هەر لەو کاتەدا سەگی عەلی سەفابەگ بوو، یەکێك لەو بەڵا نانەجیب و نارەسەنانەی ڕۆژگار بوو. خەڵکی ئاوەدانی ئاویشیان خواردبایەوە دەسبەجێ بۆ عەلی‌سەفابەگی دەگێڕایەوە. لادێییەکان هیچ خۆشیان نەدەویست. زۆریش لەنێو دێ نەدەمایەوە. لەپێش دا مسگەریی دەکرد. بەڵام مسگەرییەکەشی بە جارێك وەلا نابوو و ببوو بە پیاوی عەلی‌سەفابەگ.

مەڕو مانگای دێهاتییەکانی دەدزی، خەرمانەکانی دەسووتاندن، بە کورتی لە هیچ بێشەرەفییەك خۆی نەدەپاراست. لادێییەکان کێردیان گەیشتبووە ئێسکان، بەڵام چییان بکردایە؟... لەلایەك لەبەر خاتری کاك ساڵەو لەلای دیکەش لە ترسی عەلی‌سەفابەگ نەیاندەتوانی هیچ بکەن. جگە لەوەش دەترسان چیلکە لە پیسایی وەردەن.

کاك ساڵە خەریك بوو ژنی دێنا. زەماوەندی بوو. چەند ڕۆژ بوو دەهۆڵ و زوڕنا ڕەشەتووی وەسەر خۆی گێڕابوو. هەموو ئاوایی لە جموجۆڵ دابوو. هەموو دێهاتییەکان لە شایی و هەڵپەڕین دا بوون. دەتگوت لە هەموو ماڵان زەماوەندە. قیامەتێك بوو... ئاخر کاك ساڵەیان ژنی دێنا.

شەوی ئاخری زەماوەند بوو. لەبەر دەرگای ماڵی زاوا دەنگی سێ تفەنگ هات. بوو بە هەنگامە. کاك ساڵە بریندار ببوو. وەسمان کالایی تەقەی لە کاك ساڵە کردبوو. ماڵی بووکێ بوو بە ماڵی شینگاو دەستی بووکێ لە خەنەدا مایەوە. کالاییش لە تاریکایی‌دا خۆی ون کردو وەکێوان کەوت.

لەسەر مەسەلەی ئەو پیاوکوشتنە زۆر باس کرا. زۆریش سەیر بوو. ئاخر بۆچی لەسەر هیچ و خۆڕایی کالایچی کاك ساڵەی کوشتبوو؟ ئەویش راست شەوی زەماوەند؟ هیچ کەس چاوەڕوانی شتی وا نەبوو. دێهاتی‌یەکان یەك دڵ و یەك زمان دەیانگوت:

"یاخوا کوێر بی... ئاخر چۆنت دڵ هات ئەو پیاوە نازدارە بکوژی... حەیف نەبوو پیاوی وەك کاك ساڵە بکوژرێ؟."

هەرکەس جۆرێکی بۆ دەچوو. هێندێك دەیانگوت:

"عەلی سەفابەگ کالایچیی هان داوە..."

هێندێکیان دەیانگوت:

"کالایچییش حەزی لە کچەکە کردوە، و لەسەر ئەوە کاك ساڵەی کوشتوە..."

هێندێکیش دەیانگوت:

"کاری ئەو شێت و پەتیارە حیساب و کیتابی نیە... بەسەری هەڵلا هاتوە کاك ساڵە بکوژێ و بڕایەوە... ویستوویەتی بڵێن کالایچی کاك ساڵەی کوشت..."

ئەوانەش کە لە نیزیکەوە دەیانناسی، دەیانگوت:

"هەر بە منداڵییش کالایچی چاوی نەبوو کاك ساڵەی پێ ببینێ..."

تەنانەت دەیانگوت:

"ئەگەر کالایچی کاری بۆ عەلی‌سەفابەگ دەکرد، هەر لەبەر ئەوە بوو کە کاك ساڵە لایەنی دێهاتی‌یەکانی دەگرت... لەجێ دا چاوی دیتنی کاك ساڵەی نەبوو... کاتێك دیتی کاك ساڵە زەماوەند دەکاو دێهاتی‌یەکانیش جێژنیان بۆ گرتوە، لەپڕ لەسەری داو کاك ساڵەی نازەنینی لەخوێنی خۆی دا گەوزاند..."

هەرچۆنێك بێ... لە راستی دا هۆیەك بۆ ئەوە نەبوو کە کالایچی کاك ساڵەی بکوژێ.

هەموو ئەو بۆچوونانە دەیانتوانی راست بن. کالایچی ئەوەندە نەزم و نارەسەن بوو کە بە هەریەك لەو بیانووانە دەیتوانی کاك ساڵە بکوژێ.

پاش ئەم کارەساتە بوو کە کالایچی بوو بە چەکێکی سامناك بە دەستی عەلی‌سەفابەگەوە.

کالایچی، دزو درۆزن و کەسانی وەك خۆی کە لە کێو و بەندەنان دەخولانەوە، لەدەوری خۆی کۆکردنەوەو وەك بەڵایەك کەوتە گیانی ئەو دێهاتی‌یە فەقیرو هەژارانە کە لە چوکووراوا لەگەڵ عەلی‌سەفابەگ کێشەیان بوو. دوژمنانی عەلی‌سەفابەگ ئیدی لە ترسی کالایچی و دەستەکەی خەویان لێ‌حەرام بوو.

بەڵام پاش کوژرانی کاك ساڵە، عەلیسەفابەگیش نەیتوانی تەنانەت بستێك لە خاکی ڕەشەتوو داگیر بکا.

کالایجی نەیدەوێرا بێتەوە نێو دێ. ئەگەر یاغی نەبایە، یەکپارچە ئاگر بایە، دیسان خەڵکی ڕەشەتوو ئەویان بە پیاو نەدەزانی.



چەند ڕۆژ بوو ناوی حەمەدۆك وەك شەپۆلێك بەسەر چوکووراوادا هاتبوو. ناوی حەمەدۆك زار بە زار دەگەڕا. حەمەدۆکێك کە دێی دەسووتاند... حەمەدۆکێك کە ماڵ و هێلانەی تێك دەدان... پاش ئەوەی گوندی ئاك توزلوو سووتا، حەمەدۆك ببووە بنێشتە خۆشەی سەر زاران. ژن و منداڵی ئاك توزلوو لەبارەی ئەو حەمەدۆکەوە کە بە چاوی خۆیان دیتبوویان، زۆر شتی سەیریان بۆ دێهاتییەکانی دراوسێ و نیزیك و دوور باس دەکرد:

"بەژن و باڵای بەقەد دێوێك دەبوو... دارە کاجێکی داگیرساندبوو و بەدەستیەو گرتبوو، لەنێو دێ دا دەگەڕاو یەك بە یەك ماڵەکانی ئاور تێبەردەدا... وەك با لەنێو ئاوایی دا دەسووڕا... ئەگەر ماڵێك خەریك دەبوو بکوژێتەوە، دووبارە دەگەیشتەوە سەری و سەرلەنوێ ئاوری تێبەردەدایەوە. ئەگەر دیتباتان لێی دەترسان. لە تاریکایی شەو دا ئاوری لە چاوان هەڵدەستا... لەپڕ درێژ دەبوو هێندەی چنارێك و پاشان لە نەکاو کورت دەبووەوە... گوللەش کاری لێنەدەکرد... ئەو هەموو گوللەیەی لێدرا، یەکیان نەچووە نێو گۆشتییەوە..."

لە دێیەکانی دیکەش لەبارەی حەمەدۆکەوە داستان و قسەی سەیر سەیریان دەگوتن. هەتا دەیانتوانی...

وەختێك عەلی سەفابەگ هەر لەو جێی هەمیشە کالایجیی لێدەدی، چاوی پێی کەوت و پێشنیاری کوشتنی حەمەدۆکی پێ کرد، کالایجی زۆر خۆشحاڵ بوو، بەڵام وای نەنواند:

"ئەم کارە سەختە عەلیسەفابەگ... بەو ئاسانییە ناکرێ پیاو لەڕاست بنیادەمی وا ڕا بێ."

عەلیسەفا:

"حەمەدۆك لە چوکووراوا ناوبانگێکی دەرکردوە، ئەوسەری دیار نیە. ئەگەر خۆت بە یاغی دەزانی دەبێ یەکی ئاوا بکوژی کە ناوت لە دنیادا دەنگ بداتەوە... شانست هەڵستاوە کالایجی. ئەگەر حەمەدۆکی بکوژی، ئیدی چوکووراوا ئی خۆمانە."

کالایجی:

"ئەستەمە."

عەلی‌سەفا دەستێکی لە شانی کالایجی دا:

"مەترسە... پارووت دە رۆنی کەوتوە."

کالایجی:

"زەحمەتە... بەڵام ئەگەر خوا حەز بکا رێیەکەی دەبینمەوە."

عەلی‌سەفا:

"رێیەکەی دەبینیەوە. هەرچی بێ، ئەو تازەکارە. هێشتا زمانی کێو و بەندەن نازانێ. دەتوانی لە داوی خەی."

کالایجی:

"ئیشەڵڵا کارێك دەکەم."

کالایجی لە عەلی‌سەفابەگ جیا بووەوەو خۆی گەیاندەوە داروودەستەکەی:

"کارمان بۆ پەیدا بوو. کارێکی خەراپیش نیە. ئاسانیشە."

هاوکارەکان چاویان لە چاوی کالایجی‌یەوە بڕی.

کالایجی:

"حەمەدۆکێك تازە سەری هەڵداوە. ئەوەی کە ئاك توزلووی سووتاندوە. دەبێ ئەوی لەنێو بەرین. کارێکیشی نیە، رێگای زۆرن."

کوشتنی حەمەدۆك بۆ دەستەی کالایجی ئاو خواردنەوە بوو:

"لەو رۆژەوە کە کالایجی وەکێوی کەوتبوو، هەتا ئەمڕۆ سێ دەستە یاغیی لەنێو بردبوون. وەك دەشیانگوت کاك ساڵە چلەمین کەس بوو کە بە گوللەی کالایجی کوژرابوو.

کالایجی کابرایەك بوو خەپلۆنە. چاوەکانی شین بوون، بەڵام بە رەنگی شین مار، سارد وەك سەهۆڵ، وەك چاوی مردووان. مووی ریشە تەنکەکەی وەك چەقڵی سەریشتی جشاك لەسەر دەم و چاوی ببوونە نەشتەر. لەچاو شانە پانەکانی ملی باریك دیار بوو. ئەستۆشی دەتگوت لەسەر ئاور برژیوە، سوور هەڵگەڕابوو. پاتۆڵێکی شینی نێفەك فشی دەپێ دەکرد. سەرگیرفانی پانتۆڵەکەی گوڵدۆزی کرابوو. سەرانسەری لەشی راست و چەپ فیشەك بوو. تەنانەت فیشەکدانی لەلاقیشی دەبەست. فیشەکدانەکانیشی گوڵدۆزی کرابوون و لە دوورەوە دەبریسکان. چەند دەمانچەو غەدارەو خەنجەری دەسك سەدەفی بە کەلەکەیەوە هەڵواسیبوون. دووربینێکیشی لە ئەستۆی دەکرد. کاکۆڵە زەردەکانی لەژێر تەقیلە شینەکەیەوە دەڕژانە سەر برۆی.

چوست و چالاك نەبوو. نازاش نەبوو. بەلام لە فێڵبازی و دەغەڵی دا تەواو بوو. هیچ کام لەو کەسانەی کوشتبوونی لە پێشەوەڕا لێی نەدابوون. هەموویانی لە پشتەوەڕا وەبەر گوللـە دابوو. ئەو داوانەی ئەو دایدەنان و ئـەو کەڵەکانـەی ئـەو هـەڵی دەبەسـتن بـەفکری کـەس دا نـەدەهاتن. وەك داردەسـتی عەلیسـەفابەگ دیـار بـوو. لـە راسـتی دا داردەسـتیش بـوو. لەلایەکیش عەلی سەفابەگ بە داردەستی ئەو دەژمێردرا. هەتا ئێـستا یـەك دوو جـار نـەبێ لەگەڵ ژاندارمە بەرەوڕوو نەببوو. ئەگەر ژاندارمە هەنگاوێکی بۆ راونانی ئەو هەڵێنابایەوە، خەبەرهێنەکانی عەلیسەفابەگ دەسـبەجێ ئـەویان لـە نەخشەی ژاندارمـە ئاگـادار دەکـرد. کالایی زستانانیش میوانی عەلیسەفابەگ بوو و لە ژوورێکی تایبەتی دا کـە بـۆ ئـەو سـاز کرابـوو، میوانـداریی لـێ دەکرا. تـەنیا وەختێـك وەڕەز دەبـوو، دەچـووە شـاخی و سـەرێکی دەسـتەکەی دەدا. دەستەکەشـی وەزعـی بـاش بـوو. هەرکـە بـەفر دەبـاری لـە دێیـەکی دوورەدەستی کوێستان نیشتەجێ دەبوون و خوردو خۆراکیان بە تەواوی ئامادە بوو. کـەیفیان دەکـرد. تـەواوی ئـەو گوزەرانـە خۆشەشـیان ئـی عـەلی سـەفابەگ بـوو. هەربۆیـەش ئەگـەر عەلیسەفابەگ گوتبای برن، قسەیان نەبوو.

کالایی پرسی:

"کێتان تێدایە حەمەدۆکی بناسێ؟."

عەلی چکۆڵ کە پاڵی وەدارێك دابوو و چاوی لەسەریەك دانابوون، راست بووەوە:

"ئەمن چاکی دەناسم ئاغا. لەنێو دەستەی دۆردووە شێت دا پێکەوە بووین."

وەسمان:

"وەرە پێش بزانم، عەلیچکۆڵ."

عەلی چکۆڵ هەستاو هاتە کن کالایی، شانی عەلیچکۆڵی گرت و رایتەکاند:

"باشە، بڵێ بزانم چۆن بنیادەمێکە؟."

عەلیچکۆڵ تفی قووت دایەوە:

"لەروالەتی دەرناکەوێ چۆن بنیادەمێکە. کورتەبالاو کزو سەرزلە. چاویشی زەلامن. بیست ساڵە دیارە، هەمیشەش لەفکر دایە. هەتا پیاو دەست و تفەنگی نـەبینێ و لـە شـەڕێك دا لـە پەنای نەبێ، نازانێ چ کارەیە. پووڵـە رەشـکەی بـە گوللـە هـەڵدەگرێ. ئـەو رۆژەی هاتـە نێـو دەسـتەی دۆردووە شـێت... بۆخـۆت دۆردووە شـێتی دەناسـی، دەزانـی چـەند ئەنگێوەیـە... حەمـەدۆك پێـشەوبری لـێدایەوە. ئێـستا حەتمەن دەرزی بـە یەکـەم تفـەنگ هـەڵدەگرێ. زۆر

زرینگە. ئەو شەوەی لە چادری یورووکەکان لەگەڵ دۆردووە شێت تێك چوو، ئەگەر بیویستایە دەیتوانی هەموومان بکوژێ. دەیتوانی دۆردووش بکوژێ. بەڵام نەیکرد. ئەگەر دۆردووە شێت لێی نەترسابایە، هەتا ئێستا نەیدەهێشت زیندوو بێ. دۆردووە شێتیش لێی دەترسێ..."

کالایجی:

"زۆرت پێ هەڵگوت عەلیچکۆڵ خان. نەکا حەمەدۆك مواجبی بۆ بڕیبیەوە کە پێی هەڵلا بلێی."

عەلیچکۆڵ:

"چ پێ هەڵگوتنێك؟... گوتت حەمەدۆك چۆن بنیادەمێکە، ئەمنیش ئەوەندەی دەمناسی، بۆم باس کردی."

کالایجی دانیشت. سەری لەنێو هەردوو دەستی گرت و لە فکرەوە چوو. یەك دوو سەعات پێ چوو. سەرلەنوێ عەلیچکۆڵی بانگ کرد:

"وەرە بزانە چت پێ دەڵێم عەلی چکۆڵ. جوان گوێ بگرە بزانە دەڵێم چی. حەمەدۆك بڕوای بە تۆ هەیە؟."

عەلیچکۆڵ:

"نا."

کالایجی:

"بۆچی؟."

عەلیچکۆڵ:

"وەختێك لەگەڵ دۆردووە شێت تێك چوو، ئەمن کەوتمە لای دۆردوو."

کالایجی:

"ئەمە نەبوو بە قسە."

عەلیچکۆڵ:

"ئەو ئەسڵەن بڕوای بە کەس نیە. شکی لە هەموو کەسە. تەنانەت شکی لەو جەبارەشە کە لەگەڵیەتی."

کالایجی:

"ئەگەر لێت گەڕێن، یاغییەکی دوو ڕۆژەمان لێدەکەیە گیزیك دووران، عەلیچکۆڵخان."

عەلیچکۆڵ:

"ئەمن دەزانم چۆن بنیادەمێکە."

کالایجی توورە بوو:

"دەمەوێ سەد ساڵی رەبەق نەزانی."

کالایجی وەختێك توورە دەبوو قامکی لە کونە تفنکی را دەکردو دەستی لە مووی‌کونە تفنکی وەردەدا. ئێستاش خەریکی ئەو کارە بوو:

"بە کورتی، دەتەوێ بڵێی حەمەدۆك نە لە داو دەکەوێ و نە گوللەی وێ دەکەوێ، ها؟..."

عەلی‌چکۆڵ:

"نا... ئەمەویست بڵێم لەداو ناکەوێ. چما کەسی وا پەیدا دەبێ کە لە داو نەکەوێ؟... حەمەدۆك تازەکاریشە. دەکرێ لە داوی بخەی، بەڵام چ داوێك."

کالایجی:

"ئەمن بڕوام بە تۆ هەیە عەلی‌چکۆڵ. ئەو جۆرە کارانە بەتۆ دەکرێن. یاغیی بە ئەزموونی وەك تۆ لەم کێوانەدا گیر ناکەوێ. کاری حەمەدۆکی حەواڵەی خۆت دەکەم."

عەلی‌چکۆڵ:

"ئاغا ئەمن ناتوانم... ئەوان دوو کەسن."

کالایجی:

"ئەوی دیکە کێیە؟."

عەلی‌چکۆڵ:

"جەبارە درێژە."

کالایجی:

"دەیناسم. پیاو حەق بڵێ جەبارە درێژ کوڕی چاکە، زۆر پیاوە."

عەلی‌چکۆڵ:

"کوڕی چاکە، بەڵام ئەویش دەڕوا."

کالایجی:

"قەیدی نیە."

کالایجی لەپڕ وەك ئەوەی شتێکی وەبیر هاتبێتەوە، درێژەی پێ دا:

"گوێ بگرە کاك عەلی. جۆیەکەیان دەبینیەوە. ئەتۆ دەچی بانگهێشتنی دەکەی بۆ نێو دەستەکەی خۆمان. ئەگەر نەبوو، ڕێگایەکی دیکە پەیدا دەکەین."

عەلی چکۆڵ:

"ڕەنگە قبووڵ بکاو بێ. پێم وا نیە بە ئەقڵی بگا کە تەڵەیە."

کالایجی:

"کەوابوو تەگبیرمان ڕوونە."

عەلی چکۆڵ:

"ئەدی، ڕوونە."

کالایجی:

"دەتوانین جێگاکەی وەبینین؟... جۆ و ڕۆیەکی هەیە؟."

عەلی چکۆڵ:

"ئەو منداڵە هێشتا تازەکارە، جۆ و ڕێی لە کوێ بوو. لەو کێو و شاخانەیە، بەڵام دیتنەوەی لەسەر من."

## (١٨)

چەند رۆژ بوو بە هەڵاتن و خۆشاردنەوە بەرێیان دا رۆیشتبوون. چیاو بەردەڵان و دارستانەکانیان بڕیبوو. پشتی هەردووکیان لەژێر باری تفەنگ و فیشەکدان و کەل و پەل دا چەمیبوو. دەستیان دەلەرزین.

دەتگوت لە سەرمان دەلەرزن.

دنیا تاریك تاریك بوو. تاك و تەرا ئەستێرە دیار بوون. بە حاڵ و باڵ زریوەیان دەهات. سەرلەبەیانی ئەستێرە سەرمایان دەبێ. لای بەیانی بوو. لە نەکاو هاڕەیەك هات. جەبار تێك ڕابوو:

"چ بوو؟."

حەمەد:

"سەرچاوەیە. لەبیرت نەماوە جارەکەی پێشدا کە هاتینە ئێرە؟..."

جەبار:

"وەبیرم هاتەوە... کەوایە با تەختێك لێرە دانیشین."

حەمەد:

"نا."

هەرچەند ماندوو بوو، بێ تاقەت بوو و هێزی لەبەر دا نەمابوو، بەڵام تەنانەت لەحزەیەکیش لە هیچ جێگایەك ماندووی نەدەحەساندەوە. هەروا دەڕۆیشت. هەناسەبڕکەی وێ کەوتبوو:

"چتە کاك جەبار؟... خەریکە دەگەینێ."

رادەوەستا. هەناسەیەکی هەڵدەکێشا. دیسان غیرەتی وەبەر جەبار دەناو وەڕێ دەکەوتن:

"ڕێیەکی وامان نەماوە کاکە. ئێستا دەگەینە ئاوایی و دەحەسێینەوە. دەبێ پێش دنیا ڕووناك بوون بگەینە ئاوەدانی. ئەدی کاك جەبار... زۆر ماندوو بووی، بەلام هێندەمان نەماوە. ئێستا دەگەینێ، وانیە کاك جەبار؟... هەر ئێستا دەگەینێ."

جەبار:

"باشە."

پاشان ئیدی قسەیەکی نەکرد. هەرچی لە دێی نیزیکتر دەبوونەوە، هەنگاویان توندتر دەبوون. جەباریش بۆ ئەوەی بەجێ نەمێنێ، هەرچی تینی هەبوو دە لاقەکانی کردبوو.

دنیا خەریك بوو ڕووناك دەبوو و ئاسۆ شیخاڵ شیخاڵ دەبوو. کاتێك گەیشتنە ئاوایی، چەند سەگ بە حەپەحەپ بۆیان هاتن. حەمەد گوێی نەدایە. هەروا ڕاست و توند لە ڕێگای خۆی ڕۆیشت. گەیشتنە ماڵی عەلی دورمووش:

"مام دورمووش، مام دورمووش."

عەلی دورمووش دەسبەجێ جوابی دایەوە:

"تۆی حەمەدۆك؟."

حەمەد:

"منم."

عەلی دورمووش:

"ئەوە دێم حەمەدۆکی خۆم. بەخێر بێیەوە کوڕم. لەگەڵ ئەو بەزیدەی چیت کرد؟ بیستم کە ئاك توزلووت سووتاندوەو ئەو بەزیدەشت جز جز لەنێو ئاگردا سووتاندوە.

وەختێك دەرگا کرایەوە حەمەد بە ئاسەوە پرسی:

"کێ خەبەری بۆ هێنان، هەموو خەڵکی ئاوەدانی زانیویانە؟."

عەلی دورمووش:

"هەموومان بیستوومانە حەمەد. دەستت نەڕزێ. هەموومان خۆشحاڵ بووین. کەس مردنی کەسی پێ خۆش نیە، بەلام ژنەکەشی پێی خۆش بوو... دەیگوت حەقی خۆی وەرگرت. دڵۆپێکیش فرمێسکی بۆی نەڕشت. وەرنە ژووری کوڕم."

عەلی دورمووش لە پڕ بیری کردەوەو پرسی:

"هاوڕێکەی دیکەتان کوا؟... پیاوە پیرەکە؟..."

حەمەد هەناسەیەکی هەڵکێشا:

"مەپرسە!."

عەلی دورمووش:

"خوا لێی خۆش بێ. ئێستا ئاورەکەتان بۆ هەڵدەکەم. حەتمەن برسیتانە."

حەمەد پرسیارەکەی دووپات کردەوە:

"کاک دورمووش کێ خەبەری بۆ هێنان؟."

عەلی دورمووش:

"خەبەرت هەیە چ بووە کورم، خەبەرت هەیە؟... عەلیپەشەل بووەتە پیاوی عەبدیخان، بووەتە پیاوی ئەو یەزیدە. ئەو خەبەری هێنابوو. وەختێك دێیەکە سووتاوە، ئەویش لە دەرەوە تەماشای کردوە. پاشان کە دێیەکە بە تەواوی سووتاوە چووەتەوە نێو دێ و بە چاوی خۆی دیویەتی کە ئێسك و پروسکی عەبدیيان لەنێو ئاگر دەرهێناوەتەوە... دەیگوت بەشی زۆری ئێسکەکانی سووتابوون و ببوونە بزووت."

حەمەد:

"چۆن ئاوا... عەلیپەشەل بووەتە پیاوی ئەو خوانەناسە؟..."

عەلی دورمووش خۆڵەمێشی ئاورگەکەی دەردا:

"ئەدی کورم. بنیادەم وایە. هەرچی لێیکەی هەر ئەوەیە کە هەیە، چونکە هەرچی بێ، شیری خاوی خواردوە."

حەمەد پێکەنی. عەلی دورمووش تەماشای چاوەکانی حەمەدی کرد:

"چیە؟... باوەڕت نەکرد."

حەمەد:

"مامە... ئەتۆش چەند زوو هەموو شتێکت لەبیر دەچێتەوە."

عەلی دورمووش:

"پیرییە کوڕی خۆم، پیری..."

حەمەد دەستێکی لە شانی عەلی دورمووش دا:

"قەیدی نیە مامە گیان..."

حەمەد لەبەر ئاگردانەکە دانیشت. بە دوای ئەودا جەباریش دانیشت. عەلی دورمووش بە فوولێکردن ئاورەکەی هەڵکرد:

"باشە... خەبەرو باسی دیکە چیە؟."

حەمەد:

"دوعای سەرت."

پاش تاوێك ڕووناكایی بەیانی لە درزی پەنجەرەكانەوە هاتە ژوورێ. هەموو لایەك خەریك بوو ڕووناك دەبوو.

ژنە پیرەكەی دورمووش هەروا بە دەوری حەمەد دا هەڵدەسووڕا:

"جز جز، ها... ئەرێ حەمەدی خۆم؟... جزجز سووتا؟... وانیە حەمەدی خۆم؟... جزجز، جزجز..."

پیرێژن مەنجەڵە شۆرباوەكەی لەسەر ئاگر لابرد. ڕۆن و پیوازی تێ كرد. بۆنی شۆرباو هەموو ژوورەكەی داگرت.

"جزجز، ها؟... دەڵێن ئێسكیشی سووتاون و بوونە خەڵووز. با بسووتێ. دەڵێن گوندی ئاك تورلووش سووتاوەو بووەتە خۆڵەمێش... با بسووتێ و ببێتە خۆڵەمێش."

پیرەژن لە نێوەڕاستی هۆدەكەدا سفرەی ڕاخست. شۆرباویشی لە قاپێكی گەورە كردو لەنێوەڕاستی سفرەكەی دانا. بەڵام دەستی لە زۆربلێیی هەڵنەدەگرت و یەك بین قسەی دەكرد:

"جزجز، ها؟... جزجز؟..."

حەمەد كەوچكەكەی هەروا بە دەستەوە بوو. نە دەیتوانی دابنێ و نە دەیتوانی لەنێو قاپەكەی ڕۆكا. كەچك هەروا بە دەستیەوە دامابوو. جەبار پێی زانی. لەگەڵ جەبار چاویان لە چاوی یەكتر كرد. هەموو بێدەنگ بوون.

عەلی دورمووش هەر زەینی بەسەر نەمانەوە بوو، هەتا حەمەد خێرا خێرا دەستی كرد بە خواردن. هەر ئەو بریسكەی وەك نووكەدەرزی دیسان هاتبوو و لە بنی چاوانی دا جێگیر ببوو. بریسكەیەكی تیژو بە بڕشت. حەمەد وا دیار بوو بەختەوەر بوو. تیشكە زەردەكە دیسان لە سەری دا دەدرەوشاو دەسووڕاو دەسووڕایەوە...

سەری هەڵبڕی و ڕاست ڕایگرت. ڕوخساری سەوزەیی و چاوەكانی دەتگوت لە ڕووناكاییت هەڵكێشاون:

"دەمەوێ شتێكت پێ بڵێم مام دورمووش."

عەلی دورمووش هیچ حاڵی نەبوو. چاوی لە چاوی حەمەدەوە بڕی:

"دەتەوێ چ بڵێی؟."

دەنگی حەمەد دەلەرزی:

"ئەو یەزیدە ئیدی کوژرا..."

ئیدی قسەیەکی نەکرد. سفرەکەیان کۆکردەوە. ئاورەکەیان تێك وەرداو فوویان لێکردو سەرلەنوێ هەڵگیرسایەوە. دورمووش عەلی دووجار چووە دەرێ و هاتەوە. منداڵەکان وەخەبەر هاتبوون و بە چاوە مۆڵەق ماوەکانیانەوە تەماشای حەمەدیان دەکرد.

عەلی دورمووش هێشتا چاوەڕوانی پاشماوەی قسەکەی حەمەد بوو. وەختێك حەمەد گوتبووی:"ئەو یەزیدە ئیدی کوژرا..." حاڵەتێکی هەبوو کە دیار بوو شتێکی گرنگی بەدوادا دەڵێ.

عەلی دورمووش تاقەتی نەماو گوتی:

"باشە, کوژرا..."

حەمەد لەسەرەخۆ دەستی کرد بە قسەکردن:

"فکرێکم هەیە مامە, نازانم ئەتۆ دەڵێی چی..."

تاوێك بێدەنگ بوو, دوایە خێرا خێرا دەستی بە قسە کرد:

"ئەم دێیەو ئەو چوار دێیەی دیکە... هەرچی زەوی و زار هەیە... هەر کەس هەرچی دەچێنێ... هەرکەس هەرچی پەیدا دەکا ئی خۆیەتی... ئەمن ئیدی تفەنگ بەشان وریای هەموو شتێکم, باقییەکەی بە خۆتانە... دڕووەڵانەکانیش دەبێ بسووتێن و پاك بکرێنەوە..."

عەلی دورمووش:

"هیچ حاڵی نەبووم بە قوربانت بم... کەمێك لەسەرەخۆ قسە بکە... نازانم دەڵێی چی."

حەمەد ئارامتر دەستی پێ کرد:

"دەڵێم ئەو زەوی و زارە ماڵی بابی ئەو خوانەناسە نیە."

عەلی دورمووش لە فکرەوە چوو و نێوچاوانی خۆی هەڵکڕاند.

حەمەد:

"ئەم زەوی و زارە ئی هەموانە. خۆ خاکەکە ئەو کافرە دروستی نەکردوە. خەڵکی پێنج دێی تەواو وەك نۆکەر کاری بۆ دەکەن... لە چوکووراوا ئاغاو رەعیەت هەر نیە. نایب حەسەن وای دەگوت..."

عەلی دورمووش:

"زەوی‌یەکانی ئێرەش لەپێش دا ئی هەمووان بوون، هەتا بابی ئەو یەزیدە پەیدا بوو... هەزار فرتو فێڵی تێك کردەوە، هەتا زەوی و زارەکەی لە دەستی دێهاتی‌یەکان دەرهێنا. پێش ئەو، هەرکامێکمان هەر جێگایەکمان ویستبا دەمان کێڵاو هەر تۆوێکی پێمان خۆش بایە، دەمان چاند."

حەمەد وەك پریشك قسەی دەرداویشت:

"دیسان وای لێ‌دێتەوە... راست وەك پێشێ."

عەلی دورمووش دیسان سەری داخست و لە فکرەوە چوو.

حەمەد:

"مامە، دیسان وای لێ‌دێتەوە... دیسان وەك پێشێ دەبێ."

عەلی دورمووش:

"خوا بکا وابێ کورم."

عەلی دورمووش چاوی پڕ بوون لە فرمێسك.

حەمەد:

"دەبێ مامە، دەبێ... ئێستا لەتۆم دەوێ... دەمەوێ وەلام بدەی کەیخوداو ریش سپیی هەر پێنج دێیەکە بێنە ئێرە. دەمەوێ قسەیان لەگەڵ بکەم و زەوی و زارەکە دابەش بکەم. دەبێ لە کۆیلەتی و نۆکەری رزگار بن. هەرکەس هەرچی دادەچێنێ دەبێ ئی خۆی بێ. گاجووتەکانیش دەبێ ئی دێهاتی‌یەکان بن..."

عەلی دورمووش هاواری کرد:

"خوا بکا وابێ... خۆزگە..."

حەمەد:

"ئەتۆ وەلام بدە لێرە کۆوەبن."

ژنی عەلی دورمووش لەنێوەڕاستی ژوورەکە راوەستابوو و پاڵی بە کۆڵەکەی نێوەڕاستێ وە دابوو، تەشیی دەرست و گوێی هەڵخستبوو. تەشی‌یەکەی لە دەست بەربووەوە. دەستی شل بوون. لەپڕ هاتە لای حەمەد، لە ئامێزیی گرت و دەستی کرد بە ماچ کردنی دەستەکانی. بە دیواری دووکەڵ گرتووەوە جاڵجاڵووکەیەك داوی تەنیبوو و بە هەودایەکان دا هەڵداو پێدای دەکرد:

پیرێژن:

"ڕەبی بە قوربانی تۆ بم کوڕی خۆم... بەڕاستیتە؟ بەڕاستتە کوڕی خۆم؟... ئیدی دووبەشی بەرهەمەکەمان نادەین بە کەس؟..."

حەمەد بە دڵنیایییەوە جوابی دایەوە:

"کۆیلەتی ئیدی تەواو. هەتا ئەو ڕۆژەی دەمرم تفەنگ بە شان لێتان وریام. ئەگەر ئەمنیش مردم..."

پیرێژن:

"ئەدی گاجووتەکان؟."

حەمەد:

"ئەوانیش ئی هەمووانن..."

پیرێژن دەستی حەمەدی بەرداو چووە سووچێکی ژوورەکە. بە هەنیسک دان دەستی بە گریان کرد. هەتا زیاتر دەگریا، زیاتری گریان دەهات.

عەلی دورمووش چووە دەرێ. بەڵام دوودڵ بوو. گەڕایەوە. تەماشای حەمەدی کرد. دەم و چاوی حەمەدی وەك بەردێکی ڕەق هاتە بەرچاو:

"لەدوای کێ بنێرم کوڕم؟."

حەمەد بێ ئەوەی سەری هەڵبڕێ:

"ئەوانە کە بە ئاقڵیان دەزانی."

عەلی دورمووش:

"باشە کوڕم."

عەلی دورمووش چووە ماڵی حەسۆ شێلم. مەسەلەکەی لەگەڵ باس کرد. حەسۆ هیچی بە دورمووش نەگوت. ئەویش دوودڵ بوو. پاشان وەڕێ کەوتن و ماڵ بە ماڵ مەسەلەکەیان بە هەمووان گوت. هێندێکیان لە پێش دا خۆشحاڵ دەبوون و دوایە لە فکرەوە دەچوون. هەموو دوودڵ بوون. دێهاتییەکان هەر نەیاندەتوانی باوەڕ بە شتی وا بکەن.

منداڵ و گەورە ژن و پیاو لەبەر دەرکی ماڵەکان کۆببوونەوە سرت و خورتیان بوو. بە ترسەوە تەماشای چاوی یەکتریان دەکرد. خەڵك دەستە دەستە بێدەنگ و بە هەڵپەو دڵ پڕ هیوا ماڵەو ماڵیان دەکرد.

ئاپۆرای دێهاتییەکان ماوەیەك کپ و بێدەنگ لەنێو دێی دا شەپۆلی دا... پاشان هاتن و لەبەر دەرگای ماڵی عەلی دورمووش کۆبوونەوە. کەس دەنگی لێوە نەدەهات. تەنانەت منداڵی بەر مەمکانیش کورکەی نەدەکرد.

حەمەد لە ژووریٚ ڕا گوێی لە هەستی پێیان بوو. لە ژنی عەلی دورمووشی پرسی:

"لەدەریٚ چ باسە, دایە؟."

پیریٚژن فرمێسکەکانی سریەوە:

"دێهاتی‌یەکانن لەبەر دەرگا کۆبوونەوە. هیچ کەس هیچ نالێن. هەروا ڕاوەستاون و تەماشای دەرگای مالێ دەکەن."

پاشان پیریٚژن هاتە دەریٚ.

هەمووان چاویان تێوەبڕی. پیریٚژن لەو هەموو چاولێکردنە نارەحەت بوو. بە تووڕەیی:

"چتان دەویٚ؟... لەگەڵ ئێوەمە, هۆزۆی, چ باسە لێرە کۆ بوونەوە؟."

ئاپۆرای دێهاتی‌یەکان دەنگی لێوە نەهات.

"بۆچی دەنگ ناکەن؟."

دێهاتی‌یەکان موویان لیٚنەبزووت.

"ئەگەر دەتانەویٚ چاوتان بە حەمەدۆك بکەویٚ, لە ژووریٚیە."

دیسان کەس متەقی نەکرد.

پیریٚژن:

"خوا کوێرتان کا. بۆ هەروا ڕاوەستاون و ڕەق بوون؟... چما هەر مالەی مردوویەکتان لیٚمردوە؟... چما هەمووتان تازیەدارن؟... بڕوانە ئەوانە, عەمرتان نەمێنیٚ, هەموو دەلێی لاڵ بوون... ئاخر بە ئێوەش دەلێن پیاو؟."

لە پاشان ڕووی لە ژنەکان کرد:

"ئێوە بەوانە دەلێن پیاو و لە باوەشیان دا دەنوون؟... بە ئێوەش دەلێن ژن؟... ئێوەش ژنن؟... ئەگەر ژن بایەن, لەگەڵ ئەم بیٚغیرەتانە نەدەنوستن... بۆچی هەمووتان بوونە بەرد؟... بۆ هەڵناپەڕن, بۆ پیٚ ناکەنن, بۆ نایکەنە جێژن؟..."

ئاپۆرای لادێیی‌یەکان ببووە بەرد.

"خوا هەمووتان زەلیل کا... قوربەسەرینە چما نەتان زانیوە؟... چما نەتان زانیوە کە حەمەدۆك عەبدی جزجز لە ئاوردا برژاندوە؟..."

ئاپۆرای دێهاتی‌یەکان سووکە شەپۆلێکی تیٚکەوت.

"جزجز... هەموو گوندی ئاك توزلووش جزجز... چما نەتان بیستوە؟ دوێنێش هاتە مالی ئێمە. ئێستاش لە ژووریٚیە. گوێتان لیٚیە یان نا؟ ئیدی کار بۆ ئەوە ناکەن کە هەرچی

پەیداتان کرد بیدەن بە عەبدی. زەوی‌یەکان ئی خۆمانن، گاجووتەکانیش ئی خۆمانن. هەموو شتێك ئی خۆمانە. گوندی ئاك تووزلووش جزجز سووتاوەو بووەتە خۆڵەمێش. عەبدی‌خانیش لە نێوی دا جزجز..."

ئاپۆرای دێهاتی‌یەکان شەپۆلێکی دا. لەپێش دا سرت و خورت لە نێو خەلکی کەوت. پاشان سرتە سرتەکە زیاتر بوو. ئەمجار دەنگیان لێ‌هەڵێنا. دوایە هەرکەس قسەیەکی کردو بوو بە هەڵلا. هەنگامەیەك بەرپا بوو هەر مەپرسە. سەگان دەستیان کرد بە وەڕین. کەڵەباب دەیانخوێند. مریشك بە غاردان بەم لاو بەو لادا دەڕۆیشتن. لەو ڕۆژەوە ئاسیاب چەشمە ببووە ئاسیاب چەشمە، هەنگامەو جم و جۆڵی وای بە خۆیەوە نەدیبوو.

تاوێك دواتر تەپ و تۆزێك هەستا. دێ‌یەکە لە تەپ و تۆزدا نوقم بوو. لە تۆزی سپی، هەورێك لەسەر ئاسیاب چەشمە ڕاوەستا. پاشان لە نێوەڕاستی دێی نرکەی دڵشادی و دەنگی دەهۆڵ و زوڕنار دەنگی گۆرانی بەرز بووەوە...

"حەمەدۆکی خۆمانە."

"حەمەدۆکی خۆمانە."

"هەر بە منداڵی لێی دیار بوو ئەگەر گەورە بێ دەبێتە چۆن پیاوێك."

"ئەدی دیار بوو."

"گاجووتەکانیش ئی خۆمانن."

"هەرکەس هەرچی پێی خۆش بێ لە زەوی‌یەکەی دا دەی‌چێنێ. بۆخۆی دەچێنێ، نەك بۆ ئەوە کە دوو بەشی بدا بە کەسێکی دیکە."

"ئیدی کەس لە نیوەی زستان دا برسی نابێ."

"ئیدی کەس وەك سەگ ناپاڕێتەوە."

"حەمەدۆکی خۆمانە."

"ئیدی ناچار نابین مانگاکانمان بفرۆشین."

"ئیدی هەرکەس هەرکوێ‌یەکی پێ خۆش بێ، دەچێ."

"هەرجێ‌یەك پێی خۆش بێ..."

"ئیدی هەرکەس بەرفەرمانی خۆیەتی."

"حەمەدۆکی خۆمانە."

"جزجز..."

"عەبدیخان و دێیەکی..."

"جزجز، جزجز..."

"حەمەدۆکی خۆمانە."

"جزجز."

"خەجیجیش لە بەندیخانە دێتە دەر"

"هەر پێنج دێیەکە دەیکانە جێژن."

"حەمەدۆکی خۆمانە."

"پێنج دێ جێژنی زەماوەند بۆ حەمەدۆك دەگرن."

دوو شەو و دوو رۆژ دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا نەپسایەوە. چوار گوندەکەی دیکەی خاردەشتیش کردبوویانە جێژن. لەوانیش دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا هەڵدەستا. شەوانە هەموو خاردەشت چراخان بوو. ئەو شادمانییە شێتانەیە، کاری لە بەردو دارو ئاو و گلیش کردبوو.

پیاوماقوولی پێنج دێ هاتبوونە ماڵی عەلی دورمووش. بۆ لای حەمەد. جارێك بە گومانەوە، جارێك بە ترسەوە، جارێك بە غەمناسییەوەو جارێك بە خۆشەویستییەوە تەماشایان دەکرد.

ئێوارەی رۆژی دووهەم پێشنیارێکی پێ کردن:

"مامینە... پیاوماقوولینە... هێندێکتان جووتتان دابەستوەو هێندێکیشتان خەریکن دایدەبەستن. دەمەویست شتێکتان پێ بڵێم."

هەموران یەکدەنگ وەڵامیان دایەوە:

"فەرموو، حەمەدۆك، هەرچی بڵێی بەچاوان."

حەمەدۆك:

"بۆچی پێش ئەوەی زەوی و زارەکەی خاردەشت وەرد بەن، دڕووەکانی ناسووتێنن؟."

چەند کەس پێکەوە جوابیان دایەوە:

"ئەقڵمان پێی نەشکاوە."

حەمەد:

"باشتر نیە لە پێش دا چەقڵەکان بسووتێنن و دوایە وەردی بەن؟."

گوتیان:

"بۆچی، بەرێوەڵلا باشترە."

حەمەد لە سەرەخۆ هەستایە سەرپێ. هەموو ئەوانی دیکەش هەستان:

"لە پێش دا دەچین دڕووەڵانەکە دەسووتێنین، پاشان جووتەکان دادەبەستین."

تفەنگەکەی هەڵگرت. فیشەکدانەکانی لە خۆی بەست و هاتە دەرێ."

دێهاتی‌یەکانیش بە دوای دا.

مچەکەچەڵ نەڕاندی:

"یاڵڵا بەرەو دڕووەڵان... دەهۆڵ و زوڕنایەکەش بێنە ئەوێ."

عەلی دوورمووش:

"ئیدی چەقڵەشینکە لاقی گاجووتەکان هەڵنادڕن."

حەمەد سەنگین و لەسەرەخۆ بۆ دەرەوەی ئاوەدانی وەرێ کەوت. سەری بەرز راگرتبوو و چاویشی کەمێك نووقاندبوون. بە دوای ئەودا جەبارو لە دوای جەباریشەوە دێهاتی‌یەکان دەڕۆیشتن. ژن و منداڵ بۆ دیتنی حەمەدۆك چووبوونە سەربانان. دەنگی دەهۆڵ و زوڕناش راوەستابوو. کەس دەنگی لەبەر دەرنەدەهات.

لە دێی چوونەدەر. گەیشتنە دڕووەڵان. رەشەبای پاییز لە کێوەکانەوە دەهات و بەسەر دڕووەڵانەکەدا تێدەپەڕی. حەمەدۆك راوەستا. مووی لێنەدەبزووت. دێهاتی‌یەکان چاوەڕێ بوون بزانن چ دەکا. حەمەد ئاوڕی داوە پشتەوەی خۆی. دێهاتی‌یەکان چاوەڕێی شتێك بوون، چاوەڕێی جووڵانێك...

دڕووەڵانێکی شیری کە هەتا چاو بڕ دەکا سپی دەچوو، لەبەر دەمی پان ببووەوە. خاردەشت وا سپی دەچوو دەتگوت بەفری لێباریوە. دەنگی قرچە قرچێك دەهات. نینۆکە شەیتانەی چووك و سپی بە لاسکی دڕووەکانەوە نووسابوون و چڵە چەقڵەکانیان داهێنابووەوە.

حەمەد بەسپایی و ئارام بانگی جەباری کرد:

"جەبار."

"چیە کاکە؟."

حەمەد:

"ئەو رۆژانە کە من لێرە جووتم دەکرد، ئەگەر لە پێش دا دڕووەڵانەکەیان سووتاندبایە چەند باش دەبوو."

جەبار زەردەیەکی هاتێ.

لەو نێوەدا چەند کەس لەو لادێییەیانەی بە دوای حەمەدەوە بوون، تەکانێکیان داو دەستیان کرد بە خڕکردنەوەی چەقڵە وشکەو پووش و پەڵاش. ئەوانی دیکەش دەستیان پێ کرد. لە ماوەیەکی کورت دا تەبارێکی گەورە چەقڵی وشك کەوتە سەریەك، بە ئەندازەی تەپۆلکەیەکی بچووك. تەپۆلکەکە گەورەو گەورەتر دەبوو، هەتا عەلی دورمووش چیلکە کاجێکی وشکی داگیرساندو لەنێوی راکردن. تەپۆلکە چەقڵەکە لەسەرەخۆ ئاگری گرت. پاشان هەموو تەپۆلکەکە لە گڕی ئاور دا ون بوو. زمانە ئاورەکان لەبەر بای بەم لاو لادا لار دەبوونەوە.

دێهاتی‌یەکان لەو تەپۆلکەیە کە بڵێسەکانی بە پشووە با بەم لاو ئەو لادا لار دەبوونەوە، دوور دەکەوتنەوەو کەمێك ئەولاتر نیوە ئەڵقەیەکیان دروست دەکرد. تەماشایان دەکرد. گڕی ئاگر لە تەپۆلکەکە هاتە خوارو کەوتە نێو دەشت و با هەڵی گرت. دەهۆڵ و زورناش دەنگیان لێ‌بڵیند بوو. گۆرانی و دەنگ و هەراو ئاهەنگی دڵخۆشیی دێهاتی‌یەکان لەو دەشتەدا بڵاو دەبووەوەو لەگەڵ گڕی ئاگرەکە بەرەوپێش دەچوو. سەماو هەڵپەڕین دەست پێ کرا. جەبار لە خۆشی‌یان تەقەی دەکرد.

حەمەد هەتا خۆرئاوا هەر لەوێ راوەستابوو، تەماشای دەکرد.

با، شەپۆلێکی گەورەی ئاگری وەپێش خۆی دابوو و خاردەشتی وەسەر خۆی گێڕابوو. ئەم شەپۆلە ئاورە بە هەر کوێ دا دەڕۆیشت، تۆزێکی رەش وەك خاکە رەژیی لەپاش خۆی بەجێ دەهێشت. گڕەکان لەگەڵ خۆرەتاو بەرەو خۆرئاوا دەڕۆیشتن. ئەو چەقڵانەی ئاوریان دەگرت هاوارێکیان لێ‌هەڵدەستا. درووەڵان لەبەر ئاگرەکە وەك مەلێك دەی‌ناڵاند.

حەمەد هەر بەو سەنگینی‌یەی خۆیەوە بەرەو دێ گەڕایەوە. ژن و منداڵ بە جل و بەرگی سوورو سەوزو شین و رەنگاورەنگەوە لەنێو دەشت و دەر خەریکی سەیران و یاری بوون. ئەوانیش بە دوای حەمەد دا بەرەو ئاوەدانی وەڕێ کەوتنەوە.

ئەو شەوە تا بەیانی، گڕی ئاور لە خاردەشت دا، لە تەپۆلکەی خەنەیی‌یەوە بۆ تەپۆلکەی ئەستێران، لە سەرچاوەوە بۆ "کاباتاغاچ" و لەوێوە بۆ درووەڵانەکانی دیکەو بەرەژێرتر هەتا "چۆرووك چنار"، گەڕاو چەقڵەشینکەی سووتاند. رووناکایی‌یەکی بەرین هەموو ئەو دەشتەی دەلستەوە. پاشان لە لووتکەی عەلی‌کۆ، پەڵەیەك رووناکی بینرا، پەڵەیەکی زۆر گەورە. پەڵە ئاگرێك کە وەك ئەستێرە رادەخزی و دەوروبەری خۆی پریشك باران دەکرد... لووتکەی عەلی‌کۆ وەك هەتاوی بەرەبەیان لێی دابێ رووناك بووەوە.

دێهاتییەکان پێیان سەیر بوو. حەمەدیش پێی سەیر بوو. ئەمە یەکەم جار بوو کە لەوێ، لەسەر لووتکەی عەلیکۆ ئاگر دەبینرا.

لەو وەختەدا ئەو حەوت کەسە کە دژی خەجیج شایەتیی بەدرۆیان دابوو، هاتن لە پێش حەمەد ڕاوەستان. قسەیان نەدەکرد.

حەمەد:

"چیە؟."

گوتیان:

"ئێمە بووین..."

حەمەد تێگەیشت:

"کارێکەو کراوە."

گوتیان:

"ناچاری کردین."

حەمەد:

"دەزانم."

هەر حەوت کەس بە سەرشۆڕی و بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە، بە بێدەنگی لەپێش چاوی حەمەد لاچوون.

شەوێ تا بەیانی لەخۆشییان و لە خەفەتان خەو لە چاوی حەمەد نەکەوت. خەفەتەکە خەفەتی خەجیج بوو.

بەربەیانێکی ڕوون و بەرین و تەڕو تازەو نەرم و سووک و دڵگر کەوتە سەر ئاسیاب چەشمە. ئاسیاب چەشمە لە خەونێکی سپی و ڕووناک ڕۆچووبوو. دارەکان ئەمڕۆ جوانتر دیار بوون. خاردەشت هێشتا هەر دەسووتا. ئەو دڕووەڵانە سپی و بەرینانە سەرانسەر کەوتبوونە ژێر خاکە خەڵووزی ڕەش.

خەبەریان هێنا کە:

"عەلییەشەل هات."

حەمەد بە بێسەبری چاوەڕوانی بوو. عەلییەشەل بە زەحمەت لاقە شەلەکەی لە دووی خۆی ڕادەکێشا و دەهات. گەیشتەجێ.

حەمەد زەردەیەکی هاتێ:

"فەرموو عەلی ئاغا، فەرموو..."

حەمەد لە عەلی‌یەشەل نیزیك كەوتەوە. بەخۆشەویستی‌یەوە دەستی گرت و دەستی لە پشتە دەستی راكێشا.

عەلی ئارەقی كردبوو. هەناسەبڕكەی وێ‌كەوتبوو. لە پەنا حەمەد راوەستا. ئارەقەكەی وشك بووەوە. روخساری سیس و چرچ بوو. لەماوەی چەند رۆژ دا بە قەد چەند ساڵ پیر ببوو.

حەمەد:

"چی بووە عەلی ئاغا. بۆ كەیفت نیە؟."

عەلی‌یەشەل:

"هەر لێم مەپرسە."

حەمەد لەم وەڵامە ڕا هەستی كرد دەبێ خەبەرێك هەبێ. چونكە عەلی‌یەشەل ئەوەندە بە بێزاری و نیگەرانی و ناڕەحەتی و قینەوە ئەو وەڵامەی دابووەوە كە نەدەكرا بە كەمی بگرێ.

چاوە زلەكانی حەمەد، زلتر بوون و پرسی:

"نەكا خەبەرێكی ناخۆشت پێ بێ."

عەلی كە دەستەكانی دەلەرزین، بە دەنگێكی تێكەڵ بە ناهومێدی هەر ئەو جوابی پێشووی دووپات كردەوە:

"هەر لێم مەپرسە."

حەمەد:

"قسە بكە عەلی ئاغا. نیگەران بووم."

عەلی‌یەشەل:

"ئەوەی نەدەبوو ببێ، بووە، هەر لە پێشداش دڵم خەبەری دابوو كە رەنگە وای لێ‌بێ."

حەمەد سەری بردە بن گوێی:

"بڵێ بزانم چ بووە."

عەلی‌یەشەل:

"یەزید، ئەو كافرە..."

حەمەد:

"باشە؟..."

عەلی‌یەشەل:

"هەڵاتوە."

حەمەد:

"چی؟."

حەمەد وەك بریسکە لێی دابێ, شل بوو. چاوی لە رەشەوە هاتن. پاشان رەق بوو.

عەلیپەشەل:

"ئەمن قسەم لەگەڵ کرد. ئێستا لە شاری خۆی شاردوەتەوە. منیشی ناردەوە ئاسیاب چەشمە بۆ ماڵی خۆیان."

جەبار وەختێك ئەم حاڵەی حەمەدی دیت, ترسا. دڵخۆشیی دایەوە:

"خەفەت مەخۆ برام. ناتوانێ لە چنگمان دەرچێ. ئەمرۆ نەبوو, سبەینێ..."

ژنی عەلی دورمووش زیڕەیەکی لێهات و رای کرد بۆ قوژبنێکی ژوورەکە. دەستی کرد بە شیوەن و گریان و بەخۆ دادان:

"وەی, وەی, وەی... قوڕی دنیام بەسەر... ئەمە چ بەڵایەك بوو بە سەرمان هات... وەی, وەی, وەی..."

جەبار:

"پوورێ بۆچی خۆت دەکوژی... ئەو تازە ناوێرێ پێ لەئاسیاب چەشمە بنێتەوە. زەوی و زارەکەش ئی خۆتانە, گاجووتەکانیش ئی خۆتانن هەتا رۆژێك کە ئێمە مابین..."

"وەی, وەی, وەی..."

چەند لەحزە دواتر ئەو خەبەرە بە گوێی هەموو دێهاتییەکان گەیشت. لەماوەی چەند دەقیقەدا دێ لە بنیادەم بەتاڵ بوو. هەموو لە ماڵەکانیان خزینەوە. ئەو هەڵڵاو هەنگامەیە لەپڕ بێدەنگ بوو. دێ بوو بە گۆڕستانی خامۆشان... سەگیش حەپەیان لەبەر بڕا, کەڵەشێر بێدەنگ بوون. دەتگوت ئاوەدانی زیندەوەری تێدا نەماوە.

دەتگوت هەموو دێهاتییەکان بەو هەموو شادمانی و جموجۆڵەوە کە هەتا پێنج دەقیقە لەمەوبەر دێیەکەی دەلەرزاند, کۆچیان کردوەو چوونە جێگایەکی دیکە. ئیدی لەو دێیەدا پەلەوەر باڵی لێك نەدەدا.

ئەم بێدەنگییە تا ئێواری هەروا درێژەی هەبوو. عەلی دورمووش تێك تەپیبوو. سەرە پیرەکەی لەنێو شانەکانی دا خرابووە چاڵ. ژنەکەشی کە روومەتی بە جارێك تێك قوپیبوون, لە

قوژینێك دا كوشم هەڵاتبوو. حەمەد سەری بە تفەنگەكەیەوە نابوو و دانیشتبوو. بیری دەكردەوە. نێوچاوانی پڕ لە گنج و لۆنج بوو.

لای خۆرئاوا تاك و تەرا لەنێو دێ دا هاتوچۆ دەبینرا. لەپێش دا كەڵەبابێك لە سەرانگوێلكێ خوێندی. پەڕی سەوزو سوورو شینی كەڵەشێر دەتگوت چەورن، دەتروسكانەوە. پاشان سەگ دەستیان كرد بە وەڕین. پاشان دێهاتییەكان لەماڵەكانیان هاتنەدەرو لەم قوژبن و ئەو قوژبن دا لە دەوری یەكتر كۆبوونەوە. سەرانسەری دێی كەوتە ژێر گاڵەگاڵێك:

"ئێستا ئیدی بووەتە بنیادەم و ..."

"دەربەدەری كێو و بەندەنان بووەتە بنیادەم و ..."

"هەتیوی برایمی بەدبەخت بووەتە بنیادەم و..."

"بووەتە بنیادەم و خەریكە زەوییەكانی عەبدیخان دابەش دەكا."

"بڕوانە بەژن و باڵای."

"دەڵێی منداڵی حەوت ساڵەیە."

"هێزی لەبەر دا نیە، خۆی بەسەر پێوە ڕاگرێ."

"تفەنگەكەی خۆی پێ هەڵناگیرێ."

"ئێستا یاغی بووەو..."

"یاغی بووەو پێی وایە ماڵی بابی..."

"پێی وایە زەوییەكانی ئاغای خۆمان ماڵی باوكنی كە خەریكە دابەشیان دەكا. پێی وایە گاجووتەكانی ئاغامان ماڵی باوكنی."

"ئێستا بووەتە بنیادەم و..."

"وەك سەگ لەبەر دەركی ئاغامان گەورە بووە."

"هەتا دوێنێ..."

"هەتیوی برایمی گۆڕ بە گۆڕ..."

"چۆنیشی خۆ قەپ كردوە! پیاو ناوێرێ تەماشای بكا."

"بوو بە باعیس كە كچی خەڵكیش لە زیندان دا بڕزێ."

"كچەكە ئەوە لە ژووریدا دەڕزێ."

"توخوا تەماشای."

"دڕووەڵانی سووتاندوە كە چەقڵ لە لاقی لادێییەكان ڕانەچێ."

"بۆ ئەوەی ئەیان پەشێ."

"توخوا تەماشای."

"هاتوەتە نێو دێی, خەڵکی فریو داوە کە گۆیا عەبدیخانی کوشتوە."

"کە ئاغامان..."

"ئاغامان دەتوانێ سەد سەگی وا بە گوللەیەك بکوژێ."

"ئاغای ئێمە..."

پاشان هەموو دێهاتییەکان کۆبوونەوەو چوونە ماڵی عەبدیخان. حەساریان پڕ کرد. دەستیان کرد بە پیرۆزبایی لە ژن و منداڵی عەبدیخان.

گاڵ و بگرەکە هەتا نیوەشەوێ درێژەی هەبوو. نیوە زیاتری دێهاتییەکان لایەنی حەمەدیان گرت. ئەوان پێیان وابوو عەبدیخان بە سەلامەتی دەرچووە. ئەمان لە ماڵەکانیان نەهاتبوونەدەر. عەلی دورمووش دەتگوت مردوە. ژنی عەلی دورمووش نەخۆش ببوو و لە جێی دا کەوتبوو. زاری بۆ هەڵنەدەپچڕا کە قسە بکا. حەمەدیش خەنجەرت لێدابایە خوێنی لێنەدەهات. تەنیا جەبار بوو کە قسەی دەکردن و بەم لاو ئەولادا رای دەکردو هەوڵی دەدا دێهاتییەکان دڵخۆشی بداتەوە:

"تازە عەبدیخان ناتوانێ پێ لەم دێیە بنێتەوە. دڵتان تەخت بێ. ئەمڕۆ نەبوو, سبەینێ دەکوژرێ. بە خوا دەکوژرێ. ئەمن پێتان دەڵێم خاترجەم بن. بەخوا تازە لەسەر ئەم دنیایە زیندوو نامێنێ. ئەمڕۆ نەبوو, سبەینێ... ئەمن پێتان دەڵێم دەکوژرێ, دڵنیا بن دەکوژرێ..."

بەڵام کەس گوێی نەدایە.

هەتاو نەکەوتبوو کە لە ماڵی عەلی دورمووش وەدەر کەوتن. حەمەد نەیدەتوانی سەر هەڵبڕێ. سەری بە بێحاڵی کەوتبووە سەر سینگی. دەتگوت سەری بەردەبێتەوە. جەباریش وەك خۆی بێدەنگ لە تەنیشتی وەڕێ کەوتبوو. وەختێك لە دێی وەدەر کەوتن دوو سەگیان پێ وەڕین. حەمەد هەر گوێی لێنەبوو. جەبار بەردی پێدا دان و سەگەکانی دەرکردن. درووەڵانەکە سووتابوو. سەرانسەری درووەڵان کەوتبوە بن خۆڵەمێشێکی رەش. حەمەد لە نێوەڕاستی درووەڵانەکە راوەستابوو. وشك ببوو. جەبار نەیدەوێرا هیچی لێبپرسێ. چاوەڕوان بوو. حەمەد هەروا راوەستابوو و نەدەڕۆیشت. جەباریش لەسەر بەردێك دانیشت و تفەنگەکەی لە باوەش گرت. هەتاو کەوت. حەمەد هەروا بە پێوە وێستابوو. جووڵەی نەدەکرد. سێبەرەکەی بۆ لای

دێی درێژ ببووەوە. هەتاو بەرز بوو. بەڵام حەمەد نەبزووت. جەبار ئیدی پێشی خۆی پێ نەگیرا.
لە حەمەدی نیزیك بووەوە:
"چ بووە کاکە؟."
حەمەد دەتگوت لە خەو راپەڕیوە. هەتاو لە چاوانی چەقی."
جەبار:
"بیری لێمەکەوە کاك حەمەد. بنیادەم شیری خاوی خواردوە. رووحیشی لە رووحێ نێـی هەڵە هەر دەکا. ئەویش هەر جۆرێك بێ..."
حەمەد ددانی لە چیرەوە بردن. قسەی وەك خەنجەر دەبیڕی:
"هەر جۆرێك بووە!"
تەماشایەکی خاردەشتی سووتاوی کرد.

# (١٩)

سەوزایی توندی داری مێرسین, خواردنەوەیەکی توندو سەرخۆشکەر وەبیر پیاوی دێنێتەوە. بناری تەپۆلکەکانی سۆلمیش پڕ لە داری مێرسینە, چڕو پڕو بە پشت. ئەوانەی بە ڕێچکە بزنەکانی ئەو دەوروبەرەدا رادەبرن, بۆنی توندی ئەو دارانەیان بۆ دێ. ئەو بۆنە پیاوی تەمبەڵ و قالب گران دەکا. لای خوارەوەی تەپۆلکەکانی سۆلمیش دەشتە. لەو جێیانە خڕکە بەردێکیش پەیدا نابێ. خاکەکەی وەك لیوەی ورد نەرمە. هەموو ئەو دەشتەیان کردوەتە دار هەنار. کەسیش نازانێ ئەو هەنارانەیان کەنگێ ناشتوە. دار هەنار گوڵە سوورەکەی دەکاتەوە. ئێرە پێی دەڵێن "باخچەهەنار". تەواوی دەشتەکە تارای گوڵە هەناری پێدا دراوە. مێشەنگوینە بەسەر گوڵە هەنارەکان دا دەفڕن.

چۆمی "ساووران"بە خوارەوەی باخچەهەنار دا تێدەپەڕێ. چۆمی ساووران لە سەرەوە, واتە لە ناوچەی تووڕووس ئاوێکی باریکە, بەڵام بەتاقەتە, دەڵێی لە سەرچاوەیەك دەردەپەڕێ. ئاوێکی سەرشێتە. لەم گابەردەوە باز دەداتە سەر ئەو گابەردو کەف دەکا. بەڵام لێرە ئارامە. وەك گوڵێك لەو دەشتە پان دەبێتەوە. لێرە ئاو لە گوێزینگێ لاقی هەورازتر نایە. لەنێو ئەو ئاوە شێوە دەریایەدا هێندێ دوڕگەی وردو درشت هەن, دوڕگەی خاك و چەوی دەم ئاوان. زۆربەی ئەو دوڕگانە مێشەن. دارەکان پاڵیان وێك داوە. وەك دیوار. هێندێکیش لەو دوڕگانە نیوە رووتەنن.

"هاییت"ە خۆڕسکەکان بۆنی خۆشی خۆیان لەم دوڕگانـەدا بـڵاو دەکەنـەوە. جگـە لـەویش "ئیلگین"ە شین و گەڵا باریکەکان لەو دوڕگانەدا دەڕوێن و بە ئارامی لەبەر شنەبا دەبزوون. لـە لێوارەکانیش کاڵەکە مارەی گوڵ درشت و رەنگ زەرد رەنگی خۆیان دەنوێنن.

چەندین ساڵە لە گەورەترین دوڕگەی ئەو نێوەدا, لە دوڕگەی "بێستانجیك" کاڵەك و شووتی دەچێندرێ. ئەم دوڕگەیە "مەمۆ کوردە" یەکێك لە ئاغایانی زەمیندار بە کرێی گرتوە. درشت ترین کاڵەك و شووتیی چوکووراوا لە دوڕگەی بێستانجیك رەنێو دێ.

عەلیـچکۆڵ بێـستانەوانی ئێرەیـە. چـەندین سـاڵە پارێزگـاریی ئـەو بێـستانە بەویـیـە. چواردەوری چارداخەکەی هەمیشە پڕ لە توێکڵە شووتی و کاڵەکـە. مێـشەنگوینە لەسـەر ئـەم توێکڵانە دەنیشن. مێشەنگوینە هێند بەزۆری لەسەر ئەو توێکڵانە دەنیشن کە توێکڵـەکان ون دەکـەن. مێـشەنگوینەو شـەمەترێلکەو هـەموو جـۆرە مێـشێك. مێـشەکان لەبـەر هـەتاو دەبریسکێنەوەو رەنگیان سەوز دەچێ.

ئەو هەموو توێکڵە شووتییە لە دەوری چارداخی عـەلی چـکۆڵ نیـشانەی پیـاوەتیی ئەوە. عەلی چکۆڵ زۆر پیاوێکی دڵ و دەروون فرەوان بوو. هەرکـەس رێـی لـە کـن ئـەو بێستانە کەوتبایە, هەتا شووتیی نەخواردبایە نەیدەهێشت بڕوا. شووتی و کاڵەکی دەدا بە هەموو کەس.

ئەو عەلی چکۆڵە لە کوێ ڕا هاتبوو و خەڵکی کوێ بوو, کەس نەیدەزانی.

عەلی چکۆڵ دەتگوت بۆ بێستانچییەتی دروست بووە, لێـرە ئەوەنـدە خۆمـاڵی دیـار بـوو, دەتگـوت یەکێکـە لـە ئیلگینـە خۆڕسـکەکانی ئـەم دوڕگەیـە. دیـار نـەبوو عـەلی چـکۆڵ بێستانەوانیی پێ خۆشە یان نا...

پیاو چۆن دەزانێ ئیلگینە خۆڕسکەکانی بێستانێك جێگای خۆیان پـێ خۆشـە یـان نـا؟... عەلیچکۆڵیش راست وەك وان بوو...

عـەلی چـکۆڵ نـانی خـۆی لـە بێـستانجیك پەیـدا دەکـرد. جگـە لـەوە, بێـستانجیك جێگایەکی خۆشیش بوو. شەوانی گەرمی هاوین چۆمی ساووران بە چۆڕە چۆڕ بـە خـوار چارداخەکەی وی دا رادەبرد. وەختێك مانگەشـەو دەبـوو, خـڕە بـەردەکانی نێـو چـۆمی ساووران دەبریسکانەوە.

یەکێك لە رۆژەکانی بەهار بوو کە هاتن بێستانجیك بکێڵن, بەڵام..., بەڵام بێـستانجیك لـە جێی خۆی نەمابوو. لافاو هاتبوو, بێستانجیکی شوتبووەوەو رایماڵیبوو. پاش ئەوە بـوو کـە دوو

سالآن عەلی چکۆڵ ون بوو. ئەودەم یاغیی‌یەتی برەوی هەبوو. هەرکەس بەسەری هەڵلا هاتبایە، هەرکەس لە ژنێ خۆی زویر بایە، تفەنگی هەڵدەگرت و وەکێوان دەکەوت... لەپڕ خەبەر هات کە عەلی چکۆڵ یاغی بووە. هەرکەس ئەو خەبەرەی دەبیست سەری سوڕ دەما.

ئەم عەلی چکۆڵە هەر ئەو عەلی چکۆڵەیە کە دەزانین. عەلی چکۆڵ بۆ ئەوەی حەمەدۆکی بۆ لەداو کەوێ، کون بە کون بە دوای دا دەگەڕا. بەلام بە شتێك نارەحەت بوو. سووچێکی دڵی دەسووتا. بۆخۆشی نەیدەزانی بۆچی...

لە پێش دا لە خەلکی ئاسیاب چەشمەی پرسی.

گوتیان:

"لە عەلی کۆیە."

عەلی چکۆڵ چەند رۆژان لە عەلی‌کۆ دا گەڕا. بەلام خەبەرێکی نەبوو... خەریك بوو شێت دەبوو. لە دێهاتی سەرەوەی خاردەشت، لە "مازدەشت"و دێهاتی ئەوێی پرسی، دیسان سۆراغی نەکرد. لە هەرکەس، لە هەرکام لە دێهاتی‌یەکان سۆراغی حەمەدۆکی دەپرسی، لە پێش دا تەماشایەکی سەرو چاوی‌یان دەکردو دوایە دەیانگوت:

"حەمەدۆکت دەوێ؟... لە حەمەدۆك دەپرسی؟... ئێمە نە دیومانەو نە خەبەرمان لێی هەیە."

لە دێهاتی کێوپارە کەس نەمابوو ناوی حەمەدۆکی نەبیستبێ. کەسێك نەبوو خۆشەویستیی ئەوی لە دڵ دا نەبێ. بۆیە ئەگەریش کەسێك جێگای وی پێزانیبایە، بە زمانی دا نەدەهات. ئەمە ئیمکانی نەبوو. لە جێ دا هەروا باو بوو. لە قەدیمەوە... کەس نەیدەتوانی پەناگەی یاغیی‌یەك کە خۆشەویستی خەڵك بێ، بەو ئاسانی‌یە بدۆزێتەوە.

بەلام عەلی چکۆڵ ناهومێد نەدەبوو. ئەم کێوەی بەجێ دەهێشت و رووی لەو کێو دەکرد... ئەو کێوی بەجێ دەهێشت و رووی دەکردە کێوێکی دیکە... پاشانیش رێگایەکی دیکەی دۆزیەوە. تووشی هەرکەس دەبوو، دەیگوت:

"ئەمن لە دەستەی حەمەدۆکم... پاش ئەوەی ئاك تورزلورمان سووتاند، لێم ون بووە."

ئەم فێڵەی کاریگەر بوو. عەلی‌چکۆڵ زانی حەمەدۆك لە کام مەڵبەندە. حەمەد لە لای سەرچاوەی ساوور بوو. جار جار دەهاتە ئاوەدانی و چەند شەوێك دەمایەوە. جارجاریش لە کاجستانەکانی دەوروبەری ساوور...

سەرچاوەی ساوور پەناگەی زۆر لە وردە یاغی و ڕێگرەکان بوو. بەڵام حەمەد تێکەڵاویی لەگەڵ ئەوان نەبوو. جگە لەوە کە تێکەڵاویی لەگەڵیان نەبوو، قسەشی لەگەڵ نەدەکردن. ئەم ڕەفتارە ببووە هۆی ئەوە کە یاغییەکانی ئەوێ ڕقی لێداگرن و ئیرەیی پێ بەرن و هەروا لێی بترسن. حەمەدۆك وەك ترسێکی ڕەش و تاریك لە سەرچاوەی ساوور دا دەسووڕایەوە.

حەمەد لەسەر کاجێکی قەد ئەستوور هەرزاڵێکی بۆخۆی دروست کردبوو. ئەو شەوانەی نەدەچووە نێو دێی، لەوێ دەخەوت و جەباریش لەبن داری نێشکی دەکێشا. وەختێك نۆرە نێشکی حەمەدیش بووایە دیسان هەر لەو سەرە دادەنیشت و تفەنگەکەی بە سینگیەوە دەنووساند. جەبار نەیدەتوانی بچێتە سەر دارەکە. حەمەد ئەو سەرەی باش دروست کردبوو، ڕێك و پێکی کردبوو و نەرمی کردبوو. زۆرییی لە جەبار دەکرد کە بێتە سەرێ و جێ خەوەکەی ببینێ. جەبار نەدەچوو. لە لایەکیش پێی خۆش بوو بزانێ حەمەد ئەو سەرەی چۆن دروست کردوە.

یەکێك لە دێهاتییەکان کە خەبەرهێن بوو، عەلیچکۆڵی هێنایە بن کاجە بڵیندەکە. جەبار کاتێك ئەوی دی خۆشحاڵ بوو. دەستیان لە ملی یەکتر کردو یەکتریان ماچ کرد.

"چەند خۆشحاڵم کە برینەکەت چاك بووەتەوە عەلیچکۆڵ... زۆر خۆشحاڵم... ئێستا لە کوێی؟."

حەمەدیش خێرا لە کاجەکە هاتە خوار:

"بەخێر بێی برالە. زۆرمان بیر دەکردی."

عەلیچکۆڵ لەو هەموو خۆشحاڵییەی حەمەدو جەبار سەری سوڕما. لەپێش دا نەیتوانی قسەیەك بکا. چەند جار گوتی:

"هیچ، هیچ..."

پاشان خۆی کۆ کردەوەو گوتی:

"ئێستا لەنێو دەستەی وەسمان کالاییم. پاش ئەوەی دۆردووە شێت کوژرا، چوومە نێو دەستەی کالایی. بۆخۆمان دەگەڕێین و کارمان بە کاری کەس نیە. ئەوەمان لەنێوچاوانێ نووسراوە."

جەبار پێکەنی:

"وادیارە خەفەتت زۆرن عەلیچکۆڵ، چما خەبەرێك هەیە؟."

عەلیچکۆڵ هەناسەیەکی هەڵکێشا:

"هەر مەپرسە کاکە، هەر لێم مەپرسە."
دانیشتن و پاڵیان بە دارەکەوەدا.
عەلیچکۆڵ:
"نایب رەجەب لە کوێیە؟."
پاش گوتنی ئەم قسەیەش تەماشای دەوروبەری خۆی کرد.
جەبار:
"عومری درێژی بۆ تۆ بەجێ هێشت. ئاخرەکەی هەر بە برینەکەی چوو."
عەلیچکۆڵ:
"حەیف نایب رەجەب، حەیف... ئاخری دنیا هەر ئەمەیە."
جەبار:
"بەخۆڕایی نیە کە دەڵێن دنیا فانیە... ئاخرەکەی ئەمەیە... خاك..."
حەمەد هۆشی لە جێیەکی دیکە بوو. هاتەوە هۆش خۆی:
"بیستمان کە دۆردووە شێتیان کوشتوە. بەڵام حەز دەکەین لە زمانی تۆی ببیسین، چونکە ئەتۆ لەگەڵی بووی."
عەلیچکۆڵ:
"مەپرسە کاك حەمەد، مەپرسە... ئەو لاوە تووڵە نەمامانە لە خوێن گەوزین... حەیفیان کرد... بەڕاستی حەیف..."
جەبار:
"بۆمان بگێڕەوە عەلیچکۆڵ... بزانین چۆن بوو؟."
عەلیچکۆڵ:
"وەختێك لە ئێوە جیا بووینەوە، دۆردووە شێت زۆری پێ لێ هەڵێنا. زۆر... ئیدی لە دێهات ژنیشمان هەڵدەگرتن. ژنەکانمان هەڵدەگرت و دەمانبردنە سەر چیاو لەوێ سەمامان پێ دەکردن."
جەبار:
"هەر یاغییەك کاری وای کردبێ، خێری نەهاتوەتە رێ. مومکین نیە چاکەی بێتە رێ عەلیچکۆڵ."
عەلیچکۆڵ:

"ئەگەر هەر ئەمە با, قەیدی نەبوو. بەڵام چیمان نەکرد؟..."

جەبار:

"جا دەتانویست چی دیکە بکەن؟."

جەبار زۆر سەری سوڕمابوو و هەردەم سەرسوڕمانەکەی پتر دەبوو.

عەلیچکۆڵ:

"هەموو ماڵەکانی خستە بەر باج و خەراج. هەموو ماڵێك ناچار بوو بە پێی بوون و نەبوونی خۆی باج بە دۆردووە شێت بدا."

جەبار:

"لەو قسانە!."

عەلیچکۆڵ:

"جارێ ماویەتی."

جەبار لە سەیران چاوی پێ دەرپەڕیبوون:

"باشە چی دیکەتان دەکرد؟."

عەلیچکۆڵ:

"لە بەندەنی "وشترمل" سەنگەرێکی دروست کردبوو. لەوێ دادەنیشت. هەر حەیوانێك بەوێ دا تێپەڕیبا گوللەیەکی لە دەستی چەپی دەدا. هەرکەسیش هاتبا بەوێ دا بڕوا گوللەیەکی لە دەستی راستی دەدا."

جەبار:

"کەوابێ, باش لە کەللەی دابوو."

عەلیچکۆڵ:

"لانی کەم تفەنگی لە دەستی سەد کەس داوەو نقوستانی کردوون. زۆریشیان مردوون."

جەبار:

"پەنا بەخوا... باشە, دوایە چی؟."

عەلیچکۆڵ:

"بە برای خۆم بڵێم رۆژێك بەسەر گوندی سپیبەیحان دا دا. هەموو ژنەکانمان لە ژووران هێنانەدەرو لە مەیدانێك کۆمان کردنەوە. پیرەژنەکانیشمان هێنان. هەمووومان ناچار کردن هەڵپەڕن. بەستەزمانانە لە ترسان وەك مێگەلەمەڕ سەریان دەبەریەك نابوو. بە برای خۆم

بلێم هێندێکیان لە ترسان نەختێك هەڵدەپەڕین و پاشان رایان دەکردو خۆیان لەنێو ئەوانی دیکە داویشتەوە. پاشان دۆردووە شێت زاری کردەوەو ناموس و ئابڕووی هەمووانی وەبەر جنێو دا. هەروا جنێوی دەدا. هەمور دێیەکەمان پاوان کردبوو. پیاوەکان لە ماڵان دا خۆیان شاردبووەوەو نەیان دەوێرا بێنەدەرێ. لەپڕ نازانم چ بوو کە تۆزو خۆڵێك بەرز بووەوە ئەوسەری دیار نەبوو. ئێستاش نازانم لە نەکاو چۆن بوو. لەنێو تۆزو خۆڵ دا ماینەوە. چاو چاوی نەدەدی. دۆردووە شێتیش لەپڕ ون بوو. لەنەکاو دیتم لەسەر بانێکم. هیچ لەبیرم نیە چۆن خۆم گەیاندبووە ئەو سەربانە. تفەنگەکەم بە دەستەوە نەبوو. نیو سەعاتێك مەیدانەکە تۆزو خۆڵێك بوو هیچ نەدەبینرا. پاشان تۆزو خۆڵەکە مردەوە. دێهاتییەکان هەڵدەخولان. هەموویان لە شەکەتییان خەریك بوون بەلادا بێن. ئەمن لە سەربانی هاتمە خوارێ. لە ترسان وەك مێژۆکە دەلەرزیم. ئێستاش نازانم چۆن و بۆچی لە سەربانی هاتمە خوار. ئێستاش لەبیرم نیە... نازانم چۆن هاتمەخوارو بۆچی هاتمەخوار. لەسووچێك راوەستام و چاوم لە دێهاتییەکان کرد. دێهاتییەکان وردە وردە چوونەوە ماڵەکانیان و مەیدانەکە چۆڵ بوو. هیچ کەس منی نەدی. لەوانەشە دیتبیانم و کاریان پێم نەبووبێ. ئەو بەشەی خوا دەزانێ. لەوانەشە هۆشیان نەمابێ کە بمناسن. ئەوانی دیکەیان بە جۆرێك ئەنجن ئەنجن کردبوو کە هەر دەتگوت قیمەن. کەلاکی هیچ کەس لە مەیدانەکە دیار نەبوو. هەموویان کوت کوت کردبوون. هەم دۆردووە شێت و هەم ئەوانی دیکە. هیچ جێیەکیان دیار نەبوو. لەنێو تۆزو خۆڵ دا تەنیا چەند قۆنداغە تفەنگ دیار بوون و تەواو. لینگە چەکمەیەکی دۆردووە شێتیش لە سووچێك کەوتبوو. ئیدی هیچم نەدی. مەسەلەکە بەم جۆرە بوو... پاشان وەختێك هۆشم هاتەوە بەر خۆم، رام کردو وەشاخی کەوتم."

جەبار:

"ئاوا؟... جۆرێکی دیکەیان بە ئێمە گوتبوو."

حەمەد:

"دیار بوو ئاخرەکەی ئەوە دەبێ. ئەویش وادیار بوو هەر بە دوای ئەو رۆژەدا دەگەڕا. دەیزانی ئاخرەکەی هەروای بەسەر دێ. هەربۆیەش بە جارێك شووی لێهەڵکێشابوو و هەرچی بە دڵی دا هاتبایە دەیکرد."

جەبار:

"ئەو کالایی وەسمانەش چەپی لەبەر دۆردوو دا نیە. ئەمیش جۆرێك دۆردووە شێتە."

عەلیچکۆڵ:

"نا، ئەو وەك دۆردووە شێت نیە. ترسەنۆکە. دوو روویە. بیژوویەکە بۆخۆی. ئەو بەو ئاسانییە کلکی بە تەڵەوە نابێ."

جەبار:

"دەمەوێ ئامۆژگارییەکی برایانەت بکەم. ئەویش درەنگ یان زوو، وەك دۆردووە شێت لەنێو دەچێ. ئەویش ئاخرخێر نیە. ئەتۆ لێی دوور کەوەوە براله. ئەگەر دەتەوێ لە بەڵا بە دوور بی، لێی جیا بەوە. زگم پێت دەسووتێ."

حەمەد وەك ئەوەی هەر گوێی لەوان نەبێ، ئەسڵەن کاری بە کاری وان نەبوو.

حەمەد:

"عەلیچکۆڵ زگم پێت دەسووتێ."

پاشان دەستی عەلیچکۆڵی گرت:

"ئێستێ بڵێ چۆن بوو هاتیە لای ئێمە. خەبەرێکت بۆ هێناوین؟."

عەلیچکۆڵ ماوەیەك تەماشای حەمەدی کرد. پاشان سەری داخست. رەنگی سوور هەڵگەرا. پاشان خێرا خێرا قسەکانی کرد:

"کالایجی وەسمان لەدوا تۆی ناردووم. دەیەوێ بت بینێ. لەمنی پرسی حەمەدۆکی دەناسی. گوتم ئەدی برادەرین. زۆرم تاریف کردی. گوتم وەك برای خۆمە. گوتم وەدوای دەکەوم و دەیبینمەوە. زۆرتان بەدوادا گەڕام."

حەمەد و جەبار لەبنەوە تەماشایەکی یەکتریان کرد. بەو مانایە کە:" دەبێ کەڵەکێك لەکاردا بێ."

حەمەد:

"باشە، ئاوا؟."

عەلی چکۆڵ:

"بەڵێ، ئاوا."

جەبار:

"زۆر بەدوای ئێمەدا گەڕای؟."

عەلی چکۆڵ:

"زۆر."

جەبار:

"کالایجی چ کارێکی بە ئێمەیە؟."

عەلی چکۆڵ:

"ئەمن زۆرم تاریفی حەمەدی بۆ کرد. گوتی ئێستا کەوایە برۆ لای و بیهێنە لای خۆمان."

حەمەد:

"بژی براکەم. سوپاست دەکەم."

جەبار بە قینەوە تەماشایەکی کرد.

حەمەد:

"هەستن بابڕۆین. ئەمنیش دەمەویست بیبینم. هەستن با زووتر بڕۆین. لەکوێ چاوەڕێمانە؟."

عەلی چکۆڵ:

"لە چیای" کۆنوور"..."

حەمەد:

باشە... ناکرێ پیاو قسەی وەسمان کالایجی لە عەرزی بدا."

جەبار زۆری پێسەیر بوو.

حەمەد:

"چما دەکرێ کالایجی پیاوی بانگهێشتن بکاو..."

عەلی چکۆڵ:

"ئاخر زۆرم تاریفی تۆ بۆ کرد..."

جەبار، ئەو دێهاتییەی عەلی چکۆڵی بردبووە ئەوێ، بردە سووچێك و لێی پرسی:

"ئەو یاغییە تۆی چۆن بەگیر هێنا؟."

کابرای دێهاتی:

"بیستم تووشی هەرکەس بێ خەبەری حەمەدۆکی لێدەپرسێ، هەتا هێنایانە لای من. دەیگوت لە دەستەی حەمەدۆکم. داوای لێکردم بیهێنمە لای ئێوە. دەیگوت لێم ون بوون. منیش هێنام. زۆرم لەبەر پاڕایەوە..."

جەبار:

"باشە، تێگەیشتم. ئەتۆ برۆ، ئیدی."

کۆنوور لێرەوە زۆر دوور بوو. رۆژە ڕێیەك زیاتر.
کابرای دێهاتی بەدەم دوور کەوتنەوەوە هەر دەرۆیشت و ئاوڕی دەدایەوە دوای خۆی.
حەمەد لە دواوە بانگی کرد:
"کاك حوسێن هەتا چەند رۆژی دیکە دێینەوە. بەخوات دەسپێرم. زۆر سوپاس کە هاوڕێیەکەمانت هێنا."
دێهاتی:
"بەخواتان دەسپێرم."
لای نیوەڕۆیە گەیشتنە "سیرینگیچ". دنیا خەریك بوو تاریك بێ، لە چۆمی کەشیش پەرینەوە. لەوێ لە دێیەك نانیان وەرگرت و خواردیان. پاش یەك دوو سەعات حەسانەوە دووبارە وەڕێ کەوتن. لای تاوهەڵات گەیشتنە "سپیەقەڵا". لەسەرچاوەیەك کە قەراخەکانی خەنەتیلکەیان گرتبوو ئاویان خواردەوە. لە تەواوی ڕێگادا حەمەد لە پێشەوە، عەلی چکۆڵ لەدوای ئەو و جەباریش لەدوای وان دەرۆیشتن. لە گردێکی سپیکە لە پشت سپیەقەڵا بوو، وەسەر کەوتن. دەیانەویست شەوێ لەوێ بنوون. دیار نەبوو بۆچی کاتێك لە گردەکە دەچوونەسەر عەلیەچکۆڵ زۆر بەجێ مابوو. جەبار لەم دەرفەتە کەلکی وەرگرت:
"حەمەد, کاك حەمەد, دەزانی..."
حەمەد پێکەنی:
"دەزانم کاکە جەبار."
جەبار سەری لە کاری حەمەد دەرنەدەچوو:
"ئەدی بۆچی دەچین؟."
حەمەد:
"تێنەگەیشتی برالە؟... بۆ ئەوەی بەداومەوە بکا, پیاوی بەدوادا ناردووم. کەسێکیش کە من دەناسێ. بانگهێشتنی کردووم. دەکرێ نەچم؟ پێی وا دەبێ ترساوین. پێی وایە داوی بۆ داناوین!."
جەبار:
"ئێمە ئەوە خەریکین بە دەستی خۆمان خۆ دەخەینە داوی ئەو. ئەوان لانی کەم دە کەسن."
حەمەد:
"سەد کەسیش بن چارەیەکمان نیە."

جەبار:

"کەوایە با عەلیچکۆڵ بکوژین..."

حەمەد:

"نا... دەمەوێ کالایجی ببینم. دەمەوێ بزانم چ جۆرە پیاوێکە."

جەبار:

"بۆچی بیبینین؟... باشە, ئەگەر پێت خۆشە بچین بیبینین. بزانین چ دەبێ."

حەمەد:

"بڕوانە روخساری عەلیچکۆڵ. هەر ئاوەی جۆرێکە. روخساری وەك روخساری پەژیوانان دەچێ, وادیارە هەزار جار لەو کارەی کردوویە پەژیوانە. لە کردەوەی خۆی پەژیوانە. وام دێتە بەرچاو کە لەنەکاو بوخچەی دڵی دەکاتەوەو هەرچی لە دڵی دایە دەیڵێ... بڕوانە, تەنانەت لەحزەیەکیش چاو لە چاومان ناکا. لەوانەشە لە دڵی خۆی دا دوعا بکا کە نەچینە لای کالایجی. با بێتەوە پێشەوە تەماشای چاوانی کە..."

لەو بەینەدا عەلی چکۆڵ پێیان گەیشتەوە. ئەوانیش قسەکەیان بە ناتەواوی بەجێ هێشت.

حەمەد دەستی لە شانی عەلی چکۆڵ دا:

"باشە, کاك عەلی چکۆڵ, ئاوا؟..."

عەلی چکۆڵ لێوی دەلەرزین:

"بەڵێ... ئاوا..."

وەك سەرخۆشان بەلادا هات. مات ببوو. لەسەر گردەکە چەند دارە گوێز هەبوون. داری پیر... گەیشتنە بن دارەکان.

جەبار:

"ئێوە بخەون. ئەمن ئێشك دەکێشم."

راکشان و نووستن.

بە نۆرە نووستن و هەستان. کاتێك وەخەبەر هاتن, ئێوارە بوو. لە سپییەقەڵا ڕا بەرەو "ئاندیری" بایان دایەوە. ئێرە بەردەڵان بوو. پاشان گەیشتنە کاجستانێك. کاجەکان وا پاڵیان وێك دابوو, پڵینگ نەیدەتوانی بە نێویان دا رابری. هەمو جێیەك بۆنی پنگ و جاترە کێویلەی لێدەهات. دەنگی چۆرە چۆری ئاوێ هەموو جێیەکی پڕ کردبوو. جار بەجار دەنگی کۆترە باریکەیەك بەرز دەبووەوە.

جەبار:

"خەریکە بگەینە "بەردە شەهێن"."

عەلیچکۆڵ:

"بەڵێ... سبەینێ بەیانی دەگەینە لای کالایجی. قەرارە لە چیای کۆنوور لە پەنا "کانی شینکێ" چاوەڕێمان بێ."

حەمەد ددانی لە چیڕەوە بردن. بەڵام پێشی خۆی گرت. حەمەد هەرچەند بیری دەکردەوە نەیدەزانی کالایجی بۆچی داوی بۆ داناوە. فکری شێوابوو. عەبدیخانی وەبیر دەهاتەوە. بەڵام نەیدەتوانی ئەو دوو کەسە پێکەوە پەیوەند بدا.

عەلی چکۆڵ:

"ئێوە لێرە بحەسێنەوە. با ئەمن بچم خەبەریان پێ بدەم."

گوتیان:

"ئەتۆ برۆ."

هەردووکیان دانیشتن و پاڵیان بە دارێکەوە دا.

حەمەد:

"ئەتۆ چۆنی تێدەگەی جەبار؟... لەوانەیە وەبەر دەسڕێژمان دەن؟."

جەبار:

"نا بابە... هەتا چەند بەرخمان بۆ سەر نەبڕن و بۆمان نەکەنە کەباب, نامانکوژن."

حەمەد:

"راست دەکەی. کالایجی غیرەتی ئەوەی نیە بەم جۆرە لەگەڵمان بەرەوڕوو بێ. ئەگەر ئەمە ئەو وەسمان کالایجیە بێ کە ئێمە بیستوومانەو زانیومانە, هەتا تفەنگەکانمان لێ وەرنەگرێ, کاری پێمان نیە. ئەو دەیەوێ لەسەر سفرەی بمانکوژێ. بەڵام ئەمن دەمەوێ بزانم بۆچی نەخشەی کوشتنی ئێمەی کێشاوە."

جەبار:

"زانینی زۆر ئاسانە. ئەو پیاوی عەلیسەفابەگە."

حەمەد:

"باشە؟..."

جەبار:

"عەلی سەفابەگیش..."

حەمەد:

"نا بابە..."

جەبار:

"بەڕاستی ئافەریم بۆ ئەقڵت. ئەوانە سەگی یەکترن... تێگەیشتی؟."

حەمەد:

"تێگەیشتم."

جەبار:

"چی دیکەی تێدا بەستە نیە."

نیزیك نیوەڕۆ بوو کە عەلی چکۆڵ هاتەوە.

هەستان. بەرەو کانی شینکێ وەڕێ کەوتن. کاتێك گەیشتنە خوارەوەی کانی شینکێ, لە دوور کالایجی دەرکەوت. بۆ لای وان دەهات. دیار بوو زۆر وریای خۆیەتی. حەمەد خۆی لە عەرزی داو کالایجیی وەبەر دەسرێژ دا. لە پشتەوەش دەنگێك هات:

"ئای کوژرام."

حەمەد ئاوڕی دایەوە. جەباریش لە عەلیچکۆڵی دابوو. عەلی چکۆڵ لە خوێنی خۆی دا گەوزی.

جەبار:

"حەقی خۆی بوو. هەتا ئاخری ڕاوەستام بۆ ئەوەی بۆخۆی وەزمان بێ و گیانی خۆی بکڕێتەوە."

حەمەد بە داخ و خەفەتەوە گوتی:

"کالایجی ون بوو. پێم وایە پەلەم کردو ئەم هەنگاوت."

پاشان بانگی کرد:

"کالایجی... ئەگەر تۆسقاڵێك پیاوەتیت هەیە, وەرە پێش. مەترسە, سەگی عەلیسەفابەگ, پیاوکوژ, حەرامزادە, وەرەپێش..."

جەباریش ئەڕاندی:

"پێت وابوو لەبەرت هەڵدێین؟ ئەگەر پیاوی وەرە پێش."

لەولای ڕا جوابێك نەبوو.

تاوێك دواتر لەچواردەوریان دەنگی تەقە بەرز بوو.

حەمەد پێکەنی:

"کالایجی غیرەتی هاتەوە بەر. ئێستا نیشانت دەدەم."

هەتا نیوەشەوێ شەڕی کرد.

## (٢٠)

داوێکی ناپیاوانه که کالاێجی به دهستووری عەبدیخان و عەلیسەفابەگ بۆ حەمەدۆکی نابووەوە، رزگاربی حەمەدۆك لەو داوه بێ ئەوەی دڵۆپە خوێنێك لە لووتی هاتبێ، برینـدار بوونی کالاێجی و کوژرانی دوو کەس له داروودەستەکەی، بە خێرایی لە قەدیرلیـیەوه گەیشتە کووزان و لە جەیهانەوە گەیشتە ئەدەنەو عوسمانیەو سەرەنجام لە هەموو چوکووراوا گەڕا.

ئەم بەسەرهاتەی حەمەدۆك بە زیادەوەش لە چوکووراواو کێوەکانی تووڕووس دا زار بە زار دەگەڕا. هەمووان لایەنی حەمەدۆکیان دەگرت. خەڵکی دێهاتی کێوپارە کە لەو بەسەرهاتە ئاگادار ببوون، ئامادە بوون بە هەموو قیمەتێك لە حەمەدۆك بەرامبەر بە دوژمنەکانی دیفاع بکەن... بە هەر قیمەتێك.

خەڵك دەیانگوت:

"حەمەدۆك لاوێکی پاکە. حەمەدۆك سەرتاپای دڵە. هەتا خوێنی دایکی لە عەبدیخان نەستێنێ دەست هەڵناگرێ. ناشیەڵێ گوندی وایوای بە گەرووی عەلیسەفابەگ دا بچێتە خوار..."

شەڕی حەمەدۆك لەگەڵ کالاێجی، زیاتر لە هەموو جێیەك شوێنەواری لەسەر گوندی وایوای دانا. ئێوارە بوو کە ئەو خەبەرە گەیشتە وایوای. هەمووان دەستیان لە کار هەڵگرت، لە مەیدانی ئاوایی دا کۆ بوونەوە. دێهاتیـیەکان کەیفیان هەبوو. دێهاتیـیەکان پشتیوانێکیان بۆ پەیدا ببوو. دەیانگوت:

"حەمەدۆك لە پشتمانە..."

دێهاتیـیەکان وەجۆش هاتبوون. هەرکەس داستانێکی لەبارەی حەمەدۆکەوە دەگێڕایەوە. لە ماوەیەکی کورت دا حەمەدۆك لەسەر زارو زمانان بوو بە ئەفسانە. داستانی وا لەبارەی

قارەمانەتی و بەسەرهاتەکانی حەمەدۆکەوە زار بە زار دەگەڕا کە تەنانەت تەمەنی دە کەسیش بەشی نەدەکرد. بەڵام دێهاتییەکان حازر نەبوون دەست لە باوەڕی خۆیان هەڵگرن. حەمەدۆك لە راست کالایی و دوژمنانی وان ڕا هاتبوو. دوو ساڵ بوو دێهاتییەکان لەترسی کالایی نەیاندەوێرا لاق لە دێی بەرنەدەر. عەلیسەفابەگ زەوییەکانی یەك بە یەك لە دەست دەردێنان. دێهاتییەکان نەدەوێران بچنە شاری و شکایەت لە عەلیسەفابەگ بکەن. ئەگەر شەش مانگی دیکەش وا چووبایە، تەواوی زەوییەکان دەبوونە نی عەلیسەفابەگ و دێهاتییەکان هەموو دەبوونە کۆیلەی ئەو.

"وەسمانەزلە"، لە نێوەڕاستی گۆڕەپانەکە لەسەر بەردی چاڵاوێ دانیشتبوو. دەیگوت:

"حەمەدۆکی من... شەهێنی من..."

چی دیکەی نەدەگوت. تاوێك بێدەنگ دەبوو، سەرلەنوێ دەستی پێ دەکردەوە:

"حەمەدۆکی من... شەهێنی من..."

وەسمانەزلە پیرەپیاوێك بوو هەشتا ساڵە، ریوەڵە، چاوشین و بادامی و کۆسەکار، کە دە ـ پازدە مووش لە ریشی سپی ببوون.

وەسمانەزلە دە کوڕی رەشیدی هەبوون. کوڕەکانی و دێهاتییەکان دەوریان دابوو. هەر چاوەڕوان بوون بزانن ئەو دەڵێ چی. وەسمانەزلە جارێکی دیکەش دووپاتی کردەوە:

"حەمەدۆکی من... شەهێنی من..."

ئەمجار هەستایە سەرپێ و پرسی:

"شەهێنی من رێگر نیە، وا نیە؟."

گوتیان:

"چما ئەقڵ دەیگرێ حەمەدۆك رێگری بکا؟."

وەسمانەزلە:

"کوڕەکانم، ئەسپەکەم بۆ زین کەن. خەلکینە ئێوەش پووڵی کۆ وەکەن. هەرکەس هەرچەندی لە دەستی دێ. ئەمن دەمەوێ بچمە لای شەهێنمان. شەهێنم لەو کێوانە بێ پووڵە لەوانەیە پێویستی بێ. هەرکامێکتان چەند دەتوانن پووڵی دابنێن. دەمەوێ بچمە لای شەهێنم."

هەتاو کەوت. سەرانسەری خاکی چوکووراوا کەوتە بن هەڵمی شەونم. ئەسپی وەسمانەزلە لەنێو مژدا بەرەو چیاکانی تووروس لینگی دەدا...

"حەمەدۆکی خۆم... شەهێنی خۆم..."

بە سێ ڕۆژان خۆی گەیاندە ئاسیاب چەشە. وەختێك لە نێو دێی لە ئەسپەکەی دابەزی، ئەوەندە کفت و شەکەت بوو کە خەریك بوو بکەوێ. هەوساری ئەسپەکەی گرت و بە شەلەشەل بۆ نێوبەندی دێی وەڕێ کەوت. گەیشتە گۆڕەپانی نێودێ. ئەسپەکەی لە ئارەق دا شەلاڵ بوو.

هەناسەبڕکەی وێ کەوتبوو. گێژ بوو. منداڵەکانی ئاوەدانی دەستیان لە یاری کێشایەوەو لە دەوری پیری شەکەت کۆ بوونەوەو بە سەرسوڕمانەوە سەیریان کرد.

وەسمانەزلە پاش ئەوەی ئەختێك حەسایەوە، بانگی منداڵەکانی کرد:

"منداڵینە... وەرنەپێشێ بزانم."

منداڵەکان غاریان داو هاتنە لای.

ئەسپی مامەپیرە کە ئارەق لە چواریەلی دەچۆڕا، لاقی پێشەوەی کە بۆ لای بەر زگی هەڵێنابووەوە، دانایەوە عەرزی.

"ماڵی "عەلیەکەچەڵ" لە کوێیە، منداڵینە؟."

گەورەترین منداڵ هاتە پێشەوە:

"لەمێژە مردوە... هێشتا من لەدایك نەبووم کە مردوە."

وەسمانەزلە:

"باشە، ماڵی حەمەدۆك لە کوێیە؟."

هەر ئەو کوڕ جوابی دایەوە:

"مامە ئەتۆش ماشەڵڵا حەوسەڵەت هەیە!."

وەسمانەزلە تووڕە بوو و نەڕاندی:

"ئەم قسەیە چیە کوڕم؟... بۆ پێت سەیر بوو؟."

منداڵەکە:

"چما نەت زانیوە مامە؟... حەمەدۆك یاغی بووە."

وەسمانەزلە:

"ئەمن چووزانم ڕۆڵە گیان. ئەمن خەڵکی چوکووراوام. حەمەدۆك دایك و باب و کەس و کارێکی لەدێی دا نیە؟."

منداڵەکە:

"نچ."

وەسمانەزلە:

"ئەگەر حەمەدۆك دێتەوە، میوانی کێ دەبێ؟."
منداڵەکە:
"دەچێتە ماڵی مام عەلی دورمووش."
وەسمانەزلە:
"گوتت حەمەدۆك یاغی بووە؟."
منداڵەکە:
"ئەدی، یاغی بووە. جارێك هاتبووەوە ئاوایی... دەیگوت ئاغامانی کوشتوە... ئەودەم تەواوی مەزراو زەوییەکانی ئاغامانی، هەروەك ملکی بابی بێ، لەنێو دێهاتییەکان دا دابەش کرد... ئەدی مامە. دڕووەڵانەکانیشی سووتاند. ئاغامان دەیکوژێ. لەم دێیەدا هیچ کەس ئەوی خۆش ناوێ مامە... تەنیا مام عەلی دورمووش خۆشی دەوێ. ئاغامان ئەوی لە دێی دەردەکا، جا دەیبینی مامە."
وەسمانەزلە:
"ماڵی مامە عەلیت لە کوێیە رۆڵە گیان؟."
منداڵەکە بەسەر ماڵەکەی نیشان دا:
"هۆوەیە... لە هۆوێ."
وەسمانەزلە هەوساری ئەسپەکەی راکێشا. گەیشتە دەرکی ماڵێ دورمووش عەلی.
"میوانی خوام برا گیان."
دورمووش عەلی بە پشتی کۆمەوە بە توێی کراس و دەرپێیان هاتە دەر. ریشە سپییەکەی دەتگوت دەگاتە سەر ئەژنۆی:
"میوانی خوای بەخێر بێ... جێی لەبان سەرمە."
هەوساری ئەسپەکەی گرت و بردیە تەویلە.
لە ژووری ئاگر دایسا. ژوورەکە بۆنی کاو هەویرو تەپاڵەی لێ‌دەهات.
عەلی دورمووش هات و بەرامبەری میوانەکەی دانیشت. قوتووە توتنە زەلام و ژەنگاوییەکەی دەرهێناو لەپێش میوانی راگرت:
"بەخێراتی..."
وەسمانەزلە سەری بردە بن گوێی. بەسپایی و بە ترسەوە بە گوێی دا چپاند:
"وەرە پێش... گوێت بێنە پێش... خەبەرێکت لە حەمەدۆك هەیە یان نا؟... لە کوێ دەتوانم وەیبینم؟."

عەلی دورمووش بە قاقایەکەوە بۆلاندی:

"بۆ دەترسێی؟... بۆچی بە ترسەوە ناوی حەمەدۆك دێنی. مەگەر چ بووە؟..."

وەسمانەزلە:

"ئەمن چووزانم... ئەمن بە دوای شەهێنم دا دەگەڕێم، دەمەوێ سۆراغێکی حەمەدۆکی بزانم."

پاشان بە درێژی بۆی باس کردو گوتی کە بۆچی وەدوای حەمەدۆك کەوتوە. لەو نێوەدا ژنی عەلی دورمووشیش گوێی هەڵخستبوو.

وەسمانەزلە دیسان دووپاتی کردەوە:"حەمەدۆکی من، شەهێنی من."و قسەکەی تەواو کرد، "حەمەدۆکی من، شەهێنی من"ی کردبووە بنێشە خۆشە.

ژنە:

"حەمەدۆك، شەهێنەکەمان... ئەوە دەبینی، هەر ئەم ڕۆژانە عەبدیی دەکوژێ. ئەوە دەش بینی. پاشان دێتەوەو زەوییەکانی دەدا بە دێهاتییەکان، ئەگەر بزانی برای من، ئەو دێهاتییە بێناموسانە چ بەڵایەکیان بەسەر کوڕەکەم هێنا... با ڕۆژی بێ، ئەودەم دەبینی چۆن دەچمە نێوەڕاستی گۆڕەپان و چاوم دەقوڕمێنم و زارم دەکەمەوە. بۆخۆم دەزانم چ بەو بێ چاو و ڕووانە دەڵێم کە لاقی کوڕەکەمیان لە ئاوەدانیی بڕیەو هەرچی خراپە بوو لەگەڵیان کرد. بڕۆ برالە... بڕۆ حەمەدۆکی وەبینە، ئەگەر دێتەوە سڵاوی منیشی پێ بگەیەنە، با ئەو یەزیدەش بکوژێ، با عەلی سەفابەگیش بکوژێ. پێی بڵێ سەری کالاپچییش ببڕێ و بۆمنی بێنێتەوە چوکووراوا. بڵێ پوورت وای دەگوت، تێگەیشتی کاکە؟ سڵاوی منی پێ بگەیەنە، بڵێ پووری گیانت ئەمانەی لێت دەوێ."

عەلی دورمووش:

"لێی وەبڕە توخوا ئافرەت، لێی وەبڕە. با کاری میوانەکەمان وەڕێ خەین."

پیرێژن قەڵس بوو:

"بۆخۆت لێی وەبڕە."

عەلی دورمووش:

"بۆخۆم چ لێی وەبڕم."

ژنە:

"عەلییەشەل دەیەوێ بچێتە لای حەمەد. دەڵێ حەمەد لە "گەلێشکۆفە"یە. ئەو برایەشم بەڕێ بکە، با لەگەڵی بچێ."

عەلی دورمووش ترسابوو. پرسی:

"هەتا وێ ڕێی چەندە کچێ؟."

ژنە:

"دوورە... ئەدی چی؟."

وەسمانەزلە:

"کەوابێ ئەمشەو میوانتانم. سبەینێ دەڕۆین."

ژنە:

"ئەمشەو وەمێنی باشترە برام. ئەمنیش بە دوای عەلییەشەل دا دەنێرم. ئێستا بووەتە گزیری عەبدی. بەڵام ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە لە خۆمانە."

عەلی دورمووش چاوی لە ژنەکەی مۆڕ کردنەوە. ژنە بێدەنگ بوو.

پاشان لەپڕ دیتیان وەسمانەزلە پاڵی بە دیوارەوە داوە، سەری بەربووەتەوەو خەوی لێکەوتوە.

عەلی دورمووش پێکەنی. ژنەکەشی هەروا.

ژنە:

"پیرەپیاوی بەستەزمان... خوا دەزانێ چەند ڕۆژە بەرێگاوەیە."

عەلی دورمووش:

"خوا بۆخۆی دەزانێ."

## (٢١)

بە باریکە ڕێیەك دا بەرەو بەرزاییەکانی گەڵی شکۆفە دەڕۆیشتن. لە بەیانییەوە تا ئێستا وەسمانەزلە پەیتا پەیتا لە عەلییەشەلی دەپرسی:

"بڵێ بزانم، شەهێنم چۆن پیاوێکە؟."

هەموو جارێش عەلییەشەل وەڵامی دەدایەوە:

"چاوەکانی تا بڵێی گەورەن. مووی سەرو ریشی رەقن. روخساری رەش ئەسمەرە. چەنەگەی باریکە. رەنگی تاوەسووتە. دەستەپیاوە. دەرزیی بە یەکەو تفەنگ هەڵدەگرێ. ئازایە. پیاوە. ترس لە دڵی دا نیە. ئەگەر بزانێ دەشکوژرێ، رێگای خۆی بەرنادا."

وەسمانەزلە گوێی بۆ ئەم قسانە رادەگرت و لە فکرەوە دەچوو:

"باشە، بڵێ بزانم شەهێنم هەمیشە لەم کێوە دەبێ؟."

عەلییەشەل:

"نا... بەڵام وا دیارە ئەمساڵ دەیەوێ لێرە وەمێنێ. ئاخر گەڵی شکۆفە لە شار نیزیکە... دەزانی کە خەجیجیش لە بەندیخانە دایە. شایەتەکان قسەی خۆیان وەرگرتووەتەوە، بەڵام حکوومەت دیسانیش واز لە خەجیج ناهێنێ."

وەسمانەزلە:

"وەی شەهێنی خۆم... وەی حەمەدۆکی خۆم."

عەلییەشەل:

"ئەدی، وایە."

پاشان گەیشتنە مەیدانێکی سەوزو خۆش. دەتگوت گیای ئەو مەیدانەیان بە مەقەست بڕیوەتەوە. هەوری پاییزی لە ئاسمان دا دەسووڕان، هەوری رەش و سپی...

وەسمانەزلە:

"چەندمان ماوە بگەینە لای شەهێنم؟."

عەلی‌یەشەل بنارێکی نیشان دا. ئەم بنارە لێرەوارو بەردەڵان بوو:

"لە هۆوەیە."

وەسمانەزلە:

"حەزم دەکرد هەتا نەمردووم بە چاوی خۆم شەهێنەکەم ببینم."

عەلی‌یەشەل:

"دەی‌بینی ئیشەڵڵا."

لێرەواریان دەقەڵاشتەوەو دەچوونەپێش. لای ئێوارە گەیشتنە کۆختەیەك. عەلی‌یەشەل فیتووەکەی جارانی لێ‌دا. جەبار هاتە سەربانی.

عەلی بانگی کرد:

"جەبار... جەبار..."

جەباریش حەمەدی بانگ کرد:

"کاك حەمەد, وەرە بزانە کێ هاتوە."

حەمەدیش هاتە سەربانی:

"سڵاو عەلی ئاغا بەخێر بێی."

یەکتریان لە ئامێز گرت.

عەلی:

"دەبێ ببووری. زۆر لەمێژە دەمەوێ سەرێکت بدەم. هێندێ خەبەرم هەبوون دەبوو پێت بگەیەنم, بەڵام نەمتوانی. چەند باش لە داوی کالاێجی رزگاریت هات. بیستمان ئەو قەحبەیەش کوژراوە, عەلی‌چکۆڵی دەڵێم. باوەڕم نەدەکرد هێندە ناپیاو بێ. ئەمن لەو وەختەوە کە لە بێستانجیك بێستانەوان بوو دەیناسم."

وەختێك ئەمانە سەرگەرمی وتوویژ بوون, وەسمانەزلە لە پشتەوەیان راوەستابوو و لە سەرانسەری روخساری دا زەردەخەنەیەك دیار بوو. ئەسپەکەشی بە دوایەوە بوو و هەروەك هەمیشە پێشووی راستی بۆ لای زگی هەڵێنابوو. مووی لەشی ئەسپەکە لە ئارەق دا بریسکەیان دەدا.

حەمەد بە دەنگێکی زۆر نەوی لە عەلی‌یەشەلی پرسی:

"ئەمە کێیە؟."

عەلی‌یەشەل:

"دەڵێ خەڵکی گوندی وایوایە... هەمیشە باسی تۆ دەکا. دەڵێ دەمەوێ شەهێنەکەم ببینم."
حەمەدۆك بە ئەسپایی لێی نیزیك بووەوە, دەستی درێژ کرد:
بەخێراتی مامە."
وەسمانەزلە:
"سلاو کورِم... ناکا شەهێنی من ئەتۆ بی؟."
حەمەد:
"کێ؟."
وەسمانەزلە:
"حەمەدۆك."
حەمەد بە شەرمەوە زەردەیەکی کرد:
"خۆمم."
وەسمانەزلە بەگورج و گۆڵییەك کە چاوەڕوانیی لێنەدەکرا, حەمەدۆکی لە باوەش کردو دەستی کرد بە ماچ کردنی:
"حەمەدۆکی خۆم.... شەهێنی خۆم..."
هەم حەمەدۆکی ماچ دەکردو هەم دەگریا.
جەبار هات و مامەپیرەی لە حەمەد جیا کردەوە. پیرەپیاو هەر لەوێ لەسەر بەردێك دانیشت و سەری لەنێو هەردوو دەستانی گرت:
"حەمەدۆکی خۆم... شەهێنی خۆم..."
جەبار دووبارە هات. قۆڵی مامە پیرەی گرت و بردیە ژووری کۆختەکە. ژووری کۆختەکە هەمووی بە کەوڵە ورچ پڕ کرابووەوە. فیشەکدان و نارنجۆك و تفەنگەکان بە دارو دیوارەوە هەڵواسرابوون. دانیشتن. پیرە هەر دەیگوت:
"باوەڕ ناکەم کورِم... باوەڕ بە چاوی خۆم ناکەم. شەهێنی من تۆ بی؟ خۆتی؟."
حەمەد هەموو جارێ کە مامەپیرە ئەم قسانەی دەکرد, لە شەرمان سوور هەڵدەگەڕا.
پیرەپیاو:
"خۆتی... شەهێنی من خۆتی؟."
حەمەد:
"دەبێ ببووری مامە. ئێرە چیایە. قاوە دەست ناکەوێ."

وەسمانەزلە:

"شەهێنم خۆش بێ."

حەمەد کەمێك قەڵەو ببوو. سەر ڕوومەتی ڕەنگیان تێ گەڕابوو. سمێڵە ڕەشەکانی درێژ ببوون. سمێڵەکانی باریك بوون. سەروچاوی بەسامتر ببوون. حاڵەتێکی هەبوو دەتگوت هەمیشە ئامادەیە ئامبازی دوژمنی خۆی بێ و لەبەر یەکی هەڵدڕێ. ڕەنگە ڕەش ئەسمەرەکەی تاوەگازتر، تاریك تر و برژیوتر ببوو. بەژنیشی کەڵەگەت تر ببوو.

عەلیەشەل:

"لەو وەختەوە کە نەمدیوی..."

جەبار:

"خوا ماڵێ خەلکی گەلی شکۆفە ئاوەدان کا. زۆر باشمان پێ ڕادەگەن. لە خواردن و خۆراك کەمیمان نیە. حەمەد، ئاغاو کوێخاو حکوومەتی گەلی شکۆفەیە. ئێستا دێهاتێیەکانی گەلی شکۆفە قەت ناچنە لای حکوومەت. هەموو گیروگرفتەکانیان بە حەمەد دەڵێن و حەمەدیش پێیان ڕادەگا. حەمەدم هەتا بڵێی عادڵە... ئەدی کاك عەلی، لەوەتا تۆ نەتدیوین کارەکان بەم جۆرەن."

عەلیەشەل پێکەنی:

"چاك بوو لە چنگی کالاێجی ڕزگارتان بوو. ئەمن هەموو خەبەرەکانم بیست. بیستوومە کە عەبدی چووە خۆی هاویشتوەتە سەر کۆشی عەلی سەفابەگ و عەلی سەفابەگیش کالاێجیی بانگ کردوەو... بەکورتی هەموو خەبەرەکانم بیستوە. هاتم بت بینم، بەڵام نەم دیتیەوە. لە دڵی خۆم دا گوتم حەتمەن کالاێجی حەمەدی شرت وگوم کردوە. بەسەری خۆم دا داو ڕووم لە کێوو بیابان کرد. لە سێیەقەڵا بیستم لەگەڵ کالاێجی لە ڕاست یەك ڕا هاتوون و بریندارت کردوەو دوو کەسیشیان لێ کوژراون... لە خۆشیان کڵاوی خۆم هەڵاویشت. گەڕامەوە ئاوەدانی. هەروا گوێ قوڵاغ بووم، کە خەبەرێکی تۆ بزانم، هەتا بیستم کە لە گەلی شکۆفەی. ناو و نیشانی جێیەکەتم لە "گۆزە دووران" وەرگرت...

وەسمانەزلە:

"شەهێنی خۆم. ئەمن ڕاسپاردەی خەلکی وایوایم. کالاێجی سەگی عەلی سەفابەگە. لە گوندی دا کەس نەماوە گوللەی کالاێجیی وێ نەکەوتبێ. عەلی سەفابەگ زەوییەکانمان لێ دەستێنێ. بەڵام هاوار بەحاڵی ئەو کەسەی وەدوای حەقی خۆی بکەوێ، چونکە کالاێجیی دەنێرێتە سەرو دەیکوژێ. بیستمان کە..."

حەمەد ڕووی کردە عەلیەشەل:

"کەوابێ هەموو ئەم کارانە لەبن سەری عەبدیخان دان؟ وانیە عەلی؟... ئەمن هەستم کردبوو کە دەبێ وابێ."

وەسمانەزلە بە بێسەبری لەسەری ڕۆیشت:

"بیستمان کە شەهێنی خۆمان ئەو بێناموسەی برینـدار کـردوە... بریا کوشتبـاتایە... بریا ئەو کافرەت کوشتبایە شەهێنی خۆم."

حەمەد زۆر لە سەرەخۆو بێ پەلەقاژە وەڵامی دایەوە:

"دوێنێ بیستمان برینی کالایجی کاری خۆی کردوە. دەڵێن پاش چەند رۆژێك چووەتە جەهەننەم."

وەسمانەزلە هاتە نێو قسەی حەمەدەوەو دەستی کرد بە ماچ کردنی دەستەکانی:

"بەڕاستیتە شەهێنی خۆم؟... خوا بکا ڕاست بێ. ئەگەر وابێ زەوییەکانمان دەبنەوە بە ئی خۆمان. بەڕاستتە شەهێنەکەم؟."

حەمەد:

"ڕاستە مامە... ئەمنیش پێم سەیر بوو کە چۆن بوو نەمکوشت... چونکە باشم سێرە لێگرتبوو."

وەسمانەزلە:

"خوا بە مرادی خۆتت بگەیەنێ شەهێنەکەم, یارەبی ئامین..."

پاشان چوو لە تێرەکەی بوخچەیەکی دەرهێناو هێنای لە پێش حەمەدی دانا:

"شەهێنی خۆم, ئەمە دێهاتییەکان بۆیان ناردووی. خوایە شوکور. ڕێگام بدە ئەمن ئیدی بڕۆم. دەبێ بچم مزگێنی بەدێهاتییەکان بدەم. دەبێ لە دێی دا بیکەنە جێژن..."

بە پەلە هاتە دەرێ. هەوساری ئەسپەکەی لەدارێ کردەوە. خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکەی و هاتە بەر دەرکێ:

"بەخوام سپاردی شەهێنەکەم. دەبێ زووتر بگەمەوە دێی و مزگێنی بۆ دێهاتییەکان بەرم. مامە وەسمانت دیسان دێتەوە لات. خوا بتپارێزێ شەهێنەکەم, خواحافیز."

وەسمانەزلە ئاوزەنگیی لە ئەسپەکەی داو لینگی دا.

حەمەد:

"سەیرە..."

جەبار:

"سەیرە..."

عەلییەشەل:

"کورینه سەرم لێی دەرناچێ، بەخوا. ئەم... ئەم گەڵی شکۆفەتان چۆن دۆزیوەتەوە؟..."

حەمەد زەردەی هاتێ.

"دیومانەتەوە ئیدی..."

عەلیپەشەل:

"دێی ئێمە لە کوێ؟... ئێرە لە کوێ؟."

جەبار:

"ئێرە ئێرەیە کاك عەلی."

عەلیپەشەل:

"چۆن بوو رێتان کەوتە ئێرە؟."

حەمەد دیوارەکەی نیشان دا. سازێك بە دیوارەکەوە هەڵاوەسرابوو.

عەلیپەشەل:

"باشە... خۆ ئەمە هیچی لێ دەرنایە."

جەبار:

"بۆچی؟... هەر جۆرە دەنگێکت بوێ لێی دەردێ."

عەلیپەشەل لە جەباری توورە بوو:

"جەبار، سەرم مەخە سەر."

حەمەد:

"عەلی ئاغا... دەزانی ئەم سازە ئی کێیە؟... ئەم سازە ئی "عەلی بێچارە"یە، ئی ئاشق عەلی... لە "مازگاچ" تووشی بووین. لەسەر تەختە بەردێك دانیشتبوو، سازی لێدەدا. تفەنگەکەشی لەبەر دەمی لەسەر زەوی کەوتبوو. هاتە گەڵمان. لە یاغییە قەدیمەکانە."

جەبار:

"عەلی بێچارە ئاشقە... دەنگێکیشی هەیە هەر مەپرسە."

عەلیپەشەل:

"باشە تێگەیشتین. عەلی بێچارە هەم یاغییەو هەم ئاشقە، دەنگ و سەدایەکەشی زۆر بەناوبانگە. بەڵام ئێرەتان چۆن دۆزیەوە؟."

حەمەد:

"عەلی بێچارە خەڵکی ئەم گەڵی شکۆفەیەیە. خاڵەکانیشی زۆر پیاون. ئێستا تێگەیشتی عەلی ئاغا؟."

عەلی‌یەشەل:

"تێگەیشتم."

جەبار:

"عەلی بێچارە لە هەر کوێ بێ، ئێستا پەیدا دەبێتەوە. ئێستا دەبێ لەسەر چیای بێ. حەتمەن ئێستا گۆرانی دەڵێ. خوا دەزانێ ئێستا شیعری چۆن دەخوێنێتەوە. هەر بێتەوە، سازەکەی تاودەداتێ و دەست دەکا بە لێدان. وەزعی ئێمە ئاوایە کاک عەلی. خۆشی دەگوزەرێنین."

پاشان جەبار رووی کردە حەمەد:

"کاک حەمەد، ئەو بۆخچەیە بکەوە بزانم خەڵکی وایوای چی‌یان بۆ ناردووین."

حەمەد:

"با بزانین."

حەمەد لەسەرەخۆ بوخچەکەی کردەوە. بوخچەکە پڕ لە پووڵ بوو.

جەبار:

"ئەمە هەمووی پووڵە؟."

حەمەد:

"ئەدی... هەمووی پووڵە."

جەبار:

"دەوڵەمەند بووین."

حەمەد:

"ئەرێ."

جەبار:

"بژی مامە پیرە."

عەلی‌یەشەل:

"ئەمە بە دوای دا دێ. پێتان وانەبێ ئەو پیرەپیاوە بەو ئاسانی‌یە وازتان لێ‌دێنێ. ئێستا دەش بینن. پاش دوو مانگی دیکە دیسان لەنێو دێهاتی‌یەکان پووڵی کۆدەکاتەوەو دێتەوە. لەو جۆرە پیاوانەیە."

حەمەد:

"لەو بەدبەختانەیە. خوا دەزانێ عەلی‌سەفابەگ و کالایجی چەندیان زوڵم لێ‌کردوون."

عەلیپەشەل:

"ئێوە تازە خەمی پوولتّان نەبێ. گوندی وایوای وەك كێو لە پشتتان راوەستاوە."

جەبار:

"وەك كێو."

عەلیپەشەل:

"وەسمانەزلـە زۆری خـۆش ویـستی حەمـەد. ئەگـەر كـالاێجیش ئـەو هـەموو زولّمـەی لـێنەكردنایە، دیـسان دەهاتـە لات و پـوولّی بـۆ دێنـای. ئەمانـە وان. وەختێـك جارێـك پێـی گوتی:"حەمەدۆكی خۆم، شەهێنی خۆم"، ئیدی لە قسەی خۆی ناكشێتەوە. ئێستا ئەگەر بچیە مالّێی و سەری مندالّەكانی ببڕی، ئەگەر لە پێش چاوی خۆی سەری مندالّەكەی بـبڕی، دیـسان كاری پێت نیە، دیسان هیچت پێ نالّێ... ئەمانە ئەو جۆرە مرۆڤانەن."

جەبار:

"ئێستا كەوایە، دەكرێ بلّێین ئەگەر هەتا مردن یاغی بین، خوێنمان لە كەپۆی نایە."

عەلیپەشەل:

"قسەی خۆڕایی مەكە جەبار. پێت وایـە عەلیـسەفابەگ دەسـت لەسـەر دەسـت دادەنـێ و دادەنیشێ؟ كالایجی رووحی عەلیسەفابەگ بوو. ئێوە رووحتان لـێئەستاندوە. پێتـان وایـە لـە خوێنی كالایجیی خۆش دەبێ؟."

حەمەد:

"هەرچی لە دەستی بێ، دەیكا."

جەبار:

"ئەگەر لە دەستی بێ."

حەمەد:

"واز بێنە كاك جەبار. عەلی بێچارە گوتەنی: كامە رۆژ شەوی بەدوادا نایە؟."

لەو نێوەدا عەلی بێچارە كە تفەنگەكەی لاتـەولات لەسـەر شـانی دانـابوو، وەژوور كـەوت. راستەڕێ چووە سەر سازەكەی. سازەكەی لە دیواری كردەوە. هەر لەوێ دانیشت و دەسـتی كـرد بە قورمیش كردنی سـازەكەی. پاشـان لـەپڕ دەسـتی كـرد بـە گـۆرانی گـوتن. دەنگێكـی گـڕو ئەسـتووری هەبوو. دەتگوت دەنگی عەلی بێچارە نیە. دەتگوت ئـەم دەنگـە لـە سـالّە رێیـەك دوورترەوە دێ. دەتگوت ئەو دەنگە لە دوور، لە كێوان، لە چوكووراواو لە دەریـارە دێ. عـەلی بێچارە بەگۆرانی دەیگوت:

"وەرە دەرمان بکە زامی دڵی من
کە دنیا مەڵحەمی زامی دڵت بێ"
لە پاشان بۆخۆی بێدەنگ بوو و سازەکەی بۆی ئەستاندەوە:
"کە دنیا مەڵحەمی زامی دڵت بێ".
لە پاشان عەلی بێچارە دووبارە دەستی پێ کردەوە:
"لە دنیا دا بە بێ تۆ نیمە یارێك..."
قامکەکانی راوەستان. داهاتەوە سەر سازەکەی. وادیار بوو خەوی لێکەوتوە. لەنەکاو سەری هەڵبڕی. قامکەکانی بازیان دایەوە سەر ژێیەکان:
"ئەتۆی تەیری هەواو تۆی بەردی دڵ رەق".
وەك تۆفانێك سازی لێدەداو گۆرانیی دەگوت:
"عەلی بێچارەیە ناوم، مەپرسە
ئەمن ئەو ئاشقەم رۆژێکە ئەقڵم
کە سەد رۆژی رەبەق شێت و نەزانم
ئەمن ئەو رنووە بەفرەی کێو و شاخم
وەکوو ئاوی بەهاران دوور وڵاتم".
عەلی بێچارە بێدەنگ بوو. دەتگوت هەر لەو جێی لێی دانیشتوە چووك دەبێتەوەو لەنێو دەچێ. دەتگوت هەر لەو جێی لێی بووە، بووەتە بەردو ئیدی جووڵەی ناکا...
عەلی بێچارە سازەکەی بەئەسپایی لە سەر عەرزی دانا. حەمەدیش هەر لە جێی خۆی وشك ببوو. دیسان هەر ئەو برسکەیەی جاران هاتەوەو لە چاوەکانی خزی. دیسان هەر ئەو پەڵە تیشکە زەردەی برنجە لەسەری دا دەستی کرد بە سووڕان و پرپشك هاویشتن و دەشتی پڕ شۆقی چوکوورااوا لەبەر چاوی شەپۆلی دا.
حەمەد لە عەلیپەشەل نیزیك کەوتەوە:
"عەلی ئاغا."
عەلیپەشەل:
"چیە کاکە؟."
حەمەد بە چاو حاڵیی کرد کە بچنە دەرێ. عەلیپەشەل هەستاو رۆیشتە لای دەرگا. حەمەدیش هەستا. کاتێك ئەوان چوونە دەرێ، جەبار خۆی لە عەلی بێچارە نیزیك کردەوەو نقورچێکی تێکوتا. عەلی بێچارە وەهۆش هاتەوە:

"عەلی، بزانە دەڵێم چی عەلی."

عەلی بێچارە:

"چ بووە؟."

جەبار:

"حەمەد عەلی‌یەشەلی بردە دەرێ. تێ‌گەیشتی؟."

عەلی بێچارە پێکەنی:

"تێ‌گەیشتم."

جەبار:

"حەمەد شێت بووە. ئەقڵی لە سەری دا نیە. دەزانی ئێستا چ بە عەلی‌یەشەل دەڵێ؟ داوای لێ‌دەکا لەگەڵی بچێتە شاری. هەموو گەڵی شکۆفە دەزانێ. هەموو دێهاتی‌یەکان دەزانن. هەموو دێهاتی‌یەکان دەڵێن حەمەد دەیەوێ هەتا ماوە جارێکی دیکە بە چاوی خۆی خەجیجێ ببینێتەوە... ئەودەم ئیدی ئەگەر تەواوی تەمەنی لە زیندان دا بەرێتەی سەر، باکی نیە... هەموو دێهاتی‌یەکان دەڵێن حەمەد گوتوویە ئەگەر شار ناوریش بێ، خۆی تێ داوێم. هەموو دێهاتی‌یەکان دەزانن حەمەد چیەتی. حەمەد، هەروا بزانە بە خوێنی سەری خۆی تینوویە. ئەمن دەمەوێ پێشی بگرم، بەڵام ناکرێ. بە جۆرێك لێم مۆڕ دەبێتەوە دەڵێی دوژمنی ویم."

عەلی بێچارە:

"سەرخۆش دەبێ لێی گەڕێی هێندە بڕوا هەتا دەکەوێ."

جەبار:

"ئەگەر مەست بایە لێی دەگەڕام. بەڵام حەمەد پیاوە... ئەم کێوانە تا ئەمڕۆ پیاوی وەك حەمەدیان بەخۆوە نەدیوە... لەمەودواش نای‌بینن. ئەسڵەن بنیادەم نیە، یەك پارچە نوورە... دەڵێی پیاوچاکە."

لە دەرێ با، گاڵەی دەکرد. بایەکی شێت... هێندەی نەمابوو بەفر بباریێ. دەقیقەیەك لەمەوبەر تیپەنێك مراوی بەسەر کێوان دا تێ‌پەڕین. ئەگەر زستان داهات مراوی کۆچ بەرەوخوارێ دەکەن. هەوا بۆنی زستانی لێ‌دەهات. گەڵا باریك و تیژەکانی کاج لەبەر بای بەم لاو ئەولادا لار دەبوونەوە. حەمەد عەلی‌یەشەلی بردە بن دارکاجەکە:

"دانیشە عەلی ئاغا."

وەختێك عەلی چاوی بە روخساری حەمەد کەوت، سەری سوڕما. لێوەکانی دەلەرزین. بە نیگەرانی‌یەوە چاوەڕێ بوو کە حەمەد قسە بکا:

"حەمەد لە پەنا عەلی دانیشت:

"عەلی ئاغا. ئەتۆ پیاوێکی ئاقڵی. دەزانی کە هەر بەڵایەکی بەسەرم هاتوە, ئەتۆ باعیس بووی. بەڵام دەزانم کە نیازی خەراپەی منت نەبوو. دەزانم گوناحێکت نیەو پیاوێکی باشی."

عەلیپەشەل:

"خوا دەزانێ..."

حەمەد:

"گوێت لێبێ بزانە دەڵێم چی عەلی ئاغا."

عەلیپەشەل:

"فەرموو دڵم لێتە."

حەمەد چەند لەحزە هیچی نەگوت و فکری کردەوە. سەروچاوی رەش داگیرسابوو:

"ئەمن سبەینێ دەمەوێ بچمە لای خەجیج."

عەلی تێك رابوو:

"چی؟ چی؟..."

حەمەد بە دەنگێکی کاریگەرەوە دووپاتی کردەوە:

"ئەمن دەمەوێ سبەینێ بچمە لای خەجیج."

عەلیپەشەل:

"باشە..."

حەمەد:

"باشە نیە, دەبێ سبەینێ بچم."

عەلیپەشەل دەستی وەبەر چەنەگەی داو لە فکرەوە چوو. پاش ماوەیەك وە قسە هات:

"زۆر سەختە... زۆر... بە پێی خۆت بەرەو مردن دەچی."

روخساری حەمەد گرژ بوو. تێك چوو. رەش داگیرسا:

"مردنی خۆم قبووڵ کردوە. ئەجەلم هاتوە. دەزانم چیم لە نێوچاوانێ نووسراوە. بەڵام راست لە دڵم دا, راست لەنێوەڕاستی دڵم دا دەڵێی ئاگریان کردوەتەوە. دڵم دەڵێی گڕی گرتوەو دەسووتێ. دەڵێی خەریکن دڵم لە سینگم دەردێنن. دەبێ بچم. ئیدی تاقەتم نەماوە. سبەینێ لەگەڵ تاریك و روونی بەیانی دەبێ بڕۆم. دەمەوێ رێگای شاری..."

عەلیپەشەل پەڕییە نێو قسەکانی:

"باشه, ئەگەر لە گیر کەوتی چی؟... هیوای من و هەمووان, هیوای تەواوی خەلکی دێیەك ئەتێۆی."
حەمەد وەختێك ناوی دێی هاتە بەر گوێ, نێوچاوانی گرژ کرد:
هیوای دێیەك ئەمنم؟... کام دێ؟... کام دێ؟."
بە قینەوە تفێکی گەورەی لە زەوی کوتا.
عەلیپەشەل زۆر بە ئارامی وەڵامی دایەوە:
"ئەکەی کاك حەمەد. ئەم کارە دۆستان دەسووتێنێ و دوژمنان شاد دەکا.
دڵت لە دێهاتییەکان نەیەشێ. ئەوان لەترسان لایەنی ئاغای دەگرن. ئەگینا هەموویان دڵیان لەگەڵ تۆیە. هیوای دێ، هیوای هەر پێنج دێیەکەی خاردەشت بە تۆیە."
حەمەد بە لێبڕاوی جوابی دایەوە:
"ئەمن دەبێ بچم."
وەك سەرخۆشان بەلارە لار بەرەو چیا وەڕێکەوت. کێوەکان بۆنی شنەو بۆنی کاجیان لێدەهات...
عەلیپەشەل گێژ ببوو، هەستاو رۆیشتەوە ژووری.
جەبار بە نیگەرانییەوە لە عەلیپەشەلی پرسی:
"چی پێ گوتی کاك عەلی... حەمەد چی پێگوتی؟."
عەلیپەشەل:
"گوتی سبەینێ پێش دنیا رووناك بوون دەیەوێ بڕوا و بچێتە شاری."
جەبار هاواری کرد:
"بەخوا شێت بووە. دەبێ دەست و لاقی ببەستین. ئەگەر وەگیریان کەوێ دەیکوژن. دەبێ بیبەستینەوە. ئێستا بۆکوێ چوو؟."
عەلیپەشەل:
"حەمەد بەرەو چیا رۆیشت. دەتگوت سەرخۆشە. هەر بەلادا دەهات."
جەبار بەدوای حەمەد دا بەرەو چیا غاری دا. با، لك و پۆپی داری لێرەواری دەشکاند. هەوا بۆنی بەفری لێدەهات. دەتگوت هێندەی نەماوە بەفر بباری. هەورەکان رەش ببوون و لە ئاسمان دا تێك دەئالان. لەنەکاو هەموو لایەك تاریك بوو و دایهێنا. دڵۆپە بارانی زل زل هاتنەخواری.
حەمەدی لەژێر کاجێك کە لکە گەورەکانی تێك شکابوون، دۆزیەوە. حەمەد لەسەر موورە دارێك دانیشتبوو. جەبار چووە تەنیشت حەمەد. حەمەد لە فکر و خەیاڵی خۆی دا نوقم بوو. هیچ بەخۆی نەزانی کەسێك هاتوەتەلای.

جەبار بەسپایی لە پەنا حەمەد دانیشت:

"مەکە برالە. کەس نەماوە نەیبیستبێ. هەموو گەڵی شکۆفە پێی زانیوە. ئەو خەبەرە حەتمەن گەیشتوەتە شاریش. بەخوا دەتگرن. وەرە مەردی خوا بە دەست لەم فکرە هەڵگرە."

حەمەد سەری هەڵبڕی و تەماشای چاوی جەباری کرد:

"راست دەکەی جەبار. حەقی تۆیە. بەڵام وەرە لەمن بپرسە. وەرە حاڵی دڵی من بزانە. دەڵێی دڵیان گرتووم و ڕای دەپازنن. ئیدی ناتوانم برالە. ناتوانم بەبێ خەجیج بژیم. ئەگەر خەجیجێ نەبینم، بڵێی و نەڵێی دەمرم. ئێستا کە هەر دەبێ بمرم، با خەجیجێ ببینم و بمرم... ئەتۆ برایەتییەکی دیکەم لەگەڵ دەکەی جەبار؟."

جەبار:

"هیچ کارێك نیە بۆتی نەکەم حەمەد. بە یەکترمان گوت براو برایەوە. هەتا مردن لەگەڵتم کاکە گیان."

حەمەد:

"کەوایە دەستێکم جلکە کۆن بۆ پەیدا بکە... تەنیا ئەوەندەم لەتۆ دەوێ."

جەبار جوابی نەدایەوە. سەری داخست.

## (٢٢)

لای ئێوارێ بوو کە وەسمانە زلە بە لینگدان گەیشتە شاری. لالەغاوەو لیوزی ئەسپەکەی نوقمی کەف بوون. لە نێوەراستی بازاڕی لە ئەسپەکەی دابەزی. ئەم سەر و ئەو سەری بازاڕی کرد. دەگەیشتە هەر کەس سلاوی لێدەکرد. بە دەم هەموانەوە پێدەکەنی.

هەموو خەلکی شاری لە کوژرانی کالایچی ئاگادار ببوون. هەموو تێگەیشتبوون کە وەسمانەزلە بۆچی وا بە پێکەنینەوە چاك و خۆشی لەگەڵ هەمووان دەکا.

پاشان چەند جاری دیکەش ئەم سەر ئەو سەری بازار گەڕا. چاوەکانی بە دوای کەسێك دا دەگەڕان. بەڵام نەیدەدۆزیەوە. لە بازاڕی هاتەدەرو بۆلای چۆمی وەڕێ کەوت. گەیشتە پێش قاوەخانەی تۆفیق ئاغا. لەپێش ئەسپەکەی بە روخساری سوور هەلگەڕاو و دەستی لەرزۆکەوە، وەك پەیکەرێك راوەستا. پاشان نێوچاوانی بە شووشە پەنجەرەی قاوەخانەکەوە ناو تەماشای ژوورێی کرد. چاوی بە عەبدیخان کەوت کە لە قوژبنێك دانیشتبوو. خۆشحاڵ بوو. ئەسپەکەی لە مەیدانەکەدا لە داری ئەقاقیا خست و چووە ژووری قاوەخانە. هات لەسەر سەری عەبدیخان راوەستا. وەختێك عەبدیخان سەری هەلبڕی، چاوی بە روخساری سوورهەلگەڕاو و دەستە لەرزۆکەکانی وەسمانەزلە کەوت. کاتێك چاویان تێك هەڵنەنگوت وەسمانەزلە زەردەیەکی هاتێ. عەبدیخان رەنگی پەڕی. وەسمانە زلە بە دەنگێکی زۆر بەرز گوتی:

"سەلاموووو عەلێکوووم."

پاشان بێئەوەی چاوەڕوانی جوابی سلاوەکەی بێ، پشتی لە عەبدیخان کرد و رۆیشت عەبدیخان بەزاری داپچڕاوەوە تەماشای دوورکەوتنەوەی ئەوی کرد. وەسمانەزلە ئەسپەکەی لە دار ئەقاقیا کردەوەو سوار بوو و لینگی دا بەرەو وایوای. لە شارێڕا بۆ وایوای دوو سەعاتە رێیە.

دوای ئەوەی وەسمانە زلە لە قاوەخانە وەدەرکەوت، عەبدیخان کەوتە پەلەقاژە. دەترسا. لەترسان لە هیچ جێیەك بەند نەدەبوو. دەمانچە دەسك سەدەفەکەی بە کەلەکەی راستیەوە بوو. هەمیشە دەستی راستی لەسەر دەسکی دەمانچەکەی بوو. تەنانەت کاتێك نەردێنی دەکرد، پوولی دەژمارد یان نانی دەخوارد... ئەو هەمیشەو لە هەموو جێیەك چاوەڕوانی دوژمنێکی نادیار بوو.

عەبدیخان خێرا هەڵستاو بە غاردان رۆیشتە لای ئەحمەد ئاغای سیاسەتبازی عەریزە نووس.

ئەحمەد ئاغای سیاسەتباز کابرایەکی سەیر بوو. خۆشیش بوو. ئەگەر قسەی دەکرد دەتگوت تەلیسێکیان گوێز دەزاری کردوون و ڕای دەتلەکێنن. ئەحمەد ئاغای سیاسەتباز دوژمنی بابەکوشتەی فەخرییە شێت بوو، هەر لەو کاتەش دا نۆکەری ئەڵقە لە گوێی عەلیسەفابەگ بوو. سیاسەتباز لەژێر سێبەری کالایچی دا کار نەبوو نەیکاو کار نەبوو نەیباتە پێش. ئەویش بەخەبەری کوژرانی کالایچی ئاگری گرتبوو.

عەبدی خان هەر بەو پەلە پەلە هاتە ژووری دوکانەکەی ئەحمەد ئاغا:

"بنووسە ئەحمەد ئاغا... بنووسە ئەگەر حکوومەت حکوومەتە، دەبێ نیشان بدا کە حکوومەتە... راست وەك پێم گوتی بینووسە... بنووسە لەو کێو و بەندەنانە لە ترسی یاغییان کەس ناوێرێ هاتوچۆ بکا... بنووسە لەبن هەر دەوەنێك حکوومەتێك دروست بووە... ئەو جۆرە کە پێت دەڵێم بینووسە ئەحمەد ئاغا... بنووسە منداڵی پازدە ساڵەش وەکێوان کەوتوون. راست ئەو جۆرە کە پێت دەڵێم بنووسە... بنووسە دێهاتی دەسووتێنن، بنووسە هەر وەخت کەیفیان لێبێ، دێنە نێو شاریش. بنووسە گیان و ماڵمان لە مەترسی دایە ئەحمەد ئاغا... راست ئەو جۆرەی من دەڵێم بنووسە... بنووسە ئیدی ژنانیش دەستیان داوەتە چەك. بنووسە خەریکن رادەپەڕن... بنووسە کە قانوون هەر لەسەر کاغەز قانوونە. ئەو جۆرە کەپێت دەڵێم بینووسە ئەحمەد ئاغا... هەتا دەتوانی بنووسە... بنوووسە کە حکوومەت دەبێ لەشکری پیادەنیزام بنێرێ و ئەوانە خاشەبڕ بکا... راست وەك پێت دەڵێم وای بنووسە."

سەرو چاوی تاڵ و تاریکی ئەحمەد ئاغا تاڵتر بوون. کڵاو گەرگەرییە رەشەکەی لەسەر سەری هەڵگرت و لەسەر مێزەکەی دانا. دەسرۆکەیەکی لە گیرفانی دەرێنا و نارەقەی نێو چاوانی پێ وشك کردەوەو پرسی:

"دەبێ ئەمانە بنووسم؟."

عەبدی خان:

"پیت بە پیت و وشە بە وشە...ڕاست ئەوەی کە گوتم بینووسە ئەحمەد ئاغا... بنووسە ئەم ژاندارمانە پێیان ناوێرن. ئەم ژاندارمانە قوونەبانی ئەوەیان نیە دەرۆستی ئەمانە بێن. لەشکرێك لەو ژاندارمانە دەرەقەتی حەمەدۆك نایە، ئەوانی دیکەش لەوێ ڕاوەستن. بنووسە خەریکن شۆرش دەکەن. بنووسە خەریکن ڕادەپەڕن. بنووسە یاغیەك... کوڕێکی بیست ساڵە کە لە ماڵی خۆم دا گەورە بووە... حەمەدۆکی دەڵێم ئاغا... ئەو جۆرە کە دەیڵێم بینووسە... بنووسە کە حەمەدۆك دەچێ مەزراکانی من لەنێو دێهاتیەکان دا دابەش دەکا... بنووسە کە مەزراکانی من، زەویەکانی من لەنێو نۆکەرەکانم دا، لەنێو ڕەعیەتەکانم دا دابەش دەکا... بنووسە خەریکە هەر پێنج دێیەکەم دابەش دەکا... بنووسە کە ئەمن لەترسان ناوێرم بێمە شاریش... بەرامبەر بە ئیدارەی ژاندارمری خانووم گرتوە. تەلیسە خیزم لە پشتی پەنجەرەکان داناون... لەترسی گوللە... بنووسە کە کولاورۆژنەکانیشم گرتوون... لە ترسی نارنجۆکان. بنووسە کە دوێنێ هاتبوو لە ماڵێ خۆم دا کە بەرامبەر بە ئیدارەی ژاندارمریە بمکوژێ. ئەگەر پێمان نەزانیبایە، ئەگەر زوو وەدەست نەهاتباینایە، ماڵەکەمی بە دینامیت دەتەقاند. ڕاست ئەو جۆرەی کە پێم گوتی بینووسە ئەحمەدئاغا...بنووسە حەمەدۆك گوتوویە هەموو شارەکە بە دینامیتان هەڵدەتەکێنم... تێدەگەی ئەحمەدئاغا... تەواوی شارەکە... ئەو جۆرە کە پێم گوتی بینووسە... ڕاست ئەو جۆرە کە گوتم."

ئەحمەد ئاغای سیاسەتباز بە گریانەوە جوابی دایەوە:

"ئاخر ئەمن چۆن ئەمانە بنووسم؟... دەستم وەبەر ساتۆر دەدەن... ئێستا دامنا نووسیم، ئاخر ئابڕووی شارەکەمان دەچێ. دڵم نایە شارەکەمان بەدناو بکەم. ئێستا ئەگەر کالایی ڕۆیشتوە، عەلیسەفابەگ خۆش بێ. ئاخرەکەی فکرێك دەکاتەوەو دەستەیەکی دیکە ساز دەکا. عەلیسەفابەگ ڕازی نابێ عەریزەی وا بۆ حکوومەت بنووسم."

عەبدیخان دەرهەڵبوو:

"ئەتۆ، چ دەڵێم بە قسەی من بکە... بنووسە، هەر ئەو جۆرە کە گوتم."

سیاسەتباز:

"ئاخر ئەمن نا..."

عەبدی خان:

"هەرچی پێم گوتی بینووسە برام... بینووسە."

ئەحمەد ئاغای سیاسەتباز:

"ناتوانم بینووسم."

عەبدی خان تووڕە بوو و هەستا:

"کەوابێ دەچمە لای فەخری خان، ئێستا دەیبینی ئەو چۆنی دەنووسێ."

ئەحمەد ئاغای سیاسەتباز:

"دەیدەی بە هەرکەس بیدەیە بۆت بنووسێ، بەلاّم خێرت بۆ ناکا."

عەبدی خان راستەڕێ چووە لای فەخری خان. فەخری خان زۆر دوور دەنگی لاقی ئەوی بیست و سەری لەسەر مێزەکەی هەلگرت.

# (٢٣)

شاخی"بەردە شەهێن" لەولای گەڵی شکۆفەیە. ئەو شاخە کێوێکە لە بەردی لووس و رەق. نووك تیژ و زەردوما گەیوەتە ئاسمان. بەردە شەهێن ناوی لە ئەفسانەکانیش دا هەیە. لە زۆر داستانان دا باسی کراوە. لەبارەی ئەو شاخەوە زۆر داستانیان گێڕاونەوە...

سەرچاوەیەك لەسەر سینگی بەردە شەهێن هەڵدەقوڵێ و دەڕژێتە خوار. ئەو کانییەش پێی دەڵێن سەرچاوەی بەردە شەهێن. چوار دەوری کانی شەهێن دارو درەختە. دارەکانی ئێرە سەوز و چکۆڵەن. پنگی بۆنخۆش دەوراندەوری کانییەکەی گرتوە. لە بەرزایی، لە جێگایەك بە بەرزیی سێ دار سپیداری زۆر بڵیند، لە سەرەوژێری بەردە شەهێن عەتر دەبارێ. ئاوێکی کەفاوی لەو سەرەوە، لە سنگی وەك دیواری بەردە شەهێن هەڵدەڕژێتە خوار.

دەڵێن قەدیم لاوێك هەبوو. ئەم لاوە شەهێنی زۆر خۆش دەویستن. کون و ئەشکەوتەکانی لای سەرەوەی بەردە شەهێن هێلانەی شەهێنانە. ئەم لاوە کاتێك شەهێنەکان جووچکە هەڵدێنن، دەیەوێ جووچکە شەهێنێك بگرێ. هێلانە شەهێنەکە لەنێو قەدی ئەو زەردومایەیە. نە دەتوانێ لە بەرەوەڕا وەسەر کەوێ و بگاتە هێلانە شەهێنەکەو نە بۆشی دەکرێ لە نووکی شاخەکەوە بێتە خوارێ. لاوەکە تەنافێکی درێژو ئەستوور دەدۆزێتەوە, سەری تەنافەکە لە سەرەوەی بەردەشەهێن بە دارێکەوە دەبەستێ و بە تەنافەکەدا بۆ لای هێلانە شەهێنەکە دێتە خوار. جووچکە شەهێنەکە لە هێلانەی دەردێنێ و لە باخەڵی دەنێ. لەو نێوەدا دایکی جووچکەکان پێ دەزانێ. بە رق هەستاوی خۆی بە بەردەشەهێن دادەدا. بەباڵ وەك شمشێر لە تەنافەکە دەداو دەیبڕێتەوە. لاوەکە بەو جووچکە شەهێنەوە کە لە باخەڵی دا دەبێ, لە شاخی بەردەشەهێن بەردەبێتەوەو هەپروون بە هەپروون دەبێ.

هەر بۆیە بەم کێوە دەڵێن بەردەشەهێن.

حەمەد کە هەر شەوێ وەرێ کەوتبوو، ئێستا گەیشتبووە بن بەردە شەهێن و دانیشتبوو بەسێتەوە کە هەستی پێیەکی هاتە بەرگوێ. ئاوڕی دایەوە، جەباری دیت کە بە دوایەوەو تەماشای دەکا. چۆڕ چۆڕ ئارەق لە سینگە کولکنەکەی هەڵدەڕژا.

جەبار ماوەیەکی زۆر هەر لەو جێی لێی بوو راوەستا. حەمەدیش سەری داخستبوو تەماشای عەرزی دەکرد.

پاشان جەبار هات لەپەنای حەمەد دانیشت. بە ئارامی دەستی درێژ کردو دەستی حەمەدی گرت. چەند جار دەستی حەمەدی گوشی. حەمەد گوێی نەدایەو هەروا بێدەنگ مایەوە.

جەبار بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وەقسە هات:

"کاکە..."

ئەوەندە دۆستانەو دڵسۆزانە بانگی کرد کە حەمەد نەیتوانی ئاوڕی وەسەر نەداتەوە.

جەبار دەستی حەمەدی لەنێو دەستی خۆی گرت و پاڕایەوە:

"کاکە... مەکە..."

حەمەد بە داخ و خەفەتەوە سەری راوەشاند:

"ئەتۆش ناتوانی لە دەردی من حاڵی بی براکەم... ئەمن ئەگەر بمرم زۆر باشترە."

جەبار دەتگوت دەناڵێنێ:

"حەمەدی خۆم... من لە دەردی تۆ حاڵیم. بەڵام ئێستا وەختی نیە. دەردی تۆ دەردی منیشە برای خۆم."

حەمەد:

"کەوابوو، پێشم پێ مەگرە کاکە جەبار. ئەمن دەچمە لای خەجیجەکەم. ئەگەر گرتیانم ئەوە لە چارەم نووسراوە. ئەگەر دەگیریش نەکەوتم کە..."

پاشان رقی هەستاو نێوچاوانی تێك نا:

"کەس ناتوانێ بمگرێ."

جەبار:

"ئەتۆ خەریکی بە دەستی خۆت دەستبەند لە دەستی خۆت دەکەی براڵە. ئەگەر یەکێك بت بینێ و بتناسێ چارە چیە؟... عەبدیخانیش لە شارێیە. ئەگەر بت بینێ چی؟..."

ئەو بریسکەیەی خزیبووە چاوەکانی حەمەدەوە گەورەتر بوو:

"بزانین چارەنووس چۆنی دێنێ... ناتوانن من بگرن."

جەبار:

"کەوایە خێرت بێتەرێ... برۆ خوات لەگەڵ."

حەمەد:

"بەخوام سپاردی براگیان."

جەبار:

"سێ ڕۆژان لە ماڵی "تەمیرە کوردە" چاوەڕێت دەبم. ئەگەر هەتا سێ ڕۆژان پەیدا نەبوویەوە، دڵنیا دەبم کە گیراوی."

حەمەد:

"باشە کاکە."

حەمەد هەستاو وەڕێ کەوت.

حەمەد دوور دەکەوتەوە. جەبار هەتا ئەو جێگایە کە حەمەدی لێدیار بوو، لە پشتەوەڕا تەماشای کرد. لە دڵی خۆی دا هەر دەیگوت:

"ئەتۆش بۆی دەرچووی حەمەدۆك... بە ڕێیەك دا ڕۆیشتی کە گەڕانەوەی تێدا نیە... ئەم کێوانە تازە ناتوانن حەمەدۆکێکی دیکە بە خۆوە ببینن... وەیش..."

حەمەدۆك لە گوندی گەڵی شکۆفە جووتێك کاڵەو دەستێك جلکی کوڕانەی بۆ پەیدا ببوو، جلکی کوڕێکی پازدە ساڵە.

جلەکان دەستچن بوون. بە دەزوو چنرابوون. چاکەتەکەی بە توێکڵە هەنار ڕەنگ کرابوو. پانتۆڵەکەی سپی و چلکن بوو. دڕابووش. جلەکان زۆر بە بەری تەنگ بوون. حەمەد لەو جلانەدا زۆر چووکتر ببووەوە. دەتگوت لەت کراوە. گۆپاڵێکی ئەستووری شوانانەشی بە دەستەوە گرتبوو. کڵاو تەپلەیەکی لەسەر نابوو. شەپکەی کڵاوەکەشی لێ‌ببووەوە. دەمانچەکەو یەدەگەکانی لەبن پانتۆڵەکەیەوە لە لاقی بەستبوون. قایشەکەشیانی لە پشتێنی قایم کردبوو.

دەتگوت دەفڕێ. چاوی هیچیان نەدەدی. سەری لە گێژەوە دەچوو. دەتگوت لە هەوایەکی بەتاڵ دا دەگەڕێ. دنیا لە پێش چاوی پاك ببووەوە.

لای نیوەشەوێ گەیشتە نیزیك شاری. لە گەڕەکەکانەوە دەنگی وەڕینی سەگەل دەهات. دەبوو چ بکا؟ ئەگەر بەو نیوەشەوە چووبایە نێو شار، کاروانسەرایەکی دەست نەدەکەوت لێی وەمێنێ. لەوانەش بوو دەستی کەوێ. لە لای بەرەوەی خۆی گوێی لە دەنگی ناشێك بوو.

گەڕایەوە. بەرەو لای ئاشی وەڕێ کەوت. دەنگی ئاشەکە هێندە بڵیند بوو گوێی پیاوی کەڕ دەکرد. بۆنی ئاردی گەرم لە دوورەوە هاتە بەر لووتی.

سبەینێ هەینی بوو. ڕۆژی چاوپێکەوتنی زیندانیەیان... بەلایەکی گەورە لەسەر ڕێگای بوو: دایکی خەجیجێ. بیستبووی کە هەموو هەینووان دایکی خەجیج دەچێتە سەردانی کچەکەی و خەبەری ئەویش بۆ خەجیجێ دەبا. بیستبووی کە دایکی خەجیج داستانی سەیرو باوەڕ پێنەکراو لەبارەی ئەوەوە ساز دەکاو بە خەجیجیان دەڵێ، بەلام نەك شتی خەراپ... شتی باش. گۆیا داستانی ئاور تێبەردانی درووەلانەکانی خاردەشتیشی زۆر گەورە کردبووەوەو گەیاندبوویەوە گوێی خەجیج، هەروا مەسەلەی دابەش کردنی زەوی و زارەکەی عەبدیخان... بیستبووی کە بە خەجیجێی گوتوە:"حەمەد ئەوەندە کەڵەگەت بووە هەر مەپرسە... قەدی دەڵێی منارەیە. گۆیا خەجیجیش زۆری پێ خۆش بووە... زیندانیش ئیدی بۆ ئەو زیندان نەبووەو بۆی بووەتە بەهەشت... خەجیج هەموو سەعاتان جارێك ئامێزی لە ئیراز داوەو لە ماچان دا نوقمی کردوە...

لەو ڕۆژەشەوە کە حەمەد لە گەڵی شکۆفە نیشتەجێ ببوو، بە ڕێك و پێکی خەبەرو پووڵی بۆ ناردبوو...

جەواڵە ئاردی تۆزاوی بە پەنای یەکەوە هەڵپەسێرابوون. چوار بەرداشی زەلام دەسووڕان. لە هەر چوار لایانەوە ئارد لووزەوی دەبەست. دەنگی ئەو ئاوە کە ئاشەکەی پێ دەگەڕا، بە هەموو لایەك دا بلاو دەبووەوە. ئاشەوانەکە پیاوێك بوو ڕیش ماش و برنجی، ئارد سەرتاپای لەشیی سپی کردبوو. یازدە کەس لادێیی لەنێوبەندی ئاشخانەکەدا ئاگریان کردبووەوەو لە چواردەوری دانیشتبوون.

حەمەد هاتە ژوورێ و سلاوی کرد. ئەوانیش جێیان بۆ کردەوەو خولقیان کرد. حەمەد لە نێویان دانیشت. ئەوانیش سەرلەنوێ قسەکانی خۆیان دەست پێکردەوە. ئەوان تا ماوەیەك هیچ ئاگایان لە حەمەد نەبوو. باسی زەوی و زارو بەرهەم و هەژاری و کۆڵەمەرگیی خۆیانیان دەکرد. لە بارەی بازرگانێکەوە کە لە بەندەنێ وشترملی کەوتبووە گیری یاغییەکان و ڕووتیان کردبوو، باسیان دەکرد. هێندێکیان پێیان وابوو ئەو کارە کاری حەمەدۆکە. ناوی حەمەدۆك هەموو کاتێك مەسەلەی دابەش کردنی زەوی و زارەکەی ئاسیاب چەشمەی وەبیر خەڵك دەهێنایەوە. ئێستاش هەروا بوو. یەکێك لەوان کە لە هەمووان پیرتر بوو، دەیگوت:

"ئێستا لەوە گەڕێ. بلێ ئەتۆ زەوییەکانت دابەش کرد، بەهەرحاڵ، بەلام شێتی سەگباب، درووەلانەکەت بۆچی سووتاند؟..."

ئەوانی دیکە لەبارەی سووتاندنی درووەڵانەکەی خاردەشتەوە داستانی وایان دەگێڕایەوە کە بە ئەقڵی کەس دا نەدەهات. حەمەد لە داخان هەر خۆی دەخواردەوە. هێندەی نەمابوو دەرهەڵ بێ. لەدڵی خۆی دا جنێوی دەدان. هیچ کام لەوانە لە نەسڵی مەسەلەو هۆیەکانی نەدەدوان. وادیار بوو هەر بە ئەقڵیان دا نەدەهات. حەمەد رقەکەی نیشتەوە. لە دڵی خۆی دا پێکەنی. دێهاتی‌یەکی چوکووراوا چووزانێ درووەڵانی چەقڵەشینکە یانی چی. چووزانێ ئەو بەڵایە چ بەڵایەکە؟

پاشان دێهاتی‌یەکان هەر کەسە لە جێی خۆی، خۆیان مات کردو خەویان لێ‌کەوت. حەمەدیش هەروا. وەختێك وەخەبەر هات کە هەتاو بڵیند ببوو. یەکێك لە دێهاتی‌یەکان لە ژوور سەری راوەستابوو و دەیگوت:

"هەستە رۆڵە گیان هەستە. هەتاو گەرم بووە. ئیدی بەسە هەستە. لەبن پێی ولاغان دا دەپلیشێیەوە، یاڵڵا کوڕم، هەستە."

حەمەد وەخەبەر هات. هەستا. بە پەلە بۆ لای شاری وەڕێ کەوت. گەیشتە شاری. چووە بازاڕی. گەیشتە نێوەڕاستی بازاڕ. بازاڕ هەروەك جاری پێشوو دیتبووی، وابوو. شەربەت فرۆشەکە، بۆشکە برنجەیی‌یەکەی بە کۆڵەوە بوو و لەنێو بازاڕی دا سەروخواری دەکرد. حاجی کوورە بە کەیف بوو. خەریکی ناڵ کوتانەوە بوو. کاتێك حەمەد بە پەنای دا رادەبرد، حاجی کوورە لەبەر خۆیەوە گۆرانیی کووزان تۆغلیی دەگوت. دووکەڵی کەباب لە کەبابخانەکان دەهاتەدەر. ژنە دێهاتی‌یەکان بە پانتۆڵی رەشەوە ئەم دوکان و ئەو دوکانیان دەکرد.

حەمەد بە ترس و تێبینی‌یەوە لە نیزیك باغی شارداری بانگی کابرایەکی لادێیی کرد کە خەریك بوو پێ هەڵڵا دەچوو. لێی پرسی:

"بەندیخانە لە کام لایە؟."

کابرای دێهاتی:

"ئەم کۆڵانە بگرەو برۆ. برۆ ژووری ئەو دەروازە بەردینە."

حەمەد چووە ژووری دەروازە بەردینەکە. گوردانێك ژاندارمە بەڕیز خەبەردار راوەستابوون و چاوەڕوانی وەکیل باشی‌یەکەیان بوون. لە دیتنی ئەو هەموو ژاندارمەیە بەسەر یەکەوە حاڵەتێکی تایبەتیی بۆ پەیدا بوو. وادیار بوو دڵی پێی دەگوت غار داو بگەڕێتەوە چیاکان. هیچ وەخت لە هیچ جێگایەك ئەوەندە دڵی تەنگ نەببوو. لە پێشەوەو لە لای راستی ژاندارمەکان چاوی بە خانوویەکی نزم و بێ پەنجەرە کەوت. دیواری ئەو خانووە سەرووی هێنابوو. دووسێ ژنی دێهاتی لەبن ئەو خانووە دانیشتبوون و چاوەڕێ بوون. حەمەد بە چاکی خۆی کۆم کردەوەو کوشم هەڵات. ئێستا زۆر چووکتر دیار بوو. ئێشك گرێك لەسەر بانی پیاسەی دەکرد. حەمەد تێ‌گەیشت زیندان

لیرەیە. حەمەد زۆری چیرۆك و داستان لەبارەی زیندانەوە بیستبوون. ئەم خانووە راست وەك ئەو زیندانانە دەچوو کە لە چیرۆکەکان دا بیستبووی. لەسەرەخۆ بۆ لای خانووەکە چوو:

"هەر ئەو ئێشك گرە تووڕەو تۆسنە، وەك ژەهرەمار لێی ترش و تاڵ بوو:

"چت دەوێ کوڕە؟."

حەمەد خۆی فەقیرۆکە کردو بە دەنگێکی وەك گریانەوە جوابی دایەوە:

"خوشکم زیندانییە."

ئێشك گر بە دەنگێکی زبرەوە پرسی:

"خەجیجێ دەڵێی؟."

حەمەد ملی بە لاوە نا:

"ئا..."

ئێشك گر بۆ لای ژووریێ هاواری کرد:

"خەجیج... خەجیج، برات هاتوە."

خەجیج بە بیستنی ناوی برا رەق بوو. بەسپایی هاتە دەرێ. بۆ لای حەمەد چوو. حەمەد رەنگی وەك بەفر سپی ببوو. هەر لەوێ لەبن دیواری دانیشتبوو.

ئێشك گر:

"ئێرە، ئێرە، لێرەیە."

کاتێك خەجیج چاوی بە حەمەد کەوت، لاقی سست بوون. هەر لە جێی خۆی رەق راما. نە جووڵەیەکی کردو نە دەنگێکی لەبەر دەرهات. پاشان بە لاتسیاو لاتسیاو هات و لە پەنای حەمەدی لەبن دیوار دانیشت. خەجیج دەتگوت تەواو بووە. ماوەیەکی زۆر هەروا لە پەنای یەکتر مانەوە. دەتگوت لاڵ بوون. هەروا تەماشای چاوی یەکتریان دەکردو قسەیان نەدەکرد. ئیرازیش هات. سەری لە وەزعی خەجیجێ سوڕما. سەری لەو بێدەنگییەیان دەرنەچوو.

لە حەمەدی نیزیك کەوتەوە:

"بەخێراتی کوڕی باش."

حەمەد لە وەڵام دا لەبن لێوانەوە شتێکی گوت کە کەس لێی حاڵی نەبوو. ئیراز ئەمەشی هەر زۆر پێ سەیر بوو.

لای نیوەڕۆیە ئێشك گرەکە هات. نەڕاندی:

"ئیدی بەسە. یاڵلا بچنەوە ژووریێ."

حەمەد هەروا ئارام, هەر بەو ئارامی و سەنگینی‌یە کە پێی هاتبوو, هەستاو پوولێك کە لە دەسرۆکەیەکیەوە پێچابوو لە کۆشی خەجیجێی هاویشت و ڕۆیشت. هەتا لە دەروازە بەردەکە چووەدەر, خەجیجیش لە جێی خۆی ڕاوەستابوو و لە پشتەوەڕا تەماشای دەکرد.

ئیراز:

"چ خەبەرە کچێ؟... ئەوە کێ بوو؟."

خەجیج ناڵاندی:

"با بچینە ژووری پووری... وەرە بچینە ژووری."

وەختێك چوونە ژووری, خەجیج خێرا خۆی لەنێو جێیەکەی هاویشت. ئیراز گێژ ببوو:

"چتە کچم؟."

خەجیج:

"حەمەدۆك..."

ئیراز:

"چی؟... کێ؟..."

خەجیج:

"ئەو کوڕە حەمەدۆك بوو."

ئیراز بە سەری خۆیدا دا:

"ڕەبی کوێر بم... خوایە کوێرم کەی... بۆچی چاکم تەماشای ڕوخساری شێرەپیاوەکەمان نەکرد؟... خوایە ئەم چاوانەم کوێر بن و لە کاولی بێنە دەر."

بێدەنگ بوون. پاشان هەردوو ژن بە چاوی پڕ فرمێسکەوە یەکتریان لە ئامێز گرت.

خەجیج:

"دەچینە بۆرگیر..."

ئیراز:

"ماڵەکەمان..."

خەجیج:

"سواغەکەی بە خەنە دەکەم پووره ئیراز... پووره ئیراز, بەخوا نایەڵم دەست لە ڕەش و سپی بدەی."

ئیراز:

"ماڵەکە ئی هەموومانە. دەبێ هەموومان زەحمەتەکەی بکێشین."

لەم ڕۆژانەدا دەرگایەکی تازەی هیوا لەزیندانی‌یەکان کرابووەوە. باسی لێبووردنی گشتی دەکرا. کەس نەیدەزانی کام نوێنەری پارلمان خستبوویە سەر زارو زمانان کە ئەو ڕۆژانە دەچێتە ئەنکەرەو لە مەجلیس دا لەبارەی لێبووردنی گشتی‌یەوە قسە دەکا. بەو جۆرە کە ئەو گوتبووی هەتا یەك دوو مانگی دیکە بەشێکی زۆریان وەبەر لێبووردنی گشتی دەکەوتن. زیندانی‌یەکان لەسەر لێبووردنی گشتی زۆر شێعریان دانابوون و زۆر ئاوازیان ساز کردبوون.

زیندان شەو و ڕۆژ بە گۆرانی‌یەکانی لێبووردنی گشتی و ئەو جۆرە گۆرانی‌یانە دەهاتە لەرزین.

لە زیندان پیرەپیاوێك هەبوو بەناوی ئاغا مستەفا کە مێشکی زیندانی‌یەکان بوو. پیاوێکی دنیادیدەو ئاقڵ بوو. هەموویانی ڕێنوێنی و ئامۆژگاری دەکرد. خەجیج هەموو ڕۆژێ دەچووە لای ئاغا مستەفاو دەیپرسی:

"مام مستەفا، لێبووردنی گشتی حەمەدۆکی منیش دەگرێتەوە یان نا؟."

ئاغا مستەفا وەڵامی دەدایەوە:

"نەك هەر حەمەد، هەموو مەخلوقی خوای دەگرێتەوە... لە تەیری ئاسمان ڕا بگرە هەتا گورگی بیابان، هەموو عەفوو دەکرێن."

خەجیج خۆشحاڵ دەبوو. شەو و ڕۆژ خۆشحاڵ بوو.

خاکی دەشتی یۆرگیر گەرم و بەرپێژەوە.

خەجیج هەمیشە وەزعی یۆرگیری لەو زیندانی‌یانە دەپرسی کە ئەو نێوە نێوە شارەزا بوون. بۆیە ئێستا هەموو دێهات و کەلێن و قوژبنی یۆرگیری لەبەرچاو بوو.

خەجیج دەیگوت:

"ئێمە لە "بەردەڕەش" خانوو دروست دەکەین، وانیە پوورە ئیراز؟."

ئیراز وەڵامی دەدایەوە:

"ئەدی، لە بەردەڕەش."

خەجیج دیسان دەهاتە دەرێ و دەچووە لای زیندانی پیاوان و بانگی دەکرد:

"مام مستەفا."

ئاغا مستەفا بە دەنگێکی پڕ لە لاواندنەوەو خۆشەویستی‌یەوە جوابی دەدایەوە:

"چ باسە، کچە شێتەکە."

ئەمەی دەگوت و دەهاتە بەر دەرگا، و هەرچەند دەیزانی خەجیج چ پرسیارێکی هەیە، دەیپرسی:

"چیە کچە شێتەکە."

خەجیج دەیپرسی:
"مام مستەفا، حەمەدیش؟."
ئاغا مستەفاش هەروەك هەمیشە جوابی دەدایەوە:
"لە تەیری ئاسمان ڕا بگرە هەتا گورگی بیابان، هەرچی مەخلوقی لەو کێوانە هەیە... وەختێك لێبووردنی گشتی دەربچێ، ئاوا دەردەچێ... حکوومەت دەیەوێ بە سلامەتیی خۆی فەرمانی لێبووردنی گشتی دەربکا."
خەجیج وەك هەمیشە دەیگوت:
"دەستەکانت ماچ دەکەم مام مستەفا."
مام مستەفاش وەك جاران پێدەکەنی و دەیگوت:
"کیژی شێتۆکە..." و دەگەڕایەوە بەندی خۆیان.
ئیراز:
"دەیانەوێ ڕۆژی چوار شەممە بمانبەنە کووزان. دەڵێن دادگای ئێرە ناتوانێ حوکمی ئێمە بدا... خوا بکا، هەتا ئەو ڕۆژە لێبووردنی گشتی دەرچێ و بە خۆڕایی نەمانبەنە کووزان... دڵم زۆر ناڕەحەتە، وەختە..."
خەجیج لەسەر دڵی بوو بە خەفەت:
"خوابکا... حەمەدیش ناتوانێ بێتە کووزان. بریا ئەوێ ڕۆژێ بە حەمەدم گوتبایە... بەڵام زمانم گیرابوو پووریێ، دەتگوت لاڵبووم."
ئیراز:
"ئەگەر ئەمن زانیبام ئەوە حەمەدە..."
خەجیج:
"لێبووردنی گشتی نیزیکە."
ئیراز:
"ئاغا مستەفا ماشەڵڵا زۆر ئاقڵە. ئەو ئاگای لە هەموو شتێك هەیە. دەڵێن لە ئەنکەرەش پیاوی هەن و خەبەری بۆ دەنێرن."
خەجیج:
"ئەمڕۆ هەینوویە. چەند ڕۆژمان ماوە بۆ چوار شەممە..."
پاشان بە قامکەکانی دەستی کرد بە ژماردن:

"شەممە، یەك شەممە... پێنج ڕۆژمان ماوە بۆ چوار شەممە پوورە نیراز. بریا لەبیرم بایە بە حەمەد بڵێم کە چوار شەممەی لێرەمان ڕادەگوێزن... بریا پێم بگوتایە."

نیراز:

"ئەگەر ئەمن زانیبام حەمەدۆکی خۆمانە، دەسبەجێ پێم دەگوت."

خەجیج:

"پووری...، ئەتۆ بڵێی لێبووردنی گشتی دەربچێ؟."

نیراز:

"ئاغا مستەفا ماشەڵڵا زۆر ئاقڵە. لە ئەنکەرەش پیاوی هەن. ئەدی دەردەچێ. ئاغا مستەفا خەبەری لە هەموو شتێك هەیە."

خەجیج:

"دەمەوێ ئەو بۆیەی لەبەر دەرگاکەمانی دەچەقێنم شۆڕابەی بگاتەوە سەر زەوی."

نیراز:

"دەگاتێ."

خەجیج:

"گوێلکەکانمان ساڵ بە ساڵ زیاتر دەبن..."



وەختێك حەمەد لە زیندان هاتە دەرێ باڵی گرت. سەری لە گێژەوە دەچوو. چاوی بە جۆرێك لە خێڵەکەوە دەهاتن کە خەریك بوو بکەوێ. هاتە بازاڕێ. بە زەحمەت خۆی گەیاندە سەر سەکۆیەك و دانیشت. پاش تاوێك هاتەوە سەرەخۆ. لەبەر دەرکی دوکانێك پرتەقاڵیان هەڵڕشتبوون. لە سووچێکی دیکە کەلەمیان لەسەریەك دانابوون، وەك تەپۆلکەی چووك چووك... لەسەر سەکۆ بەردینەکە هەستا چووەلای نێوەندی بازاڕەکە. تاپۆرایەکی زۆر لە قاوەخانەی تۆفیق ئاغا دانیشتبوون. زۆربەیان عەبایان بەسەر شانەوە بوو و پێمەڕەکانیان بە شانیانەوە نابوو. پیاوێکی کورتە باڵا ئەوانی دیکەی وەبەر جنێوان دابوو. پێی سەیر بوو. لە دڵی خۆی دا گوتی:"لێرەش ئاغاو رەعیەتی هەیە."هەر لەوێ چاوەڕێ بوو. پیاوە کورتە باڵاکە هەروا جنێوی دەدان. ئەوانی دیکەش دەنگیان دەرنەدەهات. سەریان داخستبوو و موویان لێنەدەبزووت. پاشان ئەو پیاوەی جوێنەکانی دەدا لەپڕ نەرم بوو و گوتی:

"برایان... ئێوە بۆمن لە گیانیشم خۆشەویست ترن."

حەمەد سەر سوڕمانەکەی دوو چەندان بوو. سەری لەو کارە دەرنەدەچوو. پیاوە پێمەڕە بە شانەکان هەر بەو جۆرە کە سەریان داخستبوو، لەسەرەخۆ هەستان و بۆلای رووبار وەرێ کەوتن. چەند کەس گوتیان:

"دەچن بۆ مەرەزەجاڕ."

حەمەد دیسان سەرسوڕمانەکەی زیاتر بوو. چووە نێویەندی بازاڕی. دووکەڵی کەباب راست لەو جێیە کە جاری پێشوو کەبابی لێخوارد بوو، لە دوکانێ هاتەدەر. چووە ژووورێ.

بە بۆنی کەبابەکە دڵی پێك دا هات.

شاگرد کەبابچی کە چاوی بە مشتەری کەوت، هاواری کرد:

"باوەشێن..."

حەمەد بە شاگرد کەبابچییەکە:

"ئەختێك زوو کاکە گیان."

شاگرد کەبابچی هاواری کرد:

"خێراتری باوەشێن بکە..."

حەمەد وەختێك ئاوڕی دایەوە دوای خۆی، راچەنی، ترسا، نەیدەویست باوەڕ بەچاوی خۆی بکا. ئەو کەسەی راست لە پشتەوەی خۆی دانیشتبوو عەلیەشەل بوو. ئەمە خەون و خەیاڵ نەبوو. عەلیەشەل خۆی بوو کە بەدەمیەوە پێدەکەنی. چەندیش خانینانە... حەمەد هیچی نەگوت. لە یەك لەحزەدا هەزار فکری بە دڵ دا هات. عەلیەشەل هیچی نەدەگوت. هەروا تەماشای دەکرد و زەردەی دەهاتێ. عەلیەشەل هەستاو هات لەسەر سەندەڵیەکی بەتاڵ کە لە تەنیشت حەمەدەوە هەبوو، دانیشت. خۆی خوارکردەوەو بە گوێی حەمەدی داچپاند:

"مەترسە هیچ نەبووە. دوایە قسان دەکەین."

کەبابەکەیان بۆ هێنان. خواردیان و هەستان هاتنەدەر. شەربەت فرۆش کووپە برنجەیییەکەی بە کۆڵیدا دابوو و لە نێوەڕاستی بازاڕی دا سەرو خواری دەکرد.

حەمەد:

"کاکی شەربەت فرۆش... شەربەتێکم بدەیە."

کاتێك شەربەت فرۆشەکە شەربەتی بۆ حەمەد تێدەکرد، حەمەد دەستی درێژ کرد و بەسەر کووپەکەی دا هێنا. شەربەت فرۆشەکە پێکەنینی هات:

"زێڕە کوڕی باش، زێڕە."

عەلی‌یەشەل:

"لە جەبارم بیست کە هاتوویە شار. ئەمنیش سوار بووم، شەوێ هاتم گوتم نەکا خوانەخواستە بەڵایەکت بەسەر بێ... لەبەر دەروازەی بەندیخانە زۆرت چاوەڕێ بووم. خەجیج چۆنە؟ ئیشەڵلا باشە. چما ئەتۆ شێت بووی حەمەد؟ چما دەکرێ پیاو بە پێیان بێتە شاری. ئەگەر خوانەخواستە پێیزانن کە ئەتۆ لێرەی و وەدوات کەون، چۆن خۆت دەرباز دەکەی؟ بۆیە ئەسپم بۆ هێناوی و بەدوات دادەگەڕێم تا ئەگەر خوانەکردە ناسیانی بتوانی سوار بی و خۆت بگەیەنیەوە شاخی..."

حەمەد چاوی پڕ بوون لە فرمێسك:

"بژی عەلی ئاغا، هەر خۆش بی."

عەلی:

"خوا بکا ئەتۆ هەمیشە هەر بژی... چونکە حەمەدۆك ئەتۆی."

حەمەد:

"شتێکت پێ‌بڵێم برالە؟."

عەلی:

"فەرموو کاکەگیان."

حەمەد:

"لەگەڵ خەجیجێ رووبەرووی یەکتر دانیشتین. بەڵام هەردووکمان زمانمان بەسترا. نەمانتوانی یەك وشەش پێکەوە بدوێین. هەر دڵم بەرایی نادا خەجیجێ لەو ژوورەدا ببینم. ئەمن ئیدی لەوێ ناچمەوە لای، ئەگەر بچم دیسان زمانم لاڵ دەبێ... ئەتۆ بچوو بزانە قسەیەکی هەیە یان نا؟."

عەلی:

"باشە... ئەتۆ لە قاوەخانەی نێو بازاڕی چاوەڕێم بە. ئەسپەکەم لەوسەری بازاڕی لە دارەتووێك خستوە... خۆی باوێ سەرو..."

حەمەد:

"باشە کاکە."

شتێکی نادیاری وەك ترس و لەرزی لە دڵدا بوو. دەتگوت شتێکی ساردوسڕ بەنێو موورەگەی پشتی‌دا دێ و دەچێ. ئۆقرەی لێ‌هەڵگیرابوو. دەتگوت کەوتوەتە جێیەکەوە کە جێی نابێتەوە. دەیەویست ڕابکا، هێندێك شت بشکێنێ و لەت و پەتیان کا. هەستێکی وەك

ترس و غەم لە دڵی دا دەگەڕا. یەك تەكان... خێرا خۆی گەیاندە ئەسپەكە. ئەوانەی چاویان لێی بوو، بەسەر سوڕمانەوە تەماشای ئەو منداڵە دێهاتییەیان دەكرد كە بە گێژو كاسی لە ڕووبەڕووی ئەوانەوە تێپەڕی. پووشكە كا بە لمبۆزی ئەسپەكەوە نووسابوون. دەسكە گیایەكی ڕنیەوەو لمبۆزی ئەسپەكەی پاك كردەوە. ئەسپەكەی ڕەنگ خۆڵەمێشینە بوو. خاڵە درشتەكانی ئاماڵ شین بوون. ئەو خاڵانە هەتا لە كەفەڵی نزیكتر دەبوونەوە، ڕەنگێكی خەنەییان دەگرت. دەستێكی بەسەری حەیوانەكەدا هێنار هاتە قاوەخانە. چای داواكرد. چایان بۆ هێنا. خەجیجی هاتەوە پێش چاو. خەجیج زۆر گۆڕابوو. روخساری زەرد ببوو. بەرە چاوی گنجیان تێكەوتبوو، بەڵام سەروچاوی قەڵەوتر ببوون. دیار بوو زۆر شەكەت و بێزارە. حەمەد دڵی نارەحەت بوو. چەند دڵۆپ فرمێسك لە چاوەكانی بەربوونەوەو كەوتنە سەر مێزەكە، بەڵام وەك ئەوە دەچوو كە هەردەم دەیەوێ هەڵستێ. چایەكەی خواردەوە. بە نیگەرانی چاوەڕێی عەلی بوو. چاوی لە ڕێیەوە بڕیبوو. سەر و سەكوتی عەلی لەسەری كۆڵانێ وەدەركەوت. عەلی بە كەیف نەبوو. رووگرژ بوو. حەمەد بە پیریەوە چوو. هەردووكیان بۆلای ئەو جێیە چوون كە ئەسپەكەیان لێ بەستبووەوە.

حەمەد:

"چی گوت؟."

عەلی:

"لێم مەپرسە."

حەمەد:

"ئاكا خەبەرێكی ناخۆشت پێیێ."

عەلی:

"خەبەرێكی خۆشم پێنیە."

حەمەد دڵی وەجۆش هاتبوو:

"بیلێ، بیلێ... هەر پێشێ دڵم خەبەری دابوو براكەم... دەزانم خەبەرێكی ناخۆشت پێیە... بیلێ."

عەلی:

"ئەم چوار شەممەیە دەیانەوێ خەجیجێ بەرنە كووزان. دەیانەوێ لە كووزان زیندانیی بكەن. خەجیج دەیگوت بە حەمەدی بلێ گەردنم ئازاكا. گوناهی خەجیجێ قورسە، یانی دادگای ئێرە وادەڵێ. ئێرازێش دەبەن."

ئەم خەبەرە لە پێش دا وەك بریسكەیەك لە حەمەدی دا. بەڵام تاوێك دواتر حەمەد خۆی كۆكردەوەو هۆشی هاتەوەبەر خۆی . عەلیی لەبیر چووبووەوە. لەبەر خۆیەوە زەردەی دەهاتێ. تەواوی دەشتی چوكووراوا بەدارو بەرد و گژو گیاوە بوو بە یەك پارچە تیشكی زەرد. پێكەنینەكەی هێشتا لەسەر لێوان بوو. پاشان لەپڕ خۆی هاویشتە سەر ئەسپەكە. لە یەك لەحزەدا گۆڕابوو. ببووە حەمەدۆكێكی دیكە:

"وەپێش كەوە عەلی ئاغا. تەواو بوو."

عەلی وەپێش كەوت. بەخێرایی لە شار دەركەوتن. بە دەشتی "هەزارگا"دا تێڕپەڕین و گەیشتنە دەوروبەری"دیكیرلی"، لای باغە پرتەقاڵەكەی كاراجالی وەستان.

عەلی جڵەوی ئەسپەكەی گرت و راوەستا. تەماشای چاوی حەمەدی كرد:

"چ بوو؟...چ تەواو بوو؟... بە منیش بڵێ."

حەمەد لە ئەسپەكەی دابەزی. بەزەردەخەنەوە دەستی عەلیی گرت:

"لەرێیە چاوەڕوان دەبم و خەجیجێ لەوانە دەستێنمەوە."

عەلی تووڕە بوو:

"ئەتۆ بەتەواوی شێت بووی... ئاخر بەرۆژی رووناك لە دەشتی چوكووراوا دەكرێ ئەو كچەی لەدەستی ژاندارمە دەربێنی؟..."

## (٢٤)

حەمەد وەك دنیایەك خۆشحاڵی وەژوور كەوت. جەبار لەو رۆژەوە كە حەمەدی ناسیبوو، قەت وا خۆشحاڵی نەدیتبوو. عەلی بێچارەش هەروا. حەمەد دەتگوت لە خۆشحاڵییان باڵی گرتووەو خەریكە دەفڕێ. جەبارو عەلی بێچارە ئەم وەزعەی حەمەدیان زۆر پێخۆش بوو. حەمەد لە ژوورێدا پیاسەی دەكردو گۆرانیی دەگوت:

" سێوە سوورەی هەوەڵ بەر

تامت خۆش بوو رەش ئەسمەر

دایكت لێفەی نەدا پێت

مەمەت دیارە سەرانسەر"

ئەگەر تاوێك پێشتر كەسێك پێی گوتبان حەمەد ئەو گۆرانیییانە دەزانێ، ئیمكانی نەبوو باوەڕ بكەن. حەمەد لە جێدا لەگەڵ ئەو شیعرو گۆرانیییانە نێوانی نەبوو.

حەمەد گوڕاندی:

"عەلی بێچارە... سازەكەت تاودەیەو كەمێك ئاهەنگی سەما لێدە."

بەڵام حەمەد هەمیشە وای قسە نەدەكرد. ئەو هەمیشە كەم دوێ و سەنگین بوو، و پاش هەڵسەنگاندن و لێكدانەوە قسەی دەكرد.

عەلی بێچارە بۆئەوەی قسەیەك بكا هەستا و چوو سازەكەی لە دیواری كردەوەو دەستی كرد بە لێدان و بە گوتنی گۆرانیی گشت. هەم سازی لێدەداو هەم گۆرانیی دەگوت:

"چووم و دیتم دەرگای ئاسن داخرابوو

بسكی رەشی شەوبوو زیوی تێدابوو"

حەمەدیش وێڕای عەلی بێچارە دەیگوت. چاوی بە عەلیەشەل کەوت کە لەبەر دەرگا ڕاوەستابوو، و جووڵەی نەدەکرد. بە عەلی بێچارەی گوت ئاهەنگێکی سەمای "هالای" لێ بدا. عەلی بێچارە دەستی کرد بە لێدان، ئەوانی دیکەش لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا دەستیان کرد بە سەما. پاشان حەمەد دەستی لە سەمایەکە هەڵگرت و لە پەنا دیواری دانیشت و پاڵی دایەوە. دەتگوت ئارام بوونەوەی نیە. بە قامکان سەمای دەکرد.

حەمەد بانگی جەباری کرد.

جەبار:

"فەرموو ئاغام."

حەمەد:

"ڕۆژێکەو ئەمڕۆ جەبار."

جەبار:

"چما خەبەرێك هەیە؟."

حەمەد:

"ئەمڕۆ ڕۆژەکەیە... ئەو ڕۆژە کەدەبێ نیشان بدەین چەند پیاوین."

جەبار:

"قسەکەت بکە حەمەد... دەتەوێ بڵێی چی؟."

حەمەد هەستا. ئەو جلکە منداڵانەیەی لەبەری کردبوون، دایکمندن و هاوینشتنیە قوڕنێك. جلەکانی خۆی لەبەر کردەوە. کەوشەکەی لە پێیدا بوو، لە چەرمی ئەستووری ماراش دروست کرابوو. سوورێکی تاریك بوو. پاژنەی کەوشەکەی لە لاستیکی ئوتومبێل بوو. پانتۆڵەکەی پارچەیەکی قایی ڕەنگ قاوەیی بوو. لە بازرگانێکیان ئەستاندبوو، کە بۆخۆیان ڕووتیان کردبوو. حەمەدو جەبار وەختێك لە شەڕی کالایی گەڕابوونەوە، چەند ڕۆژێکیان چەتەیی کردبوو، چەند کەسیان ڕووت کردبوو. ئەمەش بۆ ئەوەبوو کە پووڵ و جل و بەرگ و چەك و چۆڵە و فیشەکەکانیان تەواو بکەن. لەو تاڵانەی وەدەستیان کەوتبوو زۆر خۆشحاڵ بوون. دیسان دەیانویست بەندەنی ماراش ببەستن. قایش پشتێن و قایشە تفەنگەکانیان زیوکاری کرابوون. زۆر جوان و بە سەلیقەوەش...

پانتۆڵە قاوەییەکەی خەت خەتی ڕەشی تێدا بوون. ئەم پانتۆڵەو بەرگی دەمانچەکەی، کەریم ئۆغلی خانی یۆرووکەکان بۆی ناردبوون. بەرگی دەمانچەکەی گوڵدۆزییەکی زۆر جوان کرابوو.

فیشەکدانەکانی دووریز، ڕاست و چەپ لە خۆی دان. ئەو فیشەکدانانەش گوڵدۆزی کرابوون. ئەمانەش هەر دیاریی خانی یۆرووکەکان بوون.

جەبار بە نیگەرانی‌یەوە پرسی:

"چ باسە حەمەد؟... بۆ قسە ناکەی؟."

حەمەد:

"ڕۆژێکەو ئەمرێ..."

عەلی‌یەشەلیش لەبەر دەرگا دانیشتبوو پاڵی بە دیوارەوە دابوو، و پێدەکەنی.

جەبار:

"شەلە، تۆ بڵێ چ بووە."

عەلی‌یەشەل:

"ڕۆژی چوار شەممە دەیانەوێ خەجیجێ لە شاری ڕا بەرنە کووزان. دەیەوێ لە ڕێگادا لە ژاندارمەکانی بستێنێتەوە... خۆشحاڵی‌یەکەی هی ئەوەیە."

جەبار لێوی تەڕ نەکرد. نێو چاوانی تێك نا. عەلی بێچارەش هیچی نەگوت. ئەو هەر کاریشی بەو کارانە نەبوو.

حەمەد تێگەیشت. بەڵام وەسەرخۆی نەهێنا. ئەگەر جەبار دڵی یەشابایە پێی گرنگ نەبوو. ئەو لە هیچ کەس چاوەڕوانی یارمەتی نەبوو. ئەم قسانە بۆ ئەو لەمێژبوو حەل ببوون.

ڕۆژەکانی هەوەڵ کە لەگەڵ عەلی بێچارە ببوونە ئاشنا، عەلی بێچارە داستانێکی کوێر ئۆغلێی بۆ گێڕابوونەوە. داستانی پەیدا بوونی کوێر ئۆغلی.

چەند ڕۆژ بوو کوێر ئۆغلیی لەپێش چاوان بوو:

"حیکایەتخوان وا حیکایەت دەکا کە لە قەدیمی زەمان لە شاری بۆلۆ..."

داستانەکە بەو پێشەکی‌یەوە دەست پێدەکراو کورتەکەشی ئەوە بوو کە:

کوێر ئۆغلی تووتکە سەگێکی چکۆڵە لە کۆڵانێ دەبینێ. تووتکەکە هێندە چکۆڵە دەبێ، هەر هێندەی لەپەدەستێك. چوار۔ پێنج گۆڵەسەگ پەلاماری ئەو تووتکە چکۆڵەیە دەدەن و دەیخەنە بەر چنگ و ددان. بەڵام تووتکە چکۆڵەکە بە هیچ جۆر لە مەیدان دەرناچێ و دیفاع لە خۆی دەکا، سەرەنجامیش سەگە زەلامەکان دەشکێنێ و هەریەکەیان بۆ لایەك ڕاو دەنێ و بۆخۆشی لە ڕێی خۆی دەڕوا... کوێرئۆغلیش کە بۆخۆی چاوی لەو کارەساتە دەبێ، لەدڵی خۆی دا دەڵێ: هەیاران!... بڕوانە، تەنانەت تووتکە سەگێکی چکۆڵەش ئەگەر ئازابێ..."

ئیدی پاش ئەو ڕۆژەیە کە کوێرئۆغلی دەبێتە ئەو کوێرئۆغلی‌یە بێ‌پەروایە، کە پاش ئەوەی ئەو پێشهاتەش بۆ بابی دێتە پێش، ڕێگای کێو و شاخان دەگرێتە بەر.

داستانی کوڕێ ئۆغڵی سەرنجی حەمەدی باش ڕاکێشابوو. پاش بیستنی داستانی کوڕێ ئۆغڵی جارێکی دیکەش سوێندی خواردبوو کە عەبدیخان بکوژێ.

حەمەد:

"چتە کاك جەبار. بۆچی نێوچاوانت تێك ناوە؟."

جەبار:

"هیچ."

حەمەد:

"مەترسە. کارێکم لە تۆ ناوێ."

جەبار:

"هیچ."

حەمەد:

"هیچ چیە؟."

جەبار:

"هیچ."

حەمەد:

"باشە..."

جەبار:

"زگم پێت دەسووتێ حەمەد."

حەمەد ئەم قسەیەی پێ خۆش نەبوو:

"ئەتۆش کە هەمیشە زگت دەسووتێ."

جەبار:

"چونکە پیاوی حەمەد، چونکە زۆر جوامێری..."

حەمەد:

"باشە؟..."

جەبار:

"تۆ بلێی و نەلێی ئەمن ئاگر دەگرم."

حەمەد:

"پێم بڵێ بۆ؟."

جەبار دەهری بوو و نەڕاندی:

"دەتەوێ بە ڕۆژی ڕووناک، ئەویش لە دەشتێکی وەک چوکووڕاوادا ئەو کچەی لەدەستی ڕەوە ژاندارمەیەک دەربێنی، ها؟... ئەویش لە دەشتێکی پڕ لە دێ و ئاوەدانی... چوکووڕاوا تەڵەیە، تەڵە... تەڵەی یاغییان... هەر یاغییەک ڕێی دە چوکووڕاوا کەوتبێ، ئیدی ئەگەڕاوەتەوە... ئاور دەگرم. زگم پێت دەسووتێ. پاشان ئەتۆ چوکووڕاواش شارەزا نی. ئەگەر یەکی وەک ئایەب ڕەجەبیشت لەگەڵ بووایە، دیسان قسەیەک بوو... ئاخر بە کام شارەزاوە دەچیە چوکووڕاوا؟."

حەمەد وەک بەردێک قیت ڕاوەستا:

"ئێستا ئەتۆ لەگەڵم دێی یان نا؟ ئەوەیان بڵێ."

جەبار:

"ئەمن بە پێی خۆم ناچم خۆم بە تەڵەوە بکەم."

حەمەد:

"ڕوون قسە بکە. باسی تەڵەو مەڵەم بۆ مەکە. دێی یان نایەی؟."

جەبار:

"نا."

حەمەد:

"باشە. ئەتۆ قسە بکە عەلی بێچارە... ئەتۆ لەگەڵم دێی یان نا؟."

عەلی بێچارە:

"ئەمن چوکووڕاوا شارەزا نیم براله... ئەمن لە چوکووڕاوا دەترسێم. ئەمن قازانجم بۆ تۆ نابێ. بەڵام ئەگەر بتهەوێ دێم. لەبەر دڵی ڕەفیقی خۆم هەموو کارێک دەکەم."

حەمەد مۆڕەیەکی لە عەلی بێچارە کرد:

"ئاوا؟..."

ئەو شەوە نانیان پێکەوە نەخوارد. هەریەکەی لە قوژبنێک دانیشتن و نێوچاوانیان تێک نا. لەو نێوەدا عەلیبەشەل لە هەمووان بە کەیف تر بوو. وەختی خەو هات.

جەبار:

"ئێوە بخەون، ئەمن ئێشک ڕادەگرم."

حەمەدو ئەوانی دیکە نووستن.

نیوەشەوێ جەبار هاتە ژوور سەری حەمەدو هەڵیستاند. حەمەد هەستاو لە جێیەکەی دا دانیشت. هیچ خەوی لێنەکەوتبوو. بە تووڕەیی پرسی:

"چیت لەمن دەوێ جەبار؟... ڕەفیقایەتییەکەت نیشان دا, ئیدی دەڵێی چی؟."

جەبار:

"کاکە."

دەستەکانی حەمەدی لەنێو دەستی خۆی گرت و دووبارە دووپاتی کردەوە:

"کاکە."

حەمەد پێکەنی:

"ڕەفیقایەتییەکەت نیشان دا."

جەبار:

"وەرە دەست هەڵگرە برالە. ئاخرەکەی خەجیجێ ئازاد دەکەن. بۆخۆت دەزانی هەموو کەس لایەنی خەجیجێ دەگرێ. هەموو دەڵێن وەلیخان حەمەد کوشتوویە... ئاخرەکەی بەری دەدەن."

حەمەد:

"ڕاستە شاهیدەکان شاهیدییەکەیان وەرگرتۆتەوە, بەڵام سوودی نیە. ئەگەر سوودی هەبایە خەجیجیان بۆ موحاکەمە نەدەبردە کووزان. خەجیج لەسەر من خەریکە لە زیندان دا دەڕزێ, یان دەمرم یان لە چنگی ژاندارمەکانی دەردێنم. هیچ ئامەوێ ئەتۆ لەگەڵم بێی. ئەگەر نەیەی باشترە. ئەم ڕێیە سەدی نەوەدی مردنە... پیاوی ئاقڵ بە دەستی خۆی, خۆی تەسلیمی مردن ناکا."

جەبار:

"حەمەد, لەو دنیایەدا هیچ کارێك نیە بۆتی نەکەم. بەڵام ئەم کارە شێتییە. ئەم کارە یانی ئەوە کە پیاو بەدەستی خۆی ئاگر لە خۆی بەردا. لە هەموویان زیاتر بۆتۆ حەیفە برالە. وەرە بە قسەم بکە برالە. قسەی من لە عەرزی مەدە. تکات لێدەکەم کە قسەم لە عەرزی نەدەی, دڵم نەشکێنی... ئەگەر ئەتۆ وا بەخۆڕایی بکوژرێی, دەبێتە داخ و لەسەر دڵم دەنیشێ و هەتا ئاخری عومرم لەگەڵم دەبێ... وەرە مەرد بە لێی گەڕێ..."

حەمەد:

"بەخۆڕایی خۆت ماندوو مەکە جەبار. بەخۆڕایی ئامۆژگاریم مەکە... ئەگەر سەدی سەدیش بزانم دەکوژرێم, هەر دەچم. ئاخر ئەگەر ئەمن بەم جۆرە بژیم فایدەی چی؟ بەخۆڕایی خۆت ماندوو مەکە."

جەبار:

"ئیدی خۆت دەزانی برام. هەرچی بەسەرت هات هۆیالّی خۆت بە ئەستۆی خۆت."
جەبار دەستی حەمەدی بەرەلاّ کردو چووە قوژبنێك.
شەمەو یەکشەمەو دووشەمە رابردن. حەمەدو جەبار تەماشای روخساری یەکتریان نەکرد. لەبەر یەکتر هەلّدەهاتن. حەمەد هەموو رۆژێ تاریك و روونی دەچووە شاخی و ئێواران کە دنیا تاریك دەبوو، دەهاتەوە مالێ.
رۆژی سێشەمە پێش تاریك و روون حەمەد هەستاو عەلیەیەشەلی وەخەبەر هێنا:
"ئەمن دەڕۆم عەلی ئاغا."
عەلی لە جێی دەرپەڕی:
"ئەم کارە بە تەنیا ناکرێ. ئەمنیش لەگەلّت دێم."
عەلی پێکەنی و لەسەری رۆیشت:
"پێت را نەبێ دەتوانم تفەنگت بۆ باوێم... تفەنگ هاویشتن لەسەر خۆتە، ئەمنیش لە دوور ڕادەوەستم و تەماشا دەکەم. لەکەلێنێك خۆم دەشارمەوەو سەیرێ دەکەم. با لە گەلّی شکۆفە ئەسپێکی باشت بۆ پەیدا بکەم. بۆخۆشم سواری ئەسپ دەبم و لەگەلّت دێم. بۆت دەبمە خەبەرهێن. دەبێ لە نیزیك چیای بۆسە دابنێیی. دەبێ قامیشەلانەکەش لە پشتەوەت بێ. راوەستە. با ئەمن بچمە گەلّی شکۆفەو بێمەوە."
چاوەکانی حەمەد لە خۆشحالّییان بریسکەیان دەدا. عەلیەیەشەلی لە باوەش گرت و ماچی کرد:
"چاکەی تۆ چۆن بدەمەوە عەلی ئاغا؟."
عەلی بە خەفەتەوە سەری راوەشاندو بە دەنگێکی خەماوییەوە گوتی:
"کامە چاکە برالە؟... ئەمن دەمەوێ جێی خەراپەکانم پڕ بکەمەوەو تەواو."
عەلی بە پەلە هەستاو رۆیشت. یەك دوو سەعات دواتر وەختی تاوهەلاّت دەنگی چوارنالّیی ئەسپێك بیستراو پاشانیش دەنگی پرمە پرمی ئەسپەکە گەیشتە پشت دەرگا.
حەمەد هاتە دەرێ:
"بژی عەلی ئاغا."
عەلی:
"ئەمە ئەسپی زەماوەندە، وەرم گرت و رازاندمەوە."
ئەسپەکە مووروروی شین و شریتی رەنگاوڕەنگی لە ملی کرابوون. زین و لەغاو و هەوسارەکەی گولّدۆزی کرابوون.
حەمەد:

"ئەسپی زەماوەند."

عەلیەشەل:

"باڵتۆیەکی چەرمیشم بۆ هێناوی، هەم بە کەڵکی بارانێ دێ و هەم بە کەڵکی..."

حەمەد:

"باشە؟..."

عەلی:

"بە کەڵکی ئەوەی چەکەکەت نەبینن... بەخۆتی دادەی تەنیا سەرت دیار دەبێ. زووبە... با وەدرەنگ نەکەوین."

حەمەد خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکە، پاش ئەویش عەلیەشەل سوار بوو... جەبار لەنێو دەرگادا راوەستابوو و بێ ئەوەی قسەیەك بکا تەماشای دەکردن. عەلی بێچارەش هەروا. روخساری جەبار زەرد ببوو، وەك روخساری مردووان. وەك پەیکەرێکی بێگیان وشك ببوو.

حەمەد ئەسپەکەی بۆ لای دەرگا دەنگ دا. بێ ئەوەی چاو لە چاوی کا، خواحافیزیی لێکرد:

"گەردنم ئازا کە کاك جەبار. عەلی بێچارە ئەتۆش گەردنم ئازاکە."

جەبار هەروا وەك پەیکەرێك لە جێی خۆی رەق بوو، بێ ئەوەی بتوانێ وەڵامێك بداتەوە.

عەلی بێچارە:

"گەردنت ئازا بێ کاکە."

ئەسپەکان بە سەرەوژێری دا غاریان دا. جەبار ماوەیەکی دووروودرێژ هەر لەوێ و هەر بەو حاڵە کە بوو، مایەوە.

## (٢٥)

باران نم نم دەباری. بارانی رۆژی تـاوو سـاو... تاوێـك رووتی‌دەكردو دیسان دەباریـیـەوە. قامیشەكانی قامیشـەڵان تەڕ ببوون. ئاو لە لاسكی قامیشـەكان بـەرەو خـوار دەخزی. لەسـەر گەڵاكان زەنگوڵ زەنگوڵ رادەوەستاو لەژێر تیشكی رۆژدا بریسكەی دەدا.

ئـەودەم لـە خـوارەوەی "سـتێر" قامیـشـەڵانێكی لـێبوو. رێگاكـە بـە پـشتەوەی ئـەو قامیشـەڵانەو بەو بنارەدا كە بە داری مێرسین داپۆشرابوو تێدەپەڕی.

لەگوندی "چنارەچكۆڵ" تێپەڕین و گەیشتنە قامیشـەڵان. وەختێك هـەتاو هاتـە ئـاوابوون، بارانەكەش لێی كردەوە.

عەلی‌یەشەل:

"چاكم نەكرد ئەو باڵتۆیانەم هێنا."

حەمەد:

"بۆچی؟..."

عەلی:

"ئاخر بارانەكە كردیەوە."

حەمەد:

"دیسان دای دەداتەوە."

عەلی:

"جێ بۆسەی لەم قامیشـەڵانە باشتر لە چوكووراوا وەدەست ناكەوێ."

حەمەد:

"ئەرێ وەڵڵا عەلی ئاغا. چۆنە ئەتۆ ئەم لایە وا شارەزای؟... دەڵێی بست بە بست چوکووراوات لەبەرە."

عەلیەشەل:

"وەختێك منداڵ بووم لەچوکووراوادا ئەسپم دەدزین و دەمبردنە کێوی. ئێستا تێگەیشتی بۆچی چوکووراوام لەبەرە؟."

حەمەد:

"تێگەیشتم کاك عەلی... خاترجەمی کە بەم جادەیەدا تێدەپەڕن؟."

شەلە:

"کووزان تەنیا دوو رێگای هەیە کاکە... یەکیان پردی "چوکوور"ە و یەکیشیان ئێرەیە. باش بوو کە باران باری... ئێستا رێگای پردی چوکوور هەتا ئەژنۆیان قوڕە. گومانم نیە کە بێرەدا دێن. جێ بۆسەی لێرە باشتر جارێ دەست ناکەوێ. کاری خۆت دەکەی و وەك ئاو خواردنەوە خۆت دەگەیەنیەوە شاخی. ئەگەر جەبار دەیزانی جێی وات دەست دەکەوێ، حەتمەن لەگەڵت دەهات."

بە بیستنی ناوی جەبار، حەمەد رەنگی تێك چوو.

عەلیەشەل:

"بەخوا دەهات. جەبار ترسا... ترسا کە بە رۆژی رووناك لە دەشتایی دا پێوە بێ."

حەمەد هیچی نەگوت:

"عەلی درێژەی پێ دا:

"ترسا... ئەوەندە ترسا، مەپرسە... جەبار زۆر زرینگە. دەیزانی کە هەر یاغیيەك رێی کەوتوەتە چوکووراوا، گەڕانەوەی نەبووە..."

حەمەد پرسیاری کرد:

"تەنانەت یەك کەسیشیان نەیتوانیوە بە سلامەتی لە چوکووراوا رزگاری بێ؟."

شەلە:

"تەنانەت یەك کەسیشیان."

پێپێچەکەیان کردەوە. بێ هەست و خوست، کەمێك نانیان خوارد.

عەلیەشەل:

"ئەمن دەڕۆم بۆ لای شاری و بە دوای ئەوان دا دێم. ئەتۆ بڕۆ لە کێوی کەمێك بنوو. لەگەڵ دنیا رووناك بوون وەرە نێو قامیشەڵان. ئەسپەکەت لەنێوبەندی قامیشەڵانەکە لەجێیەکی نەدیو وەبەستە. پاشان وەرە لێوی جادەی. ئەمن رۆیشتم. سبەینێ لای ئێوارێ ئەوان دەگەنە ئێرە."

شەلە خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکەی و بەچوار ناڵی بەرەو شار لینگی دا. حەمەدیش سوار بوو و بەرەو چیا دەنگی دا. گەیشتە پەنا ئاورگێکی بەردین. ئاورگە بەردینەکە ئاو خەرای کردبوو، بەڵام دیسانیش سەنگەرێکی باش بوو. پیاو دەیتوانی لەباران دا لە ژێری دا بحاوێتەوەو تەڕ نەبێ. وەك ئەشکەوت بوو. قوولکە ئاورەکە پڕ لە ئاو بوو. بە بەردان پڕی کردەوە. ئەسپەکەی لە پشتەوەی خۆی لە دار بەڕوویەك خست. باڵتۆیەکەی دەخۆیەوە پێچاو لەسەر ئەو بەردانە کە قوولکەکەی پێ پڕ کردبوونەوە، راکشا. تاوێك خەوی لێکەوت و لەپڕ راپەڕی. هەتا بەیانی هەر بەو جۆرە رای بوارد.

بەری بەیانی خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکەو پێی پێوەنا. گەیشتە قامیشەلان. لێی خوڕی بۆ نێوەڕاستی قامیشەلان و ئەسپەکەی لە رەگە قامیشێك خست.

لە دوێنێ شەوەوە تا ئێستا خۆشحاڵ بوو. تەواوی لەشی کوترابوو و ژانی دەکرد. پاڵی بە پۆلە قامیشێکەوە داو دانیشت. بەو پۆلە قامیشەوە زەرگەتە هێلانە لەسەر هێلانە هەڵیان بەستبوو. جاڵجاڵۆوکەش لەم قامیشەوە بۆ ئەو قامیش داویان راهێشتبوو.

تاو هەلات. هیچ شتێك لە چاوەڕوانی ناخۆشتر نیە. ئەویش چاوەڕوانی لە چ وەختێك دا؟... نیوەڕۆ داهات. گەرمایەکی شەدار دەشت و دەری داگرت. ئێوارە داهات. سێبەری کێوەکانی ئەوبەر بەرەو خۆرهەلات درێژ بوونەوە. حەمەد تفەنگەکەی تاو دایەو لە قوولکەیەك دا لە تەنیشت جادە چووە بۆسەوە. جار جار لە قوولکەکە دەهاتەدەرو تەماشای رێگای شاری دەکرد. بەڵام هەتا چاو بڕی دەکرد هیچ دیار نەبوو. خۆی دەخواردەوە. خەریك بوو کێو و بیابان وەبەر گوللە بدا... پێوەنێ... کارت بەوە چیە کە کوێیە. قامیشەلان و جادەکە وەبەر گوللە بدە... لە داخان خۆی دەخواردەوە. ئیدی هەر دەقیقەیەك بە سالێك دەگوزەرا.

پاشان خەنجەرەکەی هەڵکێشاو دەستی کرد بە هەڵکەندنی قوولکەکە. بە هەموو هێزی خۆیەوە هەڵی دەکەند. گڵەکەی بە مستان دەردەدا. بەهەناسە بڕکە غاری دایە نێوەڕاستی جادەی. بەڵام هیچ دیار نەبوو. هەروا لەنێوبەندی جادەی راوەستابوو و جووڵەی نەدەهاتێ. زیندەوەر دیار نەبوو. تەمابڕاو بوو. چوو تفەنگەکەی لەنێو قوولکە دەرهێناو هات لە نێوبەندی جادەی راوەستا. هێندەی نەمابوو رۆژ ئاوابێ. لەو سەری جادەی چەند تارمایی دیار بوون کە دەبزووتن. ئەو تارماییانە بەرە بەرە نیزیکتر بوونەوە. لەپڕ دڵی داخورپا. دوو ژن لە پێشەوەو چوار ژاندارمە بە دوایان دا دەهاتن. بەسپایی خۆی خزاندە نێو قامیشەلانەکە. هەتاو لە کێوەکەی بەرامبەرییەوە نیوەی ئاوا ببوو و نیوەشی مابوو.

سێرەی لە لاقی ژاندارمەیەکی کەڵەگەتە گرت کە لە دوای هەمووانەوە دەڕۆیشت. دەستی بە پەلاپیتکە داهێنا. ژاندارمەکە هۆڕاندی و خۆی لە عەرزی دا. حەمەد وەك تیرباری گوللەی دەباراند. راست و چەپی وەبەر گوللە دابوو. ژاندارمەکان گێژ ببوون.

حەمەد:

"هۆۆۆی... ئەمن حەمەدۆکم. ئەو ژنانە بەرەڵا کەن و بگەڕێنەوە."

ژاندارمەیەکی دیکەش هۆڕاندی و کەوت دوو ژاندارمەکەی دیکە خۆیان لە خەندەکێك هاویشت کە پڕ بوو لە ئاوی ئاوەڕۆی جادە. دەستیان کرد بە دەست کردنەوە. تاریك داهات. بارانیش نم نم دایدایەوە. ژنەکان بێ ئەوەی بزانن دەبێ چ بکەن، لە جێی خۆیان ڕەق ڕامابوون. هەردووکیان لە ترسان دەلەرزین. پاشان هەردووکیان لە نێوەڕاستی جادەی لەنێو ئاو و قوڕ دا دانیشتن.

حەمەد:

"هۆۆۆی ژاندارمەکان... بگەڕێنەوەو بچنە سەر کارو گوزەرانی خۆتان. ئەگەر ڕەوەیەکیش بن هیچتان پێ لەگەڵ من ناکرێ."

هات وهاواری بریندارەکان دەرو دەشتی پڕ کردبوو.

حەمەد:

"ڕەفیقەکانتان هەڵگرن و بڕۆن... هەڵیان گرن و بڕۆن..."

ژاندارمەکان ماوەیەك تەقەیان ڕاگرت. ژنەکانیش کەمێك هۆشیان هاتەوەبەر. ئیراز سیخورمەیەکی لە خەجیج کوتا:

"ڕاست بەوە خوا کوێرت نەکا... هەستە وردە وردە بڕۆین بۆ لای حەمەد."

خەجیج ناڵاندی:

"چ قیسمەت و نسیبێکم هەبوو پوورە ئیراز... با بڕۆین."

بە بێ هەستی دەرەدزەیان دایە.

خەجیج:

"حەمەد."

حەمەد:

"هاتن؟."

ئتاریکێك بوو چاو چاوی نەدەدی. حەمەد لە قوولکەکەی هاتە دەرێ و غاری دایە نێوبەندی جادەی. ژنەکان وەك سێبەر لە تاریکایی دا دەجووڵانەوە. حەمەد گەیشتە لایان. دەستی گرتن. ئەوانی بردە نێو قامیشەڵان و پەنا ئەسپەکە. ژاندارمەکان هێشتا تەقەیان لەم لاو ئەولا دەکرد. ئەسپەکە لەگەڵ هەستی پێیان حیلەیەکی درێژی کێشا. حەمەد هەوساری ئەسپەکەی کردەوە:

"سوار بن... سوار بن و بەدوام دا لێخوڕن."

وەختێك لە قامیشەلان هاتنەدەرێ، ژاندارمەكانیش دەستیان لە تەقە هەڵگرتبوو و خەریكی راگوێزتنی رەفیقە بریندارەكانیان بوون.

سوارێك كە سێ ئەسپەكەی پڕیشكی لێ هەڵدەستان، بەرەو بنار دەیكوتاو لەوان تێدەپەڕی. تاوێك دواتر گەڕایەوە. دڵی حەمەدی خەبەری دابوو كە ئەو سوارە دەبێ عەلی بێ.

یەكێك بەسپایی بانگی كرد:

"حەمەدۆك... حەمەدۆك..."

حەمەد وەڵامی دایەوە:

"لێرەین عەلی... وەرە."

عەلی بە هەناسەبڕكە خۆی گەیاندە ئەوان. دابەزی:

"كاك حەمەد، ئەسپەكەی بگرەو سواری بە. لە پاشان لە گەڵی شكۆفە بیدەوە بە خاوەنی. لەم بنارەی رامەوەستە. سبەینێ وەكیل باشی عاصم هەرچی ژاندارمەیە هەڵیان دەگرێ و وەدوات دەكەوێ. وریا بە دەگیر نەكەوی. دوایە ئەمن دەتگەمەوە. ئەمشەو بە هەر جۆرێك بووە خۆت بگەیەنە گەڵی شكۆفە. دوایەش برۆ لای ئاكچاداغ... رانەوەستی... بە تاو برۆ. یاڵلا بەخوام سپاردی."

عەلی گەڕایەوەو لە تاریكێ دا ون بوو.

حەمەد:

"ئەم پیاوەتیەت لەبیر نابەمەوە عەلی ئاغا."

خۆی هاویشتە سەر ئەو ئەسپە كە عەلیەشەل بۆی هێنابوو:

"خەجیج... وەرە پاشكۆیەم."

خەجیج لە ئەسپەكەی دیكە دابەزی و لە پاشكۆیە حەمەدی سوار بوو. لە تاریكایی دا لینگیان دەدا.

حەمەد چەند جاری رێ لێ ون بوو. دوایە دۆزیەوە. تاو نەكەوتبوو كە گەیشتنەوە گەڵی شكۆفە. راستەرێ چوونە نێویەندی ئاوایی. لەبەر دەركی ماڵێك دابەزین.

حەمەد بانگی كرد:

"ئۆهۆی... خاوەن ماڵ."

لاوێكی هەژدە ساڵە دەرگای كردەوەو هاتە دەرێ. كە چاوی بەوان كەوت خۆشحاڵ بوو، و پێكەنی. هات و هەوساری ئەسپەكانی گرت و بردنیە تەویلە. ئەسپەكان شەڵاڵی ئارەق و كەف بوون.

خەجیج و نیراز تەزیبوون. هەڵدەلەرزین. لە بوولێڵ دا سەروچاویان نیگەران و تێکچوور دیار بوو.

چوونە ژووری. ژنەکان ئاوریان هەڵکردبوو, و لە پەنای ئاگردان دۆشەکیان راخستبوون.

حەمەد:

"خانەخوێ, ئەمن دوو رۆژە برسیمە."

گوتیان:

"هەر ئێستا, حەمەدۆک, هەر ئێستا."

# (٢٦)

عەبدی تێك تەپیبوو، لاواز ببوو... لەقاوەخانەی، ڕۆژ تا ئێوارێ گوێی لە ناوی حەمەدۆك دەبوو. زمانی خەڵکی توورەکە نەبوو کە بتوانێ زاری ببەستێ.

لە داخان خۆی بەسەر پێوە ڕاندەگرت. نەیدەتوانی لە جێیەك دانیشێ و هەڵسوڕێ. لە قاوەخانەی تۆفیق ئاغا هەڵدەستاو دەچووە دوکانی مستەفاغا ماراشی... لەوێش ڕا وەڕێ دەکەوت و دەچووە ماڵی "ڕەمزی کەڵەشێر"ی سەوزی فرۆش، لێرەش بەند نەدەبوو و دەچووە لای ئەحمەدئاغای سیاسەتبازی عەریزەنووس. ڕۆژ تا ئێوارێ ئەمە کاری بوو... وا زۆربڵێ ببوو کە نۆرە قسەی کەسی نەدەدا:

"ئەوە دیتان، خۆ باش دیتان؟... هەر دەتانگوت منداڵە، بەڵام ئەمن دەمزانی چ جانەوەرێکە، ئەمن دەمزانی چ یەزیدێکە. ئێستاش ئەوە پێتان دەڵێم ئەگەر زووتر نەبزوون، ئەو یەزیدە لە کێوان حکوومەتێك دروست دەکاو کار لە کار دەترازێ... خاترجەم بن دروستی دەکا... ئاخر کەسێك کە بێت و ملکی باب و باپیری من، مەزراو زەویی باب و باپیرانم لەنێو دێهاتییەکان دا دابەش بکاو جێژنی بۆ بگرێ، چیی لە حکوومەت کەمترە؟... ئێستا ڕاوەستن با سبەینێ بە ڕەسمی حکوومەتەکەی دامەزرێنێ... هەزار تەلگرافم زیاتر بۆ ئەنکەرە لێداوە، بەڵام هەروا بزانە... بە خوای لە ژووری سەران ئەسڵەن سەرم لەکاری ئەم حکوومەتە دەرناچێ. ئاخر چۆن ئەو هەموو خەڵکەی لەو کێوانەدا بۆ یاغییەکی سەرکێوان خۆڕایی کردوە؟... ئاخر حکوومەت بۆ دەبێ دەسبەجێ قشوون نەنێرێ و ڕەگ و ریشەی ئەم بێناموسانە دەرنەهێنێ؟ پێتان وا نەبێ دەمەوێ خەراپەی حکوومەتتان پێ بڵێم. حاشاو مادەڵڵا، زمانم لاڵ بێ، حاشا، مومکین نیە... بەڵام بۆ دەبێ حکوومەت ئێمە بکاتە دیلی دەستی مستێك یاغیی سەرکێوان؟... ئاخر حەیف نیە؟... بەخوا حەیفە، بە پێغەمبەر حەیفە..."

بەیانیی رۆژی دووهەم ژاندارمە بریندارەکانیان هێنایەوە شاری. مەسەلەکە کەوتە سەر زارو زمانان. هەموو کەس لایەنی حەمەدۆکی دەگرت. عەبدیخانیش لەنێوەڕاستێ بازاڕی دا بە دەوری خۆی دا دەسووڕاو خۆی دەخواردەوە. تووشی هەرکەس بووایە دەستی پێ دەکرد:

"پێتانم نەگوت؟."

ئاشناو نائاشنا بۆ ئەو فەرقی نەدەکرد. پێشی بە هەمووان دەگرت و دەیپرسی:

"ئەمن بە ئێوەم نەگوتبوو؟."

پاشان چووە قاوەخانەی تۆفیق ئاغاو دانیشت. سەری لەسەر مێزەکە داناو هەروا دۆش داما. نانی نیوەڕۆشی لەبیر چوو. هەروا وەنەوزی دەدان کە یەکێك لە پیاوەکانی عەلیسەفابەگ بە دوای دا هات:

"ئاغام کاری پێتانە."

عەبدی بە قالب گرانی سەری هەڵبڕی و بە بێوازییەوە پرسی:

"چی؟."

ئاغام گوتیان تەشریفت بێتە ماڵی ئێمە."

عەبدی هەڵستا. سەری دێشا. وەخت بوو بتەقێ. عەلیسەفابەگ هەتا بەر دەرگا بە پێشوازییەوە هات و دەستی وەبن پیلی دا:

"وەرە خان، فەرموو بۆ ژوورێ. بە جارێك ئێمەت لەبیر چووەوە."

عەبدی سەری هەڵێنا. چاوەکانی ببوونە دوو پیاڵە خوێن. ماوەیەکی زۆر تەماشای چاوی عەلیسەفابەگی کردو هیچی نەگوت. پاشان لە نەکاو دەستی پێ کرد:

"ئەمن نەمگوت؟."

عەلی سەفابەگ زەردەیەکی هاتێ:

"ئێستا وەرە ژوورێ، وەخت زۆرە بۆ قسان."

"ئەمن پێتانم نەگوتبوو؟."

هەتا لە پلیکانەکان وەسەر کەوتن دووسێ جار راوەستان بۆ ئەوەی عەبدیخان بحەسێتەوە. چوونە ژوورێ. عەبدیخان بە ئاخ و ئۆخ خۆی هاویشتە سەر مۆبلەکە:

"ئەمن نەم گوتبوو؟."

قاوەیان هێنا. نەیدەتوانی فنجانی قاوەکەی لە دەستی خۆی دا راگرێ. دەستی بە خواردنەوەی قاوەکە کرد. قاوە بە لالەغاوەی دا دەهاتە خوار. عەلیسەفابەگ هات، لە پەنای دانیشت و دەستێکی بە ریشی دا هێنا:

"ئەوە چت کردوە عەبدیخان؟ ئێستا ئەو عەریزەیە چییە؟ ئەتۆ ئاخرەکەی ئەم شارە بە سووتاندن دەدەی. دەتەوێ حکوومەت قشوون بنێرێ؟... ئاخر بۆ شارەکە حەیف نییە؟ ئاخر دڵت دێ؟... خۆ بە خاتری دوو حەرامزادەی کێوی ناکرێ شارێك بەدناو بکەی."

خان چەند هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا. بە خەفەت خواردنەوە سەری راوەشاند:

"پێت وایە عەبدی بۆخۆشی دەزانێ چ دەکا, بە قوربانت بم؟ پێت وایە عەبدی حاڵ و باڵێکی ماوە؟ دەیەوێ من بکوژێ. بەخوا ئەگەر بێڵێ زیندوو بمێنم. بەم وەزعەوە دەتهەوێ چ هۆش و گۆشێکم بۆ وەمێنێ؟ دەست و لاقم تینیان لەبەر براوە. دەزانی بە چی نارەحەتم؟ پێت وا نەبێ لە مردن دەترسم, بە هیچ جۆر. بەوە نارەحەتم کە حکوومەتێکی وا مل ئەستوور بە بستەمنداڵێك ناوێرێ. کورە لەوەش گەرێ, دڵم لە شتێکی دیکە زیاتر لە هەمووی ئەمانە نارەحەتە عەلیسەفابەگ... چووەتە دێی زەوییەکانی دابەش کردوەو گوتوویەتی عەبدیم سووتاندوەو لەو قسانە... ئەگەر ئەتۆ لە جێی من بایەی ئاورت نەدەگرت بە قوربانت بم؟ ئەوەیە کە خەو لە چاوانم تاراوە. دەترسم... بەڵام نەکا پێت وابێ لە مردن دەترسم... بە هیچ جۆر... ئەجەل حەقە بە قوربانت بم. ئەمرۆ نەبێ سبەینێ, سەرەنجام هەر دەگاتە سەرت... ئەجەل وشترێکە لەبەر دەرکی هەموو کەس دەکەوێ. بەڵام درەنگ و زووی هەیە... بۆیە ئەمن لە مردن هیچ باکم نییە, بەڵام دڵم بەوە نارەحەتەو لەوە دەترسم کە ئەمرۆ ئەو بێ دایك و بابە هات زەوییەکانی منی دابەش کرد, سبەینێش یەکێك دێ زەوییەکانی تۆ دابەش دەکا, دووسبەش یەکی دیکە پەیدا دەبێ زەوی و مەزرای ئەوی دیکە دابەش دەکاو هەر بەو جۆرە. جا بزانە ئاخرەکەی بە کوێ دەگا... ترسی من نا لەوەیە عەلیسەفابەگ."

عەلی سەفابەگ دەستێکی لە شانی عەبدی دا:

"نا عەبدیخان, نا... وا نییە کە تۆ فکر دەکەیەوە. خەیاڵت تەخت بێ. ئەوان بە سزای خۆیان دەگەن, خاترجەم بە."

چاوەکانی خان بریسکەیەکیان داو دەم و چاوی خوێنیان تێزا:

"لەوە دەترسێم سبەینێش نۆرەی تۆ بێ... دڵم هەر بەوە نارەحەتە. با هەموو کێو و بەندەنەکان بە دەست یاغییەکانەوە بن... باشە با بن, بە من چی؟ چەندیش دەبن با بن... ئەمەش گرنگ نییە بە قوربانت بم... ئەوەی من لێی دەترسێم عەرزە, عەرز... مەزراکان... ئەگەر دێهاتییەکان لە کەللەیان بدا, تازە پێشیان پێ ناگیرێ. ئەمن لە ئەجەل ناترسم. لەوەی دەترسێم عەلیسەفابەگ. ئیدی خۆت دەزانی عەلیسەفابەگ. بەڵام ئەگەر لەمن دەپرسی, ئەو هەتیوە هەرچەندی زووتر بمرێ, دیسان درەنگە. ئەو هەتیوە تۆوێکی چاندوە کە ئەگەر بۆی

بگرێ، خەتەرناکە. مەیەڵە وەخت بە فیڕۆ بچێ... مەیەڵە وەخت لە دەست بچێ... خەڵکی گوندی وایوایش هەموویان لایەنگری ئەون."

عەلیسەفابەگ بایەخی پێ نەدەداو پێدەکەنی:

"دەزانم چتە خان، دەزانم... حەقتە... بەڵام مەترسە، ئەمڕۆ نەبوو، سبەینێ. قەولت پێ دەدەم سەری دەبڕن و دەیهێنن لەبەر دەرگای ماڵەکەت هەڵی دەواسن... مەترسە. وەکیل باشی عاصم بە گوردانێك ژاندارمەوەو "برایمەڕەش" بە پەنجا کەس داوتەڵەبەوە بەدوایەوەن... ژاندارمەکانیش نەبن، هەر برایمەڕەش مشووری دەخوا، لە یاغیيە کۆنەکارەکانە، بست بە بست تەواوی ئەو کێوانە شارەزایە، هەموو رێ و شوێنێکی یاغیگەریی وەك ئاو لەبەرە. پێم گوتوون سەری حەمەدۆکی ببڕن و بەسەر دار خێزەرانێکیەوە کەن و بیبەن لەبەر دەرکی ماڵی عەبدیخان بیچەقێنن... هەرواش دەکەن."

عەبدیخان:

"ئەو بۆیە نابێ تاقە رۆژێکی دیکەش زیندوو بێنێ... تەنانەت تاقە رۆژێکیش... ئیشەڵڵا وەك گوتت وا دەبێ... ئیشەڵڵا."

عەلیسەفابەگ:

"ئیشەڵڵاو ماشەڵڵای نیە عەبدیخان، مسۆگەرە، مسۆگەر. چما برایە رەشی ناناسی؟."

"بۆچی؟."

"هەر ئەو برایمەڕەش."

عەبدیخان کەمێك روحی هاتەوەبەر، هومێدێکی پەیدا کردبوو:

"برایمەڕەش دەرۆستی دێ، لێی دڵنیام. ئەتۆ کاری وایوایت بە کوێ گەیاند؟."

عەلیسەفابەگ هاتە نێو قسەکەیەوە:

"لەو وەختەوە کە کالایچی کوژراوە کارەکانم ناجوورن. دێهاتیيەکان سامیان شکاوە. ئەگەر وەزعەکە هەروا بڕوا..."

عەبدیخان:

"با ئەو هەتیوە بکوژرێ، ئەودەم..."

عەلیسەفابەگ:

"دەکوژرێ."

## (٢٧)

هاواری دێهاتی‌یەکان لە دەستی ژاندارمەکان گەیشتبووە ئاسمان. ژاندارمەکان بۆ گرتنی حەمەد دەستووری یەکجاری‌یان پێ درابوو:

"حەمەدۆك دەبێ بگیرێ. بە مردوویی یان بە زیندوویی دەبێ تەحویل بدرێ... ئەگەر نا..."

بەڵێ دەستوورەکە رستەی "ئەگەرنا"شی تێدا بوو, و ئەوانەی ئەو جۆرە دەستوورەیان پێ بوو, دەماری دێهاتی‌یەکانیان دەردێنا. هەموویان دارکاری دەکردن... ژن و منداڵیشیان...

تەواوی دێهاتی کێوپارەی هاواریان لێ‌بەرز ببوو. کەس نەیدەزانی حەمەدۆك لە کوێیە. هیچ کەسیش حازر نەبوو بە دوای دا بگەڕێ... ئەوانەی وەدواشی دەکەوتن, ژاندارمەکانیان هەتلە دەکرد. حەمەد ئەو کچە بێ‌گوناحەی لە دەستی ژاندارمەکان دەرهێنابوو, و ئەمە ببوو بە داستانێك لە تەواوی دێهاتی کێوپارەو ئاسیاب چەشمەدا زار بە زار دەگەڕاو لەسەر ئەم داستانەش زۆر داستانی دیکەیان ساز کردبوون. هەمووان کارو گوزەرانیان وەلانابوو, لە دەوری یەکتر کۆدەبوونەوەو باسی حەمەدۆکیان دەکرد. دێهاتی‌یەکان لانی‌کەم رۆژێ دوو پارچە شیعرو گۆرانی‌یان لەسەر ئەو مەسەلەیە دادەنا.

دوو رۆژ دوای کارەساتەکەی قامیشەلان بوو کە ژاندارمە هاتنە ئاسیاب چەشمە. نێوچاوانیان دەتگوت کەکرەی تالە... دەستەیەکیان چوونە ماڵی دورمووش عەلی. ئەو پیرەپیاوەیان لەبەر دەرکی ماڵەکەی گرت و کێشایانە بەر پرسیاران. بەڵام نەیانتوانی یەك قسەشی لێ‌دەرکێشن, هەرچی لێیان دەپرسی و هەڕەشەیان لێ‌کرد فایدەی نەبوو. دایانە بەر قۆنداغە تفەنگان. ژنەکەی وەك مریشك بەدادو رۆڕۆ بە دەوری دا دەهات و سنگی خۆی دەکوتاو هەرچی بە زمانی‌دا دەهات بە ژاندارمەکانی دەگوت. قۆنداغە تفەنگێك ئەویشی بێدەنگ کرد.

پیرەپیاو و پیرێژنیان نوقمی خوێن لە حەساری ماڵەکەیان دا بەجێ هێشتن و چوونە زگ ئەوانی دیکە. هەتا ئێواریّ بەشێکی زۆر لە دێهاتییەکانیان دارکاری کرد. شەویّ لە ماڵی عەبدیخان میوان بوون. هەموو بەیانییان سەرلەنوێ دارکارییەکەیان دەست پێ دەکردەوە. ژاندارمەکان لە دارکارییش ماندوو ببوون. ئیدی حەوسەڵەی دارکارییشیان نەمابوو. بەڵام چارەی هەموو دەردان پەیدا دەبێ. دێهاتییەکانیان ناچار کرد لەیەکتری بدەن. لەسەر حەمەدۆك ئەشکەنجەو ئازار وەك باگردان بەسەر دێهاتی کێوپارەی دا تێدەپەڕی و بەرەو لوتکەی شاخی دەچووە پێش.

حەمەدۆك پەنای بۆ "عەلیکۆ" بردبوو. عەلیکۆ کێوێکە حەستەم، شاخاوی و بە سام. عەلیکۆ، لانی شووری شاخ درێژو رەنگ شینە. بەردەکانی تیژو دڕن، وەك خەنجەر. ئەو کێوە پێداڕۆیشتنی ناکرێ. بەردەکانی دەست و لاقی مرۆڤ هەڵدەدڕن. بیستووتانە کە دەڵێن: کێوی بەردئەستێیان؟... عەلیکۆ کێوێکی وایە. لە نیزیك لووتکەکەی دارەکان کەمترو کەمتر دەبن و هێشتا ماویەتی بۆ لووتکەکەی، کە ئیتر داری پێوە نابینرێ. لووتکەکەی رووتەن و بەردی ساغە، یەکپارچە شاخ... چوار فەسڵ، ئەو لووتکەیە بەفری لێنابڕێ.

"عەلیکۆ بەرزەو لووتکەی بەفراوی

بە شەو لە سەرمان نانوون لە ناوی"

حەمەد هەر لەو سەردەمەوە کە دەچووە راوەشوور، ئەم کێوە بەرد بە بەردو ئەشکەوت بە ئەشکەوت و شاخ بە شاخ شارەزابوو. راست لە لووتکەی عەلیکۆ ئەشکەوتێك هەبوو. بەڵام ئەم ئەشکەوتە رێگای بۆ نەدەچوو. دەبوو بەسەر شاخێکی پێنسەد گەزی دا خۆت خزاندبایەو بە زگە خشکە وەسەر کەوتبای تا دەگەیشتیە ئەشکەوتەکە.

کاتێك لە گەڵی شکۆفە وەدەرکەوتن، وەزعیان گۆڕا. ژاندارمەکان لە چوار لاوە بە دوایان دا دەگەڕان. خەبەریان هەبوو کە برایمەڕەشیش بە دوایانەوەیە. شوان و گاوان و دارکەرو جووتیار هەموویان خەبەریان بۆ حەمەد دێنا. هەرچی رووی دابایە، حەمەد یەکەم رۆژ ئاگادار دەبوو. ئیرازو خەجیج زۆر ماندوو ببوون. لاقیان ماسیبوون. هەربۆیە بە ناچاری ئەوان لە گەڵی شکۆفە مابوونەوە.

ژاندارمەکان و برایمەڕەش، گەڵی شکۆفەیان رادەماڵی و بەرەو لووتکەی کێوەکان دەچوونەپێش. شوانی خاڵی عەلی بێچارە خەبەری بۆ حەمەد هێنا کە:"ئێوە لە گەمارۆدان... ئەگەر نەتوانن رابکەن کوژرانتان مسۆگەرە."

نەیانتوانی رابکەن. بەرەبەیانییەك شەڕ دەستی پێکرد. لەچوار لاوە هێرشیان دێنا. حەمەد فیشەکەکانی زۆر بە ژمێرەو لەسەرەخۆ خەرج دەکرد. تەنیا لەو کەسانەی دەدا کە نیزیك دەبوونەوە.

وەکیل باشی عاصم لە پەستا دەی‌نەڕاند: "تەسلیم بە."
حەمەد جوابی دەدایەوە: "باشە" و سەرلەنوێ دەستی بە تەقە دەکردەوە.
قەدی کێوەکە پڕ لە ژاندارمە بوو کە لە جێگای خۆیان نەدەبزووتن. تفەنگی حەمەد گەرم داهاتبوو، و گوللەیەك لە لوولەی تفەنگەکەی دا گیری کردبوو. بۆ ئەوەی تفەنگەکەی سارد بێتەوە لە گڵی راکرد. حەمەد بە دەمانچە دەستی بە تەقە کرد. خەجیج لە ترسان وەك مێژۆك دەلەرزی. حەمەد پێدەکەنی. حەمەد شەلاڵی ئارەق بوو. ئارەق لەبن هەنگڵی و لە مووروەگەی پشتی هەڵدەچۆڕاو کەفی دەکرد. ئارەقی وشکەوەبوو لەسەر مووروەگەی پشت و نێوشانی ببووە شۆرە.
ئیراز یارمەتیی حەمەدی دەدا. زۆری پێ نەچوو کە تفەنگەکەی بۆ فێنك کردەوەو گوللەکەی لە لوولەکەی دەرهێناو دایەوە دەستی حەمەد. حەمەد وەختێك تفەنگەکەی وەرگرتەوە زۆر خۆشحاڵ بوو.
لای ئێوارێ ـ دیار نەبوو لەبەرچی ـ ئەوان دەستیان لە تەقە هەڵگرت. ئەمە یەکێك لە شێوە کارەکانی برایمەڕەش بوو. دەبوو تەقە راگرێ و وا نیشان بدا کە دەستیان لە شەڕ کێشاوەتەوە، بۆ ئەوەی گەمارۆ دراوەکان هەستن و رێگایەکی دەرباز بوون بۆخۆیان پەیدا بکەن و ئەمانیش بیاندەنە بەر دەسرێژ. حەمەد لەو کەڵەکە حاڵی بوو.
ژاندارمەکان و داروەدەستەی برایمەڕەش دەستیان کردبوو بە خزین و چوونەوەخوار. قوونەدزەو چوونە خوارەکەیان دیار بوو. ئەمە دەرفەتێکی باش بوو بۆ لێدان و دەرپەڕاندنیان. هێرش بۆ سەر ئەو کەسانە کە خەریکی پاشەکشەن رێگایەکی باشە بۆ لێدان و پەرش و بڵاوکردنیان.
حەمەد بە ئارەتە کێشان لە سەنگەرەکەی دەرپەڕی و بۆ لای ئەوان سەرەوژێر بووەوە. خەجیج بە دوای حەمەد دا دەستی بە هات و هاوار کرد. حەمەد گوێی پێ نەدا. ئەوانە کە دەیاندی حەمەد لە سەنگەرەکەی هاتوەتە دەرو بە تەقەکردن کەوتوەتە سەریان، پێیان پێوە نا. هەتا خۆرئاوا حەمەد بە دوایانەوە بوو. کاتێك گەڕانەوە نیوەشەو بوو. خەجیج بە گریانەوە دەستی لە ئەستۆی حەمەد کرد. ئیراز خەجیجی گرت و لە حەمەدی پچڕییەوە:
"چت لێ قەوماوە مردووت مرێ؟ چما دنیا خەراپ بووە؟ ئاخر چ بووە، کاری یاغی هەر ئەمەیە... کەسێك مێرد بە یاغییان بکا دەبێ ئەو جۆرە ناڕەحەتییانەش لەخۆ بگرێ... لێرەبڕە... قەت کەس نەمار، خۆ کوڕەکە تۆی لە ژاندارمەکان نەستاندەوە کە لێی ببی بە بەلا..."
حەمەد:
"دەمەوێ شتێکتان پێ بڵێم."
ئیراز:
"بڵێ."

حەمەد:

"ئەگەر لێرە وەمێنین وەزعمان شڕە، دەبێ هەڵێین و شوێنمان ون کەین. هەر جۆرێك بێ دەبێ بچینە عەلیکۆ. چواردەورمان ژاندارمە گرتوویە، هیچ ڕێگای دیکەمان نین. بەشی حەوتوویەکمان خواردن پێیە. بە دوو ڕۆژ دەگەینە عەلیکۆ. ئەمن جێیەك لە عەلیکۆ پێ دەزانم. دەچینە ئەوێ و دەیکەینە ماڵ. ئەوێ بە کەس نابینرێتەوە. ئەمن ڕۆژێك لەو ڕۆژانە کە دەچوومە ڕاوەشوور، شوێنی شوورێکی برینداریم هەڵگرتبوو. هەروا کە بە شوێن حەیوانەکەدا دەڕۆیشتم، لەپڕ بەسەر ئەو جێگایەدا کەوتم. دەتوانین هەتا ماوین لەوێ بژین."

خەجیج:

"نەك هەتا ماوین، هەتا ئەو ڕۆژەی لێبووردنی گشتی دەردەچێ. دەڵێن لێبووردنی گشتی ساڵێکی دیکە دەردەچێ. دەڵێن حکوومەت دەیەوێ ڕۆژی هاتنەسەرکاری خۆی بکاتە جێژن و لێبووردنی گشتی دەربکا، هەتا ئەوێ ڕۆژێ..."

حەمەد:

"لێبووردنی گشتی؟... بەڵام ئەمن دەبێ لە پێشدا ئەو کارەی دەمەوێ بیکەم، بیکەم... پاشانیش... دەچمە یۆرگیر."

حەمەد بێدەنگ بوو. شەو دەنگی لەبەر دەرنەدەهات.

حەمەد:

"هەتا ڕۆژی لێبووردنی گشتی کاری خۆم دەکەم."

خەجیج:

"ئیشەڵڵا دەیکەی... ئەگەر لە کونەمشکانیش دا خۆی بشارێتەوە."

حەمەد:

"هەستێ بڕۆین."

وەڕێ کەوتن. سەرمابوو. هەساو بوو. ئەستێرەکان دەتگوت بە ئاسمانەوە بەستوونی و سپی کراونەوە. لك و پۆپی داران تەڕ بوون. هەتا پتر دەڕۆیشتن تەڕتر دەبوون. خەجیج ویستی بناڵێنێ، بەڵام ددانی بە جەرگی خۆی دا گرت. بوون بە ژنی یاغییان ئاسان نیە. ژنێ کابرای یاغی دەبێ زۆر شتان لە خۆی بگرێ. بە پارێزو بێ ئەوەی دەنگیان لەبەر بێتەدەرو هەستی پێیانیان ببیسترێ، دەچوونەپێش. لکەدار سەروچاویانی هەڵدڕیبوو. هاتنەخوارێ. خەریك بوو هەتاو بکەوێ. ڕوخساری حەمەد نیوە تاریك و نیوە ڕووناك بوو. لەگەڵ خەجیج چاویان تێك هەڵنەنگووت. ئیراز ئەوانی هەر لەوێ بەجێ هێشت و خێرا دوور کەوتەوەو لە پشت گابەردەکان ون بوو.

## (٢٨)

وەسەرکەوتن بۆ لووتکەی عەلیکۆ دژوار بوو. بەردەکان وەك بەردە سماتە دەست و لاقیانیان خواردبوو. سەریان لە گێژەوە دەهات. لە خواری، خاردەشت لـە نێـو هـەوران دا هێنـدەی لەپـە دەستێك دیار بوو. پێنج گوندی خاردەشت لەو نێوەدا دەتگوت پێنج خاڵن.

گەیشتنە بن ئەو شاخەی کە ئەشکەوتەکەی لە سەرەوە بوو. حەمـەد دەیتـوانی دووجـاریش بچێتە ئەشکەوتەکەو بگەڕێتەوە، بەڵام ئەو ژنانە دەبوو چ بکەن؟ حەستەم بوو.

حەمەد:

"ئێوە هەر لێرە بن، ئەمن لە پێش دا بارەکەمان دەبەمە سەرێ و پاشان دێم ئێوەش دەبەم."

حەمەد وەڕێ کەوت. ژنەکان لە رۆیشتنی حەمەد بەسـەر ئـەو دیـوارە بەردییـەدا سـەریان سوڕمابوو. حەمەد بە نیو سەعات گەڕایەوە. پێکەنین لە چاوەکانی دا دیار بوو:

"لە خانووش باشترە، قایم ترە... هێلانە هەڵۆیەکیشمان لە تەنیشتە، دراوسێی هەڵۆیانین."

دەستی خەجیجێی گرت و هەڵی هێنا:

ئەتۆ وەرە، پوورە ئیراز با لێرە بێ هەتا ئەمن دەگەڕێمـەوە. دەمـەوێ ئـەتۆ بـۆ هەڵۆیـەکان بەرم با بتخۆن."

خەجیج ترسا:

"دەبێ لەو دیوارەی وەسەر کەوم؟."

حەمەد:

"ئەتۆ کارت بەدیواری نەبێ، خۆت بە من بگرە."

دەستیان کرد بە خزین. خەجیج چاوی لە رەشەوە دەهاتن. یەك دوو جـاری زیڕانـد. حەمـەد تەشەری لێدا. وەسەر کەوتن.

ئیراز چاوەڕێ نەبوو. هەستاو وەڕێ کەوت. ترسا. دەستەکانی ئەوەندە ماندوو ببوون دەتگوت خەریکن لێ‌دەبنەوە. بەڵام وەختێك حەمەد دەیەویست بگەڕێتەوە سەری، دیتی ئەو وەسەر کەوتوە:

"ئەتۆ زگماك یاغیی پوورە ئیراز."

"ئەدی... زگماك."

زارکی ئەشکەوتەکە ئەوەندە فرەوان نەبوو کە بتوانن هەرسێك پێکەوە بچنەژوور. ئەشکەوتەکە قووڵ بوو. درێژ بوو. گڵی بەردەرکی ئەشکەوتەکە گلێك بوو بە وردی وەك ئاردو بە رەشی وەك خەڵووز. سەر ئەم گڵە پڕ لە جیقنە باڵندە بوو. دیواری ئەشکەوتەکە خەت خەتی سپیی پێدا هاتبوونە خوار.

حەمەد:

"هەتا ئەمڕۆ بنیادەم پێی دێرە نەناوە."

ئیراز:

"باشتر."

خەجیج:

"ئێرە دێی ئێمەیە."

ئیراز:

"ماڵی ئێمەیە."

خەجیج لە خۆشی‌یان چاوی پڕ ببوون لە فرمێسك:

"یاڵلا راست وەبن ماڵەکەمان رێك و پێك کەین."

ئیراز:

"یاڵلا..."

حەمەد:

"ئەمن دەچمە دێی. ئەم دەمانچەیەتان لە کن بێ. دەبێ وریای خۆتان بن."

خەجیج:

"ئاوێنەیەکم..."

ئیراز پێکەنی:

"ئای جحێڵی، ئای..."

خەجیج:

"لەگەڵ سەرینێك و دوو لێفە، پیاڵەیەك و مەنجەڵێك و سێڵێك و ئارد... ئیدی ئەوی دیکەی سلامەتیت. بۆخۆت دەزانی."

حەمەد:

"بەخوام سپاردن."

نیوەشەو بوو کە حەمەد گەیشتە ماڵی عەلی دورمووش. پیرێژن دەرگای کردەوە. هەر کە چاوی بە حەمەد کەوت، بە سس، سس بردیە ژوور.

حەمەد:

"چ بووە دایەحۆری؟."

حۆری:

"سس... دەنگ مەکە."

حەمەد ئیدی زاری هەڵنەپچری.

پیرێژن چرا فتیلەکەی هەڵکرد. پەنجەرەکانی توند داخست و چووە دەرێ. سوورێکی بە دەوری خانووەکە دا دا، کەسی نەدی هاتەوە ژوورێ:

"رۆڵەم... چۆن توانیت بێیە نێو دێ؟... دێ پڕ لە ژاندارمەیە. مامە عەلیتیان لەبن داران دا کوشتوە. بەستەزمان ریشیان دەگرت و بەسەر زەوی دا رایان دەکێشا. هەموو دێهاتیەکانیشیان دارکاری کردوە. هەمووی ئەمانەش کاری ئەو یەزیدە ریش بزنەیە. ئاخرەکەی نەت توانی بیکوژی و دەرچوو... خەبەری تۆیان لە مامە عەلیت دەویست... مامە عەلیت گوتی ئەمن خەبەرم نیە. ئیدی وەبەر قۆنداغە تفەنگانیان دا. ئەوەندەیان لێدا کە هێشتا لە جێی دا کەوتوە. لە منیشیان دا. هەموو گیانم رەش و شین بووە. زووتر ئەو یەزیدە بکوژە."

حەمەد:

"عەلیەشەل خەبەری چیە؟."

پیرێژن توورە بوو و دەنگی لێهەڵێنا:

"ئاخر چت پێ بڵێم؟... ئەتۆ هەرچی بەسەرت دێ خەتای خۆتە... بەخوا بۆیە دەبێ بە چەقۆیەکی کول کول سەرت ببڕن... ئەو وەختی لەبەر دەستت دا بوو گوتم بیکوژە، بەلام بە قسەت نەکردم و نەکردم... ئێستا بووەتە نۆکەری عەبدیخان. عەبدیخان خانووەکەی تۆشی داوە بەو. دەبوو هەر ئەودەم کە پێم دەگوتی بە قسەی منت کردباو کوشتبات. ئێستا شوێنی تۆی هەڵگرتوە. وەپێش ژاندارمان کەوتوەو شوێنی تۆیان بۆ دەگێرێ. بووەتە گزیری

عەبدیخان. حیساب و کیتابی خان ئەو بەسەری ڕادەگا. هەموو دێهاتییەکانی بە ژاندارمان بە کوتان دا... هەمووی خەتای تۆیە حەمەد. پێم گوتی بیکوژە."

"عەلییەشەل لە کوێ دەبێ؟."

"دەتەوێ لە کوێ بێ؟ لە ماڵەکەی تۆ، دوێنێ ژن و منداڵەکەشی هێناو دایەزراندن. ئێستا دەبێ ژنە خوێن تاڵەکەی ئەو حەرامزادەیە بێ لە ماڵی دوونەی خۆشەویستم بژی. بەخوا دڵم پڕە لە خوێن. لەداخان هەر وشك بووم. نازانم بڵێم چی. هەروا تەماشام کردوەو خۆم خواردوەتەوە."

حەمەد:

"ئەمن دەچمە وێ."

حەمەد هەڵستا.

پیرێژن:

"ئەوێ پڕە لە ژاندارمە. بەسپایی بچوو ئەو سەگبابەی بکوژەو هەڵێ."

حەمەد هاتە دەر. گەیشتە خانووەکەی خۆیان. بۆنی شیری کولیو و گوێرەکەی بەبەر هەڵلاهات. بۆنی گیای بەهاریشی هاتە بەر لووتی.

حەمەد:

"عەلی ئاغا، عەلی ئاغا."

وەختێك عەلی گوێی لە دەنگی حەمەد بوو، لە جێی دەرپەڕی، لە دڵی خۆی دا گوتی:"حەمەد حەتمەن شێت بووە... حەتمەن."

بەپەلە لە ژوور هاتەدەر. بەدەست حەمەدی تێگەیاند کە دەنگ نەکا. بۆخۆی بەدەنگی بەرز دەستی کرد بە قسەکردن:

"زۆر بەخێر بێی برام... چی؟... حەمەدۆك؟... حەمەدۆك لە ئاکچاداغە؟ چەند چاك بوو کە خەبەرت داینێ، ئێمە دەمانەویست لەلای "سپیيە قەڵا" شوێنی هەڵگرین. هەر بژی کاکە. سوپاست دەکەم."

پاشان بە گوێی حەمەدی دا چپاند:

"تۆ بچوو بۆ ماڵی عەلی دورمووش، ئەمنیش ئێستا دێم"

پاشان چووە ژووری بۆلای ژاندارمەکان:

"کابرا بای داوەتەوە بۆلای ئاکچاداغ. لەوێ وەك کەوبارە دەکرێ بە دەستان بیگری. ئێستا یەکێك لە پیاوەکانم خەبەری بۆ هێنام، ئیدی کارەکەمان ئاسان بوو. دەتوانین شوێنی ئەو بێناموسە هەڵگرین. لەوێ گەمارۆی بدەن و کارەکەی یەك لا بکەن. ئەمن دەچم مزگێنی بە

ژنی عەبدیخان دەدەم و دەگەڕێمەوە". هاتەدەرێ. شەوەکە زۆر تاریك بوو. لە ئازایەتیی حەمەد سەری سوڕمابوو. وەختێك شەلە هاتە ژووێ، دایە حۆری پێی سەیر بوو. تەماشایەکی حەمەدی کرد کە ماناکەی ئەمە بوو:"ئەتۆ قەت نابی بە بنیادەم."

حەمەد:

"دایە حۆری دەمەوێ دووسێ قسان لەگەڵ عەلیئاغا بکەم."

دایەحۆری:

"هەرچەندی پێتان خۆشە قسان بکەن. ئەمن هیچ حەز لە چارەی ئەو بێناموسە ناکەم. ئەمن کارم پێتان نیە. قسەی خۆتان بکەن."

شەلە پێکەنی:

"نازانم ئەو دایە حۆری خانە بۆچی بووەتە دوژمنی گیانیی من؟ ئەمن خۆ خەراپەیەکم بۆی نەبووە؟."

دایە حۆری لە داخان سەرێکی راوەشاند:

"ئەمن دەزانم ئەتۆ خەراپەت کردوە یان نا. ئەمن تۆ باش دەناسم شەلی سەگ مردوو. ئێستا لەگەڵ ژاندارمە رێك کەوتووی، وانیە؟... ئەگەر لەبەر خاتری حەمەد نەبووایە، نەمدەهێشت لەو دەرکەی بێیە ژوور. بەخوا بەردێکم تاو دەدایەو ئەو سەرە سەگباب خێوەتم وردو خاش دەکرد."

دایە حۆری چووە قوژبنێك.

شەلە:

"حەمەد تۆ ئەو خوایە پێم بڵێ چۆن توانیوتە لەو قیامەت و تەنگانەیەدا بێیە نێو دێ؟."

حەمەد:

"هەرچۆنێك بێ هاتین ئیدی."

"برایمەڕەش بە دواتەوەیە. لەو یاغییە خوێنخۆرانەیە. عەبدی و عەلی سەفابەگ لێیان تیژ کردووی. ئەوان دەڵێن برایمەڕەش بە حەمەدۆکی دەوێری، زۆری لێخاترجەمن، کۆڵێکیشیان پووڵ داوەتێ، بەڵام برایمەڕەش، ئەو برایمەڕەشی جاران نیە. حۆلیش بووە. لەگەڵ پیاوەکانی سەرجادەیان گرتوە، چاوەڕێن ئەتۆ بەوێ دا بڕۆی و تەقەت لێبکەن. ئەتۆ نابێ بەو دەوروبەرانەدا بڕۆی، دەنا دەتکوژن. با ئەوەشت پێ بڵێم کە ئەمن ئێستا بوومە گوڵەجەرگەی عەبدیخان، کەس ناوێرێ بڵێ عەلیەشەل پشتی چاوی بڕۆیە. هەر قسەیەکی هەبێ بە منی دەڵێ، هەرچیشی بوێ لە خۆم دەپرسێ... ئەو یەزیدە نەکوژراو نەکوژرا. بریا ئەو شەوەی ماڵەکەتان ئاور تێ بەردا نەتان هێشتبا ئەو ژنەتیوە بچێتە ژوور."

حەمەد بە خەفەتەوە:

"ئێمە چووزانین، بە چی ڕا بزانین؟."

"قەرار وایە برایمەڕەش سەری تۆ ببڕێ، بە دارخێزەرانێکیەوە بکاو بیهێنێ لەبەر دەرکی ماڵی عەبدیخان بیچەقێنێ... عەلیسەفابەگ قەولی پێ داوە."

حەمەد:

"ئێستا ئەتۆ دەبێ دوو لێفەو دوو دۆشەك و ئاوێنەیەك و مەنجەڵ و ئاردو ئەو جۆرە شتانەم بۆ پەیدا بکەی و بۆم لە بارگینەکە بنێی. خوێ و ڕۆن و ئاڵەت و زەردەچێوەشت لەبیر نەچێ."

عەلی:

"کارێکی نیە. خوا ئاغای خۆمم پێ بێڵێ! ماڵەکەی پڕە لەو جۆرە شتانە."

## (٢٩)

وەکیل باشی عاصم بە گوردانێک ژاندارمەوەو برایمەڕەش بە دارو دەستەکەیەوە پاییزو زستانێک لە کێوەکان مانەوە. خەڵکی دێهاتی کێوپارەی لە دەستیان وەزاڵە هاتبوون. هەرکام لە دێهاتی‌یەکان ڕێ‌یەکی پیشان دەدان. ئەوان ئاکچاداغ و "کایران داغ"و "کۆنووورداغ"و بەندەنی "مریەم چیل"یان پشکنی و چێوتەقیان کرد. نە جل و بەرگیان بە بەرەوە ماو نە هێزیان لە بەردا ما. هەر کونەمشکێکیان دەست کەوتایە دەیان پشکنی. بەڵام حەمەدۆک سەرو سۆراغی دیار نەبوو. هەروا بزانە لە جێ دا حەمەدۆکێک لەدایک نەببوو. نیوەی زستانێ لە ئاسیاب چەشمە مانەوە. هەموو کون و کەلێنەکانی عەلی‌کۆ گەڕان. بۆ ڕاوە شووریش چەندین جار چوونە عەلی‌کۆ، گەیشتنە نیزیک ئەشکەوتەکەش، بەڵام نەدەکرا وەسەر کەون.

عەلی‌یەشەل وەپێش ژاندارمەکان دەکەوت و چاو و ڕاوی بۆ دەکردن کە "حەتمەن دەی‌بینمەوە"، بەڵام ژاندارمەکانی دەبردە دەشتی هەزارگا. بە قسە شوێنی هەڵدەگرت!... ژاندارمەکان دەیانگوت:"چ بوو عەلی ئاغا؟... هەر ئەوە بوو هونەری شوێن گێڕانەکەت؟."

عەلی‌یەشەل گلەیی لە پیری دەکردو دەیگوت:"چ بکەین؟ پیری‌یە. چاوم وەک جاران نابینن. تازە پیر بووین و بۆی دەرچووین."

عەلی‌یەشەل پیر نەببوو. جوانتر ببووەوە. دەتگوت گێژەڵووکەی چوست و چالاکە. هومێدێک لە دڵی دا دەدرەوشا.

پاش ئەوەی پاییزو زستانێ کێوەکانیان کون بە کون و بست بە بست لە حەمەدۆک پشکنی، شەکەت و بێ‌حاڵ گەڕانەوە شار. لەو ماوەیەدا دوو دەستە یاغیی دیکەیان لە کێوەکان دا لەنێو بردبوو. دوو دەستەی گەورەو مل ئەستوور. بەڵام حەمەدۆک خەبەری نەبوو. شار ماتەم

دای‌گرتبوو. برایمەڕەش دە ساڵ پیرتر ببوو. دەیگوت:"ئەمن تا ئێستا شتی وام نەدیوە، نهێنی‌یەك، رەمزێك لە كاری ئەو حەمەدۆكە دا هەیە... دەڵێی غەیب بووە. بەڵام هەر جۆرێك بێ بەگیری دێنم و لەگەڵی بەرەورِوو دەبم. حەتمەن زانیویەتی دەمەوێ لەگەڵی یەك لا كەم. ئەو جارەی لە گەڵی شكۆفە تووشی بووم، سێرەم لە كەللەی سەری گرت و زیاتر لە سەد گوللەم لێدا. بەڵام هیچی نەبوو. گوللە كاری لێناكا، دەنا بە یەكەم گوللە دەمكوشت."

دەمێكی پێ چوو ئەم قسەیە لە هەموو شاری گەڕاو كەوتە سەر زارو زمانان "حەمەدۆك گوللە نایبڕێ". ئەم قسەیە بە گوێی عەبدی‌خانیش گەیشتەوە. عەبدی‌خان بە جارێك توابووەوە. ببوو بە چنگێك ئێسك و پێست. بە هیوای خەبەری مردنی حەمەدۆك كەوتبووە رۆژێك كە باسی ناكرێ. جار جار سەرێكی عەلی‌سەفابەگی دەداو دەیگوت:"ئەدی چ بوو عەلی‌سەفابەگ؟ ئەدی كوا؟ ئەوەندە چاوەڕوان بووم، نیوەی رووحم رۆیشت. ئەگەر هەروا بڕوا نیوە گیانەكەی دیكەشم لەنێو دەچێ". عەلی‌سەفابەگیش هەمیشە جوابی دەدایەوەو دەیگوت:"سەبرت هەبێ خان". چما نەت بیستوە دەڵێن ئەگەر سەبرت هەبێ لە بەرسیلەی هەڵوای دروست دەكەی؟ سەبرت هەبێ، حەوسەلەت هەبێ، ئەمن قەولت پێ دەدەم كە سەری دەبڕن و دەیهێنن لەبەر دەركی تۆ دەی‌چەقێنن. قسەی من قسەی پیاوانە عەبدی‌خان، بەڵام ئەتۆ دەبێ ئەختێك حەوسەلەت هەبێ."

ئەو خەبەرە كە "گوللە كار لەحەمەدۆك ناكا"، عەبدی‌خانی بە جارێك شێت كردبوو. یەكسەر چوورە لای ئەحمەدئاغای سیاسەتبازی عەریزەنووس. مەسەلەكەی لەگەڵ باس كردو داوای لێكرد دەسبەجێ تەلگرافێك بۆ ئەنكەرە بنووسێ. سیمای كەرانەی ئەحمەد ئاغای سیاسەتباز كەرانەتر بوو. زمانیشی لە زاری دا بوو بە گۆپاڵ و نوتقی بەسترا.

عەبدی‌خان:

"بنووسە ئەحمەدئاغا، ئەو جۆرە كە پێت دەڵێم بنووسە. بنووسە لەو چیایە یاغی‌یەك پەیدا بووە كە تینووی خوێنە، بنووسە منداڵان سەر دەبڕێ. بنووسە گەورە كچان لە ماڵەكان دەدزێ و دەیان باتە سەر چیاو سووكیان دەكا. بنووسە لە كێوی حكوومەتی دروست كردوەو رۆژ بە رۆژ دەسەڵاتی زیاتر دەبێ. بنووسە زەوی دابەش دەكا، مەزرای خەڵك دابەش دەكا، دێهاتی‌یەكان لە رێ دەردەكا، فێریان دەكا زەویی خەڵك لەنێو خۆیان دا داروبەش بكەن. بنووسە ئەحمەد ئاغا، جۆرێكی بنووسە بچێتە مێشكیانەوە. ئەوەی كە دەیڵێم، راست ئەوەی كە دەیڵێم بینووسەو خەتیشی لەبن بكێشە تا هۆشیان بێتەوە لای خۆیان. بنووسە ئەحمەدئاغا گیان. بنووسە پاش ئەوەی كچەكان لە كچێنی دەخا، لەبت و پەتیان دەكا، لەتك و پەتكەكانیشیان ورد دەكاو بە

دارانەوە هەڵیان داوەسیّ. بنووسە جادەو بەندەنەکانی ماراش لەبەر دەستی دارو دەستەکەی دایەو کەس ناوێریّ پیّ دەونێوە بنیّ. بنووسە ئاغا سیاسەتباز, بنووسە برای من. جۆرێکی بنووسە باش حاڵی بن, هەموو خوێندەواری‌یەکەت وەکار خە بە قوربانت بم... وای بنووسە کە هەرکەس لە ئەنکەرە بی‌بیسیّ, قامکی خۆی بگەزیّ. وای بنووسە دەسبەجیّ قشوون بنێرن. بنووسە ئەحمەد ئاغا, ئەمن دەچم چەند تەمرێك دەکرم و دێمەوە."

شار شڵەژابوو:"حەمەدۆك بستێك منداڵە؟... ئەگەر بستێك منداڵە, بۆ ناتوانن بیگرن؟."

هات و هاواری عەبدی‌خان لە لایەك و چاو و راوی عەلی‌سەفابەگیش لەلایەکی دیکە مەسەلەکەیان گەورەو گەورەتر دەکرد. دایکان بۆ ترساندن و بێدەنگ کردنی منداڵەکانیان ناوی حەمەدۆکیان دێنا:"بێدەنگ بە, دەنا بانگی حەمەدۆکی دەکەم."

پاش ئەو خەبەرو دەنگۆیانە, وەکیل باشی عاصم لەگەڵ ژاندارمەکانی خۆی و هێزی یارمەتی‌دەر سەرلەنویّ دەستووری وەرگرت کە وەدوای حەمەدۆك بکەویّ. برایم‌ڕەشیش سوێندی خوارد کە ئەمجار هەر جۆرێك بووە حەمەدۆکی دەگریّ.

## (٣٠)

گڵووکە زەردکە گوڵێکی کێوییە. لاسکی گڵووکە زەردکە ئەوەندە کورتە دەکرێ بڵێین هەر لاسکی نیە. لەسەر عەرزی وا دەبینرێ دەڵێی بە عەرزییەوە نووساوە. گڵووکە زەردکە لەنێو بەردان دا بە پەنای یەکترەوە دەڕوێ و وەك مافووره نێو بەردەکان پڕ دەکاتەوە. ڕەنگی زەردی هەتاو...

بەرزایی گوڵە شین و بنەوشییەکان دەگاتە ئەژنۆیان. بنەوشەکان شەدارن... کۆمەڵ بە کۆمەڵ رواون و دەدرەوشێنەوە. گڵووکە سوورکەی کێوی پشکوتوون. سوورایی ئەم گڵووکانە وەك سوورایی دیکە نیە... وەك بلووری سوور... شیرین و گەرم...

سەوزایی بە جۆرێك هەموو جێیەکی داگرتوە دەڵێی لەزەوی هەڵدەقوڵێ. ئەگەر لەسەر عەلیکۆ ڕا تەماشا بکەی، پێت وا دەبێ سەوزایی وەك باران دەبارێ. گابەردەکان پڕن لە پەڵە خەنەتیلکەی رەنگاوڕەنگ... هەوا سووکە... هەوا بۆنی مەستانەی گوڵانی لێ دێ.

لە بنارەکان، بەردەکانی عەلیکۆ سوورێکی مەیلەوشینن. هەوری سپی خۆیان لەو گابەردانە هەڵدەسوون و تێپەڕ دەبن. عەلیکۆ دەڵێی لە لانکە دایەو رادەژێ."

لە خوارەوەی بنارەکان، لەو جێگایە کە دەشتی هەزارگای لێوە دیارە، لەنێو تاقە تاقە داری کاج دا سەرچاوەیەك هەڵدەقووڵێ. حەمەد ئاوی خواردنەوەی خۆیان لەو کانییەڕا دێنێ.

دەرو دەشت هەتاو لێی داوە، خاردەشت لە رووناکایی دا نوقم بووە... هەموو شتێك و هەموو جێیەك، دارەکان، بڕکەکانی چەقڵەشینکە، بەردەکان و گابەردەکان تیشك باران دەکرێن... دەڵێی خەریکن لە تیشك دا دەتوێنەوە، گوڵەکانیش هەروا. خەجیج لە زارکی ئەشکەوتەکەدا سەری وەسەر ڕانی ئیراز کردوە. ئیراز ئەسپێیانی لێ دەکوژێ. سەری خەجیج ئەسپێی تێکەوتوەو چەندیش زۆر...

هــەموو زســتانەکەیان لــە ئەشــکەوتێ دا رابــوارد. ژووری ئەشــکەوتەکەیان وەك ماڵێــك رازاندبووەوە. ماڵی ئەوانە لەماڵی ئاغایەکی دەوڵەمەندی لادێش خۆشتر بــوو. نێــو ماڵەکــەیان بە گەڵای پەریوەشــان پــڕ فــەرش کردبــوو و لەســەر ئەویشەوە بــەڕەی گــوڵ تەشــپی و جوانیــان راخستبوون. بەڕەی دەسکری یۆرووکەکان... ئەو بەڕانە کــە بــۆنی بــەهاریان لــێدەهات. ئــەو بەڕانــە کــەریم ئــۆغڵیی خــانی یۆرووکــەکان, بــە جیــاز بــۆ خــەجیجێی نــاردبوون. دیــواری ئەشکەوتەکەیان بەکەوڵە شوور داپۆشیبوو, بە کەوڵی شوورە شاخ درێژەکان. شاخەکان دەتگوت سپی کراونەوە, دەبریسکانەوە. مووی شوورەکان دەتگوت خاکەی زێڕییە...

زستان زۆر ناخۆش رابردبوو. لە باو بــۆران و باسریــشکی لووتکــەی عــەلیکۆدا هەرچــەند هــەتا بەیانی ئاگریان دەسووتاند, بەڵام چەند جار مــەترسیی رەق بوونــەوە هەرەشــەی لــێکردبوون. حەمــەد مــانگ و نیوێك هەولی دابوو و سەرەنجام توانیبووی لە ســەرەوەی ئەشــکەوتەکە کونێــك بــۆ دووکــەڵ کێش بکاتەوە, بەڵام فایدەی نەبوو. دووکەڵ لە ئەشکەوتەکەدا دادەوەستا. لە تۆفان و بەفرو کرێــوەدا ناچار دەبوون جاروبار بێنە دەرو هەناسە بکێشن. سەرمایان دەبوو, لە سەرمان رەق دەبــوون, دەســت و لاقیان سڕ دەبوون و بە ناچار خۆیان بە ژووری ئەشکەوتی پڕ لە دووکەڵ دا دەکردەوە.

هەرچی لێفەو بەڕەو کەوڵە شووری هەیان بوو سێ بە سێ بەسەر خۆیان هەڵدەکێشان, خۆیان خــڕ دەکردەوەو بە یــەکترەوە دەنووســان. کــە هــەتاو دەکــەوت, حەمــەد دەچــووە راوە شــوور. ژنــەکانیش دەستیان دەکرد بە چێشت لێنان و گــۆرەوی چــنین. ئــەو کەوڵانــەی بــە دیواریانــەوە دابــوون هــی ئــەو شوورانە بوون کە حەمەد کوشتبوونی. ئەوان گۆشتی شــوورەکانیان دەخــواردو کەوڵەکانیــشیان وشــك دەکردەوە. تەواوی زستان تاقە یەك رۆژ چییە, بێ گۆشــت نــەبوون. ئــاردو رۆن و خــوێش بــە رێــك و پێکی عەلییەشــەل بــۆی دێنــان. لــەبناری کێــوی لــە ئەشــکەوتێك دا دایــدەناو حەمــەدیش لــەوێڕا دەیبردنەوە ئەشکەوتەکەی خۆیان. جێیەکەیان تەنانەت عەلییەشــەلیش پێــی نــەدەزانی. بــۆ ئــەوەی کاتێك لە ئەشکەوتەکە دەچوونە دەر, شوێنیان لەسەر بەفر دیار نەبێ, باوەشێك "قرژە ڕەشــکە"یــان بــە دوای خۆیــان دا رادەکێــشا. قــرژە رەشــکە باشــترین شــتە بــۆ ئــەوەی شــوێنی پــێ لەســەر بــەفر نەمێنێتەوە. شوێنی پێ هەرچەندیش قووڵ بێ, قرژە رەشکە وەك گردەڵ بە ســەری دا دەڕواو کــوێری دەکاتەوەو نیو سەعاتێکی پێ ناچێ کە شوێنی خۆشی بە تەواوی کوێر دەبێتەوە.

هەربۆیەش بوو کە هــەرچی عەلیکۆیان پشکنی, شوێنی ئــەوانیان نەدیتــەوە. ژاندارمــەکان چۆن گومانیان لەوەدا دەما کە ئەوان لەوێ نین؟ تەواوی کێوەکە بەفر بــوو. ئــەویش چ بــەفرێك؟ لووس. وەك ئاوێنە. دەتگوت لەپی دەستە.

خەجیج سەری وەسەر ڕانی ئیرازێ کردبوو:

"ئەدی کوا پوورێ؟... ئاخر بوو بە چی؟... کوانێ لێبووردنی گشتی؟... دیارە مام مستەفاش هیچی لێنازانێ. ئەگەر لێبووردنی گشتی دەرچووبایە، تا ئێستا دەردەچوو."

ئیراز:

"دەردەچێ کچم، دەردەچێ... سەبرت هەبێ. دەڵێن ئەگەر سەبرت هەبێ، لە پشتی هەموو تەپۆلکەیەک هەتاوێك هەڵدێ."

خەجیج:

"پوورێ گیان... ئەمن نامهەوێ لە پشتی هەر تەپۆلکەیەك هەتاوێك دەرکەوێ... ئەمن دەمەوێ تەنیا یەك هەتاو دەرکەوێ... تەنیا لە پشتی یەك تەپۆلکە... ئەمن هیچی دیکەم ناوێ."

ئیراز:

"سەبرت بێ."

خەجیج:

"ئێرە لووتکەی چیایە پوورێ. دەبینی قیسمەت و نسیبم چیە؟ دەبینی چیم لە نێوچاوانێ نووسراوە؟ دەڵێی خەون دەبینم. دەڵێی بۆخۆم نیم، حەمەدیش ئیدی حەمەد نیە."

ئەو ڕۆژانە کە بێکار بوون، حەمەد فێری تفەنگ هاویشتنی کردبوون. ئیراز بە باشی دەستی بە تفەنگ ڕاهاتبوو، ببوو بە تفەنگچییەکی تەواو. بەڵام خەجیج هەرچەند زەحمەتی کێشابوو، هیچی بە هیچ نەکردبوو. ئەسڵەن لە تفەنگ و گوللە بێزار بوو، کاتێك چاوی بە تفەنگ دەکەوت، ئاگری دەگرت:

"کەنگێ لەم وەزعە ڕزگار دەبین؟."

ئیراز:

"ئێستا گەنم لە چوکووراوا گەیشتوونە ئەژنۆیان، هێندەی نەماوە گوڵێ بدەن. ئێستا مێروولە لە هێلانەکانیان هاتوونە دەرو لەبەر هەتاو ڕێچکەیان بەستوە."

خەجیج:

"خاکی "ئاداجیك"..."

ئینجا چاوی لەسەر یەك دانان:

"ئێستا دەراڵە شاخەکانی ئاداجیك پڕن لە نێرگس... وا نیە پوورێ؟."

ئیراز:

"ئەدی پڕن لە نێرگس..."

خەجیج:

"خاکی ئاداجیك یەك بە چل دەبڕێ. ئەگەر بچینە وێ پاش ساڵێك خانووی خۆمان دروست دەکەین. پووڵیشمان خۆ هەیە."

ئیراز:

"قەباڵەکەی بە ناوی حەمەد دەنووسین. هەموو خاکی ئاداجیك ئی حەمەدی خۆمانە. لێبووردنی گشتی دەردەچێ. ئەگەر دەریش نەچێ, ئێمە جێگایەکی دیکە پەیدا دەکەین و دەچینە ئەوێ. ئەگەر کرابایە حەمەدی نسحەت بکەین کە دەست لە عەبدیخان هەڵگرێ زۆر باش دەبوو. دەچووین و ناوی خۆمان دەگۆڕی, ئەودەم وەختێك رۆژی دەهات, حەمەدی خۆمان عەلییشی دەکوشت و رای دەکرد. نا, نا, عەلیی دەبێ بە دەستی خۆم بکوژم, هەربۆیەش فێری تفەنگ هاویشتێ بووم."

خەجیج:

"گیروگرفتەکانمان چەند ئاڵۆزن پووری گیان؟."

ئیراز:

"زۆر, زۆر کچم... جار جار دڵم ئاسوودە دەبێ. دەڵێم لە جیاتی رەزا خوا کوڕێکی وەك حەمەدی داومێ. بەڵام هێندێ وەختان وەك شێتێکی پێ بە زنجیرم بەسەر دێ... هەر ئەو مەمکانەم کە رەزا شیری لێخواردوون, دەڵێی نشتەریان لێدراوەو خوێیان پێ کراوە دەبرژێنەوە. هێندێك جار ئەو دڵە شێتەم پێم دەڵێ تفەنگەکەت هەڵگرەو برۆ ئەو عەلییە بکوژە, پاشان هەرچی دەبێ بلا ببێ. سەبرکە کچم. ئەو عەلیەیەی وەك قیمە... خوا زەلیلت کا عەلی... چۆن دڵت هات ئەو کوڕە تووڵەنەمامەی من لە خۆڵ و خوێن بگەوزێنی؟."

خەجیج:

"سەبرت بێ پووری... لە پشت هەر تەپۆڵکەیەك هەتاوێك دەردەکەوێ. ئەمن دەترسم پووری. دەزانم کە دەردەکەوێ, بەڵام..."

ئیراز تەشەری لێداو چاوی لە چاویەوە بڕی:

"دیسان دەستت پێ کرد؟... ئەتۆ ئاخری کوڕەکەی بە کوشت دەدەی. ئەتۆ بە دەستی خۆت دەتەوێ ئەو کوڕەی بە کوشتێ بدەی؟."

خەجیج ملی بە لاوە نا:

"حەوتوویەکە ڕۆیشتوە پووری. جاران کە دەڕۆیشت سێ ڕۆژ زیاتری پێ نەدەچوو، بەڵام ئەم جار بوو بە حەوتوویەك. ئاخر ئەم کێوانە... ئاخر یاغییەکان... دەترسم پووری، دەترسم پووری گیان، هیچیش ناکرێ، دەترسم، وەختە دیق بکەم پووری، دڵم وا تەنگە هەر باسی مەکە، سێ ڕۆژ زیاتری پێ نەدەچوو پووری، ئاخر وانیە؟... نەکا بەڵایەکی بەسەر هاتبێ... با ئەمن بچمە لای ئاوەدانی خەبەرێکی لێبزانم، با ڕوو لە کێوان کەم، با هەموو جێیەك بگەڕێم... ئەگەر بەڵایەکی بەسەر نەهاتبایە، حەمەدم هێندەی پێ نەدەچوو پووری."

خەجیج زۆر زۆر گریا:

"با بڕۆم پووری گیان، لێم گەڕێ بڕۆم..."

ئیراز نێوچاوانی تێك ناو تەشەری لێدا:

"کچێ لە جێی خۆت دانیشە جندە... بەخوا هەنگاوێك هەڵێنیەوە هەر بە تفەنگ دەتکوژم. پێویست نیە بچی ژانەسەر بۆ کوڕەکە دروست بکەی. ئەگەر ئەتۆ دەست و لاقی نەبەستی ناتوانن هیچی لێبکەن... دێتەوە."

خەجیج هەڵستا، غاری دایە نێو ئەشکەوتەکەو لەپەوڕوو کەوت. بە هەنیسك دان دەگریا. سەری بە هەنیسکانەوە هەڵدەگیرا. ماوەیەکی زۆر هەروا مایەوە. کەمێك ئارام بووەوە. دووبارە تێك چووەوە. ئیراز هاتە ژوور سەری:

"کچم، کچم... خەجیجێ خۆم، کچە جوانەکەم... بۆچی خۆت دەکوژی؟ حەیف نیە بۆ کچێکی وەك تۆ نازەنین کە ئاوا خۆت بە هیلاك بدەی؟... خاترجەم بە حەمەد هیچی بەسەر نەهاتوە. حەمەد بە تەنێ خەنیمی سەد کەسە کچم، خۆت هیلاك مەکە."

خەجیج فرمێسکی چاوەکانی سڕیەوە:

"خوا بکا وابێ پووری... خوا لە زارت بروانێ..."

لە خوارێ مژ لەسەر خاردەشت بڵیند ببوو. پەڵە هەورێکی ڕەش بە ئاسمانەوە دەسووڕا کە حەمەد شەلاڵی ئارەق و بە دەست و لاقی خوێناوییەوە، بە هەناسەبڕکە خۆی لە ژووری ئەشکەوتێ هاویشتەوە.

خەجیج هەر کە چاوی بە حەمەد کەوت ئامبازی بوو و بە گریانەوە دەستی دەستۆی کرد. هەرچەندی دەگریا، گریانەکەی نەدەوەستا.

حەمەد:

"مەگری خەجیج, با بۆت بگێڕمەوە. ئێستا کەمێك ئارام بەوەو گوێم بۆ بگرە."

حەمەد دەستی بەسەر سەری خەجیج دا دێنا.

ئیراز تووڕە بوو. بە ئانووت و تەشەرەوە دەستی خەجیجێی گرت و کێشای:

"چ باسە کچێ؟... چتە؟... وەك ئەدی بدییان... ئاخرەکەی ئەتۆ سەری ئەو کوڕەی لە بەردێك دەدەی... بەری دە, ئەو کوڕەی."

حەمەد پێکەنی:

"با بۆتان بگێڕمەوە تا بزانن چم بەسەر هاتوە. وەختێك لە لای کەریم نۆغلی دەگەڕامەوە, لە دەورووبەری "ساریجا" کەوتمە داوی برایەڕەش. کابرایەکی سەیرە, هەم ئاقڵەو هەم ئازایە. هەتا بناری کێوی وەدوام کەوتن. لەوانەیە تازە ئێرەش بدۆزنەوە. ئەمڕۆ ڕاست سێ ڕۆژە کە لەگەڵ برایەڕەش خۆشارەوەکێن مان دەکرد. لەبەریان هەڵدەهاتم, هەڵدەهاتم و دوایە لە نەکاو بام دەدایەوە سەریان. هەتا ساریجا ڕێیان دەکەوتم و دەگەڕامەوە. وەختێك ئەمن دەگەڕامەوە ئەوان ڕێم دەکەوتن. خۆشارەوەکێنێکمان ساز کردبوو هەر مەپرسن. تەنیا غەمی ئەوەم هەیە کە جێگاکەمان فێر بن. پاشان بە یارمەتیی جەبار لە بناری گێژم کردن, شوێنەکەمیان لێ ون بوو و هاتم. حەوتوویەك نابێ لە ئەشکەوتێ وەدەر کەوین. ئێستا ئێوە برینەکەم بۆ ببەستن."

هەردوو ژنەکە بە هاوکاریی یەکتر جلەکانیان لەبەر حەمەد داکەند. شانی بریندار ببوو. کاتێك گوللەکەیان لە برینەکەی دەردێنا, حەمەد لەرزی هاتێ, ئەویش لەرزێکی چۆن... ئەژنۆی خڕ کردنەوە, بە سنگییەوە نان و دەستی کرد بە هەڵچۆقین. خەجیج سەری لێ شێواو ئەقڵ لە سەری دا نەما. خەجیج شێت ببوو, نەیدەزانی چ بکا."

حەمەد حەوتوویەکی تەواو ئەو تاو لەرزەی لێبوو. برینەکەی چڵکی کردبوو. زۆریش ئەستوور ببوو... حەوتوویەك دواتر سووکتری کردو توانی قسەکەی تەواو بکا:

"پێش ئەوەی بگەینە ساریجا لەگەڵ ژاندارمەکان تێك هەڵنەنگوتین. دە کەس بوون. سەرکردەکەشیان وەکیل باشی عاصم بوو. تەقەمان لە یەکتر کرد. پێم وایە ئاخرەکەی ئەجەلی ئەو وەکیل باشی عاصمە بە دەستی من دێ. هەڵدەستاو بێ پەروا بۆ لای من دەهات. جارێك پێم گوت چتە وەکیل باشی? نەکا لە گیانی خۆت گوزەرابی. تفەنگەکەم بەرەو سنگی ڕاداشت. وەکیل باشی عاصم وەختێك لە نەکاو چاوی بە من کەوت, کە لە ژوور سەری ویم, ئارەتەیەکی کێشاو خۆی لە عەرزی دا. گوتم مەترسە وەکیل باشی. ئەتۆ گوناحێکت نیە, ئەمن ئەگەر ویستبام بتکوژم تا ئێستا دە جارم کوشتبووی. هەستە بڕۆ وەدوای کاری خۆت کەوە. یەك وشەش جوابی نەدامەوە. پاشان قەرار بوو ئەفەرێك لە ساریجا چەك و فیشەکم پێ بگەیەنێ.

وەختێك گەیشتمە ئەو جێگایە کە دامان نابوو، لەپڕ بوو بە گوللەبارانێك، مەپرسە...
برایمەڕەش وەك خێزو خۆڵ گوللەی دەباراند. بریندار بووم. دوو ڕۆژان لە دوام بوون. لەو بگرەو
بەردەیەدا دەنگێکم هاتە بەر گوێ وەك دەنگی جەبار دەچوو. دەنگەکە ڕاست دەنگی جەبار
بوو. تۆمەز هەر خۆیەتی، بە هاوارمەوە هاتوە. ئەویش لەولاوە هێرشی کردە سەر برایمەڕەش.
برایمەڕەش و دەستەکەیان ڕاونا، بەڵام کاتێك دەگەڕاینەوە، دیسان پەیدا بوونەوە. ئەمجارە جەبار
فریوی دان و بە دوای خۆی دا ڕایکێشان و ئەمن ڕزگاریم هات. بەڵام جەبار خۆیم نەدی.
دڵنیام جەبار دەرۆستیان دێ. ئێمە ئیدی دەبێ ئێرە چۆڵ کەین. ئەم دەوروبەرە تازە بۆ ئێمە
نابێ. هەمیشە بە دوامانەوەن. هەمووی ئەم کارانە لەبن سەری عەلیسەفابەگ دان."

حەمەد حەوتوویەکی دیکەش لە جێی دابوو. هەر دوو ڕۆژ جارێك لە بنارەکان دەنگی تەقە
بەرز دەبووەوە.

برینی حەمەد ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر دەبوو.

## (٣١)

پاییز داهاتبوو. خەڵکی خاردەشت بە دڵگەرمی‌یەوە کاریان دەکرد. ئەمساڵ بەرهەم زۆر باش بوو. گوڵەکان قورس بوون, پڕ لە دان بوون.

دایە حۆری وەك گێژەڵووکە لە خاردەشت دا دەسووڕا, وەك یەکپارچە گڕ. لە پەستا قسەی دەکرد, جنێوی دەدان. پاش ئەوەی ژاندارمەکان دارکاری‌یان کردبوو, پەراسووی راستی ئازاری گەیشتبوو. وا دیار بوو شکاوە, ژانی دەکرد. بنێشتەکاڵی لە پەراسووەکەی نابوو. وەختێك هەناسەی هەڵدێنایەوە دەم و چاوی گرژ دەبوون و سەرلەنوێ وەك خۆی لێ‌دەهاتەوە:

"خوا کوێرو زەلیلتان کا... ئاخر چتان لە گیانی پیرەژنێکی وەك من دەویست؟..."

پاشان بە ناڕەحەتی‌یەوە دەستی پێ کرد:

"ئۆهۆی دێهاتی‌یەکان... ئیدی ئەمساڵ کەس نیە دوو بەشی بەرهەمەکەتانتان لێ بستێنێ... عەبدی‌خان ناوێرێ بێتەوە ئاوەدانی, ئەگەر بیدەنێ کەرن. لە کەریش خەراپترن. هەر بڵێن ئەمساڵ بەرهەم باش نەبوو. باشە؟... درۆش ناکەین, چما بەرهەم باش بوو؟... نا, خەراپ بوو. ئەسڵەن ئەمساڵ بەرهەم نەبوو. باشە چ بکەین. ئەگەر دەتەوێ وەرە روحمان لێ‌بستێنە. بەڵام بەرهەم... ئەسڵەن با بڵێین ئەمساڵ تەواوی بەرهەمەکە سووتاو لەنێو چوو."

دایەحۆری لە ئاسیاب چەمەوە دەچووە ئەو دێ و لەو دێڕا دەچووە دێیەکی دیکەو دەهاتەوە. لە ڕێگاش دا لەگەڵ خۆی دەدوا. ئەگەر چاوی بە کەسێك دەکەوت کە خەریکی گێرە یان دروێنە بوو, لێی دەچووە پێش و دەستی پێ دەکرد:

"دەبێ دوعا بۆ عومرو ماڵی حەمەدۆك بکەن, شەو و رۆژ دەبێ دوعای بۆ بکەن. تێ‌دەگەن دەڵێم چی؟... دوعای بۆ بکەن. ئەگەر حەمەدۆك نەبوایە, ئێستا عەبدی‌خان وەك داڵاش بەسەر

سەرتانەوە دەسوورا. شوکری خوا بکەن کە ئیدی ناویری پێ لەم دێیە بنێتەوە. نابێ دەنکە گەنمێکیشی بدەنێ، تێدەگەن؟ یەك دەنکیشی نابێ بدەنێ. با لە شاری بۆخۆی هەر وەرکەوێ."

دێهاتی‌یەکان لە فکرەوە دەچوون. سەریان رادەوەشاند. کڵاویان لەسەر سەری خۆیان لادەبردو سەری خۆیان دەخوراندو دەیانگوت:"بزانین ئاخری ئەم کارانە دەگاتە کوێ؟ سەرەنجامەکەیان بە کوێ دەگا."

دروێنە تەواو بوون، گێرەو کێشە کراو خەرمان سوور بوون... بەرهەمەکەیان بردەوە ماڵێ. هیچ کەس دەنکە گەنمێکی نەدا بە عەبدی‌خان. عەلی و پیاوەکانی دیکەی عەبدی‌خان لەنێو دێی دا دەسووڕانەوە، بەڵام دەچوونە کن هەرکەس، ئەم وەڵامەیان وەردەگرتەوە:

"روحیشمان هی ئاغامانە. ئاغای ئێمە لەنێو هەموو ئاغایان دا یەکەمە. ئێمە رازی نین ئاغامان لە شاری غەریب و سەرگەردان بێ، بەڵام... ئەمساڵ دەنکە گەنمێك چیە وەدەستمان نەکەوتوە. چ بکەین؟ وەختێك نیە، لەکوێی بێنین؟ ئیشەڵلا ساڵێکی دیکە. ئیشەڵلا ساڵێکی دیکە خوا دەیدا بە ئێمەو ئێمەش دەیدەین بە ئاغامان. ئاغای ئێمە گوڵە. ئەو حەمەدۆکە بێژووە بوو بە باعیس کە ئاغا زێڕەی ئێمە دێیەکە چۆڵ کاو بچێتە غەریبایەتی. بەڵام ئاغامان لێی خۆش نابێ. ئیشەڵلا ساڵێکی دیکە ئەگەر خوا دای بە ئێمە، هەمووی دەدەین بە ئاغامان. ئێمە برسی بین قەیدی نیە، چونکە ئاغامان دەبێ سلامەت بێ. تێگەیشتی؟ ئێمە هەرچی هەمانە، هی ئاغامانە. خاردەشت پێنج دێی هەیە، هەر پێنجی بە قوربانی گیانی ئاغامان بێ."

دەیانگوت:

"قسەی قۆڕ بۆ دەکەن؟... ئەوەتا خاردەشت خاردەشتە، بەرهەمی وەك ئەمساڵی نەبووە. باشە بۆچی راست و رەوان ناڵێن نایدەین؟ بۆچی راست و رەوان ناڵێن ئاغاو ماغامان قبووڵ نیە؟."

دێهاتی‌یەکان:

"بریا کوێر باین و ئەمان دیتبا کە ئاغا زێڕەکەمان لە شاری‌یە، لە غەریبایەتی دەربەدەرە... بریا هەمان بایەو بۆمان ناردبایە، بریا... چما دەکرێ ئێمە حەقی ئاغای خۆمان نەدەین. رەبی خوا ئەو حەمەدۆکەی بکوژێ کە..."

دایە حۆری باڵی دەرکردبوون و دەفری. زەحمەتەکەی بەفیڕۆ نەچووبوو. ئامۆژگاری‌یەکانی کاری خۆیان کردبوو. هیچ کام لە دێهاتی‌یەکان ئامادە نەبوون تەنانەت دەنکە گەنمێکیش بدەن بە عەبدی‌خان، نەیاندەدا...

دایە حۆری پرچە سپی‌یەکانی لە خەنە گرتبوو، چارشێوەکەی لەسەری کردبووەوەو لە جیاتی‌یان لەچکێکی ئاوریشمی گوڵداری لەو لەچکانە لەسەری بەستبوو، کە گەورە کچ لە وەختی جێژن و زەماوەند دا لەسەری دەبەستن. کراسە کورتەکەشی هەر ئاوریشم بوو. سێ سکەی زێڕیشی لە مل کردبوون. ئەو مت و مووروەی سەردەمی جحێڵی و کچێنی‌یە لە سندووقێ دا قایم کردبوون، هێنابوونیە دەرو لەمل و قۆڵی خۆی کردبوون. هەمیشە پێکەنینی لەسەر لێوان بوو. لەم ماڵەوە دەچووە ئەو ماڵ و دەهاتەوەو هەمیشەش بە ئارە ئار گۆرانیی دەگوت. هەموو کەس دەیگوت:"وادیارە دایەحۆری شتێکی بەسەرهاتوە...". حەقیشیان هەبوو، چونکە دایەحۆری گۆرانیی وای دەگوت کە گەورە کچانیش بە بیستنی لە شەرمان سوور هەڵدەگەڕان. لەو گۆرانی‌یە بێپەردانەی دەگوتن...

وەختێك عەبدی‌خان بیستی دێهاتی‌یەکان ملکانەیان نەداوە، بە جارێك جندار بوو. هەستاو چووە لای ئەحمەدئاغای سیاسەتبازو بە گریانەوە تەلگرافێکی زۆر کاریگەری بۆ ئەنکەرە پێ نووسی، پاشانیش هەستاو چووە نێو شاری. تووشی هەرکەس دەبوو لە سیرێ تا پیوازێ هەموو شتێکی بۆ دەگێڕایەوە. چووە خزمەت فەرماندار، چووە خزمەت فەرماندەی ژاندارمری و گریا، هاواری کردو ناڵاندی. فەرماندارو فەرماندەری ژاندارمری لەو وەزعە تووڕە بوون. ژاندارمە لە دوای ژاندارمە ناردیانە ئاسیاب چەشمە. ژاندارمەکان خەڵکی دێیان ئەزیەت و ئازار دەدا. دایە حۆری‌یان لە ژوورێك دا حەپس کرد، بەڵام دایە حۆری و هیچ کام لە دێهاتی‌یەکان زاریان هەڵنەپچڕی کە قسەیەك بکەن. لێدانیان خوارد، جوێنیان پێ درا، وەك مێگەلەمەڕ بەم لاو لادا ڕەپێ نران، بەڵام زمانیان نەگەڕا، دەتگوت خەڵکی پێنج دێ هەموویان زگماك لاڵ بوون.

کار گەیشتە جێگایەك کە بەخشدار ناچار بوو بۆخۆی بێتە ئاسیاب چەشمە، بەڵام ئەویش هەرچی کردی و کراندی کارێکی لە دەست نەهات. کەس دەنگی لەبەر دەرنەهات. دێهاتی‌یەکان هەروا چاویان لە چاویەوە دەبڕی و متەقیان نەدەکرد.

یەکەم جار عەلی‌پەشەل دەستی کرد بە قسەکردن و جۆرێکیشی قسە کرد کە هەموو لادێی‌یەکان سەریان سوڕما:

"گیانی هەموومان دەکەین بە قوربانی ئاغامان. ئەو یاغی‌یە بێت و نیوی‌یە، ئەو حەمەدۆکە حەرامزادەیە چ کارەیە کە ئێمە گوێ بۆ قسەی رابگرین؟ ئەگەر ئاقە دەنکێکمان گەنم بووایە، بە دەستی خۆمان دەمان دا بە ئاغامان. حەمەدۆك ئاخر چ سەگبابێکە؟ بەڵام چ بکەین کە ئەمساڵ قاتی بوو؟... ئەگەر ئەمساڵ ئێمە هەموومان لە برسان نەمرین،

مۆجیزەیە. ئەمن بۆخۆم هەمەکارەی ئاغام، بەلاّم ئەمسالّ منیش ئەگەر لە برسان نەمرم باشە. ئەگەر یەك دەنکە گەنمان لەم خاکە دەست کەوتبایە، ئی ئاغامان بوو."

شەلە بێدەنگ بوو، چاوێکی بە دێهاتی‌یەکان دا گێڕا کە وەك مەڕ سەریان دەبەریەك نابوو:

"لە ئێوە دەپرسم... ئەگەر تاقە یەك دەنکە گەنمان بەرهەم هێنابایە، نەماندەبرد بیدەین بە ئاغا زێڕەی خۆمان؟."

دێهاتی‌یەکان شەپۆلێکیان داو زمانیان کرایەوە:

"دەماندایە."

شەلە:

"ئەگەر ئاغامان داوای روحی لێ‌کردباین؟..."

دێهاتی‌یەکان:

"دەماندا."

شەلە:

"ئەگەر حەمەدۆك پێ بنێتە نێو ئاوەدانی؟..."

دێهاتی‌یەکان:

"ناتوانێ."

شەلە:

"ئەگەر بێ؟."

دێهاتی‌یەکان:

"دەیکوژین."

دیارە جەنابی بەخشدار باوەڕی بەم قسانە نەکرد. مالّ بە مالّی ئاوەدانی‌یان پشکنی، بەلاّم لە هیچ مالێك دەنکە گەنمێکیان نەدیتەوە.

زۆر سەیر بوو. بەڕاستی دێهاتی‌یەکان ئەو هەموو گەنم و دانەوێلەیان لە کوێ شاردبووەوە؟

هەرچی لە خاردەشت رووی دابایە رۆژی دواتر دەگەیشتەوە شاری. ئیدی دەرگای خاردەشت بەرەو دنیا کرابووەوە.

عەبدی‌خان شێت ببوو و مووی سەرو ریشی خۆی دەرنیەوە. دیار بوو هەموو ئەم کارانە لەبن سەری حەمەدی دان. ئەو دەبوو حەتمەن بکوژرێ. هەر لەم رۆژانەش دا حوسێن ئاغای ئاك توزلوو، لەنێو نوێنی خۆی دا تفەنگی لێ‌درابوو و مردبوو. ئەم مەسەلەیەش ببووە سەرباری مەسەلەکانی دیکە. ئەم کارە دەبوو کاری چ کەسێك بێ؟ حەتمەن کاری حەمەدۆك بوو...

وەکیل باشی عاصم پیاو بوو، پیاوێکی باشیش بوو، گورگی ئەو کێوانەش بوو... بەڵام چ بکا کە لەگەڵ هەمووی ئەمانەش نەیدەتوانی حەمەدۆکی بگرێ...

سەرکۆنە لە دوای سەرکۆنە... وەکیل باشی تیدی سەری هەڵنەدەهات. رووی نەبوو بە نێو بازاڕی شار دا رابرێ. شەرمی لە هەمووان دەکرد. خەڵك پاشەملە هەزار قسەیان پێ دەگوت. زۆربەی ئەم قسانەشی دەبیستەوە:

"حەمەدۆك بستە منداڵێك زیاتر نیە!... بەڵام وەکیل باشی عاصمی بەو هەموو مل ئەستووریيە وەك ئەنگوستیلە لە قامکی کردوەو یاریی پێ دەکا!."

وەکیل باشی لە داخان خۆی دەخواردەوە.

## (٣٢)

عەلیکۆ بە دارو بەردو خاك و خۆڵیەوە بەفر دایپۆشیبوو. سەر ئاسمانیش هەتا چاو بڕی دەکرد, سپی دەچووەوە. سپیایییەکی بێ سەروبن لە عەلیکۆوە تا خاردەشت و لەوێوە تا ئاکچاداغ و گەڵی شکۆفەو چوکووراواو هەموو جێیەکی داپۆشیبوو. تەنانەت خاڵێکی رەش لەنێو ئەو سپیایییە یەك رەنگەدا نەدەبینرا.

هەتاو لەو سپیایییە بێ سەروبنەی دەدا. جار جار پەڵە هەورێك سێبەری دەخستە سەر ئەو سپیایییە یەکپارچەیەو تێپەڕ دەبوو. وەختێك هەتاو لە سپیایییەکەی دەدا چەندین میلیۆن تیشکی وەك داوە دەزوو لەسەر بەفر هەڵدەستان و لە چاوی ئینسانی دەچەقین.

وەزعی ئەشکەوتەکە خەراپ بوو, نە ئارد, نە داری سووتاندن و نە هیچ شتێکی خواردن نەمابوو. مووی سەرو ریشی حەمەد تێك ئاڵقابوو. ئیراز بە جارێك توابووەوەو رەش داگیرسابوو.

خەجیجیش هەر باسی مەکەن, تۆلی بە تەواوی هەستابوو. دووگیان بوو, لەسەر مانگ و رۆژی خۆی بوو. ئیراز دەیگوت:"ئەگەر ئەمڕۆ نەزێ, سبەینێ مسۆگەرە."

خەجیج زەرد ببوو. ملی ئەوەندە باریك ببوو دەتگوت داوە دەزووە... بسکە رەش و بریقەدارەکانی بە جۆرێك وشك و سیس ببوون کە دەتگوت گیای وشکن...

وەکیل باشی عاصم مۆڵەتی نەدەدا. لە پاییزێوە لە دەوروبەری ئاسیاب چەشمەو بنارەکانی عەلیکۆ دەگەڕاو دەگەڕا.

ئیراز حەمەدی بردە دەرێ:

"ئەمڕۆ باو بۆران نیە کوڕم. هەر کارێك دەتەوێ بیکەی ئەمڕۆ رۆژیەتی. ئەو کچە ئەوڕۆ نەزا سبەینێ دەزێ. ئەگەر ئێمە دەچینە دێی با بچین, ئەگەر دەبێ لێرە بزێ با شتی بۆ ساز بکەین. هەر کارێك دەبێ بیکەی ئەمڕۆ رۆژیەتی."

حەمەد ریوەڵە ببوو و لە مووی ریشی دا نوقم ببوو. نێوچاوانی تاڵ بوو:

"ناتوانین بچینە ئاوەدانی. هەموو دێیەکەی ماڵ بە ماڵ دەگەڕێن. چارەمان نیە, هەر دەبێ لێرە خۆی بۆ ساز کەین."

ئیراز:

"لەوانەیە کچەکە هەتا یەك دوو سەعاتی دیکە بژێ. هەر کارێك دەتەوێ بیکەی بیکە."

حەمەد جار جار دەچووە ئاوەدانی. بەڵام هەمیشە باوەشێکی قرژە رەشکە بە دوای خۆی دا رادەکێشا.

چوونە ژوورێ. خەجیج لە پەنا دیواری ئەشکەوتێ دانیشتبوو و پاڵی دابووەوە. دەتگوت چاوی بڕیوەتە جێگایەکی دوور. نە جووڵەی دەکردو نە هیچی دەگوت. چاوەکانی دەتگوت سەهۆڵیان بەستوەو هەروا بە مۆڵەق وەستابوون.

حەمەد:

"خەجیج, ئەمن و پوورە ئیراز دەچینە ئاوەدانی. ئەتۆ فیشەك وەبەر تفەنگەکەت بدەو چاوەڕێ بە هەتا ئێمە دێینەوە."

خەجیج:

"ئەمن ناتوانم بە تەنیا بێنمەوە."

حەمەد:

"ئەدی چ بکەین خەجیج؟."

خەجیج:

"ئەمنیش دێم."

حەمەد:

"خەجیج کاری وا نەکەی."

خەجیج:

"ئەمن لێرە خەریکم دەمرم."

حەمەد:

"پوورە ئیرازیش لە کنت دەمێنێتەوە."

خەجیج:

"نابێ."

حەمەد:

"بۆچی وا دەکەی خەجیج؟."

خەجیج:

"چ بکەم؟."

ئیراز:

"لێرەبە کچم."

خەجیج:

"ناتوانم."

ئیراز:

"بەڕاستی لەو وەختەوە هاتووینە چیا, ئەخلاقت گۆڕاوە."

خەجیج:

"راست دەکەی."

حەمەد:

"خوا بتکوژێ."

بێدەنگ بوون. حەمەد چوو لە گۆشەیەك دانیشت و سەروچاوی لەنێو دەستانی گرت و لە فکرەوە چوو. فکری خەراپی دەکردنەوە. هەڵۆیەك بەسەر ئەشکەوتەکەدا چەرخی دەدان. باڵەکانی درێژ بوون...

حەمەد:

"ئێوە لێرە بن."

حەمەد دەستی کرد بە چوونەخوار. وەك شێتانی لێهاتبوو. وا بەرەو خوار دەخزی دەتگوت غار دەدا.

ئیراز تەشەری لە خەجیج دەدا:

"چت لە گیانی ئەو کوڕەی دەوێ, خێرنەدیتوو... کوڕەکە دەردی خۆی بەس نیە؟ ئێستا دەبێ دەردی تۆشی لێ ببێتە سەربار؟... لایەك ژاندارمەکان و لایەکیش ئەتۆ..."

خەجیج زاری هەڵنەدەپچڕی.

پاش نیوەڕۆیە ئیراز لە ئەشکەوتێ هاتەدەر, بەڵام داخ و مەخابن!... حەمەد لەبیری چووبوو گردەڵێ قرژە رەشکە بە دوای خۆی دا بەرێ. تۆپزایی قرژە رەشکەکە لە جێی خۆی دیار بوو. وەك شێتان دەستی کرد بە بانگ کردن بۆ لای بەرەوە. حەمەد لەمێژ بوو دوور

کەوتبووەوە. هەرچی تینی تێدا بوو، دای بە گەرووی و بانگی حەمەدی کرد. پاشان هاتەوە ژوورێ و خۆی بە عەرزیدا دا:

"موسیبەت، موسیبەت... دەترسم موسیبەتێکمان بەسەر بێ. لەبیری چووە گردەڵی قرژە رەشکە لەگەڵ خۆی بەرێ. باو بۆرانیش نیە کە شوێنەکەی پڕ بکاتەوە. هەوا تاو و ساوە. ئەگەر بەوێ بچم شوێنەکەی پاك بکەمەوە، لەدەستم نایە. ناتوانم بەو جێیانەدا بڕۆم کە ئەو پێیان دا ڕۆیشتوە."

شەوی ڕۆژی دواتر حەمەد هاتەوە. ڕەنگی بە ڕووانەوە نەمابوو. لەژێر ئەو کۆڵەدا کە هێنابووی پلیشابووەوە.

حەمەد:

"زۆر ترسام، وەختێك گەیشتمە خوارێ، لەپڕ وەبیرم هاتەوە کە گردەڵە قرژە ڕەشکەکەم لەگەڵ خۆم نەهێناوە. بەڵام تازە نەدەکرا وەگەڕێم... ئەگەر ویستبام بگەڕێمەوە گردەڵەکە هەڵگرم و سەرلەنوێ بڕۆمەوە، شەوم بەسەر دەهات. دڵم هەر لە لای ئێوە بوو. زوو هاتمەوە. ژاندارمەکان یەخەی عەلیپەشەلیان گرتوەو داوایان لێکردوە شوێنی منیان بۆ هەڵگرێ. لەو بارەوە زۆر دەترسم. ئەگەر چاوی بە شوێنەکە بکەوێ، کار تەواوە. چونکە خۆی پێ ڕاناگیرێ، یەکسەر ژاندارمەکان دێنێتە ئێرە. بۆخۆی فێری کردبووم گردەڵێك لە قرژە ڕەشکە دروست بکەم. سوێندی دابووم کە قەت لەبیرم نەچێتەوە. بۆخۆشی دەزانێ ئەگەر چاوی بە شوێن کەوت خۆی پێ ڕاناگیرێ. بۆیە دەترسم. ئەویش لەم وەختەدا..."

ئیراز:

"ئەو بێناموسیی‌یەی ناکا. بەخۆڕایی مەترسە. شەلە بۆتۆ حازرە گیانی خۆشی بەخت بکا."

حەمەد:

"دەزانم حازرە رووحیشی بدا... بەڵام ئەگەر چاوی بە شوێن کەوت، ئیدی بە دەست خۆی نیە. خۆی پێ ڕاگیر ناکرێ. هەقی خۆی ئەوە بوو ڕۆژی هەوەڵێ شەلەم کوشتبایە... بەڵام تازە دەرچوو."

## (٣٣)

وەکیل باشی عاصم ئیدی لە رووحی خۆی بێزار ببوو. دەیگوت:"ئەو حەمەدۆکە لە مـن بۆتە بەلاّ. بریا گۆڕەهوو بووایەو چووبایە جێیەکی دیکەو ئەمن لە شەڕی رزگاریم هاتبـا. لـە دەستی ئەو یەزیدە رووحم گەیوەتە سەری لووتم."

ژاندارمەکانیش ئیدی بێزار ببوون. دەیانگوت:"ئاخر تەواوی ئەو زستانە دەکرێ لەو شـاخ و کێوانە بگەڕێین؟ ئاخرەکەی دەبێ بە چی؟."

لـە هـەر جێیـەك تووشـی شـوێنی بنیـادەم دەبـوون وەدوای دەکـەوتن. لـە هـەر جێیـەك رووشاڵێکیان لەسەر بەفر دەدی, وەشك دەکەوتن و چەندین رۆژ بە دوای حەمەدۆك دا دەگەڕان. ئەو بەدواداگەڕانە ببووە هۆی ئەوە کە تا ئێستا چەند دەستەی دیکە لەنێو بەرن, یان بیانگرن.

ئێستاش مانگێك بوو لـە دەوروبـەری عـەلیکۆ بۆسـەیان دانـابوو. چـونکە کـوڕە شـوانێك گوتبووی حەمەدۆکم لەم نیزیکانە دیوە.

عەلیکۆ دەکرێ بڵێین گەمارۆ درابوو. لە چواردەوری ژاندارمەیان دانابوو.

وەکیل باشی باوەڕی نەدەکرد بەو بەفرو زستانە حەمەدۆك لە عەلیکۆ بێ, بەڵام قسەی ئەو کوڕە شوانە, وەکیل باشی عاصـمی دوودڵ کردبوو و نەیدەتوانی لە عەلیکۆ دوور کەوێتەوە.

ژاندارمەیەك کە لە ئاسیاب چەشمەوە تا ئێرە یەك تەکان غاری دابوو و بـەفری دڕیبـوو, بـە هەناسـەبڕکە خۆی گەیاندە وەکیل باشی عاصم:

"وەکیل باشی, دیتمان, دیتمان... خەریك بوو گردەڵی قرژە رەشکەی بەسـەر شوێنی خـۆی دا دەکێشا. خەریك بوو وەسەر دەکەوت. کـە چـاوی بـە ئێمـە کـەوت رای کـرد. هـیچ تەقـەی نەکرد, بەڵام شـوێنەکەی کـوێر نابێتـەوە. ئەگـەر قـرژە رەشـکەش بـە دوای خـۆی دا راکێـشێ

شوێنەکەی کوێر نابێتەوە, چونکە بەفرەکە بەستوویە. ئیدی قرژە رەشکە کارێکی لە دەست نایە. چووین و شوێنەکەمان دی. شوێنەکە هی ئێستا نیە."

وەکیل باشی عاصم خۆشحاڵ بوو. یەکەم جار بوو کە دەیتوانی راست و رەوان لەگەڵ حەمەد بەرەوڕوو بێ.

ژاندارمەیەکی نارده ئاسیاب چەشمە, ماڵی عەبدیخان کە عەلیپەشەلی لەگەڵ خۆی بێنێ.

شەلە هات:

"فەرموو وەکیل باشی."

وەکیل باشی:

"شوێنەکەیان دیوەتەوە عەلی."

شەلە:

"ئەمن لە بەفرێ دا باش نابینم. شوێن ئەگەر لەسەر رەشانگی بێ دەتوانم وەدوای کەوم."

هەموو ئەو لادێییانەی کە لە دەوروبەریان بوون, بۆیان لە مل دا:

"عەلی لەسەر بەفرێ شوێنی پێ ناگەرێ. چاوی لەسەر بەفر باش نابینێ. ئەگەر شوێن لەسەر رەشانگی بێ, دەتوانێ..."

بەڵام وەکیل باشی وازی لە عەلی نەهێنا:

"ئەگەر نەشتوانێ دەبێ لەگەڵمان بێ."

عەلی وەختێك ئەم قسەیەی بیست وەك مێژۆکە دەستی کرد بە لەرزین:

"دەبەر بەری پێیانت مرم وەکیل باشی. بەو کێوانەوە لە سەرمان مەمکوژە."

قسەی وەکیل باشی یەك بوو:

"نابێ, دەبێ بێی."

شەلە ملی بە لاوە ناو دانیشت و پاڵی وەدیواری دا.

وەکیل باشی ژاندارمەکانی بەرەو عەلیکۆ دەنگ دا. هێندەی چاو لەسەر چاوی دانێی دێیەکە شڵەژا:

"شوێنی حەمەدۆکیان دیوەتەوە. شوێنەکەیان دیوەتەوە."

هەموو دێیەکە هەتا بناری عەلیکۆ بە دوای ژاندارمەکان دا رۆیشتن. لە بناری هەموویان لە دەوری شوێنەکەی حەمەدۆك خڕ بوونەوە. هەمووان چاویان لە شوێنەکەوە بڕیبوو و رەق ببوون.

وەختێك عەلیپەشەل چاوی بە شوێنەکە کەوت, دڵی داخورپا, سەری سوڕما, قسەی کرد, قسەی دەکرد بەڵام بۆخۆشی نەیدەزانی دەڵێ چی؟ لەبن لێوانەوە دەیگوت: "ئەو سەگبابە بۆچی قرژە رەشکەی بە دوای خۆی دا رانەکێشاوە؟ ئاخر بۆ؟... بەگیری دێنن. شوێنەکەی بە باشی دیارە."

وەکیل باشی عاصم قۆڵی عەلیی گرت و بردیە پەنای شوێنەکە:

"بۆچی لێوت دەبزوون و دەنگت نایە؟ لەگەڵ خۆت قسان دەکەی؟ بڵێ بزانم ئەو شوێنە هەو نیە؟."

شەلە:

"ئەم شوێنە جێ‌پێی شوانانە. ئی ساڵێك لەمەوبەرە, تازە نیە."

وەکیل باشی عاصم تووڕە بوو. باسکی شەلەی گرت و لە عەرزی داو نەڕاندی:

"نانەجیب... نانەجیبی شەل... هەم گزیری ئاغای و هەم نۆکەری حەمەدۆك؟ نان و نەکی ئاغای دەخۆی و نۆکەری بۆ حەمەدۆك دەکەی؟... ئێوە هەر کامتان حەمەدۆکێکن. بەڵام حەیفی ئەوەیە دەرفەتێکتان بۆ ڕێك ناکەوێ, وانیە؟..."

دەستووری بە نەفەرەکانی دا:

"وەدوا شوێنەکە کەون."

لە سەرمان دەتگوت ڕەق بوون. دەست و لاقیان چووبوون. بەو جۆرە دوو ڕۆژان بە دوای شوێنەکە دا ڕۆیشتن و لووتکەکەیان گەمارۆ دا.

دێ تازیەبار بوو.

عەلی‌یەشەل ملی بە لاوە نابوو و بە دەنگێکی وەك گریان بەخۆی دەگوت:

"تازە دیتیانەوە. تازە حەمەدۆکمانیان دیتەوە, ئاخر بۆچی ئیحتیاتت نەکرد؟..."

دایە حۆری دەی گوڕاند:

"با بی‌بیننەوە. قەیدی نیە با بی‌بیننەوە, تا حەمەدۆك مشووری هەموویان بخوا. ئەگەر هەزار کەسیش بن, حەمەدۆکم دڕیان پێ دەداو دێتەدەرێ."

لای ئیوارێ یەکەمین تێك هەڵچوون ڕووی دا. ژاندارمەکان ئەو ڕێگایەیان دۆزیبۆوە کە دەچوو بۆ ئەشکەوتەکەو زارکی ئەشکەوتەکەشیان دیبوو. لە خوارێ ڕا هەروا نارنجۆکیان هەڵدەدانە زارکی ئەشکەوتەکە.

حەمەد بۆ ئەوەی ئەوان لە زارکی ئەشکەوتەکە نیزیك نەبنەوە, یەکەمین بەرەنگاریی نیشان دا. وەکیل باشی عاصمی دایە بەر دەسڕێژ. دەیانتوانی ڕابکەن. بەڵام نەدەکرا, چونکە خەجیج ژانی دەهاتێ و بەمنداڵیەوە بوو. وەختێك دەنگی تەقە بەرز بووەوە خەجیج دەستی کرد بە گریان.

ئیراز:

"ئەمن نەمگوت؟... ئەمە ئاکامی ئەوەیە کە گردەڵە قرژەڕەشکەکەی لەبیر چووبوو."

حەمەدۆك:

"راسته... هۆی ئەوەیە کە گردەڵەکەم لەبیر چووبوو, بەڵام دیسان نەیاندەتوانی بمدۆزنەوە. پێم وایە عەلی‌یەشەل خۆی پێ رانەگیراوە. پێم وایە دیسان شوێنی منی هەڵگرتوە. بریا کوشتبایەم, ئەگەر باو بۆران دەست پێ بکا, ئەمانە ناتوانن یەك دەقیقەش لێرە بەند بن, لێ‌دەدەن دەڕۆن و هەتا حەوتوویەکی دیکەش ناتوانن بێنەوە... ئەی شەلی نەحلەتی."

وەکیل باشی عاصم بە زمانێکی شیرین داوای لە حەمەد دەکرد:

"حەمەد... کوڕم, تەسلیم بە... تازە لە داو کەوتووی... لە هەر چوار لاوە گەمارۆ دراوی. بە زوویی لێ‌بووردنی گشتی دەردەچێ. وەرە بیکە پیاوەتی و تەسلیم بە. ئەمن نامەوێ تۆ بکوژرێی."

حەمەد وەڵامێکی نەدایەوە. بە گوللەیەك بەردەکەی پەنا وەکیل باشی عاصمی لەبەریەك بڵاو کرد. بە دوای ئەوەدا شەڕەکە توند بوو. هەردوولا گوللەیان دەباراند.

وەکیل باشی عاصم:

"حەوتوویەکیش بێ, مانگێکیش بێ, لێرە نابزووین حەمەدۆك. ئاخرەکەی فیشەکت لێ‌دەبڕێن."

حەمەد ددانی لە چیرەوە بردن و سەرەنجام وەقسە هات و نەڕاندی:

"دەزانم وەکیل باشی, دەزانم... ئاخرەکەی هەروا دەبێ کە گوتت... بەڵام هەتا ئەو وەخت یەکی زیندووتان لێ‌ناهێڵم. هەمووتان دەکوژم. وەکیل باشی بزانە کە ئەمن تەسلیم نابم. ئاخرەکەش دەبێ کەلاکم لەو ئەشکەوتە بەرنەدەری. تێ‌گەیشتی وەکیل باشی؟."

وەکیل باشی:

"حەیفە بۆ تۆ حەمەد. حەیفە بۆ پیاوێکی وەك تۆ. ئەگەر هەمووشمان بکوژی, دیسان فایدەیەکی نیە, چونکە ژاندارمەی دیکەمان بۆ دێن. لەو کارە قازانج ناکەی حەمەد. ئەمساڵ لێ‌بووردنی گشتی دەردەچێ, وەرە تەسلیم بە حەمەدۆك."

حەمەد نەڕاندی:

"فیشاڵان مەکە وەکیل باشی, ئەمڕۆ ئەجەلت هاتوە. هەتا ئەمڕۆ نەمکوشتووی. بەڵام ئەمڕۆ دەتکوژم. ئاخرەکەی لە دوام نەبوویەوە."

تەقە وا گەرم ببوو کە گوێیان لە قسەی یەکتر نەدەبوو. دەورویەری حەمەد پڕ ببوو لە قاپۆڕە فیشەك. دوو توورەکەی دیکە پڕ لە فیشەکی مابوون, بەڵام دەترسا, نەیدەویست فیشەکەکان بە خەسار بدا. ئیراز خەریکی خەجیجێ بوو. جار جار ئارام دەبوو و لە نەکاو دەی‌زیراند.

ئیراز:

"لە چ رۆژێك دا, لە چ رۆژێکی خەراپ دا."

پاشان خەجیجی بەجێ دەهێشت و دەچووە یارمەتیی حەمەد هەتا خەجیج دەیزیڕاندەوە، شان بە شانی حەمەد تەقەی دەکرد. هەر کە زیڕەی خەجیجێ بەرز دەبووەوە، حەمەدی بەجێ دەهێشت و دەچووە ژوور سەری خەجیج.

خەجیج جواناوی بەنێوچاوانێ دا دەهاتنەخوار. خەجیج وەك مار جینگڵی دەدان و شیوەنی دەکرد:

"دایە گیان، دایەگیان... بریا منت هەر نەبووایە دایەگیان."

حەمەدو ئیراز رەش داگیرسابوون. ژووری ئەشکەوتەکە پڕ ببوو لە بۆترشی ئارەق.

حەمەد لەحزەیەك هاواری کرد:

"ئەی دایەگیان کوژرام."

پاشان پەژیوان بووەوەو بە جۆرێك لێوی خۆی کرۆشت کە خوێنی لێهات. خەجیج کە لەبەر ژانان وەك مار جینگڵی دەدان، بە دەنگی "کوژرام"ی حەمەد وەك گوللە لە جێی دەرپەڕی و لە پەنا حەمەد کەوتە عەرزی. دەیگوت:

"حەمەدم، بریندار بووی؟... ئەمن خۆم دەکوژم."

ئیراز گەیشتە سەری، جلەکانی لەبەر حەمەد داکەند:

"گوللەکە لە شانی دراوە."

دەستی کرد بە بەستنی برینەکەی.

حەمەد هەر لەو حاڵەدا تەقەی دەکرد.

وەکیل باشی عاصم لەوە کە تاقە کەسێك ئەو هەموو فیشەکەی هەیە، سەری سوڕمابوو. چەند کەس لە ژاندارمەکانی فیشەکیان لێبڕابوو. بەرە بەرە خەریك بوو ناهومێد دەبوو.

خەجیج زیڕەیەکی توندی دیکەی کێشا. ئیراز گرتی و دای نیشاندەوە:

"تینێ بدە خۆت، قەوەتێ بکە..."

روخساری خەجیج ببووە یەکپارچە ئازارو چرچ و لۆچ. پاشان لە نەکاو ویاقەی ساوایەك بڵیند بوو. حەمەد ئاوڕی دایەوە پشت خۆی. منداڵێکی شەلاڵی خوێنی هاتە بەرچاو. خەجیج رەنگ بە روانیەوە نەمابوو. حەمەد سەری وەرگێڕا. دەستەکانی حەمەد دەلەرزین. ئیدی دەستەکانی هێزیان نەمابوو. تفەنگەکەی لە دەست بەربووەوە.

ئیراز تفەنگەکەی هەڵگرتەوەو دەستی بە تەقە کرد. خەجیج وەك مردوویەك کەوتبوو. حەمەد تاوێك دواتر وەهۆش خۆی هاتەوە، خۆی توند کردەوەو بە دەنگێکی سەیر گوتی:

"پوورێ تفەنگەکەم وێ دەوە."

حەمەد دەستی درێژ کرد. ئیراز تفەنگەکەی دایەوە دەستی حەمەد. ئیراز خۆی گەیاندەوە لای خەجیج، منداڵەکەی خاوێن کردەوەو گوتی:

"کوڕە."

زەردەخەنەیەکی وەك کەکرەی تاڵ لە روخساری حەمەد دا دەرکەوت:

"کوڕە"

شەڕ تا ئێوارەی رۆژی دواتر درێژەی هەبوو. حەمەد بە دەستێك تەقەی دەکرد. ئیراز فیشەکی وەبەر تفەنگەکەی دەدا. ئەو لوولەی تفەنگەکەی لەسەر بەردێك دادەناو سێرەی دەگرت و دەستی لێدەکێشا.

لای ئێوارێ ئیراز بە لارەملی هاتە ژوور سەری حەمەدو گوتی:

"ئیدی نەمان ماوە."

حەمەد لەبیری چووبوو کە فیشەکیان تەواو بوون. دەنگێك لە گەروویەوە هات. دەتگوت خەریکن دەیخنکێنن. بەسەر تفەنگەکەی دا کەوت، پاشان راست بووەوە. چاوی پێ دەرپەرپیبوون. نەیدەزانی چ بکا. رەق رامابوو. هەڵستا، بە چەپ و راست دا دەکەوت. هەر بەو حاڵە خۆی گەیاندە ژوور سەری منداڵەکە. لەسەر منداڵەکەی هەڵدایەوە. ماوەیەکی زۆر تەماشای کرد. دەتگوت گێژ بووە. پاشان گەڕایەوە بەر زارکی ئەشکەوتەکە. زەردەی دەهاتێ.

تفەنگەکەی لەسەر زەوی هەڵگرتەوەو دەسرۆکەکەی لە گیرفانی دەرهێناو وەك ئاڵایەك لە لوولەکەی بەست.

گەڕایەوە لای ئیراز. ئیراز لەسەر گابەردێکی قووڵ دانیشتبوو و لەبەر خۆیەوە دەگریا. ئیراز دەتگوت بووەتە بەرد.

حەمەد:

"پوورە ئیراز."

ئیراز سەری هەڵبڕی، تەماشایەکی حەمەدی کردو گوتی:

"خەجیج."

خەجیج لە هۆش خۆی چووبوو.

حەمەد:

"گوێتان لێبێ بزانن دەڵێم چی. ئەمانە نایەڵن ئەمن زیندوو بم. کوڕەکەم ناو بنێن حەمەد."

پاشان هاتە دەرێ. تفەنگەکەی هەڵێناو هاواری کرد:

"تەسلیمم... تەسلیم بووم وەکیل باشی عاصم."

وەکیل باشی عاصم پیاوێك بوو جوان چاك, سمێڵ چەخماخی, بەخۆوەو چاو زل و حاڵـەتێکی باوکانەی هەبوو. وەختێك گوێی لەدەنگی حەمەد بوو, باوەڕی نـەکرد. بـاوەڕی نـەکرد حەمـەد تەسلیم بێ. هاواری کرد:

"تەسلیم دەبی حەمەدۆك؟."

حەمەد بە دەنگێکی کزەڵۆکە جوابی دایەوە:

"تەسلیمم وەکیل باشی... بە ئاواتی خۆت گەیشتی."

وەکیل باشی گەڕایەوە لای نەفەرەکانی:

"ئێوە لە سـەنگەرەکانتان مەبزوون, ئەمن دەچمە سەرێ. لەوانەیە فێڵمان لـێبکا."

چەند لەحزە دواتر وەکیل باشی گەیشتە زاری ئەشکەوتەکەو چووە ژوور سەری حەمـەدۆك و دەستی گرت، پێدەکەنی:

"ئەوە چ خێرتە حەمـەدۆك... سەرەوخێر بی."

حەمەدۆك:

"خۆش بی."

ئیراز لە قوژبنێك دانیشتبوو و کز دامابوو:

"ئێستاش باوەڕ ناکەم ئەتۆ تەسلیم بووبی حەمەدۆك."

حەمەد هیچی نەگوت. دەستەکانی بەرەو کەلەپچە درێژ کرد.

ئیراز وەك گوللە لە جێی خۆی دەرپەڕی:

"وەکیل باشی, هۆی وەکیل باشی... پێت وا نەبێ ئەتۆ حەمەدۆکت گرتوە."

پاشان چووە قوژبنی ئەشکەوتەکە, لەسەر مەلۆتکەکەی هەڵدایەوە. منداڵەکـە دەرکـەوت. چاوی لەسەر یەك دانابوون.

ئەوە ئەتۆ نی کە حەمەدۆکت گرتوە وەکیل باشـی... ئەمەیـە حەمـەدۆکی ناچـار کـرد تەسـلیم بێ, نەك ئەتۆ. ئێستا ئەتۆ برۆ کڵاوەکەت بە لایەکی سـەرتەوەنێ و بڵێ ئەمن حەمەدۆکم گرتوە."

وەکیل باشی عاصم بە هیچ جۆر چاوەڕوانی دیـمەنێکی وا نـەبوو. تەماشـایەکی خـەجیج و ئیرازو حەمەدی کرد, زەردەخەنەکەی لەسـەر لێوانی وشك بوو دەستی بۆ لای حەمەد درێژ کردو کەلەپچەکەی لە دەسـت دەرهێناو گوتی:

"حەمەدۆك..."

بەلام نەیتوانی قسەکەی تەواو بکا. چەند لەحزەیەك بێدەنگ لە چاوی یەکترەوە رامان:

"حەمەدۆك."

پاشان بۆلەیەکی لێهات:

"حەمەدۆك، ئەمن ئەو پیاوە نیم کە بتوانم تۆ لەم وەزعەدا بگرم."

پێنج خەشاب فیشەکی لە خۆی کردەوەو فڕێیدانە سەر زەوی:

"ئەمن رۆیشتم، ئەتۆ بە دوام دا تەقە بکە."

وەکیل باشی بە نەرمەنەرِ خۆی لە ئەشکەوتەکە فڕێ دایە دەرێ.

حەمەد لە دواوە تەقەی لێدەکرد.

وەکیل باشی خۆی گەیاندەوە هاوکارەکانی:

"چما ئەو بێناموسە بەو ئاسانی‌یە تەسلیم دەبێ؟... فێلێکی کردبوو دەیەویست ئەمن لە داو بخاو بمکوژێ. ئەگەر خۆم فڕێ نەدابایە خواری ئەنگوابووم. چاك بوو کە ئاگام لە خۆم بوو. خەریکە هەوا تووشی دەکا. با بگەڕێینەوە بنارەکان. دەنا هەمووومان لێرە رەق دەبینەوەو دەمرین."

ژاندارمەکان شەکەت و بێحاڵ بەرەو خواری شۆڕ بوونەوە، هەر دەگەڕانەوەو ئاوڕیان دەدایەوە پشتی خۆیان. هەوری رەش رەش بەسەر لووتکەی عەلیکۆوە دەسووڕان. زۆری نەمابوو هەڵی کاتە باو بۆران. وردە وردە دایدایە، دوایە توند و توندتر باری. پاشانیش بایەکی توند هەڵی کردو بەفرەکەی وەك شێتان بە هەموو لایەك دا پرژاند.

لای خۆراتاوا لە عەلیکۆ قیامەتێك بوو. باوبۆران گاڵەی دەکرد. با تۆپەڵە بەفرەکانی لەم بەردەوە بەو بەرد دادەدا. عەلیکۆو دەوروبەری عەلیکۆو سەری ئاسمانیش سپی سپی ببوون. زەمین و زەمان لەو سپی‌یایی‌یەدا دەسووڕان.

## (٣٤)

دەمێکی پێ چوو خەبەرەکە بەدێ و لەوێش ڕا بە شاری گەیشتەوە:"حەمەدۆکیان کوشتوە. هەر باو بۆرانەکە ئارام بێتەوە تەرمەکەی لەکێوی دێننە خوارێ."

خەلکی ئاسیاب چەشمە چاویان بڕیبووە لووتکەی بەفراوی و سەر بە تەمتومانی عەلیکۆ. عەلیکۆ کێوی کێوان... عەلیکۆ... تاقانەی کێوان... عەلیکۆ حەمەدۆکی خوارد...

هەموویان لە ژوورەکانیان خزیبوونەوە. هەموو چاوەڕوانی عەبدیخان بوون. ئەگەر خەبەرەکەی بیستبێ، ئێستا پەیدا دەبێتەوە.

دێهاتییەکانی وایوای یەك یەك زەوییەکانیان لە عەلیسەفابەگ دەستاندەوە. وەسمانەزلە ببووە نۆجوانێکی پازدە ساڵەو گۆرانیی بۆ عەلیسەفابەگ دەگوت:

"حەمەدۆکمان، شەهێنمان."

خەبەر گەیشتە وایوای. وەختێك خەبەرەکە بە گوێی وەسمانەزلە گەیشتەوە وشك بوو. خەنجەرت لێدابایە خوێنی لێنەدەهات. بە خەنجەرانیش وەقسە نەدەهات. بەلووزەو فرمێسکی لە چاوان دەهاتەخوار...

پاشان وەقسە هات:

"وەیڕۆ شەهێنم ڕۆ... چۆن پیاوێك بوو شەهێنەکەم، وەیڕۆ... چاوێکی چەند گەورەت پێوە بوون... برۆیەکانت... قامکەکانت یەکی قەلەمێك بوون شەهێنەکەم... بەژنت بەژن نەبوو شەهێنەکەم، دار شمشاڵ بوو... وەیڕۆ شەهێنەکەم ڕۆ... پێت گوتبووم مام وەسمان، دەمەوێ ڕۆژێك بێمە ماڵێ و میوانت بم... قیسمەت نەبوو شەهێنەکەم... وەیڕۆ شەهێنەکەم ڕۆ... ژنەکەشی لە پەنای بوو، خوا دەزانێ ئەو بەستەزمانە ئێستا چیی بەسەر هاتوە...

گوێتان لە من بێ دێهاتی‌یەکان... شەهێنمان ئێمەی لەدەست ئەو کافرە رزگار کرد بوو، دەبێ ژنەکەی بێنینە دێی خۆمان... دەبێ جێ و رێی بدەینێ و ئاگامان لێی بێ. ئەگەر بشگێرێتەوە، دەبێ لە زیندان دا پێی رابگەین."

دێهاتی‌یەکان:

"باشە، باشە."

ترسی عەلی‌سەفابەگ دیسان لە نێو دڵی دێهاتی‌یەکان دا هێلانەی کرد.

عەبدی‌خان بە غاردان خۆی گەیاندە ماڵی عەلی‌سەفابەگ.

عەلی سەفابەگ لەماڵ نەبوو. ژنی عەلی سەفابەگ گوتی:

"دیتت عەبدی خان؟... دیتت حەقی خۆی چۆن وەرگرتەوە؟... چاوو دڵت ڕوون."

عەبدی خان:

"چاوی هەمووان روون کچم، چاوی هەمووان."

عەبدی‌خان لەوێ ڕا خۆی گەیاندە فەرماندارو دەستی کرد بە ماچ کردنی دەست و داوێنی:

"خوا حکوومەتەکەمان بۆ بپارێزێ جەنابی فەرماندار، وەکیل باشی عاصم قارەمانە، پیاوە. رووحم بەقوربانی ئەو جۆرە پیاوانە."

فەرماندار:

"چاوت رۆشن عەبدی‌خان، ئەو هەموو گلەیی‌یەت لە حکوومەت هەبوو.ئەگەر عەلی‌سەفابەگ نەبووایە ناوی شارەکەت عەیب دار دەکرد. خوا دەوامی عومری عەلی‌سەفابەگ بدا کە نەیهێشت تەلگرافەکەت بەرێ بکەن."

چاوەکانی عەبدی‌خان لە قاپێلك هاتنەدەر. فەرماندار پێکەنی:

"بەڵێ، نەیهێشت تەلگرافەکەت بەرێ بکەن."

عەبدی‌خان:

"هیچ کامێکیان؟ هیچیان هەر لێ‌نەدان؟."

فەرماندار:

"بەڵێ. ئەگەر ئەو تەلگرافانەیان لێ‌دابایە، هەم ئەتۆ لە دار دەدرای، هەم ئەمن. ئاخر ئەتۆ شێت ببووی پیاوی حیسابی؟ دەکرێ تەلگرافی وا بۆ ئەنکەرە لێبدەی؟."

عەبدی‌خان لە فکرەوە چوو. پاشان قاقا پێکەنی:

"باش بوو کە ئەو تەلگرافانە نەرۆیشتن جەنابی فەرماندار، ئاخر ئەمن زۆر تووڕە بووم. سوپاس بۆ خوا. دەنا شارە جوانەکەمان بەدناو کردبوو. سوپاس بۆ خوا. بنیادەم وەختێك تووڕەیە، بۆخۆشی

نازانێ چ دەکا. ئاخر راستت دەوێ بۆمن زۆر ناخۆش بوو کە حکوومەت بەو هەموو تاقەت و توانایەوە بە بستە منداڵێك نەوێرێ. باوەڕ فەرموو زۆرم پێ عەیب بوو. چەند باش بوو کە ئەو تەلگرافانەیان بەرێ نەکرد. سەیر شێتییەکم کرد بوو. ئێوە دەبێ ببوورن جەنابی فەرماندار."

لەکن فەرمانداری هاتەدەر، چووە خزمەت فەرماندەری ژاندارمری. سوپاس و قەدرزانینی پێشکێشی ئەویش کردو پرسی کرد کە ئەگەر رازی بێ، دیارییەك بۆ وەکیل باشی عاصم ئامادە دەکاو تکاشی کرد کە سەری حەمەدۆك نەك لێرە، بەڵکوو لەبەر دەرکی ماڵەکەی ئەو لە ئاسیاب چەقمە بەداردا کەن. فەرماندەریش قبووڵی کرد.

ئەم خەبەرە عەلیەشەل گەیاندبوویە شار. پاشان هاتەلای عەبدیخان و گوتی:

"دوژمنت عومری درێژی بۆتۆ بەجێ هێشت، شوانێك لە کێوی ڕا هاتوە، بە چاوی خۆی کەلاکەکەی دیوە. دەیگوت وەکیل باشی عاصم خەریك بوو سەری دەبڕی کە بیهێنێتەوە... ئەمن بۆئەوەی زووتر خەبەرەکە بە ئاغای خۆم بڵێم، ئیدی بەند نەبووم و وەڕێکەوتم."

عەبدیخان لە پێش دا باوەڕی نەکرد بوو، بەڵام پاش ئەوەی باوەڕی کرد بوو، لە خۆشییان شێت ببوو.

هەتا سێ رۆژانیش هەرکەس لە کێویڕا دەهاتەوە خەبەرەکەی دووپات دەکردەوە.

کاتێك عەبدیخان هاتەوە ماڵێ، عەلیەشەلی لە گۆشەیەك داناو دەستی کرد بە دڵخۆشی دانەوەی:

"وەکیل باشی عاصم کەمێك ئازاری دای، لەبیر خۆتی بەرەوە عەلی. وەکیل باشی زۆر پیاوە، زۆر ئینسانە...، بزانە ئەو دوژمنەی ئێمەی چۆن لەبەین برد؟."

پاشان لەپڕ هاتە کوڵ:

"ئەو دێهاتییانە... ئەو بێ ئەمەکانە... هەرکە دیتیان یەك ساڵ ئەمن نەمتوانی بێمەوە دێی، دەنکە گەنمێکیان بۆ نەناردم. سبەی و دووی دێمەوە دێی و پێیان دەڵێم ئەی بێناموسینە، ئەی بێشەرەفینە... ساڵی ڕابردوو قاتی بوو؟ قاتی بوو و نەتانتوانی حەقی من بدەن؟ پشتتان بە حەمەدۆك بەستبوو, ها ئەوەش حەمەدۆکتان. ئەمەش سەری براوی حەمەدۆکەکەتان. هەڵی گرن چی لێدەکەن، بیکەن. ئەوەش حەمەدۆکتان. ئێستا پێتان نیشان دەدەم کە قاتی بەچی دەڵێن... نیشانتان دەدەم."

دەستی عەلیەشەلی لەنێو دەستی خۆی گرت:

"عەلی."

"فەرموو خان."
"ئەمساڵ بەرهەم لە ساڵەکانی دیکە باشتر بوو. وانیە؟."
"دوو هێندەی ساڵەکانی دیکە بوو خان."
خان:
"بە فکری تۆ چ لەو دێهاتیانە بکەم؟."
"خان بۆ خۆی دەزانێ."
عەبدی تازەترین دەستە جلی خۆی دەبەر کرد. عەتری لە دەسحێبەکانیدا و چووە سەر تاشخانە سەرو ڕیشی تاشین. لە خۆشییان نەیدەزانی چ بکا. چووە لای مستەفا ماراشی. بە پێکەنینەوە لە دوکانەکەی وەژوور کەوت.
مستەفاغا ماراشی:
"پیاو نابێ بە مردنی دوژمنیشی پێبکەنێ عەبدیخان. دنیا هەر ڕۆژە ئی یەکێکە."
دوکان بە دوکان هەموو بازارەکەی پشکنی. خەبەرەکەی بە هەمووان گوت. لە هەر کەس"چاو و دڵت روون"ێکی وەردەگرت و دەرۆیشت. لە پاشان سواری ئەسپەکەی بوو و بەرەو ئاسیاب چەشمە وەرێکەوت، کە ئەوەی نەیدەویست ببێ، بوو.
خەبەری بیست کە:"حەمەدۆك بریندار بووە، بەڵام لە دەستی وەکیل باشی ڕای کردوە."
"کێ دەڵێ ؟."
"وەکیل باشی عاصم وا دەڵێ."
"وەکیل باشی عاصم لە کوێیە؟."
"خەریکە دێ بۆ شار. ئەمن لە "شەبابلی" چاوم پێیکەوت."عەبدیخان سەری ئەسپەکەی بۆلای شار وەرگێڕا. وەکیل باشی عاصم و ئەفەرە شەکەت و کفتەکانیشی هاتنەوە شاری.
عەبدی لەبەر دەرکی ماڵەکەی دابەزی. بەڵام چ دابەزینێك؟ دەتگوت لە ئەسپەکەی بەربووەتەوە. وەك مردووان وەرێکەوت و چووە لای فەخری خانە شێتی عەریزە نووس:
"بنووسە براله، ڕاستەرێ بۆ عیسمەت پاشا بنووسە... بنووسە کە فەرماندارو تەلگرافچی و عەلیسەفابەگ و فەرماندەری ژاندارمەو حەمەدۆکی یاغی پێکەوە ڕێك کەوتوون, بنووسە فەخریخان... بنووسە قوربان هەرچی تەلگرافی بۆ جەنابتم نووسیوە, دەستیان وەدەستی یەکتر داوەو نەیانهێشتوە بگاتە دەستت. بنووسە فەخریخان... ڕاست ئەو جۆرە کە دەڵێم بینووسە..."

## (٣٥)

وەسمانەزلە:

"شەهێنی خۆم پشتی ئاغایانی شکاندوە. عەلیسەفابەگ هێشتاش نیازی هەیە پیاوەکانی خۆی بنێرێتە سەر چیا. چەندی پێ خۆشە با بیان نێرێ. شەهێنی خۆم هەموویان دەخوا."

لە دەری ئاوەدانی لەبن دارێکی پیر کۆ ببوونەوە. گەڵاکان دەستیان بە زەردبوون کردبوو. هێندەی نەمابوو هەڵوەرن.

وەسمانەزلە:

"هەموو مەزراکانمان هی خۆمانە. وەنا؟."

گوتیان:

"بەڵێ، هی خۆمانە."

ئەمەی لەنێوچاوانی کێ دەناسن؟."

"لەنێوچاوانی حەمەدۆك."

وەسمانەزلە هەڵستا:

""عەلی صائب بەگ" نوێنەری "ئورفە" لە ئەنکەرە هاتوەتەوە."

دێهاتییەکان هەموو گیانیان ببووە گوێ:

""لەگەڵ عیسمەت پاشا راستەوخۆ قسەی کردوە. هەر ئەو پاییزەی، رۆژی جێژنی حکومەت، لێبووردنی گشتی دەردەچێ، واتە پازدە رۆژ تا مانگێکی دیکە... لێبووردنەکە حەمەدۆکیش دەگرێتەوە. حەمەدۆك منداڵیشی هەیە. دەبێ مووچەیەکی بدەینێ و بێتە دێی خۆمان، وانیە؟."

دێهاتی‌یەکان یەک دەنگ جوابیان دایەوە:

"پێی لەسەر چاوانمان. مووچەو مەزراکەمان هیچ، رووحیشمان بە قوربانی پیاوێکی وا پیاو بێ."

وەسمانەزلە لە باشترین زەوی‌یەکانی دێ جێی سەد کیلەی بۆ حەمەدۆک جیا کردەوە. ئەم سەد کیلە زەوی‌یە هی "ئەشین" بێوەژن بوو. دێهاتی‌یەکان لەنێو خۆیان دا پوولیان کۆ کردەوەو ئەو سەد کیلە زەوی‌یەیان لە ئەشین بێوەژن کڕی. هەموو دێهاتی‌یەکان پێکەوە زەوی‌یەکەی حەمەدیان کێڵاو هەر سەد کیلەکەیان کردە گەنم."

وەسمانەزلە چنگی لە گڵە کێڵراوەکە داگرت. گڵەکە وەک ئاو بەنێو قامکەکانی دا هەڵڕژا:

"ئیدی ئەگەر بشمرم، هیچی دیکەم لە دنیا ناوێ. عەلی صائب بەگ درۆ ناکا. هەروەک دەڵێن، لێبووردنی گشتی دەردەچێ. عەلی‌صائب بەگ لە پیاوەکانی جێگای باوەڕی عیسمەت پاشایە."

لە شاری قیامەتێک رابوو. عەلی‌سەفابەگ لەسەر ئەوە کە حەمەدۆک نەگیرابوو هەرچی لە دەستی دەهات دەرهەق بە فەرماندارو فەرماندەری ژاندارمری تەنەخیی نەدەکرد. ئەوانی بە هاودەستی و پشتیوانیی یاغی‌یەکان تاوانبار دەکرد. تەلگرافی بۆ ئەنکەرە لێدەدا. لە ئەنکەرەوە فەرمانی توند بۆ گرتنی حەمەدۆک دەردەچوو.

یاوەری ژاندارمە بۆخۆی فەرماندەرایەتیی ژاندارمەکانی گرتە دەست. ئیدی رووحی دێهاتی‌یەکانی تووڕووس هاتبووە سەر لووتیان. نەک لە دەستی یاغی‌یەکان، بەڵکوو لە دەستی ژاندارمەکان...

حەمەدۆک نەیدەتوانی لە هیچ دێیەک وەمێنێ. چەندین رۆژ لەسەر یەک برسی و تینوو، ئەویش بە مندالێکی بەر مەمکانەوە لەکێوان رایان دەبوارد. چەند جار کەوتنە داوی یاوەر فاڕووق، بەلام رزگاریان بوو. ئەگەر لەم رۆژانەدا کەریم ئۆغلی فریای حەمەدۆک نەکەوتایە، وەزعی حەمەدۆک شڕ بوو. حەمەدۆک لە هەر کوێیەک بایە، کەریم ئۆغلی بە هەر جۆرێک با چەک و فیشەک و تازووخەی بۆ دەناردو پێی دەگەیاند. ئەو پوولانەی لە وایوایشەوە دەیان ناردن، هەر لە رێگای کەریم ئۆغلی‌یەوە بە حەمەدۆک دەگەیشتن.

کەریم ئۆغلییش هەروەک وەسمانەزلە، بە چوار چاوان چاوەڕێی جێژنی حکوومەت بوو. ئیدی شتێکی واشی نەمابوو.

خەلکی دێهاتی سەرانسەری خاردەشت، خەبەری لێبووردنی گشتی‌یان پێ خۆش نەبوو. ئەگەر قانوونی لێبووردنی گشتی دەرچوویایە، حەمەدۆکیش دەگەڕایەوە نێو دێ و دەبوو بە

دێهاتی‌یەکی وەك خۆیان و گیروگرفتەکانیان لەگەڵ عەبدیخان دەهاتنەوە سەر دۆخی جارانیان. ئەوان دەیانگوت:

"ئاخر لێبووردن چیە؟ یاغی ئەگەر یاغی‌یە، دەبێ لە چیای وەمێنێ. ئەمن ئەگەر لە جێی حەمەد بوومایە دەستم لەو چیایە هەڵنەدەگرت... دەیەوێ بێتەوە دێ و ببێتە یەکی وەك مەمانان؟... فایدەی چیە؟... ئێستایە کە هەموو دنیا لێی دەترسێ."

## (٣٦)

عەلی‌یەشەل:

"بیستووتە حەمەدۆك؟."

چاوەکانی حەمەد روون بوون. پێکەنی:

"نا."

"ئەوە دەڵێی چی؟... چۆن نا؟."

"بەخوا نا."

"کەوابێ با بۆت باس بکەم."

حەمەد:

"بڵێ بزانم."

عەلی:

"پێیم گوتبووی کە وەسمانەزلەم لەگەڵی شکۆفە دیوە. عەلی صائب بەگ لە ئەنکەرە هاتوەتەوە، گوتوویە رۆژی جێژنی حکوومەت لێبووردنی گشتی حەتمی‌یە. پاشان وەسمانەزلە دێهاتی‌یەکانی خڕ کردوەتەوەو گوتوویە حەمەدۆك شەهێنی خۆمانە. دەبێ بێتە گوندی خۆمان، نێو خۆمان. هەموو دێهاتی‌یەکانیش گوتوویانە پێی لەسەر چاومان. پاشان پووڵیان لەسەر یەك داناوەو بنەتۆوی سەد کیلەیان زەوی بۆ کڕیوی. زەوی‌یەکە وەسمانەزلە بۆخۆی هەڵی بژاردوە. ئێستاش ئەوە خەریکن خانووت بۆ ساز دەکەن. وەسمانەزلە دەڵێ مومکین نیە عەلی صائب بەگ درۆ بکا، ئەمنی راسپاردوە پێت بڵێم وریای خۆت بی هەتا فەرمانی لێبووردن دەردەچێ. دەیگوت دەمەوێ بۆخۆم خەبەری لێبووردنی بۆ بەرم. باشە، دەنگ و باس چۆنە حەمەدۆك؟."

حەمەد:

"بەدەستی ئەم یاوەر فارووقەوە ناسوودەییم لێ‌هەڵگیراوە. هەموو یاغی‌یە پیاوکوژەکانی بەجێ هێشتووەو وەدوای من کەوتوە. هەتا ئێستا لانی کەم دوو جار تووشی یەکتر بووین و لێکمان داوە. ئەمجار ئەگەر تووشی ببمەوە دەیکوژم. هەرچی دەبێ بلا ببێ."

عەلی‌یەشەل:

"کاری وا مەکە حەمەد، هەر ئەم رۆژانە لێبووردنی گشتی دەردەچێ."

حەمەد:

"چارەم نیە، شەو و رۆژ بەدوامەوەیە. ناچارم بیکوژم."

عەلی:

"ئەیکەی حەمەد. کەمێك ددان بە جەرگی خۆت دا بگرە."

عەلی رۆیشت.

لەو رۆژەوە کە خەبەری لێبووردن بڵاو بووەوە، خەجیج خەوی لە چاوان تارابوو.

خاکی لای "ئالآیار" وەك تفی خوێنێ سوورە. وەك شووتی‌یەکی زۆر سوور کە لەنێوێ دا لەتی کەی و بیدەیە بەر هەتاو. خاکی لای ئالآیار راست بەو سووری‌یەیە.

سێ رۆژ بوو پەنایان بۆ گلە سوورەکانی ئالآیار بردبوو. هەرچەند یاوەر فارووق وەك کەلاك خۆرە بەسەر سەریانەوە دەسوورا. بەڵام بەختەوەر بوون.

خەجیج و ئیراز لەبەر خۆیانەوە گۆرانی‌یان دەگوت. ناوی کورەکەیان هەر حەمەد بوو. حەمەد خەپەتۆڵە ببوو. حەمەد بە باشترین لای لایی خەوی لێ‌دەکەوت.

خەجیج حەمەدی هەڵداویشت و دەیگرتەوەو دەیگوت:

"پوورە ئیراز بروانە کاری خوای... ئێمە بنەتۆوی سێ کیلە زەویمان لە خوا دەویست. بەڵام خوا سەد کیلەی داینێ... خانوویەکیش سەربار..."

خەجیج گاڵتەو منداڵ بازاڕی و کاری شێتانەی ئەوتۆی دەکرد کە لە منداڵێکی دوازدە ساڵەش بە دوور بوو. هەمیشە لە حەمەدی دەپرسی:

"چتە حەمەد؟... تۆخوا چیە؟ لێبووردن دەردەچێ، زەویمان هەیە، خانوومان هەیە، ئیدی بۆچی هێندە نێوچاوان تێك دەنێی؟ بۆچی پێ‌ناکەنی؟."

حەمەد تەنیا زەردەخەنەیەکی تاڵی دەکردو تەواو.

پێش ئەوەی هەتاو بکەوێ، لە ئالآیار کەوتنە گەمارۆی یاوەر فارووق. یاوەر دەی‌نەڕاند:

"حەمەدۆك، ئەمن وەکیل باشی عاصم نیم، وەرە دەرێ."

حەمەد وەڵامی نەدەدایەوە. فێر ببوو کە چۆن دەکرێ لە چنگی ژاندارمە رزگاری بێ.
جوابی نەدەدایەوە. تەنیا بۆ سەرگەرم کردنی ژاندارمەکان تەقەی دەکرد. پێی وابوو دەتوانن ئەگەر تاریك داهات، رێگایەك بدۆزنەوەو خۆیان دەرباز بکەن.

ئیراز لە یاغییە هەرە بەناوبانگەکانیش کارامەترو ئازاترو تفەنگچیتر ببوو. دەیتوانی هەر بە تاقی تەنیا سێ رۆژی تەواو ئەو ژاندارمانە دەست بەسەر بکا. یاوەر فارووق خەریك بوو شێت بێ. پیاوێك و ژنێك لە هەمووش خراپتر بە منداڵێکی قۆنداخەوە...

یاوەر:

"حەمەدۆك... لە دەستی من ناتوانی دەرباز بی."

حەمەدۆك ئیدی چارەی نەبوو. بە ئەزمی کوشتن تەقەی دەکردو هەربۆیەش لەنێوەندی ژاندارمەکان دا سەنگەری گرتبوو. ئەمە یەکەم جاری بوو کە ئەو بێ ئیحتیاتییەی دەکرد.

لە پشتەوەی گوێی لە دەنگێك بوو:

"کوژرام."

حەمەد لە جێی خۆی وشك بوو، بەڵام نەگەڕایەوە سەر خەجیج. سەنگەری یاوەری دایە بەر دەسرێژ. بەوەشەوە نەوێستاو دایە بەر نارنجۆك. پاشان بە رق هەستاوی گەڕایەوەو هاتە ژوور سەری خەجیج. خەجیج لەسەر زەوی درێژ ببوو و گیانی دەرچووبوو. منداڵەکەش لە تەنیشتی بوو. خەجیج دەتگوت خەوی لێکەتوەو لە خەوێ دا پێدەکەنێ.

حەمەد شێت ببوو. وەك باران گوللەی دەباراند. نارنجۆك لەسەر نارنجۆك... ئیرازیش لە لایەکی دیکەوە.

یاوەر بریندارو خوێناوی و شپرزە ببوو. ژاندارمەکان توانای بەربەرەکانێیان نەمابوو. ئیراز خۆی بەسەر تەرمی خەجیج دا دابوو و دەگریا. روخساری خەجیج راست وەك ئەو رۆژەی لێهاتبوو کە بردبوویانە بەندیخانە.

حەمەد تفەنگەکەی لە باوەشی گرتبوو، سەری داخستبوو و دەگریا. ئیراز سەری لەسەر تەرمەکە هەڵگرت و لە ئاسمانێی هەڵڕوانی. لە پەرپەرۆچکەی ئاسمانێ قەتارێك مراوی دیار بوون. خوێنی خەجیج و خاکی سووری ئالآیار ببوونە یەك.

پاشان منداڵەکە گریا. حەمەد منداڵەکەی لە باوەش کردو بەخۆیەوە گوشی. بۆ ژێر کردنەوەی دەستی کرد بە هاتوچۆو لالایی.

حەمەد:

"با خەبەر بە ئاوەدانی بدەین بێن خەجیجێ بنێژن."

ئیراز بۆ لای ئاوەدانی وەڕێ کەوت. حەمەد منداڵ لەباوەش... و روخسار سامناك چاوی لە تەرمەکە بڕیبوو و لە راست خۆی وشك ببوو.

وەختێك دێهاتی‌یەکان پێیان زانی، ژن و پیاو و گەورەو بچووك بە گریان و شیوەن هاتنە سەر تەرمی خەجیج:"وەی‌ڕۆ... خەجیجە بێ مرادەکەی حەمەدۆکم ڕۆ... وەی‌ڕۆ، وەی‌ڕۆ..."

حەمەد کوێخای ئاوەدانیی بانگ کردو پووڵی لەمستێ نا:

"خەجیجێم بە رێزو شکۆوە بەخاك بسپێرن."

ماوەیەك چاوی بڕیە روخساری خەجیج. خەجیج پێدەکەنی. حەمەد منداڵەکەی وەرگرت و لە باوەشی کرد:

"با بڕۆین پوورە ئیراز."

حەمەد لە پێشەوەو ئیراز بە دوای دا، نێوقەدی کێویان گرت و وەڕێ کەوتن. لە سەرێ ئەشکەوتێکیان دۆزیەوەو لەبەر زارکەکەی لەسەر بەردێك دانیشتن.

دارەکانی دەوروبەریان گەڵاڕێزانیان بوو. مەلێك بە کوڵ دەیخوێند. لە تەپۆلکەی رووبەڕوویانەوە کۆترێکی سپی هەڵفڕی.

مارمێلکەیەك بە موورە دارێك دا وەسەر کەوت. لەو نێوەدا منداڵەکە کە لە باوەشی بابی دا نووستبوو، وەخەبەر هات و دەستی کرد بە گریان و زیرە زیر...

ئیراز هات. قامکە چکۆڵەی حەمەدی گرت و لە چاوانیەوە ڕاما:

"برای خۆم... دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم، حەمەدۆکی خۆم."

حەمەد جووڵەی نەدەکردو چاوەڕێ بوو.

"برای خۆم، حەمەدۆکی خۆم... ئەو منداڵەم وێ دە بیبەمە دێهاتی "ئانتەپ". ئەو منداڵە لەم کێوانە لە برسان و لەتینوان دەمرێ... ئەمن تازە لە خوێنی رەزای خۆم خۆش بووم. ئەو منداڵە رەزای منە. بەدەیە بیبەم. بەدەیە بیبەم و گەورەی بکەم، ئەو منداڵە بێ‌گوناحەی."

حەمەد بە ئەسپایی منداڵەکەی بۆ لای ئیراز راداشت. ئیراز منداڵەکەی وەرگرت و بە سنگی‌یەوە گوشی:

"رەزای من، رەزای خۆم."

بە دەستێك منداڵەکەی لەباوەش کردبوو، بە دەستەکەی دیکەش فیشەکدانەکانی لەخۆی دەکردنەوە. هەموو فیشەکەکانی لە گۆشەیەك هەڵڕشت:

"بەخوام سپاردی حەمەدۆك."

حەمەد چوو قۆڵی ئیرازیی گرت. منداڵەکە ژیر ببووەوە، حەمەد هەتا ماوەیەکی زۆر نەیتوانی دەستی لەبەر دڵی بێتەوەو چاو لە منداڵەکەی هەڵگوێزێ:

"لە ئەمانی خوای دابن."

## (٣٧)

هەموو ئەسپێك بەكەڵكی ئەو نایە. ئەسپی وی دەبێ كەفەڵی ڕاكشاو و هێلكەیی بن. گوێی تیژو مەقەستی، نێوچاوانی قەشان و تەخت و ڕەق وەك بەرد، ڕەنگی نە كوێت و نە بۆرەو نــە خۆڵەمێشی و نە شێ و نە ئەبلەق بێ. دەبێ دوو ڕەنگ بێ، دوورەنگێكی مەحكەم و سەرتاپێ خەت و خاڵ.

ئەسپەكەیان لەبەر دەركی وەسمانەزلە بەستبووەوە، دەیحیلاندو سمكۆڵی دەكرد. نێوقەدی باریك و لاقی درێژ بوون و چاوەكانی دەتگوت چاوی بووكی تازەن، ڕووناك و بەخومار. كلكی دەكەوتە سەر گوێزینگێ، یاڵەكانی بەسەر لای ڕاستی ملی دا بڵاو ببوونەوە. وەختێك لینگی دەدا، یاڵەكانی دەتگوت "با"ن، دەتگوت هەوایەكن چین لەسەر چین.

ڕۆژی جێژنی گەورە فەرمانی لێبووردنی گشتی دەرچووبوو. زۆر كەس لە یاغییەكان، جگە لەچەند كەسێك هەموویان لەكێوەكان هاتبوونە خوارو چەكەكانیان تەسلیم دەكردەوە.

حەساری ئیدارەی ژاندارمری پڕ لە یاغیی جۆراوجۆر بوو.

یاغییەكان لە حەساری ئیدارەی ژاندارمری چاوەڕێ بوون.

وەسمانەزلە دەستی بە یاڵی ئەسپەكەیدا دێنا:

"لایقی حەمەدۆكی، لایقی كوڕی خۆمی."

دێهاتییەكانیش دەیانگوت:

"لایقیەتی."

وەسمانەزلە خۆی هاویشتە سەر ئەسپەكە:

"ئەمن هەتا دوو ڕۆژی دیكە لەگەڵ شەهێنم دێمەوە. ئێوە بچنە گوندی "ئەندلێن"، دەهۆڵ كوت و زوڕناژەنەكان خەبەردار كەن كە بێن. خەڵكی وایــوای دەبێ ئاوا بە پێشوازی

حەمەدۆکیانەوە بچن. یاغییەکانی دیکە دەبێ بە پێیان بگەڕێنەوە دێهاتی خۆیان. بەڵام حەمەدۆکی ئێمە بە سواری ئەسپی حدوود."

وەسمانەزلە جڵەوی بۆ ئەسپەکەی شل کرد. ئەسپ کەوتە لینگ دان. تووڕووس سەرانسەر شین دەچوو.

خەبەری لێبووردن جەبار بۆ حەمەدی برد. دو دۆستی قەدیمی یەکتریان لە ئامێز گرت و بێدەنگ لە پەنا یەکتر دانیشتن. وەختێك جەبار لە حەمەدۆك جیا دەبووەوە، گوتی:

"ئەمن دەچم تەسلیم دەبمەوە."

حەمەد زاری هەڵنەپچڕی و هیچی نەگوت. ڕۆژێکیان لای ئێواریێ هاتە ئاسیاب چەشمە. نێوچاوانی تاڵ و چاوی قووڵ و ڕوومەتی یەکپارچە چرچ و لۆچ بوون. وەك بەردێکی سەخت بوو. چاوەکانی کە لە ڕوخساری دا چووك دیار بوون، یەکپارچە تیشکی لێبڕاوی و سەرسەختی بوون.

یەکەم جار بوو کە بە ڕۆژی ڕووناك بەو ئاساییە دەهاتە نێو دێ. وەك سەرخۆشان بە لادا دەهات. وادیار بوو هۆشی لەسەر خۆی نەبوو. ژنان سەریان لە دەرکان هێنابووە دەرو بە ترس و سەرسامییەوە تەماشایان دەکرد. منداڵەکان بێدەنگ و بە ترسەوە دوور بە دوور لەگەڵی دەڕۆیشتن.

خەبەر بە دایەحۆری گەیشت کە حەمەدۆك هاتوەتە نێو دێ. حۆری بە غاردان هات و لە گۆڕەپانی نێودێ دا بەرۆکی گرت و بە هەموو تینی خۆی هاواری کرد:

"حەمەد، حەمەد. خەجیجت بە وان بە خواردن داو ئێستاش دەچی تەسلیم دەبی؟... دەتەوێ دیسان عەبدی بێتەوەو وەك ئاغایان بژی؟ ئەودەم ئەتۆ خەریکی تەسلیم دەبیەوە؟ ئاها حەمەدۆك، دڵی تۆ دڵی پیاوان نیە، دڵی ژنانە... تەنیا ئەمساڵ بوو کە ئاسیاب چەشمە برسیایەتیی نەکێشا. تەنیا ئەمساڵ نان زۆر بوو، ئێستا ئەتۆ دەتەوێ دیسان عەبدیخانان تێبەردەیەوە؟... بۆ کوێ دەچی حەمەدە ژنۆکە؟... بۆ کوێ؟... ئەتۆ دڵی پیاوانت نیە حەمەدۆك، دڵی تۆ دڵی ژنانە... تۆهۆی ژنیلە... دەتەوێ بچی تەسلیم بیەوە؟."

لەو ماوەیەدا هەموو خەڵکی ئاسیاب چەشمە لە گۆڕەپانەکەدا کۆ ببوونەوەو وەك مردووان بێ گیان و بێدەنگ تەماشای حەمەدیان دەکرد.

"حەمەدۆکی دڵ ژنۆکە... بڕوانە ئەم دێهاتیيانە... ئەو هەموو خەڵکە چاویان لە چاوی تۆوە بڕیوە... دەتەوێ تەسلیم بیەوە؟... دەتەوێ دیسان عەبدیان تێ بەردەیەوە؟ ئێستا ئێسکەکانی دوونەی خۆشەویستم لەنێو گلکۆدا خەریکن ئاگر دەگرن، ئێسکەکانی خەجیجێ نازداریشم..."

حەمەد زەرد هەڵگەڕابوو. دەلەرزی و تەماشای عەرزی دەکرد.

حۆری بەرۆکی بەرداو دەستی راکێشا.

برۆ تەسلیم بەوە ژنۆکە... برۆ... لێبووردن دەرچووە، پیرۆز بێ..."

لەو بەینەدا وەسمانەزلە بە لینگدان گەیشتێ. دری بە ئاپۆراکە دەداو بەرەو حەمەد لێی دەخوڕی:

"حەمەدۆکی خۆم... شەهێنی خۆم..."

گەیشتە لای حەمەد، دەستی لە ئەستۆی کرد:

"شەهێنەکەم، خانووەکەت دروست کراوەو حازرە، زەوییەکەشتمان داچاندوە، ئەم ئەسپەش دێهاتییەکان بۆیان ناردووی. گوندی وایوای بە دەهۆڵ و زورناوە چاوەڕێتە شەهێنەکەم، دەیانەوێ بەپیرتەوە بێن. بە دەهۆڵ و زورناوە پێشوازیت لێبکەن. نەک وەك یاغییەکانی دیکە. سوار بەو برۆ با چاوی عەلیسەفابەگ کوێر بێ."

هەموو دێهاتییەکان لەگۆڕەپانەکەدا خڕ ببوونەوە. بۆڵەبۆڵ لە سەرانسەری گۆڕەپانەکەدا شەپۆلی دەدا:

"پیرەپیاوی خوا کوێر کردوو، پیری خوا زەلیل کردوو."

حەمەد جڵەوی ئەسپەکەی لە دەستی وەسمانەزلە وەرگرت و لێی سوار بوو. عەلیپەشەل لەوسەری مەیدانێ راوەستابوو. حەمەد لێی خوڕی بۆ لای ئەو. هەمووان سەریان بەرەو ئەولا وەرگێرا. حەمەد بە چاو، عەلیپەشەلی تێگەیاند کە "وەرێ کەوە."

حەمەد بە چوارناڵی لە ئاوەدانی وەدەر کەوت و لەنێو کۆمایەك تۆزو خۆڵ دا لە دێی دوور کەوتەوە. هەموو دێهاتییەکان چاویان لە دووی بوو. لێکڕا مات ببوون، ئەگەر یەکی خەنجەرێکت لێدابان، دڵۆپە خوێنێك لە لەشی هیچ کامێکیان نەدەهات.

لەبەردەشەهێن جڵەوی ئەسپەکەی توند کرد. دابەزی. ئەسپەکەی دە چنارێك خست. چنارەکە گەڵای وەراندبوو، هەتا نێو قەدێ لەگەڵای زەردو زێڕینی خۆی دا ون ببوو. دەوروبەری کانییەکەی بەردەشەهێن سەوز ببوو، سەوزێکی بلوورین... لەسەر بەردێك دانیشت. سەری لەنێو دەستانی گرت. پاش ماوەیەك عەلیپەشەل گەیشتێ. هەناسەبڕکەی وێ کەوتبوو. لە پەنای حەمەد دانیشت. بە قامکی شادەی ئارەقی نێوچاوانی سڕیەوە:

"ماندوو بووم کاکە. هەناسەم دەرنایە."

بۆ ئەوەی بحەسێتەوە ماوەیەك بێدەنگ بوو. حەمەد لەسەرەخۆ سەری هەڵبڕی، چاوەکانی یەکپارچە بە بریسکە گۆڕینەکە رووناك بوون. هەر ئەو تیشکە زەردەی جاران لە میشکی دا بریسکایەوە، شەپۆلی داو تێپەڕی:

"کاك عەلی... ئەتۆ بلێی نیوەشەوێ لە ماڵ بێ؟ ئەگەر بچم وەدەستم دەکەوێ؟..."

"حەتمەن... ئەگەر-بچیە شاری, حەتمەن لەماڵێ وەدەستت دەکەوێ, ئیمکانی نیە شەوێ لەترسان لە ماڵێ وەدەر کەوێ."

"جارێکی دیکە ناوونیشانی ماڵەکەیم پێ بلێ."

"بۆخۆت زیندانی شاری شارەزای؟... باشە ئیدارەی ژاندارمری لەخوارەوەی زیندانە, لە لای راستی ئەگەر لە ئیدارەی ژاندارمری رەت بووی, لەوسەری کۆڵانێ تەنیا یەك خانوو هەیە کە بە گێچ سپیکاری کراوە, بەلام ئەتۆ بە شەو دەچی, بە شەو رەنگ باش نابینرێ. کلاورۆژنەکەی زۆر بلیندە, دەڵێی منارەیە... بە کلاورۆژنەکەی دەیناسی, لە کلاورۆژنەی هەموو ماڵەکان بلیندترەو دیارە. لەنێو هەموو خانووەکان دا لە چاو دەدا. خانووەکە دوو نهۆمە. بەلام خانووەکانی دیکە هەموویان یەك نهۆمن. هەر کە هەتاو ئاوا بوو, عەبدیخان دەچێتەوە ژوورێ و ئیدی نایەتەدەر. دەروازەی ماڵەکە لە پشتەوە گەلە دەدرێ. دەرگاکە درزێکی تێدایە, خەنجەرەکەت بەو درزەدا بەرە ژوورێ و هەڵی کێشەو دارگەڵەکەی پێ لادە."

حەمەد بێئەوەی هیچ بلێ هەستایە سەرپێ. ئەسپەکەی لە دارەکە کردەوەو سوار بوو. ئەسپەکە وەك با دەرۆیشت. یاڵەکانی تێك با هەڵدرابوون. وەختێك دەنگی هارەی ئاشی هاتە بەرگوێ, وەهۆش خۆی هاتەوەو جڵەوی ئەسپەکەی راکێشا. لەحزەیەك راوەستا. گوێی هەڵخست. پاشان لە سەرەخۆ ئەسپەکەی لێخوڕی. فیشەکی بردە بەر تفەنگەکەی و هەروەها دەمانچەکەی... لە نیزیك ماڵی "تەکەرەك" وادیار بوو ئەسپەکە لە شتێك دەرەوێتەوە. مامزەی لە ئەسپەکە داو بەنێو بازاڕی دا تێپەڕی. چراتۆڕی قاوەخانەکان هێشتا دایسا. چەند کەس ئەویان دیت و وەك غەوارەیان هاتە بەرچاو, بەڵام لەم رۆژانەدا دیتنی کەسانی چەکدار لە نێو شار دا زۆر سەیر نەبوو. شتێکی ئاسایی بوو. حەمەد هۆشی لە جێیەکی دیکە بوو, تەنانەت ئەوانی هەر نەشدی. بەکۆڵانی مزگەوتێ دا بەرەو هەوراز لێی خوڕی. ماڵی عەبدیخان کەوتە لای چەپی. لە بەردەرکی ماڵێ لە ئەسپەکەی دابەزی. ئەسپەکەی لەبەر دەرکی ماڵێ لە تاریکێ لە لکە دارتوویەك خست. خەنجەرەکەی لە درزی دەرگاکەوە بردە ژوورێ, دارگەڵەکەی لاداو دەرگا کرایەوە.

لە ژوورەکەی سەرێ چرا دایسا. هەر سێ پلیکانی بە شەقاوێك بڕی. وەختێك ژن و منداڵ چاویان بەحەمەد کەوت. قیامەتێك رابوو. حەمەد راستەڕێ چووە ژوورەکەی تەیشتی. عەبدیخان خەواڵوو بوو. هەردوو دەستی بەم لاو ئەولادا ئاوەڵا کردبوون و باوێشکی دەداو هەروا بەدەم باوێشك دانەوە تەشەری لێدەدا:

"چیە؟ دیسان چتانە؟."
حەمەد گەیشتە سەری. قۆڵی گرت و رای تلەکاند:
"چاوت بکەوە خانی خانان! ئەمنم ئەمن، حەمەدۆك!."
عەبدیخان چاوی هەڵێنان. لە پێش دا باوەڕی نەکرد. پاشان هەروا بە چاوی مۆلەق ماوەوە وشك بوو و نەیتوانی لەجێی خۆی بجوڵێ. رەشکێنەی چاوەکانیشی سپی ببوو.
لە ژوورەکەی دیکە قیامەتێك رابوو، حەمەد تفەنگەکەی راست کرد. سێ گوللەی لە سنگی عەبدیخان دان. بە تەقەی تفەنگەکان ئەو چرایەی لە ژووری دا هەڵ کرابوو، کووژایەوە.
وەك بریسکە لە پلیکانەکان چووە خواری و سواری ئەسپەکەی بوو. لەو نێوەدا ژاندارمەکان خەبەردار ببوون و ماڵەکەیان وەبەر گوللەباران دابوو. ئەسپەکەی بە تاو بەرەو چیاکانی توورووس لینگ دا. لە دوایەوە وەك خیزو خۆڵ گوللە دەباری. حەمەد هەر بەو خێراییە لە شار دوور کەوتەوە.
خەریك بوو تاو بکەوێ کە گەیشتە ئاسیاب چەشمە. لە گۆڕەپانی نێو دێ جڵەوی ئەسپەکەی راکێشا. ئەسپەکە لە ئارەق دا رەش هەڵگەڕابوو. سینگی وەك هەمبانەدەمە هەڵدەستاو دەپووکایەوە. مل و کەفەڵی لەکەف و ئارەق دا خووسابوون. حەمەدیش شەلاڵی ئارەق بوو. ئارەق لە موورەگەی پشتی دەچۆڕا، سەروچاو و کاکۆڵی لە ئارەق دا خووسابوون.
هەتاو بالاپیاوێك بەرز ببوو. سێبەرەکان بەرەو خۆرئاوا بێبڕانەوە درێژ دەبوونەوە. ئەسپی شەلاڵی ئارەق سەرتاپای نوورباران کرابوو و هەموو لەشی بریسکەی دەدا.
دێهاتییەکان حەمەدیان لەنێوەڕاستی مەیدانەکەدا وەك کێوێك بەسەر ئەسپەکەوە دەدی. هێدی هێدی و بێدەنگ، گەورەو چووك و ژن و پیاو و پیرو لاو لە دەوری کۆبوونەوە. ببوونە ئەلقەیەکی گەورە. بەلام دەنگێك نەدەبیسترا. هەمووان چاویان تێوە بڕیبوو. سەدان چاو لە حەمەدەوە بڕابوون، بەلام هیچ کەس دەنگی لەبەر دەرنەدەهات.
سوار کە لە نێوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا وەك گابەردێکی قورس و قایم راوەستابوو و جوولەی نەدەکرد، تەکانێکی دا. ئەسپ یەك دوو هەنگاوی هەڵێنانەوە و سەرلەنوێ راوەستا. سوار سەری بەرز کردەوە. چاوی بە دێهاتییەکان دا گێڕا.
دایەحۆری کە دەتگوت دڵۆپە خوێنێکی لە لەش دا نەماوە، زەردو رەنگ پەڕیو لە جێی خۆی راوەستابوو و جوولەی نەدەکرد. چاوە داپچڕاوەکانی لە سوارەکەوە بڕیبوو و چاوەڕوانی قسەیەك و جوولەیەکی ئەو بوو.

ئەسپەکە سەرلەنوێ بزووت. حەمەد ئەسپەکەی بەرەو دایەحۆری لێدەخوڕی. وەختێک گەیشتە پەنای دایەحۆری جڵەوەکەی توند کرد:

"دایە حۆری, دایە حۆری... بوو!... گەردنم ئازاکەن."

لێیداو ڕۆیشت بەرەو عەلیکۆ. وەك هەورێکی ڕەش لەئاوەدانی تێپەڕی و لەبەر چاو ون بوو.

وەختی وەردو شێو بوو. دێهاتییەکانی هەر پێنج گوندی خاردەشت کۆ بوونەوە. گەورە کچەکان جوانترین جل و بەرگیان لەبەر کرد, پیرێژنەکان چارشێوی سپی, چارشێوی وەك بنێشت سپییان بەسەر خۆیان دا دا. دەهۆڵ و زوڕنا لێدرا... جێژنێك بەرپا بوو... تەنانەت عەلی دورمووشیش لە نوێنی نەخۆشی هاتەدەرو هەر بەو نەخۆشییە هەڵپەڕینی گرت.

پاشان ڕۆژێکیان بەیانی زوو, هەموویان پێکەوە وەڕێ کەوتن و درووەڵانەکانی خاردەشتیان ئاور تێبەردا.

ئیدی خەبەرێك لەبارەی حەمەدۆکەوە نەبیسترا. ناو و نیشانی ون بوو.

لەو ڕۆژەوە تا ئێستا, دێهاتییەکانی خاردەشت هەموو ساڵێ پێش ئەوەی خاردەشت بکێڵن, کۆ دەبنەوەو جێژنێك دەگرن و دڕووەڵانەکانی خاردەشت دەسووتێنن. ئاگر سێ شەو و ڕۆژ لە سەرانسەری خاردەشت دا لەم دڕووەڵانەوە بۆ ئەو دڕووەڵان و بۆ هەر لایەك دەسووڕێ و غار دەداو وەك شێتان خاردەشتێ دەلێسێتەوە. لەو دڕووەڵانانە کە دەسووتێن هاوارێك هەڵدەستێ. هەر لەو کاتەدا لە لووتکەی عەلیکۆش پەڵە تیشکێك دەتەقێتەوە. لووتکەی عەلیکۆ سێ شەوان وا ڕووناك دەبێ, وەك جەنگەی نیوەڕۆ.

